کوردستان لە سەفەرنامەی بیانی دا - زنجیرەی ژمارە ١

کلودیوس جەیمس ریچ

# گەشتنامەی ریچ بۆ کوردستان
# ١٨٢٠

وەرگێڕانی
محەمەد حەمە باقی



چاپی پێنجەم
٢٠١٢

**کلودیوس جەیمس ریچ**

# گەشتنامەی ریچ بۆ کوردستان

**١٨٢٠**

وەرگێڕانی

**محەمەد حەمە باقی**




هەولێر - ٢٠١٢



**دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

- **گەشتنامەی ریچ بۆ کوردستان ۱۸۲۰ (کلودیوس جەیمس ریچ)**
- **کوردستان لەسەفەرنامەی بیانی دا زنجیرەی ژمارە (۱)**

---

- **نووسینی:** کلودیوس جەیمس ریچ

---

- **وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە:** محەمەد حەمە باقی

---

- پیتچنین: محەمەد حەمە باقی

---

- هەڵەگری: محەمەد حەمە باقی

---

- **نەخشەسازی ناوەوە:** رێدار جەعفەر

---

- **بەرگ: هۆگر سەدیق**

---

- **نرخ:** (٦٠٠٠) دینار

---

- **چاپی چوارەم**

---

- **تیراژ:** ١٠٠٠ دانە

---

- **چاپخانە:** چاپخانەی خانی (دهۆك)

---

- **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٤٩٢)ساڵی(٢٠٠٢)ی پێ دراوە.**

**زنجیرەی کتێب (٦٣٠)**



کلودیوس جەیمس ریچ   (پۆرترێت)

١٧٨٧ – ١٨٢١ ز

تێبینی: ئەم وێنەیەم لە بەڕێز مامۆستا تاها بابان (پارێزەر) وەرگرتووە

# NARRATIVE

OF A

# RESIDENCE IN KOORDISTAN,

AND ON THE

## SITE OF ANCIENT NINEVEH;

WITH JOURNAL OF

## A VOYAGE DOWN THE TIGRIS TO BAGDAD

AND AN ACCOUNT OF A VISIT TO

## SHIRAUZ AND PERSEPOLIS.

BY THE LATE

CLAUDIUS JAMES RICH, ESQ.RE

THE HON. EAST INDIA COMPANY'S RESIDENT AT BAGDAD,

*Author of "An Account of Ancient Babylon."*

---

EDITED BY HIS WIDOW.

---

TWO VOLUMES.—VOL. I.

LONDON:

JAMES DUNCAN, PATERNOSTER ROW.

MDCCCXXXVI.

**بەرگی دەرەوەی گەشتنامەی ریچ بۆ کوردستان**

# پێشەکی

## بە دەستکارییەوە بۆ ئەم چاپە

هەرکە باسی نەتەوەی کورد و کوردناسانی خۆرهەڵات و خۆرئاوا و ئەو گەشتوەرانە دەکرێ کە سەردانی کوردستانیان کردووە، یەکسەر ناوی میستەر (کلودیوس جەیمس ریچ - Claudius Games Rich)مان بەیاد دێتەوە ، کە لەم مەیدانەدا جێگەیەکی فراوانی بۆ خۆی داگیر کردووە، چونکە وەك خۆی لەم کتێبەدا دەڵێ: یەکەمین ئەوروپاییە، کە سەردانی کوردستانی بەو تێروتەسەلییە کردبێ... هەرچەندە پێش ئەو، چەندان گەشتوەری تریش هاتوونەتە کوردستان، هەر بۆ نموونە ناوی هەندێکیان بەیاد دێنینەوە:

١- کۆنترین گەشتنامە. کە ناوی (کورد)ی تێدا هێنرابێ، ئەو گەشتنامەیەیە، کە لە ساڵی ١٤٧٣ز-دا لەلایەن زێڕینگەری باڤاری (جوهان سچیل بەرگەر JOHANN SCHILTBERGER)ەوە بڵاوکراوەتەوە.١

٢- گەشتی ئەولیا چەلەبی، لە ساڵی ١٦٣٠ز-دا بۆ جزیرە و بۆتان. کتێبەکەی لە ساڵی ١٨٩٦ز - ١٩٠٠ز- لە(١٠) بەرگدا بەناوی: (أولیا - چلبی سیاحتنامەسی)، لە ئەستەموولْ چاپکراوە، کە بەرگی سێیەمیان تایبەتە بە (کورد)ەوە و مامۆستا (سەعید ناکام) کردوویەتی بە کوردی.(٢)

٣- گەشتی ژان ئۆتەر - کە ساڵی ١٧٣٤ تا ساڵی ١٧٤٣ بۆ ماوەی (٩) ساڵ

---

١ - بڕوانە لاپەڕە (٦)ی کتێبی (بەرکوتێکی خەرمانی کوردناسی لە ئەوروپا)، لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٩ز.

٢- کورد لە مێژووی دراوسێکانیدا - سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی)، وەرگێڕانی بۆ کوردی، سەعید ناکام، لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٩ز.

هاتۆتە خۆرهەڵات و بەشە زۆرەکەی ئەم سەردانەی بۆ کوردستان بووە و هەواڵی زۆر تازە و شاراوەی لە بارەی کوردستانیەوە تێدایە(*)

٤- گەشتی نیبور NIEBUHR - کە لە ساڵی ١٧٦٦ز-دا دەرچووە(٣).

٥- گەشتی قەشە (فیدلیس FIDELIS) ، ساڵی ١٧٩٤ز- بە (قەڵاچوالان)دا بۆ (بەغدا) چووە. ناوبراو سەر بە لیژنەی ڕاگەیاندنی (کرملی)، (بین النهرین) بووە(٤).

٦- گەشتی (بیرك BERK) ، ساڵی ١٧٩٩ز- سەفەری بۆ کوردستان و ئەرمەنستان و گورجستان و ئەنەدۆڵ و ناوچەکانی عێراقی ئێستا کردووە(٥).

٧ - گەشتی (ولیام هیود WILLAM GEUDE) ، ساڵی ١٨١٧ز- لە بەغداوە بەڕێگای (دەلی عەباس، قەرەتەپە، کفری ـ ئیبراهیم خانچی ـــ سەگرمە)دا بۆ (سلێمانی) چووە و لەوێشەوە بەڕێگای (سورداش، دوکان، کۆیە، هەولێر، مووسڵ)دا گەڕاوەتەوە(٦).

٨-گەشتی سیر ڕوبەرت کەرپوتەر SIR ROBERT KERPOTER) ، ساڵی ١٨١٨ز- لە بەغداوە بەڕێگای (کفری، کەرکووك)دا بۆ سلێمانی چووە، لەوێشەوە بەڕێگای (قەیوان، ئەزمڕ، قەرەسرد، پردێ، قەشان، ماوەت)دا بۆ (سەردەشت و مەهاباد و تەورێز) چووە (٦). بێگومان دوای ئەمانیش ژمارەیەکی زۆری گەشتوەرانی تر، سەردانی جیاجیای کوردستانیان کردووە و پاشان ڕاپۆرت و نووسین و نامیلکە و کتێبیان لەمەڕ گەشتەکانیان چاپ و بڵاوکردۆتەوە، کە دیسان هەر بۆ نموونە ناوی هەندێك لەوانیش بەیاد دێنینەوە: (ا. ن. کرووز، ساڵی ١٨٢٩ز-(٧)، ئار. میگنن R. Mignan - لە ساڵی ١٨٣٠ز(٨)،جەیمس بێلی فرەیزەر JAMES BAILLIE FRASER - ساڵی ١٨٣٤ز-(٩)، جی. شیل J. SHELL .J - ساڵی ١٨٣٦ز-(١٠)، ئێچ. سی. ڕاولنسین H. C. RAWLINSON -

---

(* ) سفرنامە ژان أوتر در عصر نادر شاه، ترجمە دکتر علی اقبالی، چاپ دوم، تهران، ١٣٦٦ش.

٣ - بڕوانە کتێبی (بەرکوتێکی خەرمانی کوردناسی لە ئەوروپا) ل٧.

٤- بڕوانە کتێبی (کُردها. تُرکها. عربها)، نووسینی: سیسیل. جی ئەدمۆندز، وەرگێڕانی بۆ فارسی، ئیبراهیم یونسی، تهران ١٣٦٧ إنتشارات ڕوزبهان، ل٣٦.

٥- بڕوانە کتێبی (بەرکوتێکی خەرمانی کوردناسی لە ئەوروپا) ل٦.

٦- (٦)، (٧)، (٨)، (٩)، (١٠)، (١١)، (١٢)، (١٣)، (١٤)، (١٥). بڕوانە کتێبی (کُردها، تُرکها، عرَبها) ل٣٠-٣٣.

ساڵی ١٨٣٦ز-(١١)، ئاینورپ W. AINSWO - ساڵی ١٨٣٧ز-(١٢)، ئۆژن فلاندن- ساڵی ١٨٤٠-١٨٤١-(١٣)، فیلکس جونز - ساڵی ١٨٤٤ (٤١)ف. دیتیل - ساڵی ١٨٤٧. (١٥) چیریکۆڤ J.،E، CHIRIKOV - ساڵی ١٨٤٩ز، (٦١) أ. کلیمانA، CLEMENT - ساڵی ١٨٥٦( ). (١٧) سەندریکفی NDRECFHISA - ساڵی ١٨٥٧ز( )، (١٨) بلو Blau - ساڵی ١٨٥٨ز(١٩)، ستریکەر Strecker- ساڵی ١٨٣٦ز(٢٠)، ڤامبەری Vambery - ساڵی ١٨٦٧ز(٢١)، بیکەر Becker- ساڵی ١٨٣٧ز(٢٢)، پاچستین Pachstein- ساڵی ١٨٨٣ز(٢٣)، مانسل R. Maunsell. ساڵی ١٨٨٨ز(٢٤)،بیلك(٧ ). (٢٥)

بورهارد- ساڵی ١٨٩٦ز٨(٢٦)، مارك سایکس Mark Sykes- ساڵی ١٩٠٢ز، (٢٧). بیلك Belk - ساڵی ١٨٩٣).٩

لە ساڵانی دوای سەدەی ڕابووردووشەوە هەتا جەنگی یەکەمی جیهانی، چەند زانایەکی ناوداری ئەڵمانی وەك: پرۆفیسۆر ئۆسکارمان، پرۆفیسۆر فۆن لکۆك، پرۆفیسۆر ئەدوارد سەخاو، پرۆفیسۆر ئاوگۆست پیتەرمان و پرۆفیسۆر مارتین هارتمان، ڕوویان کردۆتە کوردستان و پاش گەڕانەوەیان، نەك تەنیا هەر باسی زانستانە و بەکەڵکیان لەسەر زمان و ئەدەبیاتی کوردی بڵاوکردۆتەوە، بەڵکو ژمارەیەك دەستنووسی کوردی و سەر بە کوردیشیان لە کوردستان و خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا کۆکردۆتەوە و بۆ ئەڵەمان بردۆتەوە١٠

لە سەرەتای ئەم سەدەیەشەوە چەندان گەشتوەری تر هاتوونەتە کوردستان، وەك:

١- گەشتی: ئۆژین ئۆبین - ساڵی ١٩٠٦(* ).

---

٧ (١٩)، (٢٠)، (٢١)، (٢٢)، (٢٣)، (٢٤)، (٥٢)- بڕوانە (بەرکوتێکی خەرمانی کوردناسی لە ئەوروپا) ل ٢١-٣١.

٨ - (٢٦ )، (٢٧) - بڕوانە کتێبی (بەرکوتێکی خەرمانی کوردناسی لە ئەوروپا) ل٥١.

٩ - (٢٨) بڕوانە کتێبی (کُردها، تُرکها، عَرَبها) ل٤٣.

١٠- (٢٩) بڕوانە کتێبی (بەرکوتێکی خەرمانی کوردناسی لە ئەوروپا) ل٢٦.

(*) بنوارە: ایران امروز - ئۆژین أوبن - ترجمه علی أصغر سعیدی - چاپ أول - تهران ١٣٦٢ش.(سەرنج) لاپەڕەی ئەودیو.

١١- خاگرات ویلهلم لیتن - ترجمه دکتر پرویز صدری - چاپ أول - تهران - ١٣٦٨ش، سەرنج: ئەم سەفەرنامەیەمان کردۆتە کوردی و لە دەرفەتێکدا بەچاپی دەگەیەنین.

٢- گەشتی : برترام دیکسن Bertram Dickson - ساڵی ١٩٠٩ز(٣٠).
٣- گەشتی: ئی. بی. سۆن E. B. Soan - ساڵی ١٩٠٩(٣١).
٤- گەشتی: تی. سی. دابلیو فاول T. W. Fowle ساڵی ١٩١٠ز(٣٢).
٥- گەشتی: جی. ئی. هابەرد Hubbard - ساڵی ١٩١٤ز(٣٣).
٦- گەشتی: گی. ئیچ. دی. ڕایدەر G. H. D. Ryder ساڵی ١٩١٣ -١٩١٤ز(٣٤).
٧- گەشتی: ئەی هیرتسفیلد - ساڵی ٩١١(٣٥).
٨- گەشتی: ویلهلم لیتن -٥١٩١ (١١)
٩- گەشتی: و. مینۆرسکی- چونکە هاوکاری (ئەی. تی. ڕاولینسن) و (رایدەر) بووە، نووسینی زۆر بە کەڵکی لەسەر کوردستان بڵاوکردۆتەوە(٣٦)١٢.

١٠- گەشتی: سیسیل، جی. ئەدمۆندز- هەرچەندە ناوبراو تا ساڵی ١٩٥٨ لە عێراقدا کاربەدەست و ڕاوێژکاری حکوومەتی بەریتانیا بووە، بەڵام لە ئەنجامی ئەم گەشتانەیدا، کە بۆ ناوچە جیاجیاکانی کوردستانی باشوور کردوویەتی، لە ساڵی ١٩١٩ - ١٩٢٥-دا، کتێبێکی بەناونیشانی (کورد و تورك و عەرەب )(٣٧)١٣ نووسیوە.

°°° بەڵام ئەم گەشتنامەیەی (ریچ) ئەگەر لە ڕووی مێژووییشەوە لە چەندانێکیان، دواتربێ، ئەوا لە بواری گەشتوەریدا، لە هەموو گەشتوەرەکان دیارترە و شایانی لێ وردبوونەوەیە، چونکە یاداشتەکانی لە هەموویان وردتر و دەوڵەمەندتر و بەربڵاوترە. هەر لەبەرئەمە زۆربەی ئەو گەشتوەرانەی دوای (ریچ) سەردانی کوردستانیان کردووە، یان ئەو کوردناس و مێژووناسە بیانی و خۆماڵییانەش، کە لە هەر لایەنێکی ژیانی کوردەواری شتێکیان نووسیبێ، ناوی (ریچ)یان هێناوە.

بەشە زۆرەکەی ئەم گەشتەی میستەر (ریچ) بۆ میرنشینی بابان و پایتەختەکەیان (سلێمانی) بەتایبەتی و میرنشینی (ئەردەڵان) و پایتەختەکەیان (سنە) بەگشتی تەرخان

---

١٢- (٣٠)، (٣١)، (٣٢)، (٣٣)، (٣٤)، (٣٥)، (٣٦)- بڕوانە کتێبی (کُردها، تُرکها، عَربَها) - ل ٤٣ - ٧٣.

١٣- (٣٦)، (٣٧) بڕوانە (یادداشتی ٢ی ئایاری ١٨٢٠-ی پاشکۆی یەکەم) سەرەبڕشت لە یاداشتی ڕیچ خانمی ئەم کتێبە.

کردووه. بەڵام ئەوەندەی توانیبێتی لە هەموو ڕوویەکەوە باسی تێکڕای کوردستان و دراوسێکانی و دەسەڵاتی دراوسێکانی کورد و لایەنی ئیداری و سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و بازرگانی و کشتوکاڵ و ئەتنۆگرافی و ئارجیولوجی و شێوەکانی فەرمانڕەوایی لە ناوچەکانی قەڵەمڕەوی میرنشینەکانی کورد و پێوەندییان لەگەڵ ( تاران، ئەستەموول، بەغدا، مووسڵ ) و پێوەندی هەردوو دەسەڵاتی تورکی عوسمانی و ئێرانیشی کردووە، کە ئەو کاتە زۆربەی گرژیی و ناکۆکی ئەم دوو دەسەڵاتە، لەسەر ئەوەبووە، کە هەریەکەیان لای خۆیەوە، پێشبڕکێ لەوەدا بکات، دەست بەسەر کوردستانی باشووردا بگرێ، کە لە نێوان کەوشەنی هەردووکیاندابووە، لەم پێناوەشدا هەرچی فرتوفێڵ و پیلان و ئاژاوە هەبووە، بۆ سەرکوێرکردنی میرنشینەکانی کورد و پشێویی دروستکردن لەنێوان ئەندامانی بنەماڵەی میرنشینەکاندا و دەست تێوەردانی کاروباری ناوخۆیان کردووە و تا میرنشینەکانیان بەرودوا لەناونەبردووە، دەستیان هەڵنەگرتووە.

ڕەنگە ئەم گەشتەی (ریچ) لەبنەڕەت و لە بنەواندا بۆ کوردستان، نیاز و مەبەستی تری لە پاڵدا بووبێ، چونکە وەك خاتوون (ریچ)ی هاوسەری لە پەراوێزی لاپەڕەیەکی ئەم کتێبەدا، دانی پێدا دەنێ، ئەو کاتەش (داوود پاشا)ی والی ئەو سەردەمەی بەغدا، بەسڵ و گومانەوە بۆ گەشتەکەی (ریچ)ی ڕوانیوە، کە بە بیانووی سەیران و گەشتوگوزارەوە دەستی پێکردووە. بەڵام میستەر (ریچ) لە یەکەمین ڕۆژی دەست پێکردنی گەشتەکەیەوە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە لەلایەن دۆستگەلێکی کوردەوە بانگهێشتنی بۆ ئەم سەردانە پێگەیشتووە و (ئەدمۆندز)یش لە کتێبەکەیدا (کورد و تورك و عەرەب) سەبارەت بەم گەشتەی (ریچ) بۆ کوردستان، دەڵێ: گوایە لەلایەن (مەحموود پاشای بابان) ەوە بۆ کوردستان بانگهێشتن کراوە. بەڵام ئاماژەی بۆ ئەوە نەکردووە، کە ئەم هەواڵەی لە کوێوە وەرگرتووە(٣٨)١٤.

سەرباری هەموو ئەمانەش، ئەم گەشتنامەیەی (ریچ) جێگەی تایبەتی خۆی لە مێژووی کورد و کوردناسدا هەیە.

ئەم گەشتنامەیەی میستەر (ریچ)، کە لە ساڵی ١٨٢٠-دا نووسیوێتی و دوای مردنی خۆی، خاتوو ریچی هاوسەری ساڵی ١٨٣٦- چاپی کردووە، دوو بەرگە و لەبنەڕەتدا ناوی (بەسەرهاتی نشینگەیی لە کوردستان و لە شوێنەواری نەینەوا ـــ ی کۆن، لەگەڵ پوختەی

---

١٤- (٣٨) بڕوانە: پێشەکی کتێبی (کُردها، تُرکها، عَربها).

گەشتێك بەڕێڕەوی دیجلەدا بۆ بەغدا و ڕاپۆرتێکیش لەبارەی شیراز و پەرسەپۆلس)ە. بەڵام لە نووسینی ناونیشانەکەدا، لەسەروو هەموو ئەو ناونیشانە درێژەوە، بەخەتێکی درشتتر لەوانیتر، نووسراوە: (بەسەرهاتی نشینگەیی لە کوردستاندا) و بەرگی یەکەمیان لە ١٦ی نیسانی ١٨٢٠-ەوە دەستی بەو گەشتەی کردووە کە خۆی لە یەکەمین هەنگاوی دەرچوونییەوە لە بەغدا، بەنیازی سەردان و دیدەنی کوردستان بووە و لە ١٦ی نیسانی ١٨٢٠-دا، لەگەڵ خۆی و ژمارەیەکی زۆر لە کارگێڕان و کارگوزاران و پارێزەران و پزیشك و نۆکەر و کارەکەر و دەستەی نوێنەرایەتی کۆمپانیای هیندی خۆرهەڵات، کە نزیکەی ٦٠ کەسێك بوون بەگشتی، بەتیپی مۆزیکی دەوڵەت و ئاڵای حکوومەتی بەریتانیاوە، بەڕێگای (دەلی عەباس)،(توزخورماتو)، (توق تاوق)، (لەیلان)، (چەمچەماڵ) و (دەربەندی بازیان)دا، لە ٨/ ئایار/ ١٨٢٠- گەیشتوونەتە (سلێمانی) و لەم جارەیاندا کە میوانی میرنشینی بابان بەگشتی و میوانی مەحموود پاشای فەرمانڕەوای میرنشینی بابان بووە بەتایبەتی، تا ١٨٢٠/٧/١٧- لە سلێمانی بووە. دوای ئەم ماوەیە بەرەو کوردستانی خۆرهەڵات و سەردانی میرنشینی (ئەردەڵان) لە (سنە) بەڕێ کەوتووە و بەڕێگای (دەربەند گوێژە)، (سرۆچك)، (پێنجوێن) و (مەریوان)دا چۆتە (سنە) و لە ٢٥ی ئەیلوولی ١٨٢٠-دا، بۆ جاری دووەم بەڕێگای (بانە)، (ئالان) و (شاربازێڕ)دا بۆ (سلێمانی) گەڕاوەتەوە و ئەمجارەیان تا ٢١ی تشرینی یەکەمی ١٨٢٠، لە سلێمانی بووە.

بەرگی دووەمیشیان لە ٢١ی تشرینی یەکەمی ١٨٢٠- دەست پێدەکات، کە بۆ یەکجاریی سلێمانی بەجێ دەهێڵێ و بەڕێگای (دەربەندی بازیان) و (شوان) و (ئاڵتوون کۆپری)، (هەولێر)، (ئەسکی کەڵەك)، (مووسڵ) و لەوێشەوە بەڕێگای ئاوی دیجلەدا بە کەڵەك، لە ٣ی مارتی ١٨٢٠ - دا بۆ بەغداد دەگەڕێتەوە.

بەدرێژایی ئەو نزیکەی حەوت مانگەی لە کوردستان بووە و ڕۆژەکانی تری گەشتەکەیشی، (ڕۆژانە) بیرەوەرییەکانی نووسیون، هەندێ ڕۆژ نەبێ، کە بەهۆی نەخۆشیی، یان سەرقاڵییەوە نەیتوانیوە یادداشتەکانی ڕۆژانەی بنووسێ، ئەگینا زۆربەی ڕۆژەکانی ئەو ماوەیەی، بە درێژترین سەرنج و لێدوان و هەڵسەنگاندنی داورباری کوردستان و ڕەوشتی مرۆڤی کورد و پێوەندی کۆمەڵایەتی و پایەی ئافرەتی کورد و ئاژەڵداریی و دارستان و هەموو ئەو شتانەی لە دیدی خۆی و بەچاوی خۆی دیونی، تۆماری کردوون. هەموو ئەمانەیشی بەتاسە و پەرۆش و ویژدانەوە تاوتوێ پێکردووە و وەك نەتەوەیەکی زیرەك و ژیر و کارامە و میواننەواز و دۆستی

ڕاستەقینەی بێ وێنە، لە هەموو خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا، سەیری کورد دەکا... کاتێ کوردستانیش جێدەهێڵێ، بەخەم و پەژارەیەکی بێ ئەندازەوە ماڵاوایی لە دۆستانی کورد-ی دەکات و لەگەڵ خۆیدا پەیمان دەبەستێ، کە هەتا لە ژیاندا بێ، چاکە و پیاوەتی و وەفاداریی کوردی لەیاد نەچێ.

ئەوەی لەم یادنامە وردانەدا جێی سەرنجە، چەند لایەنێکی پێشکەوتووی ژیانی کۆمەڵایەتی و شارستانێتیی و ڕووناکبیرییە، لەهەردوو میرنشینی بابان و ئەردەڵاندا، کە (ریچ) هەر دیاردەیەی لە دیدی تایبەتی خۆیەوە هەڵسەنگاندووە... بۆ نموونە: ئەو ئازادیی و سەربەستییەی کە ئافرەتی کورد لەو ڕۆژگارەدا هەیبووە، زۆر پێشکەوتووتر بووە لەباری ژیانی ئافرەتی گەلانی دراوسێ، وەك (ریچ) خۆی دانی پیادەنێ، بەتایبەتیش کە لە یادداشتی ڕۆژی ١٨٢٠/٤/٢٧، ریچ خانم - ڕاگوزارییانە باسی چوونی دایکی مەحموود پاشای بابان بۆ بەغدا دەکات. بەنیازی وتووێژ و گفتوگۆ لەگەڵ (داوود پاشا)ی والی بەغدا، خۆی لەخۆیدا بەڵگەیەکی گەورەیە بۆ ئەو دەسەڵات و پلەوپایەیەی ئافرەتی کورد، کە گوێ لە قسەکانی گیراوە و ئاکامیش لە وتووێژدا بەسەرکەوتوویی بۆ (سلێمانی) گەڕاوەتەوە... ئەم لایەنە لە میرنشینی ئەردەڵاندا ئەگەر وەك نموونە هێنانەوە، چەند ساڵێ بکەوێتە دوای مێژووی سەردانی (ریچ) بۆ ئەو میرنشینە، ئەوا هەڵکەوتنی (ماهشەرەفخانم)ی ئەردەڵانی، ناسراو بە (مەستوورە)ی شاعیر و ڕووناکبیر و مێژوونووس (١٨٠٥-١٨٤٧)، لەو میرنشینەدا، هەر نیشانەی درێژەدانی ئەو پێشکەوتنە کۆمەڵایەتییەیە، کە پێشتر لەو میرنشینەدا زەمینەی لەباری بۆ خۆشکراوە... وەك چۆن هەر ئەم میرنشینە، لەباری ڕووناکبیرییەوە، سەدان ساڵ پێش (مەستوورە)ش، ئامێزی بەسۆزی گۆشکردن و پەروەردەکردن و پێگەیاندنی دەیان زانا و ڕووناکبیر و کەڵەشاعیری شێوە زاری (گۆران) بووە، کە دەوڵەمەندترین و بە تەمەنترین ئەدەبی نووسراوی بۆ سامانی نەتەوایەتی کورد جێهێشتووە... هەرچەندە ئەم دیاردەیەی میرنشینی ئەردەڵان، لەوکاتەدا کە (ریچ) سەردانی کردووە، دژوار هاتۆتە بەرچاوی ریچ و زوڵم و ستەمی فەرمانڕەوایەتی (ئەمانوڵڵاخان - ١٧٧٥-١٨٢٤)ی گەورەی پێ لە ڕادەبەدەر بووە و ئەو خانووسازییە خێرا و زۆرەی کە (ئەمانوڵڵاخان) دەستی پێکردووە، لەو ڕوانگەیەوە نەدیوە، کە لە ناوەڕۆکدا مەبەست ئاوەدانکردنەوە و فراوانکردن و پێشخستنی پایتەختی میرنشینەکە بووە و ئەوانەی لەو ڕۆژگارەدا دروستکراون، کە لەناویاندا مزگەوتێکی گەورە و بەناوبانگی وەك ئەوەی (دارولئیحسان)ی شاری (سنە)یە و تا ئەم ڕۆژگارەش بەلایەنێکی

شارستانیانەی ئەو میرنشینە دادەنرێ، کە خودی مزگەوتەکە، لە ڕۆژی دروست بوونیەوە تا ئێستاش، مەڵبەندێکی گەورەی ڕووناکبیریی بووە و دەیان زانا و شاعیری گەورەی وەك مەولەوی تاوەگۆزی تیایاندا خوێندووە... ئەگەرچی ئەم لایەنە، لە میرنشینی باباندا، لەبەر چەند هۆیەك، لە سەرەتادا بووبێ، کە هۆی ئاشکرا و بەرچاویان، نەبوونی ئاسایش و لە پاڵیشیدا لەبەر ئەوە بووبێ کە پایتەختی میرنشینەکە (سلێمانی)، لەو ڕۆژگارەدا تەمەنی ٣٦ ساڵ بووبێ، بەڵام لەلایەکەوە ئەو چەند (گەرماو - حەمام)ەی کە (ریچ) لە سلێمانی دیونی، وایان ستایش دەکات کە نموونەیان مەگەر هەر لە (ئەستەمووڵ) و (قاهیرە)دا بووبێ.

ئەمە لە کاتێکدا، ئەو کاتەی ریچ سەردانی سلێمانی کردووە، داروباری کوردستان بەگشتی و قەڵەمڕەوی بابان و پێتەختەکەیان (سلێمانی) بەتایبەتی، لەوپەڕی پشێویی و داپڕان و دواکەوتوویدا بووە. چونکە شەڕی دێرینەی شیعە و سوننی نێوان هەردوو دەوڵەتی قاجاری و عوسمانی و شەڕی ئەم دووانەش لەگەڵ دەوڵەتی ڕووس لەلایەك و شەڕی بەردەوامی میرنشینەکانی ئەردەڵان، بابان و سۆران و ئاژاوە و ناکۆکی نەپساوی نێوان ئەندامانی بنەماڵەی فەرمانڕەوای بابان لەسەر دەسەڵات، لەلایەکی ترەوە، ببوونە مایەی تێکدانی باری ژیانی کۆمەڵایەتی خەڵك و داتەپینی ئابووری و بارێکی گران بەسەر ئەستۆی خەڵکەوە و خەڵکەکەی بەجۆرێك وەڕس و بێزار و شپرزە کردبوو، کە بەدوای دەرەتان و چارەسەرێکدا دەگەڕان. بۆیە هەرکە مەولانا خالیدی شارەزووری (١٧٧٤-١٨٢٧) لە هیندستان تەریقەتی نەقشبەندی (المجدد)ی لەسەر دەستی شێخ عەبدوڵڵای دەهلەوی (١٧٤٥- ١٨٢٤)دا وەرگرتووە و بۆ کوردستان گەڕاوەتەوە (١٨١١) و بانگەوازی بۆ ڕێبازە تازەکەی بەناو خەڵکدا بڵاوکردۆتەوە، خەڵکەکە وەك بانگەوازێکی ڕزگارکەر بەپیرییەوە چوون و پێشوازییان لێکردووە، بەتایبەتیش چینی جووتیاران و توێژی بازاڕیی، کە شەڕی خوێناوی و بەردەوامی ناوچەکە، ژیانی لێ شێواندوون و زیانی لە بەرژەوەندی و سەروماڵیان داوە.

لەبەرئەوە لە ماوەیەکی زۆرکورت و چاوەنواڕنەکراودا، بە هەزاران کەس، لە هەموو لایەکی کوردستانەوە لە دەوری ڕێبازەکەی ئاڵاون... تەنانەت سەرانی بنەماڵەی فەرمانڕەوای بابان، زۆربەیان بوونەتە مریدی و وەك (ریچ) خۆی لە یادداشتی ڕۆژی (٢٤ی حوزەیرانی ١٨٢٠)ی ئەم بیرەوەرییانەدا، لە زمانی عوسمان پاشای برای مەحموود پاشاوە دەیگێڕێتەوە، کە هەموو وتەکانی مەولانا خالید (بەفەرمووده دەزانن و لەسەرروویانەوە مەحموود پاشای میر، چۆن لە حوزوریدا بەپێوە ڕادەوەستێ و قلیانەکەی بۆ پڕ دەکاتەوە و بۆیشی

دادەگیرسێنێ... و لە ژیانی میرنشینەکەشدا بۆ زۆر کاروباری گرنگ، هەر پرس و ڕاوێژ و سوێند خواردن (کە خیانەت لە یەکتر نەکەن)، لای مەولانا خالیدی دەبڕێننەوە...

بەڵام سەرباری ئەو هەموو ڕێز و ناوبانگە زۆرەی لە هەموو لایەکەوە بۆ مەولانا خالید هەبووە، مێملێکی سەرسەخت و بەربەستێکی تری پتەوی لەبەردەمدا بووە، کە ئەویش تەریقەتی (قادری) بووە و زانای گەورە و ناودار شێخ مارفی نۆدێ (١٧٥٣-١٨٣٨) ڕابەرایەتی کردووە.

بەو هۆیەشەوە کە تەریقەتی قادری لە دێرزەمانەوە ڕەگوڕیشەی لە هەرێمەکەدا بووە و لەگەڵ سەران و کاربەدەستانی بابانی و عوسمانی دا سەر و پێوەندی بەهێزی هەبووە و هاوکاتیش گەڕانەوەی مەولانا خالید و بڵاوبوونەوەی خێرا و بەرفراوانی تەریقەتی نەقشبەندی، بە مەترسییەکی گەورە و ڕاستەوخۆی بۆ سەرخۆی زانیوە. بۆیە هەر زوو کەوتۆتە دوژمنایەتی و زمان لێدانی و ڕاپۆرت نووسین لای میرانی بابان و سەرانی عوسمانی و تەنگ پێهەڵچنینی مەولانا خالید و هەڕەشە و تەقەڵلای تاڕادەی تیرۆرکردنی... هەموو ئەمانە بوونەتە هۆی ئەوەی تەریقەتی نەقشبەندی لەلایەن جەماوەی دژ بەو هەلومەرجانە، وەك تاقانە ئەلتەرناتیڤ و هەڵوێستێکی دژ بە زوڵم و زۆرداریی وەربگیرێ... بەتایبەتیش کە مەولانا خالید لە سەرەتای بڵاوکردنەوەی پەیامەکەیەوە، لە ڕێگەی (نووسین)ەوە بۆ سەرانی بابانی و عوسمانی و قاجاری و تەنانەت بۆ خودی شێخ مارفیش، کەوتۆتە سەرکۆنە و ڕەخنەلێگرتنی سیستەمە سەپاوەکە و هۆشیارکردنەوەی سەرلەبەری خەڵك... کە بەم کارەی مەولانا خالید، بۆ یەکەمجار لە مێژووی گوتاری ڕووناکبیریدا، بزووتنەوەیەکی (شاری) و شارستانییانە، دیالۆگ و مشتومڕێکی فەرهەنگی و نیشتمانییانە، لەناو ڕووناکبیرانی ئەو ڕۆژگارەدا دێنێتە ئاراوە و زەمینەیەکی بەپیت و بەبڕشت، بۆ هێنانە کایەی قۆناغێکی نوێی ڕووناکبیریی دەڕەخسێ، کە هەر لەو سەردەمەدا (یان کەمێك دواتر) گەورەترین بزووتنەوەی شیعریی نالی، سالم، کوردی و هاوڕێکانیان و گەشانەوەی دیالیکتی (سلێمانی) سەرهەڵدەدا، کە تا ئێستا بەردەوامە، سەرەتاکانی بۆ ئەو ڕۆژگارە دەگەڕێتەوە، کە مەولانا خالید باس و خواسی تازەی فەرهەنگیی دەورووژێنی و بەگیانی واقیع بینانەی کۆمەڵگەی کوردستانەوە، ڕەخنەی ئایینی توندوتیژ لە ڕابەرانی لە ڕێ لادەری ئایینی ئیسلام و فەرمانڕەوایانی ملهوڕ و سیستەمی گەندەڵبووی سیاسی دەگرێ و بانگەوازی ڕیفۆرمخوازیی بۆ چارەسەری کێشەکانی کۆمەڵگەی کوردەواری هەنگاو هەڵدەگرێ و هەر لەم ڕوانگەیەشەوە بووە، کە ئەو کاتەی

مەولانا خالید بۆ خوێندن لە هیندستان بووە، شیعری حەسرەتی دیدار و دیتنەوەی کوردستانی نووسیوە وە دواتریش هەر ئەم ڕوانگە نیشتمانییە، بۆ شاعیرانی وەك نالی و سالم و هاوڕێکانیان بۆتە دەستە چیلە و سەرمەشق و چاولێکەریی.

ئەو ماوەیەی (ریچ) لە سلێمانی بووە و وەك ریچ خۆی لە بیرەوەری ڕۆژی (٢٠ی تشرینی یەکەمی ١٨٢٠)دا، نووسیوێتی، مەولانا خالید ناچارکراوە لەو ڕۆژەدا سلێمانی بەجێ بهێڵێ... واتە: مەولانا خالید هەر تەنیا (٩) ساڵی پڕ لە ململانێ و ڕووبەڕووبوونەوە و دەستەویەخەبوونی ئەو واقیعە سەپاوەی پێ مەودا دراوە و لە ماوەی ئەو (٩) ساڵەشدا، یەك دوو جار ڕەنجاندوویانە و گوشاریان بۆ بردووە، تا پێتەختی بابان (سلێمانی) بەجێ بهێڵێ.

بەڵام لە ماوەی ئەم (٩) ساڵەدا، ئەو واقیعەی بەجۆرێك هێناوەتە جووڵە و جۆش و خرۆش، کە پەیام و بانگەواز و لایەنگرەکانی مەولانا خالید، وەك ئاگر و پووشوو، بە ئاقاری مەولانا خالیددا بەرین و بەرینتر تەنیونەتەوە. بەڕادەیەك کە لە سەرتاسەری تورکیا و وڵاتانی عەرەبدا، ئاماری مرید و لایەنگرانی، گەیشتوونەتە (٢١) هەزار مرید و (٣٤) خەلیفەی کورد و (٣٣) خەلیفەی سەر بە نەتەوەکانی تر... کە ئەم ئامارە زۆر و جوگرافیا بەرینە، بۆ ئەو ماوە کورتەی مەولانا خالید لە کوردستان بووە (١٨١١-١٨٢٠) جێی سەرنج و ڕامان و بەڵگەی ئەوەن، کە خەڵکەکە چەند لە سیستەمی ئەو ڕۆژگارە بێزارن و لە هەمان کاتیشدا توانای مەولانا خالیدی ڕووناکبیر دەردەخەن، کە چۆن لەناو ئەو واقیعە گەمارۆدراوەی بە ململانێ و بەگژدا چوونەوەی سەرانی بابانی و عوسمانی و تەریقەتی باڵادەستی (قادری)دا، توانیوێتی ئەو واقیعە سەرکوت و بێدەنگ کراوەدا، مشتومڕ و ململانێیەکە بە خرۆشاویی و بۆ دوای خۆی بهێڵێتەوە و بە یەکجاریی کوردستان بەجێ بهێڵی، کە خودی بڕیاری سەرهەڵگرتن و جێهێشتنەکەی کوردستانیشی، هەڵوێستێکی خوێندەوارانە و شارییانەی مەولانا خالیدە و کاتێ دەبینێ ئاستی ململانێ و ڕووبەڕووبوونەوەکە، خەریکە بگاتە بەکارهێنانی زمانێکی تری جیا لە (نووسین) و مشتومڕ، کە زمانی باوی چەك و یەکترکوشتنە، ئەوسا بەو بڕیاری سەرهەڵگرتن و جێهێشتنەی کوردستانی، دەیسەلمێنێ کە ئەو بڕوای بە دیالۆگی شاریی و شارستانییانە هەبووە...

بەکورتی، ئەوکاتەی (ریچ) ئەم گەشتەی بۆ کوردستان کردووە، هەلومەرجی فەرهەنگیی کوردستان، لە لووتکەی وەرسووڕان و خرۆشانی ڕووناکبیریی و ئەدەبیی و قۆناغێکی نوێی فەرهەنگیدا بووە و بۆ یەکەمجار لە مێژووی بزووتنەوەی ڕووناکبیریی کورددا،

گوتاری ڕووناکبیری کوردی، لە ململانێی ئەوەدا بووە، دەسەڵات لە ڕابەرانی سەرۆك خێڵ و دەرەبەگی کورد بسێنێ و خۆی ڕابەرایەتی بزووتنەوەی سیاسی کورد بکات...

کەچی ئەوەی لەم بوارەدا جێی لەنگەرگرتنە، ئەوەیە کە (ریچ)، سەرباری ناوهێنان و بەیادکردنی ئەو هەموو لایەنەی ژیانی سەرومڕی کوردەواری، بەڵام کەم و زۆر باسی لایەنی ئەدەبی کوردی و فۆلکلۆری کوردی ناکات! تەنیا ئەوەندە نەبێ چەند جارێك ڕاگوزارییانە باسی گۆرانی و مۆزیك و زەماوەند و جلوبەرگی کوردی دەکات... لە کاتێکدا لەگەلێك جێگادا خوێنەر هەست دەکات (ریچ) زۆر سەودای دنیای ئەدەبە، بەگشتی و شیعر بەتایبەتی و ناوناوەش ناوی شاعیرانی وەك (بایرۆن، شکسپیر و حافز) و هی تریش دێنێ، بەڵام ناوی تەنیا شاعیرێکی کورد، هەر لە بابا تاهیر، مەلای جزیری، ئەحمەدی خانی، بێسارانی و کۆماسی)یەوە، تا شاعیرانی شێوەی سلێمانی ناهێنێ!.

بەلای منەوە ئەمە بۆ خوێندەواری کورد، جێی پرسیار و ڕامانە لە مێژووی سەرهەڵدانی شیعری شێوەزاری (سلێمانی). چونکە ئەوەی ئێمە لەبارەی شاعیرانی سێ کوچکەی میرنشینی بابان: (نالی و سالم و کوردی)یەوە، دەیزانین ئەوەیە کە ئەم سێ شاعیرە مەزنە، دەبووایە سەروسۆراخێکیان لەناو توێژی خوێندەوارانی ئەو سەردەمەی سەردانەکەی (ریچ)دا هەبووایە، چونکە لە دایکبوونی ئەو شێوە شیعرە، بۆ ئەوکاتە، کە بە شۆڕشێکی شیعریی زانراوە، خۆی لەخۆیدا مایەی ڕازوخواز و هەڵڵا و ڕووداوی ڕووناکبیریی و تەقینەوەیەکی تازەی ئەدەبی بووە بۆ سەردەم و ڕۆژگاری خۆی، کە بە ڕۆژگاری سەردانەکەی (ریچ) بۆ کوردستان نزیك بووە، بەتایبەتی کە ماوەی (٣ مانگ و ٩ ڕۆژ) لە سلێمانی، واتە لە مەڵبەندی ئەوان بووە، کە دیارە کاتی سەردانەکەی (ریچ)، یان دەبێ هیچیان لە سلێمانی نەبووبن، یان هێشتا هیچیان ناوبانگێکی وایان پەیدا نەکردبێ، تا لە سەر زاری خەڵك باسیان بکرێ...

خۆ ئەگەر لەسەر زاری خەڵك شتێکی لەبارەیانەوە ببیستایە، بێگومانم ناوی دەهێنان، وەك چۆن ناوی (مەولانا خالیدی نەقشبەندی و شێخ مارفی نۆدێ)ی هێناوە، کە ئەوکاتە لە سلێمانی بوون و ناوبانگیان هەبووە... یان وەك چۆن ناوی کتێبی (مێژووی کورد و کوردستان - شەرەفنامە)ی هێناوە و عەڤدالێ دەستخستنی بووە.

سەرنجی تریش حەزدەکەم خوێنەری ژیر تێبینی بکات، ئەوەیە ئەو سنووری دەسەڵاتانەی ئەو ڕۆژگارەی کورد، کە (ریچ) بۆ قەڵەمڕەوی میرنشینەکانی کورد ئاماژەیان بۆ دەکات و

ریچ - خۆی بەناو سنووری زۆر لەو دەسەلاّت و قەلّەمڕەوییانەدا تێپەڕ بووە، ئاخۆ چ بەراوردێك لە مێشك و هەستی خوێنەری ئێستادا دروست بکەن!!. لە هەمان کاتیشدا بەشی زۆری ئەو شارۆچکە و گوند و ناوچانەی ئەوکاتەی (ریچ)، لە بەشەکەی سەر بە دەوڵەتی ئێستای عێراقدا، پیایاندا تێپەڕ بووە، یان تیایاندا ماوەتەوە، یان لە زمانی خەڵکانی ترەوە، بۆ زانیاری کۆکردنەوە لەسەریان، ناویان دێنیّ، وەك زۆربەی شارۆچکە و گوندەکانی (گەرمیان و شارباژێڕ و پێنجوێن و هەلّەبجە و دەشتی هەولێر و ناوچەی بادینان) و... هتد، بەداخەوە ڕژێمی (سەدام)ی هار و دڕندەی سەردەم، سەرلەبەریانی بە کیمیاوی باران و کاولکردن و سووتاندن و ڕاگوێزانەوە، ناو و نەخشەیانی لەسەر ڕووی نەخشە و جوگرافیادا سڕییەوە...

پێش ئەوەی کۆتایی بەو چەند سەرنجە خێرایەم بهێنم، دەمەویّ هەلّوێستەیەکی خێراش لەلایەنێکی ئەو چەند بابەتە پڕ و بەبڕشتەی ڕوانینەکانی (ریچ) وەربگرم، کە سەرەڕای دلّنیاییم لەوەی ریچ، بیّ هیچ پێچ و پەنایەك، ئەوەی لە دلّیدا بووە و ئەوەی مەبەستی بووە و ئەوەی لە کلاّوڕۆژنەی دیدی خۆیەوە دیویەتی، وەکو خۆی بۆی تۆمار کردووین... بەلاّم ئەمە بۆ خوێنەری کورد، نابێتە وەرگرتنێکی ئۆتۆماتیکی، کە نووسەری ئەم یادنامانە، چۆن سەیری کۆمەلّگا و دیاردەکانی ژیانی ئەو سەردەمەی کوردی کردبیّ، ئێمەش وەك ئەو، بۆ ئەو لایەنانە بڕوانین و جیاوازیی لە نێوان هەلّوێست و بیروبۆچوونی ئێمە و ئەو(ریچ)دا نەبیّ، کە دیارە دەبووایە ئەو جیاوازییەش هەر ببێت، چونکە ئەوێکی بیانی و نامۆ، بە دێرینە و نەریت و دوور لەهەموو لایەنێکی ژیانی کوردەواری، هەروا بەو چەند مانگەی ژیان بەسەربردنی لەناو کورددا، هەموو شتێك بەو پەلەیە وەك کورد بۆ خۆی، نایبینیّ ... وەك چۆن بیّ پەروا (لە روانگەی ئەو هەستە زەقەی کوردانی هەردوو قەلّەمڕەوی بابان و ئەردەلاّنەوە سەبارەت پەسەندنەکردنی یەکتری) هەموو لایەنێکی نەریت و ڕەوشتی کوردانی قەلّەمڕەوی میرنشینی (بابان)ی خۆش ویستووە، بەهەمان بیّ پەرواییشییەوە، بڕیاری خێرا و توندی لەگەلّ دەروونی خۆیدا داوە، کە بە قێزوبێزەوە، لە هەموو نەریت و ڕەوشتی کۆمەلّگای کوردانی قەلّەمڕەوی میرنشینی (ئەردەلاّن) ببینیّ و هەست بکات جیاوازیی و دەلاقەیەك لەنێوان سەرتاپای ڕەوشت و ئاکاری کوردانی ئەو دوو قەلّەمڕەوەدا هەیە و ئەوەی یەکەمیان بەسەر دووەمدا پەسەند دەکات... کە ئەمە ئەو جیاوازییە گشتییانەی نێوان زۆربەی ناوچەکانی کوردستانە و لە درێژایی سەدان سالّدا، بەهۆی ئەو لەیەکتر دابڕینانەوە دروست بووە، کە داگیرکاران، دیوار و شوورەیان لە نێوان ناوچەیەك و میرنشینێکی تردا دروستکردووە

و له ئاكامدا له هەر ناوچە و میرنشینێکدا، شێوە دیالیکت و نەریتی لە یەك جیاواز دروست بووە. پێم وایە هەر ئەم ڕوانینە درشتەی (ریچ) وای کردووە لە هەندێ جێگەی تری یادنامەکانیدا، بێ پرس و ڕا، بەم و بەو، یەکسەر سەرنجەکانی تۆمار بکات، کە نموونەی ئەم قسەیەم، یادنامەی ڕۆژی (۳۰ی ئایاری ۱۸۲۰)ە، لەو ڕۆژەدا وای تێبینی کردووە کە موسڵمانی کورد، بەدەم نوێژکردنەوە، قسەش لەگەڵ ئەم و ئەوی دەوروبەریاندا دەکەن...!. لەکاتێکدا دەبوایە (ریچ) لەوە بگات، کە ئەوەی ئەو، وای تێگەیشتووە، وا نییە... بەڵکو کەسێك ئەگەر چەند نوێژێك بەسەریەکەوە بکات، دەتوانێ لەنێوان نوێژێك و نوێژێکی تردا پشوویەك بدات، یان قسەیەك لەگەڵ دەوروبەرەکەیدا بکات... ئیتر ئەمە تایبەت نییە بە موسڵمانی کوردەوە و هەموو موسڵمانێك دەتوانێ لە نێوان نوێژەکانیدا ئازادی خۆی وەربگرێ.



ئەم کتێبە، سەد ساڵ دوای نووسینی، واتە لە ساڵی ۱۹۲۰- دا (مێجەرسۆن)ی حاکمی سیاسی بەریتانیا، کە لەو سەردەمەدا لە سلێمانی ڕاوێژکاری دەوڵەتی بەریتانی بووە، بۆ یەکەمین جار بەنیازی وەرگێڕانی بۆ کوردی، بەناونیشانی (سلێمانی پێش سەد ساڵ) لە ١٨ ژمارەی ڕۆژنامەی (پێشکەوتن) دا، دەستی بە بڵاوکردنەوەی کردووە و ئیتر بارودۆخی سیاسی ئەوکاتە بۆتە هۆی تەواو نەکردنی وەرگێڕانەکە، کە بەشێکی کەمی لی بڵاوبۆتەوە.

تەقەللای دووەم، لە ساڵی ۱۹٤۷-دا، لەلایەن مامۆستا (حوسێن قاسم عەزیز)ەوە، لە ژمارەی (۷)ی ساڵی (۷)ی گۆڤاری ناوبراودا (پوختەی) چەند لاپەڕەیەکی سەرلەبەری کتێبەکەی بە کوردی بڵاوکردۆتەوە.

دوای ئەمیش مامۆستا - بەهائەددین نووری - میر لیوا - (بە عەرەبی)، لە ساڵی - ۱۹٥۱-دا بەشی یەکەمی کتێبەکە بە تەواوی و فەسڵی یەکەمی بەرگی دووەمیشی - کە کردوویەتی بە بەشی دوازدەهەمی وەرگێڕانەکەی - وەرگێڕاوە و ناوی ناوە (گەشتی ریچ بۆ عێراق - لە ساڵی ۱۸۲۰ز)دا، لەکاتێکدا وەك وتم کتێبەکە لەبنەڕەتدا ناوی (بەسەرهاتی نشینگەیی لە کوردستاندا)یە و مامۆستا (حوسێن قاسم عەزیز) یش کاتی خۆی لە گۆڤاری **گەلاوێژ** دا هەر بەو ناونیشانە وەری گێڕاوە. بەڵام دیارە مامۆستا -

بەهائەددین نووری - لەو سەردەمەدا بۆ تێپەڕاندنی چاپی کتێبەکە بێ، یان هەر هۆیەکی تر، وای ناوناوە.

دوای سالانی (١٩٧٠ز)ش وەك بیرم بێ و بە هەڵەدا نەچووبم، ڕۆژنامەی **برایەتی** کە لە سلێمانی دەردەچوو، لە هەندێ لە ژمارەکانی دوایی‌دا بەزنجیرە، سەرەتای وەرگێڕانی ئەم کتێبەی دەست پێکرد. داوای لێبوردن لە خوێندەواری کورد دەکەم، کە ئێستا سەرچاوەم لەبەردەستدا نییە و لێرەدا لەوەندە زیاتر ناتوانم ئاماژە بۆ ئەمەی دواییان بکەم.

هەروەها ئەدیبی بەڕێز - پارێزەر (تاها بابان)، ساڵی ١٩٨٤ز، کە ئاگاداری ئەوە نەبووە من ئەم کتێبەم وەرگێڕاوە، نیازی بووە ئەم کتێبە بۆ کوردی تەرجەمە بکات، بەڵام کە زانیویێتی من لە وەرگێڕانی بوومەتەوە، دەستبەرداری نیازەکەی بووە.

ئەدیبی ناسراویش (سەیید تاهیری هاشمی)، لەو دیدەنییەیدا، کە لەگەڵ (گۆڤاری سروە - ژمارە ٣١ ل١١)دا کردوویەتی، باسی ئەوە دەکات خەریکی وەرگێڕانی ئەم کتێبە بووە بۆ کوردی، بەڵام دەستی لێ هەڵگرتووە.

دیسان کاك (حوسێن ئەحمد جاف) لە ژمارە (٨٥)ی گۆڤاری رۆشنبیری نوێ - نیسان و مایسی ١٩٨١)دا وەك پێناسە و بەسەرکردنەوە و بەیادهێنانەوەی ئەم کتێبە، لە لاپەڕەکانی (٨، ٩، ١٠)دا، هەندێ زانیاری سەبارەت بەم کتێبە بڵاوکردۆتەوە.

منیش لای خۆمەوە لەبەرئەوەی کتێبەکە ئەوەندەی لای خوێنەری کورد ناوبانگی هەیە، ئەوەندە ڕەنگی نییە و نوسخەی عەرەبی و ئینگلیزیشی دەگمەنە، بەچاکم زانی تێکڕای ئەو کتێبەی مامۆستا (بەهائەددین نووری کردوویەتی بە عەرەبی، بۆ سەر زمانی کوردی وەربگێڕم و بەو هۆیەشەوە کە ئەو بەشانەی لەم کتێبەدان، تایبەتن بە سەردانی کوردستانەوەو بۆ ئەوەش نزیکتر بکەوێتەوە لە ناونیشانەکەی خۆی، ناوم نا: (گەشتنامەکەی ریچ بۆ کوردستان - ساڵی ١٨٢٠). چونکە:

١- ئەو بەشەی کە مامۆستا (بەهائەددین نووری) کردوویەتی بە عەرەبی و منیش لەوەوە کردوومە بە کوردی، کوتومت تایبەتن بە کوردستان، واتە سەردانی میرنشینی بابان و ئەردەڵان -ە. خۆ ئەگەر ئەوکاتە میرنشینی (بابان) نیمچە پێوەندییەکی ئیدارییی بە (والی بەغدا)وە بووبێ، ئەی میرنشینی (ئەردەڵان) چ پێوەندییەکی ئیدارییی بە والی بەغداوە هەبووە، تا کتێبەکە ناوی بنرێ: (گەشتی ریچ بۆ عێراق؟).

٢- ئەو ڕۆژگارەی ریچ تیایدا سەردانی کوردستانی کردووە، دەوڵەتی عێراق، وەکو حکوومەت، یان شێوە ئیدارییەکی وەك ئێستای نەبووە، یان ناوی عێراق هەر نەبووە، بەڵکو هەرێمێکی ژێر دەستەی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی بووە و بەشبەش بووە و هەر بەشەی (سنجەق - پارێزگەی ئێستا)یێك بووە، وەك سنجەقی مووسڵ، بەغدا، بەسرە و هەریەکە لەمانەش والییەکی عوسمانی ئیدارەی بەڕێوەبردووە و ڕاستەوخۆ سەر بە (بابیعالی)ی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیەوە هەبووە. بە کورتی سەد ساڵ زیاتر دوای ئەم سەردانەی ریچ بۆ کوردستان، ئەوسا قەوارەیەکی سیاسی، بەناوی دەوڵەتی عێراق دروست بووە.

بەڵام دیارە ئەوکاتەی ئەم کتێبە بۆ عەرەبی تەرجەمە کراوە، واتە بەر لە (٥٠) ساڵ و لە عێراقدا چاپکراوە، وەك وتم بۆ تێپەڕاندنی کتێبەکە ئەو ناوەی لێنراوە، وەك چۆن سەردەمانێك لە ڕاگەیاندنەکانی رژێمی سەدام دا، ئەگەر ناوی ڕووداوێکی مێژینەش ببرایە، کە لە کوردستاندا ڕووی داوە، دەبوو بوترێ ناوچەی ئۆتۆنۆمی...!!.

لە وەرگێڕانی ئەم کتێبەدا ئەوەندەی توانیبێتم، هەوڵم داوە بە ئەمانەتەوە، بە زمانێکی سفت و پاراو و لە هەندێ جێگاشدا ئەگەر پێویستی کردبێ، خۆمیش هەندێ پەراوێزم بۆ نووسیوە. بۆ جیاکردنەوەی پەراوێزەکانیش، بەچاکم زانیوە، کە:

- ئەو پەراوێزانەی میستەر (ریچ) خۆی لە کتێبەکەدا نووسیونی، وەك خۆی هێشتوومنەتەوە و هیچ ئیشارەتێکم لەسەر دانەناون.

- ئەو پەراوێزانەی هاوسەرەکەی میستەر ریچ نووسیونی، لەجیاتی (خاتوون ریچ)، (خاریچ)م لەسەر نووسیون.

- ئەو پەراوێزانەی مامۆستا (بەهائەددین نووری) بۆ تەرجەمە عەرەبییەکەی نووسیون، پیتی (ع)م لەسەر نووسیون.

- ئەو پەراوێزانەش کە خۆم بۆم کردووە، پیتی (م)م لەسەر نووسیون.

لە کۆتایی هەردوو بەرگی دەقە ئینگلیزییەکەیدا، فەرهەنگۆکێکی نزیکەی (٢٠٠) وشەی کوردی تێدایە، بەڵام نەك لەبەرئەوەی وەرگێڕی عەرەبیش بۆ عەرەبی وەرنەگێڕاوە، بەڵکو لەبەرئەوەی وشەی دەگمەن و ناوێزەی وای تێدا نەبووە، کە ئێستا نەمابن، بۆیە منیش بۆ کوردیم وەرنەگێڕان.

دیارە زۆریشم حەزکردووە بمتوانیبایە وەرگێڕانی ئەم کتێبە، بەم شێوەیە لە ئێستای چاکتربێ، بەڵام هەر ئەوەندەی دەرەقەت هاتووم و ئەو دەرەقەت هاتنەش ئەگەر یارمەتی و

هاوکاریی و شەونخوونی و ڕەنجی (ژووان)ی نووسەر و هاوڕێی ژیان و هاوسەرم نەبووایە، هەرگیز بەرهەم نەدەهات، کە بەدڵسۆزییەوە، وشە، بە وشە و ڕستە بە ڕستەی ئەم وەرگێڕانەی لەتەکمدا تاوتوو پێکردووە و لە هەموو خۆشەویستیمەوە بۆی، سوپاسی دەکەم.
سوپاس بۆ هەر سێ جگەرگۆشەکانیشم: لاوژە، موژە و کاکە ڕاسان، کە بە هەرەوەزێکی خێرا و هۆشیارانە، بەشی فەرهەنگی: (جوگرافیا و ناو)یان بۆ ئەم چاپە تازەیە ئامادە کردووە.

هەروەها سوپاسی برای هێژام، پارێزەر - کاکە تاها بابان- دەکەم، کە وەك لەپێشتردا وتم لەکاتێکدا ئەویش بە هیوای وەرگێڕانی ئەم کتێبە بووە، بەدەم پشکنینەوە لەم سەرچاوەیەدا:

BAGHDAD IN BYGONE DAYS, BY C. M ALEXANDER. PUBLISHED BY JOHN MURRY – LONDON

چەند پاشماوەیەکی تری (ریچ)ی چنگ کەوتبوو، بۆیە هەرکەزانی من لە وەرگێڕانی بوومەتەوە، بە پەرۆش و سۆزەوە ئەو چەند پاشماوەیەی پێشکەش من کرد، کە ئەمانەن: وێنەیەکی پۆرترێتی (ریچ)، وێنەیەکی پۆرتریتی (خاتوو ریچ) - کە وێنەکێشی تر کێشاونی، وێنەی شمشاڵژەنێکی کوێری ئیزەدی ئیزەدی و وێنەی ئافرەتێکی کورد، بەجلوبەرگی کوردییەوە، لە ڕووی پێشەوە و لە ڕووی پشتەوە (ئەم دوو وێنەیەی دواییان ریچ خۆی کێشاونی)...

کە دوو وێنەی یەکەم و دووەم، بۆ ئەم کتێبە کەڵکیان لێ بینراوە، بەڵام وێنەکانی تری ناو ئەم تەرجەمەیە، هەندێکیانم لە سەرچاوەی ترەوە خواستوون، کە لە جێی خۆیاندا ئاماژەیان پێکراوە و وێنەکانی ناو دەقە عەرەبییەکەش، کە مامۆستا بەهائەددین نووری لە خودی کتێبەکەی (ریچ)ەوە خواستبوونی، بۆ دووبارە چاپکردنەوەی لەم کتێبەدا دەستیان نەدەدا، بۆیە دووبارە لە دەقە ئینگلیزییەکەی ریچم وەرگرتنەوە، کە لە کتێبخانەی گشتی (سلێمانی) خواستم و ئەویش تابلۆی (هەڵپەڕکێ)کەی سلێمانی لێ دەرهێنرابوو، لەبەرئەوە ئەمیانم بەسوپاسەوە لە هاوڕێم: دکتۆر فەرهاد پیربالْ خواست.

لە کۆتاییدا دەڵێم: (٢٢) ساڵ لەمەوبەر لە تەرجەمەی ئەم کتێبە بوومەوە و چاپی یەکەمیشی کەوتە دوای ڕاپەڕین (١٩٩٢ - تەورێز)، کە ئەوکاتە (بەرەی کوردستانی) بەتەنگ گرنگیی ئەم کتێبەوە هات و ئەرکی چاپەکەی لە ئەستۆگرت و چاپی دووەمیشی لە (١٩٩٥) هەر لە تەورێز بوو... بەڵام دوای چاپی یەکەمی، هاوڕێی نووسەر: کاك ئەرسەلانی عەزیزی لە مەریوان، هەندێ سەرنج و ڕاستکردنەوەی ناوی چەند ناوچە و گوندێکی (مەریوان

و سارالّ)ی بەنامە بۆ ناردبووم، کە لەم چاپەدا، بەسوپاسەوە ڕاستکراونەتەوە، لە دووچاپی پێشووش دا ناوی کتێبەکە: ( گەشتی ریچ بۆ کوردستان )بوو، بەلاّم بەو هۆیەوە کە ئەم کتێبە بریتییە لەو بیرەوەری و سەرنجانەی کە( ریچ) بەدەم ئەم گەشتەیەوە بۆ کوردستان یادداشتی کردوون. بۆیە پێم باش بوو لە بریتی واژەی (گەشت)، ببێتە (گەشتنامە). بەم پێیە ناونیشانی کتێبەکەش دەبێتە: (گەشتنامەی ریچ بۆ کوردستان). لە کۆتاییدا سوپاسیش بۆ برازای شیرینم کاکە دیلمان ئەحمەد، کە بەپەرۆشەوە، لە هەڵەگیریدا، زۆر یارمەتی داوم.

**محەمەد حەمە باقی**

**هەولێر**

**پاییزی ٢٠١١**

# کورتەی ژیانی میستەر ریچ

کلودیوس - ی نووسەری ئەم گەشتنامەیە، لە رۆژی ٢٨ی مارتی ساڵی ١٧٨٧- دا لە نزیك (دیجون)ی سەر بە (بورگەندی)، لە فەرەنسا لە دایك بووە. هەر بە منداڵیی بۆ (بریستۆل) لە ئینگلتەرە گوێزراوەتەوە و سەرەتای ساڵانی منداڵیی لەژێر سێبەری دایك و باوکیدا بەسەربردووە. هەر لە منداڵیشەوە نیشانەی بلیمەتیی و بەرزیی پێوە دیاربووە، چونکە کاتێ بنچینەکانی هەردوو زمانی لاتینی و یۆنانی، لەلایەن خزمێکییەوە پێ وتراوە. کەڵکەڵەی زانین پاڵی پێوەناوە، تا بەبێ مامۆستا و بەپشتیوانی هەندێ کتێب، خۆی فێری گەلێ زمانی هاوچەرخ بکات.

کە تەمەنی بە هەشت نۆ ساڵان گەیشتووە، لە گەنجینەی خانەدانێکدا لە بریستۆل، دەستنووسێکی عەرەبی دەدۆزێتەوە، ئیتر خولیایەکی بەتین سەری تێدەکا، تا لای ئەم زمانە، لەنگەرێك بگرێ و دواتریش خۆی بۆ بەدیهێنانی ئەو شتە ئامادە بکات کە لە هەموو هیوایەکی زیاتر مەبەستی بووە، ئەویش توێژینەوەی زانستەکانی خۆرهەڵات بووە، کە کارێکی گرنگی لەسەر رێوشوێنی ژیانی داهاتووی هەبووە، چونکە بەهۆی کتێبێکی رێزمان و فەرهەنگێك و هەندێ دەستنووسەوە، کە لە (بریستۆل) لە میستەر (فۆکس)ی خواستبوون، توانی خۆی فێری نووسین و خوێندنەوەی ئەم زمانە گرانە بکات و بە ئاسانی و زمانپاراویی پێبگات، تا کە تەمەنی بە یازدە ساڵیی دەگات، ئەم خولیا نەلەقیوەی وای لێ بکات، بێ پشوو، لەسەری سووربێ و پێشکەوتنێکی زۆر لە گەلێك زمانی خۆرهەڵاتیدا بەدەست بهێنێ، لە نێوانیاندا زمانی عیبری، کلدانی، فەرەنسی، فارسی، تورکی، عەرەبی و کەمێکیش چینی(١٥).

---

١٥- وەك دەردەکەوێ زمانی کوردییشی زانیبێ، چونکە زۆربەی ئەو ئاخاوتن و باس و خواسانەی لە گەشتەکەیدا لەگەڵ دانیشتووانی کوردستاندا کردوویەتی بەزمانی کوردی بووە. نازانم بۆچی (خاتوو ڕیچ) ئاماژەی بۆ ئەمە نەکردووە. بەڵام وەك لە دووتوێی ئەم کتێبەدا دەردەکەوێ، وادیارە (رێنوێن و چاوساغ)ەکانی ناو کوردستانی، فارس بووبن، چونکە لە یادداشتکردنی ناوی زۆربەی شارۆچکە و گوندەکانی کوردستاندا، لەباتی پاشکۆی هەموو ناوێکی وەك (ئاوا)ی کوردیدا، (ئاباد)ی فارسی نووسیوە. جگەلەوەی کە مانای ناوی (کوردی) هەندێ لەو شار و شارۆچکە و گوندانەیشی هەر بە فارسی پێگەیەندراوە و ئەویش هەر بە فارسی یادداشتی کردوون، وەك (کرماشان)ی بە (کرمنشاە) و (شارەزوور)ی بە (شەهرەزور) و دەیان ناوی تری هەر بەو جۆرە یادداشتکردووە، کە لەم وەرگێڕانەدا هەموویان ڕاستکراونەتەوە(م).

سەرباری ئەوەش کە سەرنجی خەڵکێکی زۆری بەلای لێکۆڵینەوە دیارەکانیدا راکێشا، لە هەمان کاتیشدا بەشێوەیەکی گشتی لایەنی خۆپەروەردەکردنی خۆیشی کەمتر نەبوو.

ئەو ڕێبازەی ئەم، لە توێژینەوەکانیدا بۆ خۆی تەرخانکرد، وەك چۆن ریٚ نیشاندەری کەسانی تریش بوو، ئەمیشی بۆ ئەوە ڕێنوێی کرد، کە (هیند) چاکترین مەیدانی دەرختنی بلیمەتیی داهاتوویەتی.

لە ساڵی ١٨٠٣- دا یەکێك لەو هاوڕێیانەی بەتەنگییەوە دەهات، لای کۆمپانیای (هیندی خۆرهەڵات) تەقەللای بۆدا، کە لە مەیدانی سەربازیدا وەك قوتابییەکی جەنگ وەربگیرێت. کاتێکیش ئەو هاوڕێیەی هەواڵی دامەزراندنەکەی پێگەیاند و نیگەرانیی خۆی دەربڕی، کە لەوە زیاتری پیٚ نەکراوە، میستەر ریچ ئەوەی نیشاندا کە زۆر پشت بەخۆی دەبەستیٚ و بە شادمانییەوە پێی دەڵیٚ: تۆ، هەر ئەوەندە وا بکەیت بگەمە هیند، ئیتر ئەوانی تری لەسەر خۆم.

ئیتر وەك ئاواتی لاوێتیی، هەموو خولیا گەشەکەی، بریتی بوو لەو پرۆژەیە و بەپەلە و بۆ تەواوکردنی پێویستییەکانی، خۆی گەیاندە (لەندەن)، و سەری لەبەڕێوەبەرایەتی کاروباری (هیند)دا، کە دەبوایە پێش وەرگرتنی کارەکەی، تەواویان بکات...

لەکاتێکدا میستەر ریچ لە بەڕێوەبەرایەتی کاروباری (هیند)دا چاوەنوارِ دەکات، سەرنجی میستەر (والان سیر تشارلس ویلکنس) بەلای خۆیدا ڕادەکێشیٚ کە لە زمانەکانی خۆرهەڵاتدا بە شارەزا ناسراوە، چونکە دوای ئەوەی لە زمانەکانی خۆرهەڵاتدا تاقی دەکاتەوە، زۆر لەوە زیاتری بۆ دەردەکەویٚ کە چاوەنوارِ دەکات و زیرەکییە سەیرەکەی لەو شتانە باڵاتربووە، کە بەهۆیانەوە ئەو زمانەی پیٚ فێربووە. لەبەرئەوە دەمودەست وەك لاوێکی بلیمەت و دەگمەن، کە شایستەی ئەوەبیٚ هەموو جۆرە فەرمانێکی تری لەژێر چاودێری خۆیاندا پیٚ بسپێرن. بە ئەندامانی ئەنجوومەنی بەڕێوەبەرایەتییەکەی ناساندووە.

لەسەر ئەو ڕاسپاردانەش کە سەبارەت بە شارەزاییەکانی میستەر ریچ، باسکرا، خوالێخۆشبوو (ئەدوار باری) بەڕێزلێنانێکی زۆرەوە، فەرمانبەرێتی (کاتب تحریرات)ی دەسگای (بومبای)یان پیٚ سپارد. بەمجۆرە ڕەوتی ژیانی لە خزمەتی سەربازییەوە، بۆ خزمەتی مەدەنیی(سیڤیل) لەو دەسگایەدا گۆڕرا. بۆ ئەوەش کە هەردوو زمانی عەرەبی و تورکی باشتر فێرببیٚ، کە پێشتریش شارەزاییەکی چاوەنوارِ نەکراوی تیایاندا پەیدا کردبوو، بۆ سکرتاریەتی میستەر (لووك) گوێزرایەوە، کە لەو ڕۆژانەدا وەك باڵیۆزێکی حکوومەتی بەریتانی بەرەو میسر دەچوو.

میستەر ریچ لە سەرەتای ساڵی ١٨٠٤- دا بە پاپۆڕێکی بارگواستنەوە، کە ناوی (هیندستان) بوو، کەوتەڕیٚ، تا لە زەریای ناوەڕاست دا بە میستەر (لووك) بگات، بەڵام لەبەر

هەر هۆیەك بوو بێت، ئەم پاپۆڕە لە کەنداوی (ڕۆماس- لە ئیتالیا) ئاگری تێچوو. ئیتر میستەر ریچ لەگەڵ پاپۆڕەوانەکاندا پەنای بۆبەر ڕۆخی (کاتالۆنیا) برد و لەوێشەوە بەیارمەتی هاوڕێیەکی لە (بریستۆل) سەفەرەکەی درێژە پێدا و دوای مانەوەیەکی زۆر لە ئیتالیا و فێربوونی زمانی شیرینی ئیتالی، خوێندنی دەرسی مۆزیکی دەست پێکرد، ئەو هونەرەی کە لە ژیانی داهاتوویدا تا دەهات خۆشتر و بەچێژتر و بەرینتر دەبوو. ئیتالیاش لە هەموو ئەو وڵاتانە زیاتر لەگەڵیدا دەگونجا، کە سەردانی کردبوون، بۆیە بەخۆشییەکی گەورەوە لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا بەسەری دەکردەوە. واش ڕێ دەکەوێ پێش ئەوەی بگاتە جێی فەرمانەکەی، میستەر (لووك)ی هاوڕێی کۆچی دوایی دەکات. ئیتر ئەنجوومەنی بەڕێوەبەرایەتییەکان، ڕێگە بە میستەر ریچ دەدەن تا بۆ ئەنجامدانی بەرنامەکەی، خۆی هەر جێگەیەك کە بەچاك دەزانێ، بچێت. لەسەر ئەمەش لە (مالتا)وە بە دوورگە بچووکەکانی (یۆنانی)دا ڕوو لە ئەستەموول دەکات.

میستەر ریچ ماوەیەك لە ئەستەموول دەمێنێتەوە و پاشان دەچێتە (ئەزمیر)، لەوێش لەگەڵ چەند لاوێکی تورکدا دەچێتە قوتابخانە، بۆ فێربوونی تایبەتمەندییەکانی زمانی تورکی بە وردەکاریی نووسین و خوێندنەوەی و قووڵبوونەوە و فێربوونی هەموو جۆرە زانستەکانی ئیسلامیی.

هەر لەم ماوەیەدا چەندان سەفەری گرنگی لە ئاسیای بچووکدا کردووە و دوایی بە یاریدەدەری کۆلۆنێل (میسیت)ی باڵوێزی گشتی بەریتانیا لە میسر دانراوە و بەڕێگەی (قوبرس)دا بۆ ئەسکەندەرییە چووە. لە میسریش کەڵکی لە فێربوونی زمانی عەرەبی و شێوە جیاوازەکانی وەرگرتووە. لەهەمان کاتیشدا کاتی دەستبەتاڵیی خۆی، بۆ مەشقی سواریی و بەکارهێنانی شیر و تیر، بەسەربردووە. بڕیاریش دەدا بەڕێی زەویدا بۆ کەنداوی فارسی بچێت(١٦).

بۆئەوەش نەیناسن، جلوبەرگی میرانەی لەبەرکردووە و گەشتی بەزۆربەی ناوچەکانی فەلەستین و سوریا - دا کردووە و پشتی بەو زمانە تورکی و نەریتەیان بەستووە، کە زانیویێتی. چاو قایمانە سەردانی دیمەشقی کردووە و لەکاتی سەردانی حاجیاندا، کە بەرەو (مەککە) خۆیان ئامادە کردووە، چۆتە ناو (المسجد الكبير)ەوە، کە ئەمەش کارێکە، ئەگەر پێبزانرایە، کە (دیان)ە، لەو ڕۆژەدا ژیان بایی خۆی بووە، لە دیمەشق - یشەوە چۆتە (حەڵەب) و لەوێشەوە بەڕێی (ماردین - بەغداد)دا بۆ (بەسرە) دەچێ، لەوێشەوە بۆ (بومبای)، کە لە ئەیلولی ١٨٩٧-دا دەیگاتێ.

---

١٦لە دەقەکەدا وا نووسرابوو، بۆ ئەمانەتی وەرگێڕان وەك خۆی هێشتمەوە. (م).

زرنگییشی لە زمانەکانی خۆرهەلأت و نەریتیاندا، توانایەکی وای داوەتێ تا بتوانێ بەجلوبەرگی تورکانەوە لە (گورجستان)، چاوبەست لە خەلّك بکات و لە دیمەشقیش لەناو هەزاران حاجیاندا، کە بەرەو مەککە چوون، چەند هەفتەیەك بمێنێتەوە، بەبێئەوەی سەرگەرمترین و وریاترین موسلّمان، هەستی پێ بکات.

دوای ئەوە بە ماوەیەکی کەم، بەرژەوەندی گشتی بەریتانی وای پێویست کردووە نیشتەجێیەك لە بەغداد دابمەزرێنن و رای هەمووانیش لەسەرئەوە کۆبووە، کە میستەر ریچ تاقە کەسێکە شایستەی ئەم کارە بێت، خۆیشی هەر بۆ ئەمە، داوای دامەزراندنی کردبوو، لەبەرئەوە لەپێش (٢٤) سالّییدا، بەهۆی لێهاتوویی خۆیەوە، دووجار بەرزکراوەتەوە و بۆ بەغدا چووە.

ریچ ماوەیەکی کەم دوای ئاهەنگی ژن هێنانی، (٢٢ی کانوونی یەکەمی ١٨٠٨)، چۆتە نیشینگەکەی، کە بەغدا و بەسرەیشی گرتۆتەوە و ئەنجام لە بەغدا سەقامگیر بووە، کە بارەگای والییشی لێ بووە، چونکە بەو هۆیەوە کە شوێنەکەی لە ناوەڕاستدا بووە، توانیوێتی کاروباری سیاسی خۆی لەگەلّ دامودەسگای والی دا بەڕێوەبەرێ و ئەو دەنگوباسانەش ببیستێ کە لەو سەردەمەدا لە ئەورووپاوە هاتوون و پڕبوون لەو هەوالأنەی کە چاوەنوارِ دەکرا (ناپلیۆن) ئینگلتەرە و هیند بگرێ. بەهۆی هەست بەرزیی و دووربینیشی لە کاروباری سیاسی و ئاگاداربوونی لە ڕەوشت و خووی خەلّکەکە و بەخشندەیی خۆیشییەوە، زۆر خێرا توانیوێتی ڕێزی خۆی لای میری و لای خەلّکیش پەیدا بکات.

بەپێی ئەو خووەش کە دەسەلأتدارێتی تورك بەخۆیەوە گرتووە، لەسەردەمی نشینگەیی (ریچ)دا، چەندان شۆڕش لەناو دامودەزگای میریدا ڕوویداوە و چەندان والیش گۆڕراون و (میستەر ریچ)یش بەهۆی ڕەوشتی بەرزییەوە، توانیوێتی لە مالّەکەی خۆیدا پارێزگاریی و پەناگەو دالّدە بۆ هەموو ئەوانە دەستەبەر بکات، کە جاروبار بەهۆی ئەم کودەتا سیاسیی و نائاساییانەوە بەرمەترسی کەوتوون. چونکە مالّەکەی ئەم، پەناگەیەك بووە، کەس نەیوێراوە لەخۆیەوە توخنی بکەوێت. . .

ئەم دادپەروەرییە ڕەسمی و نیازچاکییەی ریچ، بۆتە هۆی ئەوەی گەلێ جار خەلّك هیچ سەنگێکیان بۆ بەلّێن و پەیمان و قسەی والییەکانیان دانەناوە، ئەگەر لەلایەن ئەمەوە زامن و پشتگیری نەکرایە.

نزیکەی شەش سالّی لە بەغدا بەسەربردووە و لە هاوسەرەکەی و میستەر (هاین)ی برین پێچی نشینگەکە زیاتر، کە لەهەمان کاتیشدا یارمەتیدەری بووە، هیچ هاوڕێیەکی ئەورووپایی نەبووە. . .
کاتی دەستبەتالّی خۆی بەو لێکۆلّینانەوە بەسەربردووە، کە خۆشی ویستوون، لەبەرئەوە کۆمەلّێك

دەستنووسی خۆرهەڵاتییانە و سەرچاوەی پێویستی بۆ نووسینی کتێبێك لەبارەی مێژووی فەرمانداریێتی بەغدا و ناوچە جوگرافییەکەی و سەرژمێری، کۆکردۆتەوە، کە لەپێناوی کۆکردنەوەیاندا درێغی لە رەنج و پارە سەرفکردندا نەکردووە. پێڕستی ئەم کۆمەڵەیەشی وەك ئەوسا بۆ داناوەو لە چەند ژمارەیەکی (کانگەکانی خۆرهەڵات)دا، کە لە (ڤییەنا) دەرچووە، بڵاوبۆتەوە و راستگۆترین بەڵگەن بۆ ئاستی ئەو سەرکەوتنەی لەو باسانەیدا بەدەستی هێناوە.

هەروەها کۆمەڵێکی تری دەوڵەمەندی بە (مەدالیا و دراو و خشڵ و بەردی هەڵکۆڵراو) رێکخستووە، کە لە (بابل و نەینەوا و تەیسەفون و بەغدا) دۆزرابوونەوە. گەشتێکی (بابل)یشی بۆ لێکۆڵینەوەی پاشماوەی ئەو شارە کۆنە کردووە و پوختەی سەرنجەکانی خۆی لەو کتێبەدا تۆمار کردووە، کە ناوی ناوە: یادداشت لە کەلاوەکانی بابلەوەو بۆ یەکەمجار لە (ڤییەنا) لە گۆڤاری (کانگەکانی خۆرهەڵات)و دواییش لە ئینگلتەرە چاپکراوە.

لە کۆتایی ساڵی ١٨١٣- یشدا بەهۆی تێکچوونی باری تەندروستییەوە ناچار بووە کاری نشینگەیی بەغدا، بۆ میستەر (هاین)ی یاریدەدەری بەجێ بهێڵێ و لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بۆ ئەستەمووڵ بچێت و ماوەیەك میوانی میستەر (والان - سیر رۆبرت لیستن) بووە، کە ئەوکاتە لای (بابیعالی) باڵوێزی بەریتانیا بووە.

لە سەرەتای ساڵی (١٨١٤)دا چەند شتێك وایان لێکردووە درێژە بە سەفەرەکەی بدات و بە (بولگاریا و هەنگاریا) و تا (ڤییەنا) و دواییش گەیشتۆتە (پاریس)، کە تازە سوپای هاوپەیمانان داگیریان کردووە. ئیتر هەر لە پاریسدا ماوەتەوە و دەرفەتی ناسینی گەلێ لەو پیاوە ناسراوانەی بۆ رەخساوە، کە لەو رۆژە تووشانەدا لەوێ گردبوونەتەوە، تا (بۆناپارت) گەڕاوەتەوە و هەریەکەیانی بۆ جێی خۆی پەرتوبڵاو کردۆتەوە.

لە گەڕانەوەشیدا بەرەو بەغدا، بە (سویسرا) و (میلان)دا تێپەڕبووە و لەوێشەوە بۆ (بوندقیە) چووە و بەناچاری ماڵاوایی لە (ئیتالیا) کردووە و بە (تریەستە)دا ڕابووردووە، لەوێشەوە بەرێگەی (کورفو) و (ئەرخەبیل)دا بۆ ئەستەمووڵ چووە و بەدەم رێگەشەوە سەردانی گەلێ دوورگەی کردووە و تیایاندا گەڕاوە، تا شوێنەواری کۆنی (تەروادە)، بدۆزێتەوە. لە ئەستەمووڵیشەوە بەرێگەی ئاسیای بچووکدا بۆ بەغدا گەڕاوەتەوە و بەپێی تواناش هەوڵی داوە لەم سەفەرەیدا بەرێگەیەکی جیاوازتر، لەو سەفەرەی بۆ ئەورووپا کردوویەتی، بڕوات و زیاتر بایەخ بە جوگرافیای ئەو وڵاتە بدات و بەتایبەتیش هەڵکەوتنی چیاکانی. کە لە دۆڵی

(رافیدەین)یش نزیك دەبێتەوە، سەردانی کەنیسەکانی (سریان و کلدان) دەکات و زانیاریش لەبارەی ئەو ڕەگەزە سەیر و نامۆیەوە کۆدەکاتەوە، کە پێیان دەوترێ (ئیزەدی).

دوای ئەوەی بەبارەگای نشینگەییەکەی خۆی دەگاتەوە، دەست بە درێژەپێدانی ئیشە کۆنەکانی دەکاتەوە. لە ماوەی ئەو پێنج ساڵەدا کە لەوێ ماوەتەوە، توانیوێتی گەلێ دەستنووسی تازە بخاتە سەر کۆمەڵە دەستنووسەکانی تری، بەجۆرێ کە بەرهەمە کۆکراوەکانی، بوون بە بەنرخترین کۆمەڵە دەستنووسێك، کە لە خۆرهەڵاتدا کەسی تر نەیبووە. هەر مانەوەیشی لە بەغدا، یارمەتی ئەوەی داوە ئەم کارە بە ئەنجام بگەیەنێ. هەروەها کۆمەڵە (دراو)ە یونانی و ساسانی و ئیسلامییەکانی زیاتر بکات و کۆمەڵە خشڵ و بەردە هەڵکۆڵراوەکانیشی و بەتایبەتی لوولە بابلییەکانی زیاتر بکات.

هەر لەم ماوەیەشدا بووە دووەمین گەشتی (بابل)ی کردووە (وەك پێشتریش باسمان کرد)...

لە ساڵی (١٨٢٠)دا، باری تەندروستی وای پێویست کردووە ئاڵوگۆڕێك لە ئاووهەوادا بکات، بۆیە گەشتێکی (کوردستان)ی کردووە، کە ڕووداوەکانی ئەو سەردانەی لەم گەشتنامەیەدایە.

لە گەڕانەوەشیدا سەردانی گەلێ کەنیسەی دیانی کردووە، بەتایبەتی ئەوانەی کە لە سەفەرەکانی پێشوویدا دەرفەتی سەردانیانی نەبووە. بۆیە توانیوێتی گەلێ دەقی کۆنی سریانی و کلدانی بەکەڵکی کتێبی پیرۆز - کۆبکاتەوە و کتێبخانەکەی پێ دەوڵەمەند بکات، جگە لەگەلێ دەستنووسی تری دەگمەن.

هەر لەودەمانەدا خۆی ئامادە کردووە سەردانی (بۆمبای) بکات، چونکە حاکمی گشتی ئەوێ بەپلەیەکی گرنگ دایمەزراندووە، بەڵام وا ڕێکەوتووە بارەگای نشینگەییەکەی بە فەرمانی والی، یان هەر بەهاندانی ئەو، پەلاماری بدرێ و میستەر ریچ توانیوێتی بەزەبری چەك بەرەنگاریی ئەم هێرشە ببێتەوە و پاشان بۆ بەسرە چووە.

لەوکاتانەشدا کە چاوەنواڕی پێشنیاری دەوڵەتەکەی خۆی دەکات، کەڵکی لەو ماوەیە وەرگرتووە و سەردانی (شیراز)ی کردووە و لەوێوە سەردانی کەلاوەکانی (پەرسەپۆلس) و (کورش) و پاشماوەکانی تری ئەو ناوەی کردووە.

لەکاتی مانەوەیدا لە (شیراز)، نەخۆشی (ڕشانەوە)ی بەجۆرێك تێدا بڵاوبۆتەوە، مەترسی خستۆتە هەموو دنیاوە، چونکە تەنیا لەچەند ڕۆژێکدا هەزاران کەسی ناو شار مردوون، کە شارەکە خۆی نزیکەی (چل هەزار)کەس بووە. ئەمە بۆتە هۆی ئەوەی حاکمی ئەو شارە، بە خاووخێزان و گەورەپیاوان و خانەدان و ئەو خەڵکە هەژارانەش کە توانیویانە خۆیان دەرباز بکەن، شاریان جێ هێشتووە.

ئەم پەتایە نینۆکی لە ریچ - یش گیرکردووە، بۆیە ڕۆژی ٤ی تشرینی یەکەم، کاتێ لە گەرماو دێتەدەرێ، نیشانەکانی (ڕشانەوە)ی لێ دیاری دەدات و سەرەڕای ئەو هەموو چاودێریی و چارەسەرکردنەیشی، بەڵام بەرەبەیانی ڕۆژی دوایی تر، واتە ٥ی تشرینی یەکەمی ١٨٢١ کۆچی دوایی دەکات و لە یەکێك لە باخچەکانی پاشایەتی (جیهان نوما)دا دەنێژرێ کە پێشتر نیشتەجێی خۆی بووە و بۆ لەبیرنەچوونەوەیشی پەیکەرێکیان بۆ دروست کردووە.

لەپاش خۆیشی گەلێ دەستنووسی بەجێهێشتووە. ئەو یادنامە ڕۆژانە تێروتەسەلەیشی کە بەدەم ڕێوە، لە بەغداوە بەرەو ئەستەموولێ نووسیوێتی و خۆی پێی وابووە تاقە سەفەرێك بووە، کە هاوسەرەکەی بەسواری ئەسپ لەگەڵیدا بووە. هەروەها سەردانیشی لە ئەستەموولەوە بۆ ڤییەنا و لە پاریسەوە بۆ بەغدا، هەمووی یادنامەی ڕۆژانەی لەسەر نووسیون. جگەلەو یادنامە ڕۆژانەیەی لە کوردستان نووسیوێتی و هەندێکی لەم کتێبەدا چاپکراون، چەندان لاپەڕەی تریشی نووسیوە، کە هەمەجۆر باسیان تێدایە.

کۆمەڵە دەستنووسە بەنرخە خۆرهەڵاتییەکەی و دراو و شتەکانی تریشی، پەرلەمانی بەریتانیا، بۆ مۆزەخانەی بەریتانیای کڕییەوە، کە تا ئێستاش هەر لەوێن.

لێرەشدا پێویست بەوە ناکات باسی ناوەڕۆکی لاپەڕەکانی ئەم کتێبە بکەین، چونکە خۆیان باسی خۆیان دەکەن... یادنامەی پیاوێکی مەزنە، لەبارەی وڵاتێکی تازەوە، کە گەشتوەرانی تر، بەپەلە و راگوزاری، بە هەندێ جێگایدا تێپەڕیون و لابەلا ناویان هێناوە. بەڵام ئەم یادنامە رۆژانەیە، تیشکێکی تازەتر و گەش دەخاتە سەر جوگرافیای کوردستان و نەریتی خەڵکەکەی. چونکە ئەوخاڵە جوگرافیانەی لەم کتێبەدا لێکۆڵینەوەیان لەسەر کراوە، نەك هەر ڕووناککەرەوەی هەموو لایەکی کوردستانن، بەڵکو یارمەتیدەرێکیشە بۆ ڕووناککردنەوەی شوێنە نزیکەکانی ئەم بەشەی ئاسیا.

گومانیش لەوەدا نییە، کە میستەر ریچ، حەزی دەکرد تێبینی و لێکۆڵینەوەکانی سەبارەت بەم سەفەرەی بڵاو بکاتەوە(١٧).

---

١٧لەو نامەیەدا کە (جەیمس بێڵی فرێزەر)، رۆژی شەشی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٨٢١ - لە شیرازەوە، واتە رۆژێك دوای مردنی میستەر ڕیچ، بۆ (ویلیم ئەرسکن)ی لە (بومبای) نووسیوە، ئەم بڕگانەی تێدایە: (لە نێوان ئەو کتێبانەدا لای میستەر ڕیچ دیمن، دەفتەرێکی بیرەوەری و یادنامەم بەرچاوکەوت، کە گومانم نییە نرخێکی گەورەیان هەیە، چونکە پڕێتی لە تێبینی جوگرافی و گەردووناسیی، کە بۆ نەخشەکانی ئێرانمان زۆر پێویستمان پێیان هەیە. هەموو ئەم تێبینی و لێکدانەوانەش لەمەڕ کوردستان، یان لەناو ئەم نامانەدان، یان لەناو ئەو کاغەزانەدایە، کە لە (بوشەهر) بەجێی هێشتوون.

چونکە هەموو ئامرازێکی ڕووپێوی هونەریی بۆ بەکارهێناوە و لەم گەشتنامەیەدا زۆر بە وردیی ئەو خاڵانەی دەستنیشان کردووە، کە ڕێنمایی سەفەرەکەیان کردووە.

خۆ ئەگەر مەرگ مەودای بدایە، خۆی ئەم گەشتنامەیەی بۆ جەماوەر بڵاوبکردایەتەوە، ڕەنگە گەلێ شتی تازە و گەلێ زانیاریی تر، کە لە مێشکیدا ڕەنگی بۆ ڕشتبوون و پەنگیان خواردبووەوە و لەکاتی نووسینی گەشتنامەکەدا تۆماری نەکردبوون، ئامادەی کردبوون بۆ کاتی بڵاوکردنەوەی و ئەم گەشتنامەیەی پێ دەوڵەمەند بکردایە.

لەهەمان کاتیشدا بەهۆی قەڵەمە بەبڕشتەکەی و ئەو بەرنامە وردەی بۆ ڕووپێوی هونەریی دایناوە، توانیویێتی لە هەندێ بەشی کوردستاندا ئەنجامێك بەدەست بهێنێ، کە پێشتر لامان شاراوە بووە و لە باشترین نەخشەکانی وڵاتەکەماندا نەبووە و لە هیچ پارچەیەکی تری ئاسیادا ئەنجام نەدراوە، کە ئەمەش داهێنانێکی شەرەفمەندە بۆ خۆی و بۆ وڵاتەکەی(١٨).

---

دیارە ئەگەر ون بووبن، خەسارەتێکی زۆر لە جەماوەر دەکەوێ، لەبەرئەوە هەموو ئەو پەڕە کاغەزانەی لـە کتێبخانەکەیـدا بەرچنگی ئێمە کەوتن، نەمان هێشتووە هیچیانمان لێ بزربێ و ئەو پەڕە کاغەزانەش بریتین لەو یادداشتانەی نرخـی خۆیـان هەیە. جارێکیشیان گوێم لێ بوو میستەر ڕیچ دەیوت: هەموو ئەو نەخشانەی لەبارەی ئەم بەشەی ئاسیاوە هـەن، پـڕن لـە هەڵە و ئەو نیازەشی دەربڕی کە پڕۆژەی نەخشە تایبەتییەکانی خـۆی تـەواوبکات. هـەروەها دانەیـەکیش لـەو نووسـراوە مێخییە زۆر بەنرخانەی لە (پەرسەپۆلس) هەن، بەخەتی ئەم نووسراونەتەوە، کە بـە هیـوا بـووە دانەیـەکی بـۆ مامۆسـتا (گروتیفند) لە ئەڵمانیا لێ بنێرێ.

١٨دەبێ ئەوە بڵێم کە لە دەقە عەرەبییەکەدا ژیانی میستەر ڕیچ درێژتربوو، بەڵام هەندێ بڕگەیم بـە زیـادە زانی و هەر ئەوەندەم لێ وەرگێڕاوە، کە دڵنیام ئەم پوختەیە تینوێتی خوێندەواران دەشکێنێ. (م).

# بەشی یەکەم

**دەرچوون لە خانووی نشینگەیی ـ چۆنێتی سەفەرەکە ـ باسێکی کۆمەڵەکەمان ـ باوبۆران ـ کفری ـ کەلاوەی ساسانی ـ میواندارێتیی سەرۆك هۆزی بەیات ـ چاووگەکانی نەوت لە (توزخورماتوو).**

## بەغدا - ١٦ى نیسانی ١٨٢٠

بۆ خۆ دەربازکردن لە دەست قرچەی هاوین، لە هاوینەکانی بەغدا، ئەمساڵ نیازی سەردانی چیاکانی کوردستانم خواست. چونکە پێیان وتبووین لەوێ کەشوهەوایەکی جیاوازتر، لەچاو ئەوەی بەغدادا(١٩)هەیە. لەبەرئەوەش کە کوردستان، لە ئەوروپادا کەمتر ناسراوە و منیش ناسیاوێکی زۆرم لەوێ هەبوو، کە بۆ سەردانیان زۆریان بانگهێشتن کردبووم، بۆیە پێم خۆشبوو هەلێکی ترم بۆ بڕەخسێ، تا ئەو تینوێتییەم بشکێ، کە مەگەر هەر بەسەردانی وڵاتێکی تازە، پاراو دەبوو.

لەم جارەشیاندا هەست دەکەم پێویستە بەشێوەیەکی رەسمیی گەشت بکەم. هەر لەبەرئەمەش بوو کە (ریچ خانم)ی هاوسەرم، ئەرکی ئەم سەفەرە سەختە لە (تەختەڕەوان)ێکدا(٢٠) بکێشێ، کە قەرەواش و تایبەتمەندانی حەرەم(٢١) چاودێرییان دەکرد... بۆ ئاسانکردنی ئەم ئەرکەش ئەوەندەی بتوانرێ، بەچاکم زانی ئەسپێکیشی

---

١٩. زۆر بەگران بەراوردم لەنێوان ئەو گەرمایەی بەغدا، لەگەڵ هیچ جێگایەکی تری دنیادا پێدەکرێ کە بەلای کەمەوە پێنج مانگ دایدەگرێ، . بەڵام ئەگەر بەیادی بێنین کە خەڵکەکەی لە مانگی نیسانەوە تا تشرینی یەکەم، ناچار دەبن لە ڕۆژدا پەنا بۆ ژێرزەمین و شەویش بۆ سەربانی ماڵەکانیان دەبەن، ئەوا کەمێك بۆمان دەردەکەوێت، چونکە لەو ماوەیەدا ژیان، لە ژووردا هەڵناکرێ، پلەی گەرما لەپێش هەیوانێکی سێبەردا دەگاتە (١١٥ پلە). لە نیوەڕوانیشدا دیومە گەیشتۆتە (١٢٠ پلە)، لە دەی شەویشدا (١١٠ پلە). گەرمای گڕەش بێزاری دەکردین، کە بۆنێکی توندی گۆگردی لێدەهات -خاریچ-.

٢٠- ئەمە دەبێ مانای وشەی (...... -داڕشتن - تێکردن)ی عیبری نەبێ، کە لای ئێمە لە (تەورات)دا بۆتە (LITTER) واتە (کەژاوە)، وەك لە بڕگەی بیستەمی (ئیصحاح ٦٦ی ئەشعیا)دا هاتووە؟. لە چاپی حەفتاهەمینی (SEPTUAGINT)یشدا بە مانای (کەژاوەی سەر هێستر) هاتووە. پەخشکار ئەم کورتەیەی لە هاوڕێییەکەوە پێگەیشتووە. لە (گەشتەکەی ئیبن جبیر)یشدا کە لە مووسڵەوە بۆ بەغدای کردووە، بەمجۆرە هاتووە: (... لە کەژاوەیەکدا، کە لەسەر دوو داربەستی بەرامبەر بەیەك، لەنێوان دوو گوێدرێژی بەرودوا دانرا بوو...)-ع.

٢١- وشەی (حەرەم) لە خێزانی تورکیدا، بەمانای بەشی ئافرەت دێت. ئەم وشەیە ئەوکاتە بەکاردێت کە موسڵمانێك نەیەوێت باسی یەکێك لە ژن و کچی ماڵەکەی بکات. هەروەها وشەکە بەمانای ئەو بەشەی ماڵەکە دێت، کە مێینەی تێدایە. تورکەکانیش زۆر بەسڵەوە باسی ئافرەتە نزیکەکانیان دەکەن، بەڕادەیەك زۆرجار ناچار دەبن لە ئاماژە بۆ کردنیاندا بڵێن: (ماڵەوەمان نەخۆشە)، یان (ماڵەوەمان سڵاوت لێ دەکەن).

لەگەڵدا بنێرن، تا لەو جێگایانەدا کە لەبەرچاو نابێ، سوار ببێ. هەڵکەوتی پلەوپایەی فەرمان و پۆستەکەشم وای پێویست دەکرد ژمارەیەکی زۆری فەرمانبەر و خزمەتگوزارانی بنکەی نیشینگەیی و ئەوانەش کە بۆ یاوەریمان ڕێگەیان درابوو، لەگەڵ خۆمدا بیانبەم، تا کۆمەڵێکی زۆر پێك بهێنن. بۆ خۆ ڕزگارکردنیش لەو مەسرەفەی کە دەبوایە بۆ ئەو سەربازانەی ناوخۆ، کە بۆ پارێزگاریمان لە مەترسی ڕێگەوبان یاوەرییان دەکردین، دەستە پاسەوانێکم هێنا، کە بریتی بوون لە بیست و پێنج سەرباز و ئەفسەرەکەیان . ئەمانەش ئەوانە بوون کە حکوومەتی (بومبای)، بەتایبەتی وەك پاسەوان بۆ خانووی نشینگەیی داینابوون. ئەم پاسەوانانە ڕێزێکی تایبەتیان هەبوو، پیاوگەلێکی ئازاش بوون و وەك هەستیشم دەکرد ئەم سەفەرەیان پێخۆشە.

(پاشا)ش[22] لوتفێکی زۆری نواند، بەوەی هەرچی لەدەست هات بۆ ئاسانکردنی سەفەرەکەمان، هەر لە دەستوور و فەرمان دەرکردن و نامە نووسینەوە بۆ ئەوانەی لە ناوچەکانی خۆیاندا دەستیان دەڕوات، تا ڕاسپاردەی گەرم بۆ پاشای کوردستان و سەرکردەکانیان، درێخی نەکرد. گوندی (ألدّوخلّە)، کە بیست و پێنج میل لە سەرووی بەغداوە دوورە، بۆ ئەوەم دەستنیشان کرد، تا یەکەمین شوێن، یان ژووانگەی بەیەکترگەیشتنەوەی گشتیمان بێ، بۆ حەرەم و کەلوپەل و پاسەوان و ئەوانەش کە لەگەڵ خۆمدا نایەن.

بەو هۆیەشەوە کە ئەمڕۆ سەردانێکی زۆرم لەلایەن ئەوانەوە کرا، کە بۆ ماڵاوایی و ئومێدی سەفەری سەرکەوتوو بۆ دیدەنیم دەهاتن ، لە بەغداوە درەنگ بەڕێکەوتم، بەڵام ئەم درەنگ کەوتنەم، شوێنەوارێکی وای جێ نەهێشت باسکرێ، چونکە قۆناغی یەکەمان، ئەوپەڕەکەی نەدەگەیشتە پێنج کیلۆمەتر، کە باخەکەی هاوڕێی دێرینە و قۆناغدارم (حاجی عەبدوڵا بەگ) بوو، کە تکای لێکردم ماڵەکەی بکەمە یەکەمین قۆناغ.

سەعات پێنجی دوای نیوەڕۆ بەگورجی سواری ئەسپەکەم بووم و لە نێوان سەعات شەش و حەوتدا گەیشتم و بەگ بەوپەڕی ڕێزەوە پێشوازی کردم، سەیریشم کرد خواردنێکی یەکجار نایابی تورکییانەی بۆ سازکردووین و سالحە خانمیش پێشوازییەکی بەشان و شکۆی ریچ خانمی هاوڕێیی کرد. ئەم خانمە یەکێك بوو لە ژنە کۆنەکانی ئەو سلێمان پاشایەی کە نزیکەی بیست ساڵێك حوکمی بەغدای کرد و لەساڵی ١٨٠٤ز- کۆچی کردبوو. سلێمان پاشا لەگەڵ ئەوەشدا کە مەملوکێکی (گورجی)ی پێش خۆی بوو، بەڵام بەهرە و توانای باشی هەبوو، بۆیە بەهۆی

---

٢٢- پاشا = مەبەست لە داوود پاشا (١٨١٦- ١٨٣١)ی والی ئەو کاتەی بەغدایە (م).

هێز و بڕیاری گورج و گۆڵانە و سەلیقەیەوە، توانیبووی زۆربە هۆزەکانی سەر بە ناوچەی دەسەڵاتی، مل پێ بدا و خێڵە دوورەکانیش لێی بترسن. لەبەرئەوە لە سەردەمی ئەمدا کشتوکاڵ و بازرگانی گەشەی کرد و بەغداش پێشکەوتنێکی گەورەی بەخۆیەوە دی... سێ کوڕیشی لە دوای خۆی جێماون، کە لەبەر ڕێزی باوکیان، لای خەڵکی شار خۆشەویستن و هەر پاشایەکیش کە لەدوای باوکیان هاتۆتە سەر حوکم، هەر وا بوون بۆیان. دووان لەم کوڕانە، هەریەکەیان لەگەڵ دایکی خۆیدا، ژینێکی زۆرباش دەژی، بە ئەندازەی خەڵکی وەك ئەمانە، کە پلەوپایەیەکی هەبێ و لە جێگایەکدا بن کە چاوی دەوڵەت بەخیلیان پێ بەرێت، بەتایبەتیش سێیەمیان، کە گەورەکەیانە و پایەیەکی هەیە، حسابی بۆ دەکرێ، تا لە ئەنجامدا بەهۆی فرتوفێڵەوە توانیبووی بگاتە پاشایەتی و چەند ساڵێکی کەم لەخێر و خۆشی جێگاکەیدا بژی، کە پاشان (داوود)ی زاوای توانی بیکوژێ و پاشان فەرمانێك لە (بابیعالی)یەوە وەربگرێ، کە پشتیوانی حوکمدارێتی بکات(٢٣).

## ١٧ی نیسان

سەعات حەوت و چارەکی بەیانی، مۆڵەتم لە حاجی عەبدوڵڵا بەگ خواست و خانووی گوندەکەیم جێ هێشت. ڕێگاکە بە زەوییەکدا تێپەڕ دەبوو، کە هەرگیز دڵی نەدەکردەوە، تا لە سەعات دوازدە و چل و پێنج دەقیقەدا گەیشتمە چادرگەکەمان لە (ئەلدّوخلە). بەڵام هاوسەرەکەم، سەعاتێ دوای گەیشتنی من، گەیشتە ئەوێ. بۆ دڵنیابوونیش لە کۆمەڵەکەمان، چاوێکم بە چادرگەکەدا گێڕا. دامەزراندنی ژمارەیەکی وا، لەو گوندانەی گوێ ڕێگەدا، کارێکی ئاسان نەبوو، بۆیە ناچاربووم چادر لەگەڵ خۆم بهێنم و هەندێکیش عەرەب بۆ هەڵدان کۆکردنەوەی بەیانیان و ئێوارانی چادرەکان بهێنم. چادرەکان چواردە، پازدەیەك دەبوون، کە لەوە کەمتر بوون جێگەی کۆمەڵێکی پەنجا، شەست کەسییان تیدا ببێتەوە(٢٤)،

---

٢٣بڕوانە پاشکۆی (سەرەبڕشت لە یادداشتی خاریچ).

٢٤.(ئاغا میناس) سەر ئەفسەری ئەهلی(سیڤیل)، بنکەی نشینگەیی و سەرکردەی ئەم کۆمەڵە بوو، کە بریتی بوون لە دیان و جوولەکە و تورك و ئەرمەن و فارس و هیند. لە خێزانێکی ڕێزلێگیراوی ئەرمەنیی بوو، کە بۆ ماوەیەکی درێژ خزمەتی بەریتانیایان کردبوو. ئەو پلەیەی درابوویە و توانای خۆیشی، وایان لێکردبوو ببێتە بەڕێوەبەری کاروباری ماڵەوەی میستەر ڕیچ و لەم گەشتەدا هەر هەمان ئەرك ببینێ و خەزنەدار و یاوەریش بوو. خزمەتێکی زۆری میوانەکانی ڕێگامانی کرد و کاروباری چادرگەکەی بەڕێوەبرد، کە بە

بەڵام تا هەر دەستەیەك لە شوێنی خۆی دانەمەزرا و تا هەموو کاروبارەکان بە تەواوی سەقامگیر نەبوون، ژاوەژاو و شڵەژاوی، بە درێژی ئەو ڕۆژە، چادرگەکەی بەرنەدا، شەویش هەندێ باران باری و وڵاخدار و چادرەوانە کلۆڵەکان و وڵاخەکان تەڕبوون، ئەوانەی کە هەرگیز کەس بیری لەوە نەکردبووەوە کە پێویستیان بە چادرە.

## ١٨ی نیسان

من و میستەر (بەلی نۆ)(٢٥) و هەندێ سوارەی کەمی تایبەتمەندی خۆمان، لە سەعات شەش و چارەکدا، پێش ئەوەی ئەوانیتر بەڕێ بکەون، لە چادرگەکە سواربووین، هەستم بە گەشکەیەکی تەواو کرد، بەوەی لە شڵەژان و لە ژاوەژاوی چەند زمانێکی جیاجیا، ڕزگارم بووە، چونکە ژاوەژاو و پڕمەی وڵاخ و حیلەو دەنگی زەنگوڵەی هێستر و حەپەی سەگ، هەموویان ئەو شتانەن، کە چادرگەیەکی خۆرهەڵاتی تەواو دەکەن.

هاوسەرەکەشم بەدواماندا هات، کە لەناو تەختەڕەوانەکەیدا بوو، لەگەڵ ئافرەتانی دەست و پێوەندیا بوو، کە ئەوانیش لە (کەژاوە)دا بوون - جۆرە باڵینەیەکە، بەملاو لای هێستردا دادەبەسترێ -، هەندێ پاسەوانی سوارەشیان لەگەڵ بوو.

---

کورتی تاقە پیاوێك بوو، هەموو چاوەڕێی فەرمان و هاوکاری کردن بن. لەگەڵ ئەوەشدا هەر نەیتوانی کەس ڕازی بکات، چونکە نەیتوانی کاری نەکردە ئەنجام بدات. خاوەنی پشوویەکی درێژی خۆش و قۆشمە بوو، کە ئەو پلەیەی ئەو، ئەوەی هەڵدەگرت. لەپێناوی ئاسوودەکردنی خەڵکیشدا ماندووبوونی نەدەزانی، بەڵکو زۆر بەپەرۆشەوە ئەرکەکانی ئەنجام دەدا (خاریچ).

٢٥.میستەر (بەلی نۆ) خەڵکی )توبنگەن - TUBINGEN)ی ئەڵمانیا بوو، لە هەرێمی (سوئابیا - SUABIA)، میستەر ڕیچ لە (ڤییەنا) ناسیبووی، کە لە دانشگا ببوو. ئارەزووی بۆ ئەدەبی خۆرهەڵات و حەزکردنی لەسەردانی خۆرهەڵات، وای لێکردبوو، بەهۆی (فۆن هام مەر)ی مێژوونووسی تورکیاوە، کە هاوڕێیەکی چاك بوو، پێشنیار بۆ میستەر ڕیچ بکات، تا لە گەڕانەوەیدا لەگەڵ خۆیدا بۆ بەغدا بیبات. میستەر ڕیچ -یش شادمان بوو کە ئارەزووەکەی هێنابووە دی و کردبووی بە سکرتێری تایبەتی خۆی خوێندەوارییەکی باڵای هەبوو، کە خەڵکانی وڵاتی ئەوان بە دیسیپلین و ڕاستگۆیی ناسراون. زانیارییەکی بەربڵاوی هەبوو. سەرگەرمی لێکۆڵینەوەی گەردووناسی و زمان بوو. بەتەنگ لێکۆڵینەوەکانیانەوە دەهات و هەموو کاتی خۆیشی بەگیانێکی ئەڵمانی تەواوەوە بۆ تەرخانکردبوو.

دابونەریتی تورکی وای پێویست دەکرد، کە هەردوو کۆمەڵەکەمان بەتەواوی لە یەکتر دابڕێن. ئەمەم بۆ خەڵکەکەی خۆیان هێشتەوە، تا پەیڕەوی خووخدە بکەن و بەگوێرەی هەڵسەنگاندنی خۆیان بۆ پلەوپایە و نەریت، هەڵسوکەوت بکەن. چونکە من هەمیشە خۆم وا ڕاهێناوە، بۆئەوەی ئاسودەبم و شەرەفی وڵاتەکەم پێویستی دەکات، دابونەریتی ناوخۆ چۆن ڕێگە دەدات، وا بجووڵێمەوە. لەبەرئەوەی تورکەکان پابەندی دابونەریتن و خەڵکێکن تا بڵێی بایەخ بە ڕوخسار و پۆشتەیی دەدەن و بڕوایان وایە ئەمە شتێکی پێویستە و هەرکەسیش ئەمە نەسەلمێنێ، وەك ئەوە وایە سووك و نەزان بێ و لەگەڵ خووخدەی کۆمەڵگای گەشەکردوودا، ڕانەهاتووە... لەسەر ئەمانەشەوە ڕێ نادەن ئافرەت بێتە بەرچاو و گوێ. منیش پێم وایە هەر تورکێك قێز لەمجۆرە شتانە بکاتەوە، دەبێ لەوانەبێ کە هەندێ ڕەوشتی بەرزی لەدەست دابێت. هەرچۆنێك بێت من ئەمەم لای ئەوانەوە بۆ دەرکەوتووە کە ناسیومن. ئەوپەڕی دڵنیاشم ئەو ڕێز و سۆزەی موسڵمانەکان لێیان گرتین، هی ئەوە بوو ڕێزی دابونەریتیانمان لەم ڕووانەوە گرت و هەستیانمان بریندار نەکرد، بەوەی خوو خدەیان ڕەت بکەینەوە، که زیانبەخش نەبووە و چاوەنواڕی ئەمەشیان لە ئێمە نەدەکرد داوایان لێ بکەین دەستبەرداری بن.

بەو هۆیەوە کە ڕۆیشتنی ئەمڕۆمان بەناو قوڕدا بوو، زۆر ماندووی کردین. لە نێوان سەعات هەشت و نۆدا لە جێگایەك ناوی (موحسین پاك)(٢٦) بوو، کە مەزاری ئیمامێکی بچووك بوو لە نزیك جۆگەیەك، کە لە (ئەلخالس)(٢٧) هەڵگیرابوو، دابەزین بۆ ئەوەی قاوەیەك بخۆینەوە. لە سەعات یازدە و چل و پێنج دەقیقەدا گەیشتینە قۆناغەکەمان، کە لە چاڵایی جۆگەیەکی پەرشوبڵاودا بوو.

## ١٩ی نیسان

دوێنێ دوای نیوەڕۆ هەورەگرمە و گێژەڵووکە، لە خۆرهەڵات و باکووری خۆرهەڵاتەوە دەستی پێکرد و لە سەعات حەوت و نیودا بارانێکی توند باری و ئاسمانیش هەر بروسکەی دەدا، پاشان لە

---

٢٦- لە دەقەکەدا حونجەکردنی ئەم وشانە بەشێوەیەکی ئینگلیزی ئێستا، هاتووە و مرۆ لەکاتی حونجەکردنیاندا هەست دەکات شێوەی عەجەمیانەیان پێوەیە، چونکە لە (MUKHSEN PAUK- موخسین پاك (دا (خ-KH)یەکە (حا-H)یە و (واو)ەکەش (أ)ە-ع.

٢٧- خالس- جۆگەیەکە لە (دیالە) جیا دەبێتەوە و دەڕژێتە (دیجلە)وە.

شەودا گێژەڵووکەکە خاوبووە و هەوریش کەمێك ڕەوییەوە، بەڵام لە نیوەشەودا گێژەڵووکەی توندتر دووبارە بۆوە و بارانیش خوڕتر باری و تا ڕۆژ بۆوەوە هەورە بروسکە هەر بەردەوام بوو. ئیتر چادرەکانمان قورس ببوون و خەریك بوون وایان لێ بێت نەپێچرێنەوە و بارنەکرێنەوە. بارانیش ئەوەندە باریبووە سەر زەوی، کە نیازی سەفەری ئەمڕۆی لەسەر دەرکردین. ئەو شوێنەش کە لای جۆگە پرژەکەوە چادرمان لێ هەڵدابوو، پڕبوو لە دووپشك. بەیتاڵچییەکەشمان کاتێ ویستبووی شوێنێکی چاك لە گوێ جۆگەکە چاك بکات، گوایە پێی وایە بۆ خەوتن چاکە، چوار دووپشکی دیبوو، هەروەها کۆمەڵەکەشمان لە دەوروپشتی چادرەکان ژمارەیەکی زۆریان دیبوو، ئەمەش بۆ هەموو جێگایەکی گردەڵانی و کەلاوەی ئەو وڵاتانە، شتێکی ئاسایی بوو، چونکە شوێنێك لە نزیك (شەهرەبان) هەیە، پڕە لە دووپشك. لە سەعات چواری دوای نیوەڕۆشدا بایەکی خۆرئاوایی هەڵی کرد، بای باشووری لادا.

پلەی گەرما، لە سەعات حەوتی پێش نیوەڕۆدا ٦٦ بوو، لە سەعات سێی دوای نیوەڕۆدا ٧٦ پلە و لە دەی شەودا ٦٦ بوو.

## ٢٠ی نیسان

بە درێژایی شەو بارانێکی توند باری و بووە هۆی بێزارییەکی تەواوی کۆمەڵەکەمان. سەفەری ئەمڕۆشمان لەو شتانە بوو کە نەکرێ. لە نیوەشەودا باران و بروسکە دەستی پێکرد، بەڵام زۆری نەخایاند، هەورە بروسکە نەبێ، کە لای باکووری خۆرئاواوە، لە سەعات یەکەوە تا سێ هەر بەردەوام بوو. زۆربەی گێژەڵووکەکانیش لە باکووری چادرگەکەمانەوە هەڵی دەکرد، پاشان هەور ڕەوییەوە و لەگەڵ هەڵکردنی بایەکی کەمدا لە سەرووی باکووری خۆرهەڵاتەوە، ئاسمان ڕوون بووەوە. بەشبەحاڵی خۆم، وەرزێکی ئاوا سەیرم نەدیوە، بەڵام زەبرێکی قێزەونی لای ئێمەی ڕێبواران هەبوو . پلەی گەرماش لەکاتی گێژەڵوکەکە ٦٦ پلە بوو.

## ٢١ی نیسان

بە درێژایی ئەمڕۆ، هەورە بروسکە ئاسۆی گرتبووەوە، بروسکەش لە ئێمەوە دووربوو، ئەمەش ببووە هۆی پەژارەیەکی زۆر بۆمان. لە بەیانیشدا (با) لە خۆرهەڵات و باشووری خۆرهەڵاتەوە هەڵیکرد.

سەعات شەش و نیو دەستمان بەڕۆیشتن کردەوە و ڕشێنەی بارانێك لێی دەداین، کە بایەکی باشووری خۆرهەڵاتیی هێنابووی، تا ماوەیەکیش هەور هەر بەژوور سەرمانەوە بوو. هەندێ جاریش درێغی لێ نەدەکردین و ناو بەناو دەیباراند. لە سەفەری ئەمڕۆماندا دە، پانزە

لادێیمان لەگەڵدا بوون بۆ چاککردنەوەی پرد و ڕێ خۆشکردن لەبەردەم تەختەڕەوانەکەدا. ڕۆیشتنەکەشمان گران بوو. لە زۆربەی بەشەکانی ڕێگەکەدا بەناو ئاو و قوڕاودا تێپەڕ بووین، تا سەعات دەی پێش نیوەڕۆ گەیشتینە (چوبوق)، ئیتر لەوێ لە شوێن چادرگە کۆنەکەمان(٢٨) لاماندا و سەیریشمان کرد وشکە. تەختەڕەوانەکە نیو سەعات پێش ئێمە بەڕێکەوتبوو، بەڵام پێنج دەقیقە دوای ئێمە گەیشت.

لە مەترسییەکانی سەفەری وادا لەگەڵ کۆمەڵێکی زۆردا، ئەوەیە کە گوندنشینان هەموو ئەو زەخیرە باشانەی هەیانە، لە ترسی لێ زەوتکردنیان، دەیشارنەوە، بەتایبەتیش کە بزانن لەناو کۆمەڵەکەدا فەرمانبەرانی دەوڵەتی تێدایە.

لە ئێوارەدا هەور بەری ئاسمانی گرتەوە و لەدوای خۆرئاوابوونیش لە باکوور و سەرووی خۆرئاواوە، هەورە بروسکە دەستی پێکرد. لە پڕێکیشدا سروەیەکی توند لە باشووری خۆرهەڵاتەوە ئاوقەی بوو، ئیتر ئاسۆ ڕەش داگەڕا و لە باڵی قەلەڕەشکە دەچوو. هەورە بروسکەش لە هەموولایەکەوە دەستی پێکردەوە و پەیتا پەیتا، وای ڕووناك دەکردەوە، کە یادم نییە لەو جۆرەم دیبێ، بەڵام هەورە بروسکەکان هێشتا هەر لێمانەوە دووربوون، لای خۆرئاواشەوە ئاسۆ تاریك بوو، بێ ڕووناکاییش، لەو خەیاڵە دەچوو، کە (لۆرد - بایرۆن) لە خەونە ترسناکەکەیدا، سەبارەت بە کوژانەوەی تیشکی خۆر دیبووی. هەستمان بە سامناکیی شەوەزەنگەکە نەدەکرد، مەگەر لەو کاتانەدا نەبێ کە دەکەوتنە نێوان بروسکەکانەوە، لەو جێگە تاریکەدا، ڕووناکییەکەی بەبڵاویی لێمانەوە دەردەکەوت و ناو بەناو تیری ڕووناکیمان دەدی، بەر زەوی دەکەوتن، هەرچی جارێکیش تیشکی بروسکەکە، زەوییەکەی ڕووناك دەکردەوە، پاسەوانێکی هیندیمان دەبینی، خۆی بەسەر تفەنگەکەیدا داوە، یان چادرێك، کە کۆمەڵێك قەتارچی خۆیان تێخزاندووە، یان دەستەیەك ڕێبواری ماندوو، بەو بیابانە ترسناکەدا ڕێدەکەن. دیمەنەکە لەو دیمەنانە بوو، کە شاعیران یەکجار شانازیی پێوە دەکەن. بەڵام خستبووینیە بارێکی وا ناخۆشەوە، کە چاوەڕێ بکەین زریان و لافاوێك هەڵبکەن، چادرە تەنك و نیمچە دڕاوەکانمان بەرگەی نەگرن، تا لەدواییدا گێژەڵووکەکە کاتێ تەوژمی بای دژ بەیەك، لەهەموو لایەکەوە بەری کەوتن، دەرکەوت ڕووە و باشووری لای ئێمەوە تێپەڕی و لە تاوەبارانێکی توند نەبێ، کە سێ سەعاتی خایاند (لە سەعات نۆوە تا دوازدە) بارانی تری لێنەداین. پاش ئەو تاوە، بای توندی باشووری خۆرهەڵاتیی هەڵیکرد، بەڵام کێچ و مێشوولە

---

٢٨- میستەر ڕیچ لەوێدا ئاماژەی بۆ گەشتێکی تر دەکات، کە پێشتر بۆ باشووری کوردستان بۆ لێکۆڵینەوە لە کەلاوەکانی (قەسری شیرین) و (حوش کەڕوو) کردوویەتی، لە پاشکۆی بەرگی دووەمدا ئەو بیرەوەرییانە دەبینن.

و بیرەوەرییەکانم، لە چەرمەسەرییەکانی بەغدا، تا نزیکەی بەرەبەیان، خەومیان زڕاند، کە ئیتر ئاسایی لێی خەوتم.

### ٢٢ی نیسان

سەعات پێنج و نیوی ئەم بەیانییە، کە هەستام سەیری ئاسمانم کرد، بەرگێکی خۆڵەمێشیی تێری پۆشیوە و بەدڵنیاییەوە هەڕەشەی ڕۆژێکی باراناویی دەکات، لەبەرئەوە نیازی سەفەرکردنم لەسەر دەرکرد. لە نزیکەی سەعات شەش و نیویشدا باران، لە هەوایەکی سارددا دەستی پێکرد، کە ئیتر بەتەواویی نائومێدی کردین. پاشان لە ئێوارەدا، کردی بە ساماڵ و (با) لە باشووری خۆرهەڵاتەوە دەستی پێکرد.

پلەی گەرما، لە سەعات حەوتی پێش نیوەڕۆدا **٦٣** پلە بوو، لە سێی دوای نیوەڕۆدا **٦٧** پلە و لە دەی شەودا **٦٢** پلە بوو.

### ٢٣ی نیسان

شەوێکی ساماڵ و جوان و سروەیەکی سازگار لە باشووری خۆرهەڵاتەوە هەڵیکردبوو. بەرەبەیانیش بای باکووری خۆرئاوا هەڵیکرد، بەڵام هەر ئەوەندەی هەڵیکرد، بای توندتری باشووری خۆرهەڵات، بەسەریدا زاڵبوو.

لە سەعات شەش و چارەکدا سواری ئەسپەکانمان بووینەوە. لە نزیك (چوبوق)، زوورگە کەلاوەمان بینی، بەڵام ئەوەندە دەرفەتمان نەبوو بتوانین لێی لابدەین و لێی وردبینەوە. بۆ خۆپاراستنیش لەو چاڵاوانەی باراناوی دوێنێ دروستی کردبوون، ناچاربووین ڕێڕەوی ڕێگاکەمان بگۆڕین و ڕووەو (دیالە) ڕێ بکەین. هەر لە گوندی (چوبوق) دەرچووین، کە دەکەوتە شوێنێکی نیمچە نزمەوە، ئیتر زنجیرە چیاکانی (زاگرۆس)، کە تا (تاوق) درێژ دەبوونەوە، دوا مەودای سەیرکردنمان بوو.

لە نۆدا گەیشتینە (دەلی عەباس)، سەیرمانکرد خانووەکە (خان - POST HOUSE) بە تەواوی ڕووخاوە و چۆڵکراوە. ئیتر چادرەکانمان لەنێوان خانووەکە و جۆگەی (خالس)دا هەڵدان، کە پردێکی دوو کەوانەیی هەردوو رۆخەکانی پێك دەگەیاندن و کەوانەی زیادەش لە هەردوو سەریەوە بۆ لافاو هەڵسانی لە ناکاو هەبوون. سەمتی رۆیشتنەکەشمان بەگشتی رووە و باکوور بوو، بەڵام تەختەڕەوان و کەلوپەلەکان، لە سەعات شەش و نیودا کەوتبوونە رێ و لە (١٠)دا پێمان

گەیشتنەوە. گوندنشینەکان ئاگاداریان کردین کە لای ئەوان ماوەی هەشت ڕۆژ، لەسەر یەك، باران بێ پشوو، باریوە و بەتەواوی ئاو سەر زەوی کەوتۆتەوە. لە شەوی سێ شەممەدا سێ بروسکە، یان سێ ئەستێرەی زۆر خێرا، لە خۆرهەڵاتەوە رووە و لای زوورگەکانی حەمرین کەوتوونەتە خوارێ. لە ڕاستیشدا بروسکە زۆر زۆر بوون و ئەوەتەی ئاووهەوا تێکچووە، پێشتر ئاوا بروسکەی بێ بڕانەوە و گەشم نەدیبوو. هێشتا نەگەیشتبووینە چادرگەکەمان، کە بایەکی توند لە باشوورەوە هەڵیکرد و پاشان لە خۆرنشیندا بۆ خۆرئاوای باشووری گۆڕی.

بە درێژایی شەویش بروسکە لە باکووری خۆرئاواوە، بۆ باشووری خۆرئاوا، بەبێ هەورەگرمە، هەر لەتوندیدا بوو، بەڵام شەو هێمن و هەوریش تەنك بوو.

گەرما، لە سەعات شەشی بەیانیدا ٦٠ پـلە و لە سێی دوای نیوەڕۆدا ٧٤ پلە و لە دەی شەویشدا ٦٤ بوو.

## ٢٤ی نیسان

نەمانتوانی راستەوخۆ لەو دەربەندە بدەین، کە لە زوورگەکانی حەمریندا هەبوو، چونکە هەموو رێگەکانی نێوان زوورگەکان و دەلی عەباس لە ئاودا نقوم ببوون. زۆنگاوی (ئەلبو فەرەج)یش لای چەپمانەوە تا (دەلتاوە) پڕاوپڕی ئاوە. لەبەرئەوە ڕوومان کردە ئەو دەربەندەی کە لە سەفەری پێشوومان‌دا پیایدا ڕۆیشتبووین...

لە پێنج و نیودا سواربووین و رووەو دەربەند، لەو چاڵاوگەل و قوڕاوە زۆرەماندا و لە شەش و نیودا گەیشتینێ، ئەم دەربەندەش لەم کێوەدا، کە پێشتر باسمان کردبوو، باپیری (فەیزوڵڵا ئاغا- هاوڕێییەکمە لە بەغدا)، لە سەردەمی (عومەر پاشا)دا لێی دابوو، ناویشی (ساقال تۆقان)ە، کە مانای (ڕیشگرە)یە. ڕێگەکەمان بۆ (بارادان) بڕی. لێرەدا بەلای ڕاستدا جیا دەبێتەوە، کە دەمانگەیەنێتە ئەو گوندەی بۆی دەچین. بەڵام وەك زانیمان بەهۆی بارانی زۆری ئەم دواییەوە زۆر ستەمە لە (نارین) بدرێ.

لە هەشت و چارەکدا شاخەکانمان بڕی و لای چەپمانەوە جێمان هێشتن. لە دە و بیست دەقیقەدا گەیشتینە پردی (نارین)، سەیرمانکرد ئاوی ئەم ڕووبارە نزیکەی (١٠) پێ هەڵساوە، بەڵام دووبارە زۆر زیاد نیشتۆتەوە. لێرەدا قاوەیەکمان خواردەوە و لە یازدەدا نەك ڕاستەوخۆ بەرێگەکەدا، بەڵکو بۆ خۆپاراستن لەو قوڕاوە قووڵەی خاکەکەی (نەتروینە - نایترۆس ئازوتی)، بەگوێ رووبارەکەدا دەستمان بەڕۆیشتن کرد.

لە دوازدە و چل دەقیقەدا گەیشتینە(قەرەتەپە)، بەڵام تەختەڕەوانەکە لە شەشدا بەڕێکەوتبوو، لە دوو و نیودا پێمان گەیشتەوە، دواکەوتنیشی هی ئەوەبوو لەجیاتی ئەوەی وەك ئێمە بکات و خۆی لێ نەدات. ڕاستەوخۆ بەو قوڕاوەی (نارین)دا هاتبوو.

لە ئاقاری باشووری گوندەکە و لە نزیك چادرگەکەمان، بەرزاییەکی هەیە، گۆڕستانێکی بەرزتری بەسەرەوەیە و خەڵکەکە پێی دەڵێن (نماز قیلانتەپە)، یان: گردی نوێژگە. کە نوێژگەی هەردوو جەژنەکەیە.

سەرکەوتمە سەر گردەکە بۆ ئەوەی بە قیبلەنما، هەندێ سەمت دەستنیشان بکەم. خێرا بۆم دەرکەوت گردەکە توورەکە ڕێژە. ئەمەش وای لە (ئاغا سەیید)(٢٩) کرد، تا دەست بە پشکنینی بکات. هەر کە دەستیشی بە پشکنین کرد، کووپەڵەیەکی دۆزییەوە، هەندێ ئێسکی تێدابوو. لەوە دەچوو کە لە (بابل) و (سلوقیە - SELEUCIA) دۆزرابوونەوە. ئیتر بەدەم بەردەوام بوونمانەوە لە پشکنین، چەند دانەیەکی تریشمان دییەوە، بەڵام رزیبوون و لە خاك دەرنەدەهاتن، مەگەر بە ڕزیویی.

لە ناوچەکەشدا پارچەی کووپەی، پەرتوبڵاو هەبوون و ڕووی گشتی تەپۆلکەکەیان داپۆشیبوو. لەبەرئەمە من پێم وایە دەبی ئەم گردە (دەخمە - DAKHMA)، یان مەزارێك بووبێ، کە فارسەکان، مردووی ئاگرپەرستیان لێ دانابێ، تاوای لێهاتبێ بووبێتە گۆڕستان و نوێژگەی موسڵمانان. خەڵکەکەش ئاگاداریان کردین کە هەر لەم گردەدا، جارجارە هەندێ زێڕ و زیوی بچووك دەدۆزنەوە. بەڵام نموونەیان لێی پێ نەبوو. ئەم گردە دەکەوێتە دامێنی ئەوسەری گوندەکە و بەرزترین جێگایشی لەنێوان (١٥تا ٢٠) پێ لەسەرووی زەوییەوە دەبوو.

پـلەی گەرما، لە شەشی بەیانیدا ٦٠ پـلە و، لە سێی دوای نیوەڕۆدا ٧٤ پلە و لە دەی شەویشدا ٦٤ پـلە بوو.

## ٢٥ی نیسان

لە پێنج و نیودا بەسەر زوورگێکی چەوەڵەدا دەستمان بەڕۆیشتن کردەوە، کە (قەرەتەپە) دەکەوتە لێژایی لای خۆرئاوایەوە، لێژاییەکەش هەر باسکێکی زوورگەکە خۆی بوو، کە زۆر ئاسایی شۆڕدەبووەوە و لە دۆڵێکی بچووکدا کۆتایی دەهات. لەم باسکەشەوە بە دابەزینێکی درێژ، دەچووە سەر پردەکەی (چیمەن)، کە لە سەعات حەوت و چارەکدا گەیشتینێ. پاش

---

٢٩ - سکرتێرە ئێرانییەکەی میستەر ڕیچ -ە.

ئەوەی لە چەمێکی تەنکماندا و سەرکەوتینە سەر جێگەیەکی کەمێك بەرز، لە نۆ و دە دەقیقەدا بۆ قاوە خواردنەوە دابەزین. لە دە و بیست دەقیقەدا دەستمان بە ڕۆیشتن کردەوە و لە یازدەدا گەیشتینە (کفری).

لە (کفری) ئەفسەری سەرۆك گوندەکەمان نەدی، چونکە لەگەڵ یازدە سوارەدا تا لای چەمەکە بۆ پێشوازیی ئێمە چووبوون، بەڵام لە پێچ و توونکە توونکەی زوورگەکاندا، لە یەکتر گوم ببووین. تەختەڕەوانەکەش لە شەشدا بەڕێ کەوتبوون و لە دوازدەدا بە ئێمە گەیشتەن. بڕینی (کۆرەدەرە)، یان دۆڵەکەیشی، سەخت و ناخۆش بوو. زۆرم پێ سەیر بوو کە لە کفری هەندێ جوولەکە و کەنیشتەکەیانم بینی. خەڵکەکە لێرە، سەلکی ڕووەکێك دەخۆن، بەزۆری لای خۆیان کۆی دەکەنەوە، قەوارەیشی ئەوەندەی سەلکی Shallot دەبێ پێی دەڵێن (چەزەدوم Chezedum)، پاش ئەوەی کەمێك دەیبرژێنن. ئەوسا دەیخۆن، تامی کەستانە دەدات(٣٠).

پلەی گەرما لە سێی دوای نیوەڕۆدا ٨٢ پلە و لە دەی شەودا ٦٤ پلە بوو.

## ٢٦ی نیسان

دوێنێ بەدەم ڕۆیشتنمەوە ڕووەو ئەو خەرەندەی دەکەوێتە پشت کفرییەوە، بەرێکەوت هەواڵی چەند کەلاوەیەکم بیست، پێی دەڵێن (قەرە ئۆغلان). ئیتر بەپەلە بۆ دیتنی رووم تێی کرد. بۆ بەیانیش بۆی چووینەوە و کۆمەڵێك گوندنشینمان بەپاچ و خاکەنازەوە لەگەڵ خۆماندا هێنابوو. نزیکەی چوار سەعاتێك زەویمان لە دەوروبەرمان، کۆڵی و پشکنی، کە ئەمە پوختەی باسێکی ئەو کەلاوانەیە:

نیو میل لە دامێنی خۆرهەڵاتی کفریەوەیە و لە شوێن ئاوەڕۆیەکدا، شوێنەواری چەند دیوارێك، یان بنچینەی چەند دیوارێك هەیە، بارانی ئەم دواییە دەری خستووە. لە دیوارێکدا پارچەیەك خافقی (مەڕمەڕی خۆشکراوی رەنگین) نەخشینم دییەوە، زۆرم مەبەست بوو زیاتر لەم کەلاوانە هەڵبکەنم تا ڕاستیی ئاسەوارەکە و مێژووەکەی بزانم. لە ئەنجامی هەڵکۆڵینەدا ژوورێکی بچووك، یان شوێنەوارەکەیان بینی، کە دیوارەکانی نزیکەی چوار پێ بەرز دەبوون. لەگەڵ دەرگای هاتنەژوورەوەدا. ژوورەکە بچووك بوو، پانتاییەکەی هەر دوازدە پێ چوارگۆشە

٣٠- ئێستا لەم ناوچانەدا پێی دەوترێ (جەدەنە)–ع.

دەبوو. دیوارەکان لە بەردی قسڵی سادە و بێ نەخش (وەك ئەوانەی قەسری شیرین) بوون و بەقسڵێش سواخ درابوون، سواخەکە نەخشی چڕی لەسەر کرابوو. چەند پارچە قسڵێکمان دەرهێنا، نەخشی گوڵ، یان گوڵی نەخشی شێوە(عەرەبی)یان لەسەر بوو. نەخشەکان رەنگیان ئاڵێکی زەق بوون، بەڵام خەتەکانی تەختەکەی رەش بوون، رووەکەیشی هەر لە ڕەنگی قسڵەکە بوو، ئەم ڕەنگانەش هەموویان دەتوت تازەن. لەبەرئەوەش کە تەنیشتەکانیان نەخشیان پێوەنەبوو، پێم وابێ پارچەی بنمیچەکەی بووبن. دیسان هەندێ پارچە خەڵووزی ڕووەکیمان دۆزییەوە... ئەم ژوورە و بەشێك لە ژوورێکی تریشمان پشکنی، لەوەدەچوو ئەمانە ڕیزە ژوورێك بووبن. کەمێك بۆلای خۆرئاوای باشووری خۆرئاوا و خۆرهەڵاتی باکووری خۆرهەڵاتەوە درێژبووبێتەوە. هەرواش بوو، چونکە شوێنەواری پێنج شەشێکیان بەڕیزی یەکەوە دەرکەوتن، کە لای سەرەوەی بە دیرەگێکی کورت و خڕ ڕاگیرابوون.

لای خۆرهەڵاتیشەوە، لەژێر ئەو زوورگانەدا، کە لە رۆخی چەمەکە بوون (دیوی لای خۆرئاوایان هەڵوەریبوو) گردێکی بەرز و یەکجار تەخت و شێوەی چوارگۆشەیی هەبوو، کرێکارەکان چەند سواڵەتێکیان تیایدا دیبوو، هەندێکیان بۆ هێنام، کە چینی ئەستوور بوون و دیوی ناوەوەیان کوتومت لەو رەنگە رەشە دەچوو، کە لە (سلوقیە و بابل) دۆزرابوونەوە. چرایەکی خەزەفیش لای من هەیە، هەر لەو چرایانە دەچێ، کە ئێستا گوندنشینەکان دەم و دەست دەیان توێننەوە. بەداخەوەم کە نەمانتوانیوە پارچەیەکیان ببینم. خۆ ئەگەر پارچەیەکیانم بدیبایە، شتێکی باشترم لا گەڵاڵە دەبوو، تا سەردەمی ئەو کەلاوانە دیاری بکەم. ئەو کووپە و شەربە و فەخفورییە داڕێژراوانە، وام لێ دەکەن کە بیانگێڕمەوە بۆ سەردەمی ساسانی.

لەسەر ئەم گردە ئاسەواری خانووبەرەش هەیە، لەسەر تەپۆلکەکەشییەوە بەلاشانەکانیدا، تا دامێنەکەی و پاشان تا بەرامبەری (کفری)ش، شوێنەواری خانووبەرە هەیە، کە زۆربەیان وەك ئەوانەی قەسری شیرین و - حۆش کەڕوو و ژێرخان Basement)ی چوارگۆشەیان هەیە، هەرچەندە زۆریش لە زەوییەوە بەرز نین. پانتایی ئەم کەلاوانە نزیکەی میلێك درێژ و چارەکە میلێك پان دەبن. لەم جێیە دەستمان بە هەڵکۆڵین کرد بەڵام هیچیمان نەدۆزییەوە، لای خۆرئاوای چەمەکەشەوە شوێنەواری دیوار هەیە. دیسان ئەگەر ڕووەو کفری، چەمەکە بڕین، پاشماوەی خانووبەرەی سەخت و گەورە دەبینینەوە، کە ئاوی چەمەکە دایڕوخاندووە. گوندنشینەکان پێیان وایە ئەمە پاشماوەی بەستێکە، لەسەر چەمەکە دروستکراوە، بەڵام من

خۆم پێم وایە ئاسەواری وارشی شارێك بووبێ، هەرچەندە شێوەکارەکەی لە هی کەلاوەکانی بەشەکانی  تری باشترە و لە بەردی سادە و بە قسڵ، ناو کارەکەیان دروستکردووە. ئەو شوێنەوارانەش کە لە ناوەڕاستی چەمەکەدان، بە ئاشکرا بۆمان دەردەخەن کاتێ شارەکە هەبووە، ڕێڕەوی ئەوسای ئاوەکە وەك ئێستای نەبووە. لەوە دەچێ پێشتر ئاوی لافاویان بۆ کشتوکاڵ بەکارهێنابێ.

خەڵکەکە ئەو ئاسەوارانە بە شوێنەواریی (گاور)، یان کافر دەزانن، لە ڕاستیدا زانیاری ناتەواوی ئێمەش لەبارەی ئیمپراتۆرییەتی ساسانیەوە، ڕێ نادات شتێك لەبارەی ئەم جێگایەوە بڵێین. من گومانم لەوە هەیە کە ئەمانە هیچ پێوەندییەکیان بە شەڕەکانی ڕۆمانی و ئەو ئیمپراتۆرییەتەوە هەبێ، ئەو پێوەندییەی کە تەنیا لە ڕێگەی ئەوەوە دەتوانین شتێك لەبارەی کاروباری ئەم جێگایەوە بڵێین.

لای ژووررووی باکووری خۆرئاوای سەروو چەمەکەشەوە، شوێنەواری پشکنین لە بەردێکدا هەیە، پێی دەڵێن (ماڵی کافر)، بۆیە میستەر (بەل لی نۆ) بۆ دیتنی ئەو ئاسەوارانە چوو، کە دە دەقیقە بەسوارییی لەوسەری باشووری کەلاوەکانەوە دوور دەبوو، هەندێ ژووری دیبوونەوە، کە سەریان لابراوە و دەرگای زۆر نزمیشیان هەبووە، لە هەریەکەشیاندا شوێنی  سێ گۆڕی دیبوو، کە پێوانەی بچووك و درێژییشیان نزیکەی پێنج پێیەك بووە. بنچینەکانی ئەم هەڵکۆڵراوانە، لە بنچینەی گۆڕستانەکانی (ئەخمینی Achaemenian) دەچێ لە (نەخشەکەی ڕۆستەم). بەڵام شوێنەواری هیچ نووسین و نەخشێکیان لەسەر نەبوو، سێ میلێکیش لەولای کەلاوەکان و لەسەر گردێك، ئاسەواری خانوویەك هەیە، خەڵکەکە پێی دەڵێن (قیزقەلعەسی)، یان قەڵای کچ، هەندێ دەفر و ئێسکی تیدا دۆزرابووەوە. میستەر (بەل لی نۆ) خۆی چینییەکانی دیبوو. ئەم شوێنە دەکەوێتە بەرامبەر  (ئون ئیکی ئیمام - دوازدە ئیمام)، شتێکی تری وای تێدا نییە شایستەی باس بێت.

کە گەڕاینەوە شوێنی خۆمان، نێردراوێکی (مەحموود پاشا)٣١  چاوەنواڕی دەکردین. دوێنێ ئێوارەش هەرلای ئەوەوە، کەسێکی تر هاتبوو، بزانێ ئاخۆ گەیشتووین و چ ڕێگایەك لەبەردەگرین! ئەم بەیانییە هەردووکیان ڕووەو سلێمانی گەڕانەوە، کە لەوێوە (پاشا)، لە (قەرەحەسەن) میواننەوازێك بۆ پێشوازیمان دەنێرێت. قەرەحەسەنیش کە بە ئاسانی تەختەڕەوانەکەی پیدا دەڕوات، ئەو ڕێیەیە کە بڕیارمان لەسەری دابوو لەبەری بگرین.

---

٣١- پاشای سلێمانی.(میری بابان)

له كفری هەندێ دارخورما هەن، بەپێچەوانەی ئەوانەی (توزخورماتو)وە، خورماكانیان ناگات. ئەو ماوەیەی كە لە كفری ماینەوە، سێلاو لاشانی زۆری خەرەندەكانی دارماندبوو.
پلەی گەرما، لە سێی دوای نیوەڕۆدا ٨٢ پلە بوو، (با)ش لە باكووری خۆرئاواوە بوو.

## ٢٧ی نیسان

بەیانی بۆ دیتنی كەلاوەكانی (ئەسكی كفری)، سواری ئەسپەكانمان بووین، كە كەوتبوونە باشووری خۆرئاوای كفری و دوو سەعاتێك لە دەشتەكەوە دووردەبوو. لە ڕاستیدا من هەمیشە پێم وابوو كەلاوەكانی(ئەسكی كفری) ئەو شوێنە بووە، كە كاتی خۆی شاری (كفری) لێ دروستكراوە. بەڵام ئێستا دەبینم كفری هەر لەم جێگایەی ئێستایدا بووە، ئەم كەلاوانەش هی سەردەمی گاورن. بەدەم ڕۆیشتنیشمانەوە بەرەو لای ئەم كەلاوانە، ئاشێكی زۆرمان لەو باخانەی كفری دا بەرچاو كەوتن، دەتوت قەڵای بچووك بچووكن،، كە جۆگەی هەڵبەستراو دەیگێڕان.
لە نزیك ئاسكی كفری، گردێكی توورەكەڕێژی گەورە هەیە، لەوەی (مجیلیبە)(٣٢)دەچێ، كە شانی وەك شاقوولی وایە، تەنیا ئەوەندە نەبێ كە باراناو، كەندڕ و داڕووخانی تیدا دروستكردووە. لەم دواییەدا لە یەكێك لەو كەندڕانەدا تاقێكم دییەوە، لە خشتی گەورەی سوورەكراو دروستكرابوو، كاسەی داڕێژراوی زۆریان تیدا دۆزیبووەوە، كە لە هەندێكیاندا دراوی زێڕی تێدابووە. نەمتوانی یەكێكیانم چنگ بكەوێ. تاقەكە ئەوەندە خۆڵ و كەرسەكی گردەكەی تێكەوتبوو، پڕ ببووەوە. درێژایی ئەم گردە لەسەرەوە بۆ خوارەوە، نۆسەد و شەست پێ دەبوو، پانایيشی لە خۆرهەڵاتەوە بۆ خۆرئاوا زۆر لەوە كەمتر بوو، بەرزاییشی پەنجاوحەوت پێ بوو. ئەگەرچی ئەم پێوانانە تەواویش نین، بەڵام لەڕاستییەوە نزیكن، چونكە دارتاشەكە پێوای و (ئاغا سەیید)یش یارمەتی دا. من خۆم لەكاتی پێوانە كردنەكەدا چووبوومە ژێر سێبەری كەندەڵانێكەوە، كە باراناو دڕیبووی.
لای باشووری خۆرهەڵاتەوە (با) هەبوو، هەواش زۆر گەرم بوو. كەمێك حەسامەوە و ماندووبوونم بیرچووەوە و هاتمەوە سەرخۆم. لەڕاستیشدا ئەم كەندڕانە باشترین جێگان بۆ

---

٣٢- یەكێكە لە كەلاوەكانی (بابل). بڕوانە لاپەڕە ٢٨ی (یادداشت لە كەلاوەكانی بابل)ەوە، بە پێنووسی (كلۆدیوس جەیمس ڕیچ).

پشکنینی شوێنەواری دێرینە، چونکە خەرەندی تازەبوون و باراناوی ئەم دواییە دروستی کردبوون، لەبەرئەوە هەڵمان کۆڵین و ئێسکێکی زۆر و وردی مرۆڤـ و پارچە فەخفوریمان تێدا دۆزینەوە، کە هەموویان لەناوەوە بەڕەنگی ڕەنگ کرابوون. کە فەخفورییەکانیان جیاوازتر بوون لەوانەی پێشتر باسمان کردن. هەندێکیان زێڕ و هەندێکیشیان جۆرێکی ورد و جوان بوون، کە وێنەی ئاسك و مانگایان تێدا دروستکرابوو، هەرچییەکیشمان دیبوونەوە، لەگەڵ خۆمان هەڵمان گرتن. ئەوپەڕی تواناشمان خستەکار بۆ ئەوەی بتوانین کاسەیەك بەساغی دەربهێنین، بەڵام نەمانتوانی. بەلای زۆریشەوە ئەوانەی کە بەساغی دەدۆزرێنەوە، بەتایبەتی ئەوانەن کە باراناوی زۆر گڵەکانیان لەسەر لادەبات. فەرمانم بە کۆمەڵەکەمان کرد تا لە هەموو لایەکەوە لە هەڵکەندندا بەردەوام بن، بەڵام ماندووبوونەکەیان بەهەدەر چوو، تەنیا ئەوەندە نەبێ هەندێ پارچە مەعدەنی ژەنگاویی و چەند پارچە مس و شووشە و مووروویەکی بەللووری بچووکیان دییەوە. بەڵام ڕێوشوێنم دانا بۆ ئەوەی فەخفورییەکی ساغم چنگ بکەوێ.

تا زیاتریش ئەم خەرەندە کەندڕەمان هەڵکەندبایە، گڵێکی رەشی زۆر بۆگەن و لەتە کووپەڵە و پارچە ئێسکی وردمان دەدینەوە. لە ناوەڕاستی گردەکەشدا گۆڕستانێکی بچووکی عەرەبییانە هەیە. بەمجۆرە دەبینین دەستکاری موسڵمان، تێکەڵ دەستکاری ئاگرپەرستانی فارسی دەبێ. لە ڕووی هەڵکەوت و سروشت و شێوەی ئەو پارچانەی لە بەشی سەرەوەی دیماننەوە، ببێ و نەبێ ئەم گردە، هەر ساسانی بووە و تایبەت بووە بەشوێنی مردوو لێدانان و گومانیشم لەوەدا نییە.

رووەو باکوور و بۆلای خۆرئاوای ئەم گردەوە، کەرسەکی کەلاوەی بچووك هەیە، وا دەردەکەوێ کاتی خۆی ئەم جێگایە زۆرفراوان بووبێ. لە خۆرئاواشەوە گردۆڵکەیەکی لەوانیتر گەورەتر هەیە، پێی دەڵێن (ئاش تۆقان). لە گەڕانەوەشماندا، کە بۆ سوار، چارەکە سەعاتێك دەبوو، گەیشتینە لای هەندێ پاشماوەی وارشێکی بچووك، کە ڕەنگە هەر وارشی شارەکە بووبێ، هەرچەندە گوندنشینەکان پێیان وایە پاشماوەی بەشێك بێت لەسەر چەمی کفری و بۆ پارێزگاریی لە لافاو دروستکرابێ. هەر تەنیا بەشێکی مابێ، کە بەرزاییەکەی چەند پێیەك و درێژیشی سێ سەد پێ دەبێ، کە بە خڕە بەردی وردە، چاڵ لە دیوی دەرەوە دروستکراوە. زەوییەکەیشی لەدیوی ناوەوەی دیوارەکە و بەڕووی کەلاوەکاندا، بەرزترە وەك لەوەی سەرووتری، یان لەڕووی دەرەوە، کە وەك سەکۆ، یان عەمارتەیەك وایە و بەم دیوارە ڕاگیرابێ. گومانی تیادانییە کە دیوارەکەی خۆی، مێژووەکەی بۆ سەردەمی ئاسەوارەکانی (قەسری

شیرین و حۆش کەڕوو) دەگەڕێتەوە. کەمێك دوورتریش رووەو باکوور و بەسەمتی کفری دا، بۆ پشتەوەی دیوارەکە، شوێنەواری کەلاوە نابینین. لە سەعات دە و چارەکدا (ئاسکی کفری)مان جێهێشت و لە یازدە و پەنجا دەقیقەدا گەیشتینە کفری.

فەرمانم دەرکردبوو بۆ ئەوەی هەر پارچە سکە و شتێکی تر، کە گوندنشینەکان دەیدۆزنەوە، بۆمی بهێنن. ئەمڕۆ (روبێن) سێ پارچە سکە و پارچەیەك بەردی هەڵکۆڵراوی بۆ هێنام، کە لای هاورێ جوولەکەکانی دەستی کەوتبوون، بەڵام لەوە دوورتربوون بۆ ئەوە دەست بدەن تیشکێك بخەنە سەر مێژووی کەلاوەکانی دەوروپشت. لەوە دەچوو بەتایبەتی بۆ ئەوە دروستکرابن مرۆڤ سەرسام بکەن و زیاتر سەری لێ بشێوێ. سکەیەکیان (ئەرساســــــی Ar Sacian) و دووەمیان ساسانی و سێیەمیشیان کوفی بوون، بەڵام بەردە هەڵکۆڵراوەکە خەڵاتێك بوو، سەرکەوتنێکی ڕومانیایی دەنواند. بەمجۆرە لە دواییدا توانیم پارچە ئاسەوارێکی جوانی ساسانیم چنگ بکەوێ، کە هەندێ نووسینی لەسەربوو. لە جێگەیەکی تریش کەناوی (ئون ئیکی ئیمام - دوازدە ئیمام)ە و نزیکەی چواردە کیلۆمەترێك لە کفریەوە دوور دەبێ، گردێکی تر، لەو چەندان گردەی لەم ناوەدا هەن، لەوە دەچێ سەردەمی کەلاوەکانی ساسانی بێت و لەم ناوەدا پەرشوبڵاو بوونەتەوە، بەرامبەر (ئون ئیکی ئیمام)ە، لە زنجیرە زوورگە گەچڕەکان. چاوگەی نەوت دەبینین. ساڵێکیش بەر لە ئێستا، چاوگەیەکی بچووك، لەو زوورگانەدا، لە دووری چەند دەقیقەیەکدا لە خۆرئاوای کفریەوە دۆزرایەوە. بەڵام ئەو گوندنشینەی دۆزیبوویەوە، حکوومەتی تورکی گرتبووی و دارکارییەکی زۆری کردبوو، لەسەر ئەوەی ئاخۆ پێش ئاشکراکردنەکەی، نەوتی لەو چاووگە دۆزراوەیە فرۆشتووە؟ لەتاو ئەو ئازارەش کە لە ئەنجامی ئەم دۆزینەوە شوومەدا تووشی هاتبوو، ناچار ببوو بەماڵ و منداڵەوە بۆ ئێران بچێت و لەوێ وەکو خۆی دەڵێ ئاسوودە لێی دانیشتووە. ڕێکەوتیش وا بوو ئەوکاتەی ئەو لە کفری بوو، منیش هەر لەوێ بووم، بۆ هەندێ کار هاتبوو، خۆی بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕامەوە و وتی: (خوا، ئەو نەوتە بەو تورکانە ڕەوا نەبینێ، بەو زوڵمەیانەوە، چونکە کاتێ من ئەو نەوتەم دییەوە، تافەتافی بوو، بەڵام کەلێیان دام، وشکی کرد، ئێستاش لە چۆرە چۆرێك زیاتر، شتێکی وای تیدا نییە).

پلەی گەرما، لە سێی دوای نیوەڕۆدا ٨١ پلەبوو، لە دەی شەودا ٦٦ بوو، تاوتاوەش بایەکی کەمی هەبوو، شەویش لە خۆرئاواوە بارانێکی کەم باری و لای خۆرهەڵاتیشەوە بروسکە هەبوو.

## ٢٨ی نیسان

بەیانی سەعات پێنج و چل و پێنج دەقیقە سواری ئەسپەکانمان بووینەوە. ئەفسەرەکەش لەگەڵمان هات و پێی لەسەر ئەوە داگرت، تا ماوەیەکی ڕێگاکە یاوەریم بکات. ڕێگاکەمان بەسەر زنجیرە زوورگێکی چەوەلانییەوە بوو، کە لە زوورگەکانی (کفری) جیا دەبووەوە و بەو زوورگانەوە دەلکایەوە، کە پێش چەند ڕۆژێ لێمان دابوون. ڕێگاکەمان هەر تەنیا ئەو چەمەی کفری دەهاتە بەر، کە ڕێگایەکی لەو دۆڵەی (چیمەن)دا بۆخۆی دروستکردووە، کە بەرەو (ئەسکی کفری)(٣٣) لێمان دا. لە حەوتدا زوورگەکانمان بڕی و کەوتینە ئەو دەشتەی (بەیات)ەوە، کە لەسەرخۆ لە زوورگەکانی کفریەوە بەرەو (چیمەن) لێژ دەبۆوە. لەم ناوەدا دەشتێکی پڕ کشتوکاڵ بوو. لە حەوت و چارەکدا لە شیوێکمان دا، جۆگەیەکی بچووکی باراناوی تێدەڕژا. لە هەشت و بیست دەقیقەدا گەیشتینە (قوروجای)، کە چەمێکی پان بوو، ئاوی باراناوی کەم تیادابوو، بەڵام وەك سەرنجمان دا دیاربوو پێش چەند ڕۆژێ سێلاوێکی زۆری سەرکەوتبوو، تەنانەت دەشتەکەیشی گرتبووەوە. ئێرە هەوارگەی بەیاتە تورکمانەکان بوو، بۆیە سەرۆك خێڵەکەیان (حەسەن)، یان وەك هەندێ جار دەوترێ: قەرەقوش بەگ، بەپیرمانەوە هات و بۆ نانخواردن لەگەڵیدا بانگهێشتنی کردم. پیاوێکی رووگەش و بەسەروسیما و ریشێکی سپیی جوانی پێوەبوو، زۆر زیرەك و زمان پاراو و رەوشت چاك بوو. لەوە دەچوو هەموو ژیانی هەڵکەوتەی ناو دەربارێکی رۆژهەڵاتییانە بوو بێ. ئاگاداری کردم کە بەیاتەکان ئەم ناوچەیەیان لای سوڵتانەوە وەك خەڵات پێدراوە و لە بەرامبەریدا پارەیەك بە حکوومەتی عوسمانی نادات. بەڵام ئێستا لە بەرامبەر ئەمەدا، دەبێ سەربازیی بۆ پاشای بەغدا بکەن، لەو کاتانەیدا کە خودی پاشا لەکاتی لەشکرکێشی و چالاکییەکدا خۆی لە مەیداندا دەبێ. دیسان ئاگاداری کردم کاتێ کە (نادر شا) ناوچەکەی داگیرکرد، بەیاتەکانی بۆ ئامێزی بەیاتی گەورە لە (خوراسان) گێڕایەوە و ئەوەیشی لێرە ماون، سەر بەبنەماڵەی سەرۆکن. وتیشی سەرەڕای ئەمانەش، ئەگەر پێویست بکات دەتوانن هەزار سوار خڕ بکەنەوە. هەندێ عەرەب و خێڵاتی تری راونراویش لەبن دەستی

---

٣٣- هەر بە هەمان جۆر، زوورگی بەردەڵانی لە ژوور (قەرەتەپە) لە شاخی (حەمرین) و زوورگی (زەنگەباد) جیا دەبنەوە.

بەیاتدان. ئەسپەکانیشیان چاکن. سەرۆك خێڵەکەیان ئاگادارییەکی تەواوی لەبارەی خێڵی گەورەیانەوە لە خۆراسان هەبوو. بەڵام نەیتوانی پێم بڵێ هۆزەکانی خێڵەکە، بۆ یەکەمجار، کەی بۆ ئەم ناوە هاتوون. لەڕاستیدا هەر عەرەب باشترین مێژوونووس و باشترین گێڕەرەوەی شەجەرەن لە ناوچەکەدا.

مۆڵەتم لە بەگ خواست و پێخۆشحاڵی خۆم بۆ دیتن و ئاخاوتنی نیشان دا و لە سەعات نۆدا سواری ئەسپەکانمان بووینەوە. بەلای کشتوکاڵێکی زۆردا تێپەڕین کە زۆربەیان جۆ بوون، هەندێکیان گەیشتبوون و جووتیاران سەرگەرمی درەوی بوون. جووتیارەکان هەندێ گوڵەجۆیان بۆ هێنام و لەبەر پێی ئەسپەکەمدا فڕییان دا و هاواریان دەکرد (دوژمنانتان ئاوا بمرن...) کە بەرامبەر بەمە، چاوەڕێی هەندێ پارەیان دەکرد. لە خۆرهەڵاتیشدا باوە هەموو ڕووداوێك دەقۆزنەوە بۆ ئەوەی بیکەنە بۆنەی خەڵات و شاباش.

لە سەعات نۆ و نیودا گەیشتینە (قیزیل خراپە - کەلاوە سوور)، کە لەسەر ڕێگاکەدا بوو. گرد و تەپۆڵکەش لەو ناوەدا ڕووەو حەمرین دیاربوون، کەلای چەپمانەوە بوو، پەرشوبڵاو هەبوون و گردێکی زۆر بەرزی وەك ئەوەی (ئەسکی کفری)مان بینی، کە پێیان وتین گاورکردە. ڕێیشی تێدەچێت ساسانی بێت. بەڵام من ئەمە هەر بە قسە نالێم، بەڵکو وەك ئەوەی (ئەسکی کفری)، بەدڵنیاییەوە دەیڵێم.

پاش گەڕانێکی کەم، بەلای کەلاوەیەکی تردا تێپەڕ بووین، وا دیار بوو سەر بەو شارە بوو، کە (قیزل خراپە) بەشێکی لێ پێك دەهێنا. لە دە و چل و پێنج دەقیقەدا بەلای گوندێکی گەورەدا تێپەڕ بووین، هی بەیاتەکان بوو، کە ئێستا چۆڵیان کردبوو، چونکە ئەوان لەم وەرزانەدا لەتاو کێچ و بۆ چاوەدێری خەلە و خەرمانیان، لە دەشتدا هەوار هەڵدەدەن. هەوارێکی زۆریشیانمان بینی لە هەموو لایەکدا هەڵیان دابوو.

لە یازدە و دە دەقیقەدا بە گوندێکی تری گەورەدا تێپەڕ بووین. ئێستا ئیتر زنجیرە شاخەکانی (حەمرین)مان لێ ئاوابوو، کە بەدرێژایی ڕێکردنی ئەمڕۆمان کەوتبووە لای چەپمانەوە، چونکە تا دەهات زیاتر و زیاتر ڕووەو خۆرئاوا وەردەسووڕا. توزخورماتومان لێ دەرکەوت، کە (٢٠) پلە بەلای باکووری خۆرئاواوە بوو. چارەکێکیش پێش ئەوەی بیگەینێ، لە چەمێکی زۆر پانمان دا، کە بەرزایی ئاوەکەی ئێستای دەگەیشتە ئەژنۆ و پانیشی هەرچەند یاردەیەك دەبوو، بەڵام لە پاییزاندا لەوە کەمتر دەبێتەوە. ئەم هەڵسانەیشی بەهۆی باراناوی زۆرەوە بوو. چەمەکە پێی دەوترا (ئاق سو)، لە (ئیبراهیم خانچی)یشەوە دەهات.

لای چەپیشمانەوە لە دووریی دوو سەعات ڕێوە گوندی (یەنی چە)مان دی، کە دەکەوێتە سەر ڕێی پۆستەی ئێستای نێوان بەغداد و تاووق.

لە دوو و نیودا، پاش ئەوەی لە چەمەکەمان دا، چەترەکەمم(٣٤) هەڵدا، تا سێبەرم بۆ بکات و شارەزایەکیشم بۆ شار نارد، تا (سەرا)مان(٣٥) بۆ ئامادە بکات و لە هاتنم ئاگاداریان بکات. دوای تاوێ حاکم و نوێنەرەکەی: (عومەربەگ - کە موڵکایەتی شاری بەشێوەی تیماریی(٣٦)درابوویە و بەمیرات لە باوکییەوە بۆی جێمابوو) هاتنە لام.

سواری ئەسپەکانمان بووینەوە بەناو باخی خورما و پرتەقاڵ و لیمۆ و هەنجیر و قەیسی و هەنار و زەیتوندا تێپەڕ بووین، کە بەتەواوی شاریان گرتبۆوە. لە ماڵە دڵگیرەکەی عومەربەگ جێیان بۆ چاککردین، کە لەچاو ئەوەشدا لەلادێ بوو، بەبەراورد لەگەڵ ئەوانەی بەغدادا، خانوویەکی قەشەنگ بوو، بەڵام تێکڕای شارەکە لە قوڕ دروستکرابوو، دانیشتوانیشی تورك بوون و زۆربەیان لە (ئیسماعیلی ــ چراغ سۆندیرەن)ەکان(٣٧) بوون.

---

٣٤- چەتر، ئەو شتەی خۆ لە (خۆر)ی پێ دەپارێزرێ. چادرێکی بچووکی سووکەڵەیە، بە ئاسانی هەڵدەدرێ و کۆدەکرێتەوە. تورکەکان لەکاتی دوورکەوتنەوەیاندا لەماڵ بۆ ڕاو و سەیران، لەگەڵ خۆیانیدا دەیبەن و لەهەر جێیەکیش لەنگەریان گرت، هەڵی دەدەن، کە بەتایبەتی لە نیوەڕواندا بۆ قاوەخواردنەوە هەڵی دەدەن. سەرنج: لەم پەراوێزەدا ئالۆزییەك هەیە. بەکارهێنانی چەتر لە خۆرئاوا و خۆرهەڵاتیشدا باو بووە. وشەی (چەتریش) بەو شتە وتراوە کە لەکاتی باران و هەتاویشدا بەکارهاتووە. من پێم وایە ئەو چەترەی لە دەقەکەدا ناوی براوە، ئەو جۆرە چەترانەیە کە ئێستاکە لە باخچەکان و لە گوێ زەریاکاندا هەڵدەدرێن-ع.

٣٥- یان کۆشکەکە. توزخورماتوو - موڵکی عومەربەگ بوو، کە خەڵکی بەغدایە و ئارەزووی زۆری دەربڕی، کە میوانداریی میستەر ڕیچ و خێزانەکەی بکات تیایدا.

٣٦- تیمار: ئەو زەوییە ئەمیرییانەیە کە بە (دە یەك) بە هەندێك دەدرێ بەرامبەر بەو ژمارە سەربازەی لەکاتی جەنگ و پێویستیدا داوایان لێ دەکرێ-ع.

٣٧- چراغ سوندیرەن: واتە چرا کوژێنەوەکان. وەك من بزانم خەڵکێکن لە تورکیا و ئێراندا پەرتوبڵاون. خووخدەی ئایین و بیروباوەڕیشیان کەمێك، یان بەواتەیەکی تر هەر نازانرێ. هەموو ئەوەی لەبارەیانەوە دەزانین، ئەوەیە کە موسڵمان نین. بەڵام بەگوێرەی شوێنەکان، ناویشیان گۆڕاوە. زۆر شەرمن و بێدەنگن. ئەمیش لە ترسایە، کە ڕەنگە ئەم ترسەیان سڵکردنەوە بێت لەوەی نەك گیانی چەوساندنەوەی ڕاستەقینە لای گەورەکانیان زیندوو بکاتەوە-خاریچ.

بەمجۆرە لە پەراوێزدا هاتبوو بەبێ لێدوان وەك خۆی دەینووسینەوە-ع.

شەوی شەممە لە (توزخورماتوو) باران باریبوو، زیانێکی زۆری لە باخەکان دابوو. باسی تەرزەکەشیان کرد و وتیان دەنکی زۆر گەورە بوون. پێم وایە ئەو شەوەی لێرە باریبوو، هەر ئەو شەوە بوو، کە لە (چوبوق) بێزاری کردین.

توزخورماتوو دەکەوێتە نزیك زوورگەکانی کفریەوە لە خۆرئاوای ئەو دەربەندەوەیە، کە رێك ئەو زوورگانە دەبڕێ و (ئاق سو)ی پیادا دێتە دەشتەکەوە. لەم دەربەندەدا بیرەنەوتێك و خوێ لێنێك هەن. کەمێك لە خوار ئەو زوورگانەشەوە بیرەنەوتێکی تر هەیە، بەڵام خوێ لێنی لێ نییە.

نیو سەعات دوای گەیشتنمان، تەختەڕەوانەکە هات. ئەو، سەعات شەش دەرچووبوو. رۆیشتنی ئەمرۆمان زۆر لەوە زیاتریش دەبوو ئەگەر یەکسەر بەو راستەرێیەدا بوایە، کە بە تەنیشت زوورگەکاندا تێپەڕ دەبوو، بەڵام (ئوداباشی ــ سەر هۆبە)کەمان ویستی قۆناغی ئەمرۆمان لە بەیات کۆتایی پێ بهێنێ و رێگاکە بکات بە دوو قۆناغی ئاسانەوە، بەڵام کە گەیشتینە بەیات، وا بەبیرمدا هات، چاکتر وایە تا دنیا خۆشە، لە ڕۆیشتنندا پەلە بکەین.

## ٢٩ی نیسان

بەیانی بەپەرۆشەوە بۆ دیتنی عەنتیکەکانی قەراخ شار، لە خەو هەڵسام. بیرە نەوتەکەش کەوتۆتە دەربەندی زوورگەکانەوە و میلێك لە باشووری خۆرهەڵاتی شارەکەوە دووردەبێ. لەبەرئەوەش کە کەوتۆتە ناوەندی چەمەکەوە، ئاو سەری دەکەوێ، بۆیە ماوەیەك پەکی دەکەوێ، وەك پار رووی دا. قووڵایی چاڵەکە نزیکەی (١٥) پێ دەبێ و (١٠پێ)ش ئاوی تیادا دەبێ. کە نەوتی ڕەشی تواوەی بەسەرەوە دەبێ و هەمیشە وردە بڵق سەری دەکەوێ. خەڵکەکە بنەکەی هەڵدەگۆزن و توێژەنەوتینەکەی سەرەوە دەگرن و ئاوەکەی دەکەنە جۆگەیەکەوە، کە دەڕژێتە کۆمەڵێك حەوزی بچووکی درێژکۆڵەوە، کە لەناو ئەو چەمەدا هەڵکەندراون. ئیتر وازی لێ دێنن تا وشك دەبێتەوە، دەبێت بە خوێیەکی چاکی دەنك ورد و سپی و بریقەدار و بێ تاڵیی... بەشێکی زۆری ئەم خوێیە بۆ کوردستان دەنێردرێ. داهاتی ساڵانەیشی بە بیست هەزار قرۆش دادەنرێ، کە بەسەر ئەندامانی خێزانی (دەفتەردار)ی(٣٨)کۆچکردوودا دابەش دەکرێ. بەڵام نەوتەکە موڵکی گوندەکەیە، بەشێکی بۆ خانووەکە -خانەکە-(٣٩) سەرف دەکرێ، یان دەفرۆشرێ و خانووەکەی پێ بەخێو دەکرێ و بەشێکی تری بۆ حوجرەی ئایینی و شتی تر سەرف دەکرێ. ڕۆژانە دوو گۆزە لەم بیرە هەڵدەگۆزن، کە

---

٣٨- خەزێنەداری بابی عالی و باوکی عومەربەگ.

٣٩- مەبەست لە (کاروانسەرا)یە-م.

هەریەکەیان شەش حوققە،(٤٠) یان باتمانێکی بەغدادی دەبێ. بەڵام سەرچاوەی نەوتەکە لە بنی چاڵەکە، یان بیرەکەدایە. کە هەموو گوندنشینەکان، ساڵانە بە هەرەوەز پاکی دەکەنەوە. ئیتر خواردن بەسەر هەژاراندا دەبەشنەوە و قوربانیی دەکەن و دەهۆڵ و زوڕنا لێدەدەن. ئەمەش هەر بۆ ئەوەی نەوت زیاتر سەربکەوێ. ڕەنگە ئەم نەریتەیان لە دێرزەمانەوە بۆ مابێتەوە. چاووگە سەرەکییەکانی نەوت لە زوورگەکاندان، کە ڕووەو کفری، کەمێك لەلای باشووری ئەم چاڵەوەن و ژمارەیان پێنج شەشێك دەبێ و بەرهەمیشیان لەم بیرە زۆرترە، بەڵام لەوێ خوێ نەدۆزراوەتەوە. لەوانەیە لەسەرتاسەری ئەم ناوچەیەدا نەوت بدۆزرێتەوە. لە نزیك ئەو چاڵەنەوتە لای زوورگەکاندا، زاخ و گڵەسپی هەن. ئەمانەش گەردیان وردە و سپییان هەیە و تۆپەڵن. بەڵام خەڵکەکە کەڵك لەم بەروبوومە سروشتیە وەرناگرن. جۆرە خۆڵێکیشیان دۆزیبووەوە، هەندێ لە شێوەکانی خواردنەکانیان پێ ترش دەکرد. دیارە دەبێ ترش بێ و تێکەڵیش ببێ. لێرە (گۆگرد)یش هەیە، گوندنشینەکان بۆ چارەسەری گەڕیی و خروو و ئالۆش بەکاری دێنن، کە تووشی مەڕوماڵاتیان دەبێ.

ئێستا با بێمە سەرباسی دەربەندەکە، کە لە خۆرهەڵاتەوە بۆ خۆرئاوا درێژ دەبێتەوە و لە شێوەی هەڵکەوت و ڕوخسارییدا ئەگەرچی بەرینیشە، لە دەربەندەکەی کفری دەچێ. لەشانی خۆرهەڵاتی ئەو گردەشەوە کە بەرامبەر دەشتەکەیە، چینە زەوی هاوتەریبی ئاسۆیی دەبینین، بەڵام لای شانی سەرووی دەربەندەکەوە، ڕووەو دامێن. بە گۆشەیەکی ٤٥ پلەیی، لێژ دەبێتەوە، تا ڕادەیەك کەوانەیی و قۆقزە. زوورگەکانیش لای باشوورەوە، زۆرتر گڵێنن و باراناو خەت خەتی کردوون. لەڕاستیدا دەتوانین بڵێین چاڵی بیرەکە، کەوتۆتە ئەم بەشە ڕووخاوەی بنی چەمەکەوە، لە هەموو لایەکیشەوە گەچۆڕ دیاربوو. زوورگەکانیش لەشانی باکوورەوە، لە تەموخ پێکهاتبوون. لەژێر ئەم هەموو خاك و تەمۆخەشدا وەك لەتاق، یان کەندەڵانێکی خوار خەرەندەکەدا، لەوحی سوورەوەکراو - (Clay Slate)، یان لەوحی شینی سوورەوەکراوم بینی، بەڵام هەرچی ئاو هەیە، هەمووی دەڕژێتە لای باکووری دەربەندەکەوە، زوورگەکەیان دڕیوە و کردوویانە بەچاڵێك، یان خەرەندێك. لە ژوورسەر خەرەندەکەشەوە پاشماوەی وارشی قەڵایەکی کۆن هەیە، کە مێژووەکەی نازانرێ، ڕەنگیشە ساسانی بێت. لە چاڵایی خەرەندەکەشدا ئەشکەوتێکی بچووك لە بەردێکدا هەیە، نەوتی تیادایە، لەسەر ئەشکەوتەکەش تاقێك هەیە، لە بەردی چوارگۆشە دروستکراوە، پێدەچێ ئەم دەستکردە، یەکجار کۆن بێت. بیریشم چوو باسی ئەو لقەدارینەی سەر ڕووی ئاوەکە بکەم، کە لە بیرەنەوتەکەدا هەیە، هەردوو سەری بەمبەر و ئەوبەری بیرەکەوە بەسترابووەوە. دەڵێن

---

٤٠- حوققە: بریتییە لە دوو باینەت و نیوێك، بەپێی کێشانەی ئینگلیزی. (واتە ٠/٥٦٨)ی یەك لیتر.

ئەم دارە وەك سەردەمی گاورەکان کۆنە، بەڵکو هەر بەهۆی پیرۆزیی نەوتەکەشەوە ماوە. خەڵکەکە قەڵاکەش هەر بەهی گاور دەزانن(٤١).

لە زەویشدا لەسەر چاڵایی ئەو گردەی قەڵاکەی لەسەرە، لە نزیك چاڵی بچووکی نەوتەکەوە، پەڵەی زەردی درەوشاوەم زۆر بینی، کە بۆنی (گۆگرد)یان لێدەهات. لەسەر زوورگەکە و بەلای باکووری دەربەندەکەوە، مەزارێکی بچووك هەیە بەسەر دەشتەکەدا دەنوارێ، نیشانەیە بۆ بەسەرهاتێکی ئەفسانەیی، کە لەوێ ڕوویدابێ و دەیدەنە پاڵ ئیمامی عەلی. دەڵێن هەموو شەوانێکی هەینی، چرایەك هەر لەخۆیەوە دەگرێ. ڕەنگە ئەمەش وەك دیاردە سروشتییەکەی (باباگوڕگوڕ)(٤٢)بێت.

دوای ئەوەی لە دیتنی بیرەنەوتەکە بووینەوە، بەڕێگاکەی لای بەری خۆرئاوای چەمەکەدا پیاسەیەکمان بۆ دیتنی کەلاوەکان بەدەوری شارەکەدا کرد. بەڵام لێرە کەمێکی نەبێ، شتێکی وامان نەدی شایستەی لێ وردبوونەوەبێ.

بەلای دەستەیەك لادێیدا تێپەڕ بووین، جۆماڵیان دەکرد و خەریکی دەهۆڵ کوتان و زوڕنا و نەقارە ژەندن بوون. دروێنەوانانیش هەندێ دروێنەیان دەکرد. لە خۆرئاوای شاریشدا هەندێ گردی توورەکەڕێژمان بینی، کە شتێکی وایان نەبوو، لە هی تر جیایان بکاتەوە. ڕەنگیشە بەهۆی ئەو وردە شتانەوەی تیایاندا دۆزراوەتەوە، کۆن بن، بەڵام من تا ئێستا هیچ شتێکم لەو بابەتە نەدۆزیوەتەوە.

لەسەر سەکۆیەك شوێنەواری خانوویەکی چوارگۆشەی بچووکمان بینی، کە پایەی قایم و گەورەی تیادابوو، لەوە دەچوو زۆر کۆن بێ. کەمێکیش لای سەرروویەوە، شەش پایەی ترمان بینی، کە هەموویان بەشێك لە خانوویەکی درێژکۆلەیان پێك دەهێنا و ڕووەو خۆرهەڵاتی خۆرئاوابوو. وا دیاربوو خانووەکە بریتی بووبێ لە کۆشکێك و دوو هەیوان، دەرگای کۆشکەکە دەکەوتە خۆرئاواوە، کە لەبەرامبەریدا لە خۆرهەڵاتی کۆشکەکەوە دەروازەیەك هەبوو، کە لاشیپانەکانی لەسەر کۆڵەگەی

٤١- چاووگی وشەی (گاور - گەبر)، یان ئاگرپەرستە، کە ئێستا هاوتای وشەی (کافر)ە و بەوانە دەڵێن کە لەپێش ئیسلامدا بوون. هەروەها بە ئەوروپاییش دەڵێن.

٤٢- (باباگوڕگوڕ): وشەیەکە بە جێگەیەکی دەڵێن سێ میل لە کەرکووکەوە دوورە، لە ناوچەیەکی بچووکدا، کلپەیەکی سپی نەوتینی لەچەند جێگەیەکی ناوچەکە لێ بەرزدەبێتەوە. پێدەچێ ئەوەی کاتی خۆی (دانفیل) بۆی چووبێ، ئەوەبێ، کە ئەم جێگایە (کوڕکوڕا)ی بەتلیمۆس بێت. بنوارە کتێبەکەی، بەناوی: فورات و دیجلە، چاپی چوارەم - ل ١٠٨.

نیوە بازنەیی و هەمووشیان پێچاوپێچ، ڕاگیرابوون. بەڵام شێوەی خانووسازییەکە یەکجار زەبەلاح بوو. پێم وایە کاتی خۆی ئەم کۆشکە، کەنیسە بووبێ. چونکە شێوەکەی زۆر لە شێوەی کەلاوەکانی کەنیسەی کلدانی، یان سریانی دەچێت، کە دیومن.

گردۆڵکە توورەکەڕێژەکان تا مەودایەکی زۆر لەم ناوەدا پەرشوبڵاو هەن، کە بەڵگەی ئەوەن ئەم شوێنە لە سەردەمەکانی زوودا، جێگەیەکی گرنگ بووبێ. لە گردە سەرەکییەکەشەوە، شاخەکانی حەمرین، لە ئاسۆی خۆرئاواوە بەچاو دەبینران. دەڵێن نزیکەی نۆ سەعات دوور دەبن - لێرەوە بە ئاسانی تا زیاتر رووەو خۆرهەڵات بڕوانین، دەتوانین هەردوو سنووری زنجیرەی (قەرەتەپە)، یان (زەنگ ئاباد) لە شاخەکانی حەمرینەوە ببینین.

دەشڵێن ئەو قەڵایەی ڕووخاوە، یان ئەو وارشەی لەسەر گردەکەی دەربەندەکەدا هەیە، کاتی خۆی درێژ دەبووەوە و هەر دەربەندەکە خۆیشی دەگرت، چونکە ڕووبارەکە لەشوێن ئاوەڕۆیەکی باشدا بەربەست کراوە و پردێکی لەسەر دروستکراوە، لەوەدەچێ ئەمە هەر واش بووبێ، چونکە وارش و خەرەندەکەش، هەردووکیان لەپڕێکدا لەیەك جێدا کۆتاییان دێت، وەك ئەوەی بە تەنیشت چەمەکەدا، تا ماوەیەکی تریش درێژببنەوە. دەڵێن پیاوێکیش، کە لەم دواییەدا لە تەمەنی (١٢٠)ساڵێدا مردووە، وتوویەتی لە بیرێتی کە خەرەندەکە و دیوارەکەش هەردووکیان تا جێگایەکی زیاتریش لەمەی ئێستایان بەگوێ چەمەکەدا درێژ دەبوونەوە. چەمەکەش لە جێیەکی تەنگەبەردا گیر دەدرا. وتوشێتی ئەم باسەی لە پیری کۆنەساڵەوە بیستووە. لەوانەشە ئەوە بەربەستێك - دەربەندێك بووبێ بۆ پارێزگاری وڵات لە هێرشی ئەو کوردانەی بە درێژایی سەردەمەکان، دراوسێیەکی پەژارە بەخش بوون. ئەمەش یەکێکە لەو دەربەندانەی کە دەچێتەوە سەر کوردستان. ڕێگایەکیشی لێ دەبێتەوە، دەچێتەوە سەر (ئیبراهیم خانچی)، کە سەختە، چونکە بەدرێژایی ڕێگاکە بەسەر زوورگی بچووکدا تێپەڕ دەبێ. ماوەی نێوان توزخورماتوو - ئیبراهیم خانچی، نۆ سەعات دەبێ. لە کفریشەوە بۆ ئیبراهیم خانچی، هەر نۆ سەعاتە. ڕێگاکەش تەخت و چاکە.

تاوێ دوای گەیشتنمان (محەمەد ئاغا) گەیشتبوو، کە (ئیشیق ئاغاسی - سەرۆکی تەشریفات)ی مەحموود پاشا بوو. بۆ ئەوەی ناردبوو تا بۆ ڕێنوێنی کردنی میواندرییەکەی یاوەرمان بێ. چەند نامەیەکی بەسۆزیشی لە مەحموود پاشاوە بۆ هێنابووم، کە هەموویان نەزاکەت ئامێز بوون.

لە تووزخورماتوو (خانوو - خانووی حەسانەوە)( ) هەیە. هەشتا ئەسپی تیادایە. پلەی گەرما لە شەشی بەیانیدا٦٤ پلە و لە دوازدەی نیوەڕۆدا ٧٠ پلە و لە سێی دوای نیوەڕۆدا ٦٦ پلە بوو.

لە باشووری خۆرهەڵاتیشەوە (با) هەڵیدەکرد و هەڵکردنەکەیشی توند بوو. دوای نیوەڕۆ بارانیشی لەگەڵدا باراند

## ٠٣ی نیسان

هەستم بە ئازارێك كرد كە ڕێی پیاسەی نەدام، بەڵام ئەم زانیارییانەم كۆكردەوە:

ڕووباری (ئاق سوو - یان - توزخورماتوو) لە (عەلی دەللو)ی قەرەداغ، لە كوردستان هەڵدەقوڵێ و بە ئیبراهیم خانچی دا تێپەڕ دەبێ و دەگاتە توز خورماتو. پردەكانی ئەم ناوە هەریەكەیان قوللەیەكی بچووكی هەیە، كە لە قوڕ دروستكراوە و بۆتە بەشێك لێی، تا پاسەوانی بۆ چاودێریكردنی لە دز تیدابێ، چونكە هەموو شوێنەكانی سەر بەسنووری كورد، لەبەر هێرشی چەتەكانی ئەو گەلەدان. ژمارەی دانیشتوانی توزخورماتوو، بەپێنج هەزار كەس دادەنرێ.

پلەی گەرما، لە حەوتی بەیانیدا ٦٢ پلە بوو، دەمەو بەیانی (با) لە باكوورەوە بوو. لە دووی دوای نیوەڕۆدا زریانێكی كەم، بەبارانێكی كەمەوە لە خۆرئاواوە هەڵیكرد. شەو بروسكەی هەبوو، كە لە خۆرئاواوە دەستی پێكرد و بۆ باشوور گۆڕرا.

ئەوەتەی لە بەغداد دەرچووین، ڕۆژێكمان لێ نەچووە، بروسكە نەبێت.

# بەشی دووەم

**جێهێشتنی توزخورماتوو ـ دۆڵی لەیلان ـ هەواری یوسف ئاغا ـ میواندارییەکەی ـ چوونە ناو کوردستان ـ مەزرا و دیمەنی وڵات ـ دیاری لەلایەن پاشای (سلێمانی)یەوە ـ گەیشتن بە چادرگەکەمان پێش سلێمانی ـ سەردانی پاشا.**

## ٧١ی ئایار

لە پێنج و نیودا لە توزخورماتوو دەرچووین، سەمتی ڕۆیشتنەکەمان (٧٥) پلە بەلای باکووری خۆرهەڵاتدا بوو. دەڕۆیشتین و لە نزیکی لای چەپیشمان دەشتێك بوو، تا دەهات رووەو حەمرین لێژ دەبووەوە، کە بە ئاسانی زوورگە گەچۆڕەکانمان لێوە دیاربوون. لەوەش دەچوو لێرەدا وەرسووڕابێتەوە، یان روو لە خۆرئاوا بکات، نزیکترین بەشێکی لێمانەوە، وەك وارشێکی قولیپدار و گرنج گرنج بوو، بەڵام ٨٠ پلە بەلای سەمتی باکووری خۆرئاوادا بوو. رووباری (عوزێم)یش(٤٣) لە دووری نیو سەعات، لەژێر ئەم بەشەوە، شاخەکانی دەبڕی. لەژێر ئەوەشەوە (دەمیرقەبو)مان دەدی، کە دەربەندێك بوو، پێشتر قایمکاری تیادا کرابوو، چونکە دەرگای ئاسنینی لێیە. وا دیاربوو زوورگەکەش لە پشت ئەو بەشە گرنج گرنجەوە، بەرەو خۆرئاوا وەردەسووڕێتەوە.

لە سەعات حەوتی بەیانیدا سەمتی ڕۆیشتنەکەمان ٤٥ پلە ڕووەو خۆرئاوا بوو. ئالێرەوە زنجیرە گەچۆڕەکە دەتوت کۆتایی هاتووە، بەڵام من پێم وایە کۆتایی نەهاتبێ، یان بووبێت بە زوورگێکی چەوەلەی نزم، کە رووی لە خۆرئاوا دەکرد و لێرە و لەوێش تەمۆخی تێدا دەردەکەوت. ڕۆیشتنەکەشمان بە تەنیشتی زوورگە گەچۆڕەکاندا بوو، کە کەوتبووە لای راستمانەوە.

لە حەوت و چل دەقیقەدا منارەکانی (تاووق)مان لێ دەرکەوتن. چوومە سەر گردێکی بچووك، کە یەکێك بوو لەو زوورگە چەوەلانەی لقیان لێ دەبووەوە و ڕاستەوخۆ لای راستی ڕێگاکەمانەوە بوو. لێرەوە ئیتر بەتەواوی دەمتوانی (تاووق و توزخورماتوو) پێکەوە لە ئەمسەر و ئەوسەری باکوور و باشووری ئاسۆوە ببینم.

تاووق دەکەوتە ١٥ پلە بەلای باکووری خۆرئاوادا و توزخورماتووش دەکەوتە ١٥ پلە بەلای باشووری خۆرهەڵاتدا. ئیتر هەر لێرەشەوە یەکسەر زنجیرە گەچۆڕەکە دوایی دەهات، چونکە لەشانی لای خۆرئاوایەوە ئەو هێڵە زوورگە چەوەلەیە دوایی دەهات، کە سەعاتە ڕێیەك بە تەنیشتیدا ڕێمان کرد، هێڵەکەش رووی لە خۆرهەڵات دەکرد ، بەڵام دەشتاییەکەی ناوەڕاست، چاڵاییەکی وەك تونکە تونکە، یان زوورگێکی چەوەلەی پێك دەهێنا، کە باراناو و

---

٤٣- ئەلعوزێم: ئەو چەمە سەرەکییەیە، کە ئاوی کەرکوك و تاووق و توزخورماتووی تێدەڕژێ.
ئەو چەمە لەو ناوچانەدا پێی دەوترێ: (ڕۆخانە) – م.

سێلاو دابڕی کردبوون و پڕبوون لە جۆگە و چەم و شیو. لە دووری چەند یاردەیەکیشەوە، کارێزێك هەبوو، کە بۆ یەکەمجار بوو لەم ڕێیەدا تووشی ببین. کارێزیش بریتییە لە جۆگەیەکی سەرگیراو، بۆ ئەوەی لە کانیاوی بەرزەوە ئاو بە مەزرای دەشتایی بگەیەنێت. ئەم جۆگە سەرگیراوانەش لە چەند جێگەیەکدا شوێنی هەڵدانەوەی بۆ دیاریکردنی ڕەوتی جۆگەکە تیادا دەهێڵنەوە. لە دووری دە دەقیقەیەکی تریشەوە چەمێکی پان هەیە، لێوان لێو ببوو لەو باراناوە لەناکاوەی بە خوڕ باریبوو. ئەم چەمە دەکەوێتە سەر ڕێگای نێوان (تاووق و توزخورماتوو)(٤٤).

کەمێك لەولاتریشەوە چەمێکی تربوو، پڕ بوو لە ئاوی ڕوون. ئێستا ئیتر ڕێگاکەمان ببووە هەوراز و نشێوییەکی کەم. لە (١٠)دا گەیشتینە رووباری (تاووق جای) گەورە و بەخوڕ، کە لە کوردستانەوە هەڵدەقوڵێ. ئەم ڕووبارە لای ڕاستی ئەو ڕێگایەمانەوەیە، کە دەبوایە پیایدا بڕۆین و بە قەرەحەسەندا تێپەڕ دەبوو. هەرکاتێ پێویستی بکردایە ئەوەندەی جۆگە بۆ چەندان مەزرا و گوند لێ هەڵدەگیرێ، کە ئاوی تێدا نامێنێ. زۆربەی ئاوەکەیشی لە هاویندا بۆ کشتوکاڵ بەکاردەبرێ. لە پاییزانیشدا، لەم جێگایەدا، قووڵایی هەر پێیەك، یان پێ و نیوێك دەبێ. ئاوەکەیشی هەر بەتەنیا ئەم گوندە پاراو ناکات، بەڵکو دەگاتە گوندێکی زۆری سەر و خوارووی خۆیەوە. لە زستان و بەهارانیشدا کە سێلاوی باراناو هەڵدەستێ، دەبێتە رووبارێکی زۆر گەورەی وا، کە پانتایی ڕێڕەوەکەی خۆی لێوالێو دەکا، کە پانتاییەکەی نیو میل دەبێ. ئیتر دەبێتە سێلاوێکی ترسناك، تاشەبەرد رادەدا و چاڵ و کەندی واش لە ڕێڕەوی خۆیدا دروست دەکات، کە هەمیشە لێدانی ترسناك، یان هەرگیز بۆ پەڕینەوە نابێ. ئاوەکەیشی لەناکاودا هەڵدەستێ. وەکو بیستمان زۆرجاری وا بووە، ڕێبواران لە ناوەڕاستەکەیدا بوون، کە ئاوەکەی لە ناکاودا هەستاوە، ئیتر یان خنکاون، یان بەگران رزگارکراون. لەم چەند ڕۆژەی دواییشدا بەهۆی بارانی خوڕەوە، ئاوی (تاووق جای) یەکجار زۆر هەستابوو، بۆیە چەند تەرمێکی خنکاو و کەلاکی چەند ئاژەڵێکی خنکاوی بەسەرەوە بوو. ئەمە هەمیشە لەکاتی بارانی خوڕ و نائاساییدا ڕوودەدات. وەك پار هاوین باریبوو. بەڵام ئێستا لێدانی زۆر ئاسان بوو. ئەفسەرەکە بەنزیکەی پەنجا کەسێکەوە (بە تەپڵ و زوڕنا

---

٤٤- تێکڕای ڕێکردنی میستەر ڕیچ، لە سەعاتێکدا لەنێوان سێ میل و چارەکێك و چوار میلدا بـووە، لـە کورتەکان و کۆتایی قۆناغەکانیشدا، ولاخەکان چوار میل و نیویان دەبڕی. بەڵام سەعاتی ئەو خەڵکەی لەسەر کاروانیی دەژین، سێ میلە، سەعاتی سوارەش سێ میل و نیوە.

و کەڕەناکانیانەوە) هاتبوونە پێشوازیمان بۆ یارمەتیدانمان لە پەڕینەوەی خۆمان و کەلوپەلەکاندا. لەکاتی پەڕینەوەدا لە ناوەڕاستی پانتاییەکەدا، دوو کانیمان بینی، قووڵایی یەکەمیان دوو پێ و نیو و پانایی‌شی (١٠-١٢) یاردە دەبوو. قووڵایی دووەمیشیان نزیکەی سێ پێ و نیو دەبوو، پانایی‌شی لەنێوان بیست تا سیی یاردە دەبوو. هەردووکیشیان خوڕ بوون، بنەکانیشیان پڕبوون لە تاشەبەردی گەورە... دوێنێ ئاو زۆر ببوو، بەڵام لەشەودا ئاوەکەی کەمی کردبوو، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا سووکە ترسێکی هەر خستە دڵی هەندێ لە بەغدایییەکانی دەستەکەمەوە.

پەڕینەوەمان لە رووبارەکە، بەهەمووی بیست دەقیقەی خایاند، ئیتر ئەفسەرەکە خۆی و کۆمەڵەکەی جێیان هێشتین و تەختەڕەوانەکە بۆ یارمەتیدانی چوون.

پاش ئەوەی لەژێر چەترەکەمدا قاوەیەکمان خواردەوە، سواری ئەسپەکانمان بووینەوە و روومان لە گوندەکە کرد، کە نێوانمان هەر دوو میلێك دەبوو، بەڵام بەنیو سەعات بڕیمان(٤٥).

بەلای منارەیەکی جوان و دێرینەدا تێپەڕ بووین، لای چەپمانەوە بوو، لە خشت دروستکرابوو. پێدەچێ پاشماوەی سەردەمی خولەفاکان بێ. هەروەها بەلای هەندێ گۆڕ و ئەو مەزارانەدا تێپەڕ بووین، کە زیارەت دەکران. ئەمەش وای دەگەیاند کە ئەم شوێنە، کاتی خۆی فراوانتر بووبێ، بەڵام ئێستا گوندەکە یەکجار پیسە و بریتییە لە خانێك، کە شەست ئەسپی تیادایە. پێش ئەوەش بگەینە (چای)، یان رووبارەکە، دوومیلێك لەولای چەپمانەوە، گوندی (عەلی سەرای) و لای راستیشمانەوە لە دووری میلێك، لەبەری راستی رووبارەکەدا، مەزاری (زین ئەلعابدین)مان بینی، کە خەڵکێکی زۆری لە وانەی چاو ئێشەیان هەیە، دەچنە سەری.

زۆر نیگەرانی خۆ ئامادەکردن بۆ قۆناغی دووەمان ببووم، کە چاوەنوارپیم دەکرد بەناخۆشیی بیگەینێ، چونکە پێیان وتبووین حەوت سەعاتێك دەخایەنێ، کەچی بە پێنج سەعات و نیو بڕیمان. کاتێکیش گەیشتین، دەستەیەك لە پیاو ماقووڵانی گوندەکە بۆ پێشوازیمان هاتن، کە مەلاکانیان لە پێشیانەوە بوون، پیاوی باڵابەرز و سەروسیما جوانیان تیادابوو.

---

٤٥- ئەمەش چەند بڕگەیەکە لە یادداشتی میستەر ڕیچ: خێرایی رێکردنی هێسترێکی باش (ئەگەر هەموو رێگاکە خێرا بڕوات) پەنجا هەنگاوە، بۆ هەر بیست چرکەیەك، واتە لە دەقیقەیەکدا (١٥٠) هەنگاوە، یان لە سـەعاتێکدا (٩٠٠٠) هەنگاوە. دوای لێدەرکردنی ئەو جیاوازییانەش کە دەکەوێتە نێوان یاردە و هەنگاوەوە، دەتوانین تێکڕای بەچوار میل لە سەعاتێکدا دابنێین. وەك بۆم دەرکەوتووە، هەنگاوی هێستر رێکوپێکترین هەنگاوە.

که بەسەر ئەسپەکەمەوە دەبووم، محەمەد ئاغای چاوساغ و میواننەواز، زۆری لێ دەکردم تا هەوسارەکەی ڕابکێشێ، هەرچەندیشم تکا لێ دەکرد کە ئەم کارە نەکات، بەڵام بێهوودە بوو، پێی دەوتم لەبەر خاتری مەحموود پاشا ئەمە دەکات و حەزیش دەکات وەك مەحموود پاشا سەیرم بکات...

ساڵی پار، کە مەحموود پاشا و شازادەی کرماشان، پەیمانێکیان دژی تورك بەستووە، ئەم ئاغایە، سەرکردایەتی دەستەیەکی کردبوو، هەڵیان کوتابووە سەر ئەم گوندە و تاڵانیان کردبوو. دیاربوو گوندنشینەکان مەبەستیان بوو دڵنەوایی بکەن، لەترسی ئەوەی نەك لە داهاتوودا سەردانێکی وەك ئەوی پێشوویان بکاتەوە. زۆریان دەهاتن و دەستیان ماچ دەکرد، بەڵام هەر ئەوەندەی دیار نەدەما، دەیانوت: (خوا خێر نەهێنێتە ڕێی، هەر ئەم بوو، ساڵی پار گوندەکەمانی تاڵان کرد).

سەرلەبەیانی پلەی گەرما (٦١) بوو، لە سێی دوای نیوەڕۆدا (٧٢) پلە و لە دەی شەویشدا (٦٦) پلە بوو. بەیانی لە خۆرهەڵاتەوە (با) هەبوو. لە سێی دوای نیوەڕۆدا هەور بەری ئاسمانی گرت، بەڵام کەشوهەوا هێمن مایەوە.

**٢ی ئایار**

کە بیستمان بە تەنیشت گوندەکەوە کۆمەڵە کەلاوەیەك هەن، شایانی دیتنن، ئەم بەیانییە چووینە دیتنیان. بریتی بوون لەو منارەیەی دوێنێ دیمان و پاشماوەی دیوارێکی قوڕ، کە ڕووی پێشەوەی، لە خشت دروستکرابوو، خشتەکانیان لێ دەرهێنا بوو. دەرگایەکی بچکۆلەشمان بینی، کە ئاسەوارێکی زۆری خانووسازییەکی جوان، لەسەر شێوەی ئەوەی (تەکیە) و (موستەنسریە)(٤٦) و نموونە جوانەکانی خولەفاکانی بەغداد دەچوو. (ئۆلیڤەر)یش ئەم کەلاوانەی دیبوو، بەڵام وای پێ ڕاگەیاندووین کە سەر بە (توزخورماتوو) بوون، بەبێئەوەی هیچ پێویست بکات. ئەمەش وامان لێدەکات گومان لە یادداشتەکانی بکەین، یان بەلای کەمەوە گومان لەوەش بکەین کە پێوەندی بەم باسەوە هەیە، چونکە لەوە دەچێ هەر پشتی بەبیرەوەری بەستبێ. خۆیشی دان بەوەدادەنێ کە باسی وردەکارییەکانی ناکات. بەڵام ئەگەر بیەوێ ئاماژەیان بۆ بکات، دەبێ ناوی شوێنەکانی لە یادبێ. بۆ دەرخستنی ڕاستییش دەبێ

---

٤٦- موستەنسریە: مزگەوتێکە لە بەغدا و پاشماوەی سەردەمی خولەفەکانە. تەکیەش گۆشەیەکی دەروێشەکانی (بەکتاشی)یە، لەسەر ڕۆخی دیجلە و لەبەری خۆرئاوای شارەکەدایە. نموونەیەکی جوانی ئەندازیاری خانووسازی کۆنی ئیسلامیە-خاریج.

ئەوە بڵێم کە ئەمە یەکێکە لەو هەڵە زۆر بچووکانەی تا ئێستا لە یادداشتەکانیادا لەبارەی باسی ناوچەکەوە دیومە، کە زۆر بەدەمڕاستی باسی دەکات و جێی سوپاسە.

لەوسەری گوندەکە بە دەم ڕێکردنمانەوە، بەلای مەزار، یان گلۆڵەیەکی(٤٧) بچکۆلەدا تێپەڕ بووین، گومەزێکی درێژکۆلەی وەك ئەوەی (سەییدە زوبیدە)ی بەغدای(٤٨) لەسەر دروستکرا بوو. بەڵام لەڕووی شێوە و جوانیی خانووسازییەکەوە بە هیچ جۆرێك بەو نەدەگەیشت.

گوندنشینەکان ئاگاداریان کردینەوە کە ئاسەواری کەنیسەیەکیش هەیە، ئەمەش ڕێی تێدەچێ، چونکە ئەم جێگایە یادگاری کورسی قەشەکانی کلدانی بووە. ناوی ئەمەش لە دێرینترین سەدەکانی مێژوودا هەیە.

ئەو کەلاوەیەشمان بینی کە گوندنشینەکان پێیان وتین گوایە کەنیسە بووە، میلێك، یان میل و نیوێك، یان دوو میل دەکەوتە لای ڕاستی ڕێگاکەمانەوە، بە دووربین سەیرم کرد، بەڵام لەبەرئەوەی دڵنیابووم کە شتێکی وانییە، کاتم بەسەیرکردنەوە لە دەست نەدا.

لە دواییدا لە شەش و چارەکدا ڕۆیشتین، وەك دوێنێ زەوی بە ئەفسەنتین (بە تورکی پێی دەڵێن: یاوشان) و جاترە کێوی و ڕووەکێکی زۆری تریش داپۆشرابوو، بەڵام لەبەرئەوەی نەمدەناسین، ناویانم نەدەزانی. ئەفسەنتینیش بۆنێکی خۆشی لێدەهات، دڵی پێ دەکرایەوە. هەروەها جۆگەیەکی زۆرمان بینی، هێشتا سەوزبوون. دروێنەوانان خۆیان بۆ دروێنەی هەندێکی ئامادە کردبوو.

ڕێگاکەمان رووەو لاپاڵی زوورگەکان بەرەو ژوور دەبووەوە (لەلای چەپیشمانەوە ڕێگاکەی کەرکوکی جێدەهێشت). لای چەپمانەوە شاخەکانی (حەمرین)مان لێدەرکەوتن. لە حەوت و بیست دەقیقەدا گەیشتینە گوندی (جەمیلە)ی خنجیلە، کە لە قوڕ دروستکرابوو. ناوە عەرەبییەکەش مانای (کچۆڵەی جوان)ە، ناوەکەیشی لێ نەدەهات، چونکە هێلانەیەکی پیس بوو.

ئێستا ئیتر هەستمان کرد، بەو زنجیرە زوورگەداسەرکەوتین کە ڕووی لە باکووری خۆرهەڵاتی گوندی (متارا) دەکرد و زوورگەکەش کە وەك دەڵێن بە (تازە خورماتوو)دا تێپەڕ دەبوو، پاشان وردە وردە نەدەما، ناوەکەی هەر لەو وەرگرتبوو.

پێم خۆشبوو ئەم ڕێگایەم تاقیکردەوە، هەرچەندە سێ و چوار ڕۆژێك لە ڕێگاکەی (ئیبراهیم خانچی)یش درێژتربوو، بەڵام شتێکی زۆری لێوە فێربووم بۆ خۆپاراستن لە

---

٤٧- مەرقەدی موسڵمانێکی پیاوچاکە.

٤٨- ژنی هارون ڕەشیدە.

هەموولایەنێکی ئەم وڵاتە. سەریشم لەوە سوڕما کە (میواننەواز)ەکەم ئاگادارییەکی تەواوی لە هەموو جێگاکان و سەمتەکان و لێکدانەوەی زنجیرە زوورگەکان بەیەکترەوە، هەبوو. لەو شتانەشدا کە پێشتر خۆم ئاگاداریم لەسەریان هەبوو تاقیم کردەوە، کەچی وەڵامەکانی ئەوەندە جێی متمانە بوون، شایانی ئەوەبوون بەتەواوی پشت بە زانیارییەکانی ببەسترێ.

بەڵام بەشەکەی تری زوورگەکەی کفری، یان بەشەکەی ئەوسەری خۆرهەڵاتی (کە لە راستیدا باسك، یان شادەمارێتی) بە (کەرکووك و ئاڵتوون - کۆپری)دا تێپەڕ دەبێ. لێرەشەوە بەدامێنی (ئەربیل)دا دەڕوات تا دەگاتە (دیجلە)، ئیتر لەوێ پێی دەڵێن (قەرەجوق داغ)، ئەو بەشەی خۆرهەڵاتی، گەچۆڕ و نەوتیشی تیادایە. بەڵام بەشەکەی خۆرئاوای، یان زوورگەکەی(متارا) بریتییە لە تەموخ و چەو و کوتومت لە هەموو روویەکییەوە لە زنجیرەکەی (حەمرین) دەچێ، شتی وازۆریشی تێدایە، شایانی لێوردبوونەوە بێ، کە لە دەربەندی (جەمیلە)ش پیایدا تێپەڕ بووین، زنجیرەیەك، یان بە دوو زنجیرەی چین چینی شاقولیدا تێپەڕ بووین، دەتوت بەزۆر وایان لەخۆیان کردووە. پاش ئەمان چینگەلێکی ئاسۆیی تەمۆخی تەواو و رووتەن دێت، کە گابەردی زەبەللاحیان لێ رووخاوە و لەو ناوەدا لەملاو لەولا پەرشوبڵاو بوونەتەوە و وەك خانوویەکی رووخاو، هیچیان بەساغی نەماونەتەوە. لە راستیدا زوورگەکەش بەتەواوەتی لە کێوێکی رووخاو دەچێ. پاشان بە چینگەلێکی لار گەیشتین، سەیر لەوەدابوو لارییەکەی، لەلاری چینەکانی حەمرین دەچوو. ئەم زوورگانە لە هێڵە شاقولییەکەوە (٦٠) پلە بەلای خۆرهەڵاتدا، یان (٣٠) پلە لەژێر هێڵی ئاسۆوە بوون. ئەم چینانە لە زوورگەکەدا بەتەواوی هاوتەریب بوون و یەك سەمتیشیان هەبوو، وەك ئەوە وابێ بەجۆرێك چووبێتنە سەریەکتر کە بە (٤٥) پلە روو لە باکووری خۆرهەڵات بکەن، بەڵام بەرەو ژوور هەڵکشانەکەی یەکجار لەسەرخۆ و رووەو خۆرهەڵات بوو، ئەوەندە نەبێ لەو تونکە تونکانەی ناوخۆیدا کە باراناو، لە تەمۆخ دروستی کردوون، پێچ دەکاتەوە، یان لوول دەبێ.

لە حەوت و چل دەقیقەدا گەیشتینە هەردەیەکی قێزەون، یان دەشتێکی بەرین، کە کەڵەکە چەوەڵەی بەرز و کەندڕی سامناکی تێدابوو. رێگاکەمان (٥٠) پلە رووەو باکووری خۆرهەڵات بە تەنیشتیا تێپەڕ دەبوو.

لە هەشت دا گەیشتینە زنجیرە لووتکەیەکی تر، کە چینگەلێکی لێژ بوو، هەمان ئەو شێوەیەی هەبوو، کە پێشتر باسکرا. بەڵام چینە خاکە چەوەڵانییەکەی داپۆشبوو، تا پێشتریش بچووینایە، چینە چەوەڵانییەکە ئەستوورتر دەبوو. لەملاو لەولاشمانەوە هەندێ

مەزرای بچووکی جۆمان بینی. کاروانێکی کوردیشمان بینی (مۆرت Myrtle)یان لە گونیەدا بار کردبوو، بۆنێکی خۆشیان لێ دەهات، پێدەچوو بۆ ڕەنگسازی بەکاری بهێنن.

لەم ناوچەیەدا گلێ و چەو، وەك ئەوەی لاپاڵەکانی (حەمرین) بە دەرەوە بوون. لە هەشت و چل و پێنج دەقیقەدا گەیشتینە جێگایەك، بەسەر دەشتی (لەیلان)دا دەینواڕی، کە لەوێ ئیتر زوورگەکان لێژدەبنەوە.

ئێستا ئیتر پێمان ناوەتە دەشتی (لەیلان)ی پڕ لە مەزرا جۆوە، کە وەك دیاربوو نیشانەی خێروبێری پێوە دیاربوو. هەندێکی کەمیشی خەریکی گەیشتن بوو، لە نۆ و نیودا بۆ قاوەخواردنەوە و بۆ ئەوەی ئەفسەری (ئیعاشە) کاروباری خۆی ڕێك بخات، ڕاوەستاین.

لە دە و چارەکدا دووبارە سواربووینەوە و لە یازدە چارەکێك کەمدا گەیشتینە (لەیلان)، کە گوندێکی بچووك و هی (عەبدوڵلا ئەفەندی) بوو، کە سەرپەرشتیاری پێشووی (ئیمام ئەلئەعزەم)(٤٩) و لە دۆستە دێرینەکانم بوو، ساڵی پار، ئێرانی و کورد، هەڵمەتیان هێنابووە سەر ئەم گوندە و هەرچییەکیان پێ تاڵان کرابوو، بردبوویان، ئەوەیشی بۆیان هەڵنەگیرابوو، سووتاندبوویان. بۆ ئەوەش ئەمەیان کردبوو، تا نەیەڵن سەربازی تورك، ئالیك بە وڵاخەکانیان بدەن.

من پێم وایە گوندنشینان لە هەموو ناوچەکانی وڵاتی تورکدا، هەمیشە دانەوێڵەکانیان لەچاڵ و بیری نزیك گوندەکانیاندا دەشارنەوە و ئەگەر زەوییەکەی سەرەوەیشی چاك تەخت بکرێ، بەلای زۆرەوە نادۆزرێتەوە، تەنانەت لای سوپای داگیرکاریشەوە، مەگەر یەکێك ڕێنماییان بکات.

بەختم یاربوو، چونکە لە بێلای ئەو خانووەی تێی چووبووم، توانیم(کەرکوك) ببینم، بۆ زیاتر دڵنیابوونیش چەند جارێك و زۆر بەوردی ڕووی ئامێری پێوەرەکەم تێکرد. ئەو خاڵەش کە کردبوومە ڕوانگە، قەڵاکە بوو، کە بەشێك لە شارەکەی بە ئاشکرا لەژێردا دەردەکەوت. سەمتی قەڵاکەی کەرکووکیش (٢٤) پلە بەلای باکووری خۆرئاوادا بوو. دەمویست ئەوەندەی دەتوانم بەدڵنیاییەوە ئەو نێوانە ساغ بکەمەوە کە خەڵکەکەی ئێرە پێیان وتبووم. بەڵام هەروا بەچاو دەمخەملاند، کە بەهێڵێکی ئاسۆییدا دوازدە میل دەبوو، کەچی عەبدوڵلا ئەفەندی، کە چەند جارێك لە کەرکووکەوە چۆتە (لەیلان)، خۆی بە سەعاتەکەی ڕایگرتووە، دەڵێت نێوانەکەیان بە کاروانی هێستر، سێ سەعات و نیو دەبێ و بەسواریش سێ سەعاتە و بۆ

---

٤٩- ئەبو حەنیفە: یەکێکە لە ناودارانی ڕێبازگەکانی ئیسلام، کە ناوی (ئەعزەم)ی لێنراوە و هەر لەو شارۆچکەیەش نێژراوە کە بەناوی خۆیەوەیەتی و دوو میلێك لە باکووری بەغداوەیە.

سواری توندڕەویش دوو سەعات و نیو دەبێ. لەبەرئەوە دەبێ نێوانەکە (١٠) میلی جوگرافیایی بێت. لە شەویشدا کە پێوامەوە، لە شوێنی ڕاستەقینەی کەرکووك دڵنیابووم، چونکە لە ڕاپۆرتەکانی پێشوومدا و لە ڕاپۆرتەکانی سیر (ئارکیر پۆرتەرR. Kerporter)دا دڵنیابووم، کە شوێنی کەرکووك بەجۆرێك نەخشەکێشراوە، لەوە زیاتر بەلای خۆرهەڵاتدا کەوتووە، کە خۆی هەیە. لەبەرئەوە ئەو سەمتەم بەڕاست زانی کە خۆم بۆم دیاری کردووە.

زەویش لەنێوان (کەرکووك) و (لەیلان)دا بەتەواوی دەشتاییە، هەندێ گردی توورەکەڕێژیشی تێدا بڵاوبۆتەوە. لە هەندێ گوندا خورمایەکی کەم دەبینرێ، بەڵام باخی کەمی تێدا دەبینرێ. لە خۆرئاواشەوە دەشتەکە بۆتە سنوور بۆ دەشتەکەی (مارا) و لە خۆرهەڵاتیشەوە ئەو زنجیرەیەی کە سبەینێ دەیبڕین.

تازەخورماتووش سێ سەعاتێك دوور دەبێ.

نرخی پارێزگاریکردنی ساڵانەی (لەیلان) بەدراوی بەغدایی، دەکاتە بیست و پێنج هەزار قرۆش، ئەمیش وەك تێکڕای ئەو گوندانەی دەکەونە سەر سنووری کورد، شلۆقن، حەسانەوەیان تێدا نییە، چونکە بۆتە جێگایەك بۆ بەردەم هێرش و کاولکاری تەواوی هەڵمەتی کورد.

کەهیا (کۆیخا) ی سەرۆکی گوندەکەش تکای لێکردم، لای مەحموود پاشا بکەومە نێوانەوە بۆ گێڕانەوەی سێ سەد سەرمەڕ، کە کورد، بە تاڵانی لێیان زەوت کردبوون و دەپاڕانەوە کە سەردانەکەم بۆ کوردستان، بێتە مایەی ڕێگریی لە هێرشی کورد، هەر هیچ نەبێ تا دوای دروێنە و خەلە و خەرمان کۆکردنەوە.

دانیشتوانی ئەم گوندە و هەموو گوندنشینەکانی دراوسێیان، تورکن و سەر بە (چراغ سوندیرەن)(٥٠).

یان (عەلی ئیلاهی)٥١.

پلەی گەرما، لە شەشی بەیانیدا (٦٨) پلە و لە سێی دوای نیوەڕۆدا (٨) پلە و لە دەی شەویشدا (٦٧) پلەبوو. لای باشووری خۆرهەڵاتیشەوە (با) هەبوو.

---

٥٠- بڕوانە پەراوێزی ژمارە (١٨)ی بەشی یەکەم.

٥١- ئەمەش وەك لە پێشکەیدا وتمان، ئەوە دەسەلمێنێ کە چاوساغ و وەرگێڕەکانی (ریچ)، فارس بوون، ئەگینا لەو ناوچەدا بە پیڕەوانی(کاکەیی) ناڵێن: عەلی ئیلاهی، بەڵکو لە ئێراندا لەلایەن نەشارەزایانەوە وایان پێ دەووترێ (م).

## ٣ی ئایار

له پێنج و نیودا (لەیلان)مان جێهێشت و ڕووەو باکووری خۆرهەڵات، بەڕۆخی چەمی لەیلان دا بەڕێ کەوتین، کە دەکەوتە لای چەپمانەوە، ڕەوتیشی لە زوورگەکەوە، زنجیرەیەك ئاشی ئەمبەروبەرەکەی دیاری دەکرد، کە هەموویان قولیپی بچکۆلە و خڕی بەردینیان هەبوو. لە یەکێکیانەوە ئاشەوانێك هاواری دەکرد: (وێرئەڵلا) بە واتا (خوایە بینێریت). تێگەیشتم هەرکاتێ ئاشەکان لەکاردەکەون. بەمجۆرە بەردەوام هاوار دەکەن. ئیتر ئەوەی دانەوێڵەی هەبێت، دێتە پێشەوە بۆ ئەوەی بۆی بهاڕن.

دوای نیو سەعات گەیشتینە زوورگەکە، کە لێرەدا یەکسەر لە دەشتەکەدا بەرزدەبێتەوە و هەردەیەك پێکدێنێ، لە کفریەوە درێژ دەبۆوە و بەلای بەشەکەی لای خۆرهەڵاتیدا تێپەڕ دەبوو، ئەم هەردەیە ئاوەڕۆ و جۆگەیەکی زۆر، کە باراناو پێکی هێنابوون، دایاندڕیبوو، کردبوویانە شیوی تەنگەبەر و گردۆڵکەی بچووك بچووك. گەورەترینی ئەم چەمانە، ڕووبارەکەی (لەیلان)بوو، کە خوڕییەکەی نیشانی دەداین، ئەو شوێنەی لێوەی دێت، چەند لێژە. سەرچاوەی ئەم ئاوەش لەو زوورگەدایە، کە لە سەرەوە باسکرا. بەدرێژایی ڕەوتیشی هەر جۆگەی تری تێ دەهات.

ئەم دۆڵانەش هەموویان و بەتایبەتی دۆڵی (لەیلان) بریتین لە چەند گوندێکی بچووك، کە باخی میوە و گوڵ دەوری داون. بەتایبەتیش لەم وەرزەدا بەهەموو مانای وشەوە دەبنە بەهەشتی بچووك بچووك. بناغەی ئەم زوورگ و هەردەیەش تەمۆخێکی لاربوو، کە بەچاو دەبینرا. چینگەلێکی تری لاریش، بەهەمان سەمت و پلە هەیە، کە چیگەلی بەشە زوورگەکەی (متارا) هەیەتی. لەسەروو ئەم چینەشەوە، چینە گابەردێکی بە تۆپەڵ هەیە، کە وەریوە و بۆتە خاکێکی چەوەلەیی. ئەم جێگایە، یان ئەم ناوچەیە ناوی (قەرە حەسەن)ە، کە ڕاستەوخۆ بە پاشای بەغداوە لکێنراوەو دەسەڵاتی حاکمی کەرکووکی بەهیچ جۆرێك لەسەر نییە. ساڵانەش (٨٥) هەزار قرۆش دەدات. ماوەی شەش سەعاتێك درێژایی هەیە. جەنگی پێشوو هەڵمەتی کورد (پار) و ژمارەی دانیشتوانی ناوچەکە و بڕستی کشتوکاڵیان کەم کردۆتەوە. هەندێ پەڵە جۆمان بینی. بەڵام زۆربەی زەوییەکەی گیا داپۆشیبوو. لەناو گیاکەشدا ئەوەندەی چاوداری کێویلە و زەڕات و گوڵەکێوی تێدا بوو، جۆر و ژمارەیان نەدەزانرا. جگە لە جاترە کێوی و نەعنا و پوونگە. بەرزایی و تەپۆڵکەی زوورگەکانیش بۆ لەوەڕی مەڕومالات دەستیان دەدا. دۆڵەکانیش بۆ لەوەڕگەی گا و گۆتاڵ و ڕەوگە وڵاخ

دەبوون. لەکاتی سەرکەوتنمدا بەسەر ئەو هەردەیەدا کە لە دەشتەکەوە زۆر بەرز نەبوو، نە دەگەیشتە سێ سەد پێ، یەکسەر هەستمان بە جیاوازیی روخساری ناوچەکە و دەروونیشمان کرد، دەتوانین بڵێین ئیتر لە ناوچەی (گەرمەسێر)ی( ) ناخۆش ڕزگارمان بووە. هەستم کرد گەشکە و بزووتنێکی نوێ لە دەروونمدا سەری هەڵدا و پەژارە تەنگەکەم بەریدام و وردە وردە بێزارییم ڕەوییەوە، وەك چۆن هەوری شەوێکی زریان دەڕەوێتەوە، ئاوا هیوایەکی بەتام تیامدا ژیایەوە و سەرلەنوێ گورج بوومەوە و هەر منیش نەبووم کە ئەم هەموو هەستەم تێدا ببزوێ، بەڵکو هاوسەرەکەشم کە پێشتر باری تەندروستی شێوابوو، هەر کە قۆناغی ئەمڕۆی بڕی، هاتەوە سەرخۆی. زۆر لەوانەش کە لە کۆمەڵەکەمدا وەڕس ببوون، دوای دوو سەعاتە ڕێیەك، بەنێوان زوورگەکاندا، هەستیان دەکرد نیشانەکانی نەخۆشییان تێدا نامێنێ...

لە حەوت و نیودا بۆ ناو دۆڵێك شۆڕبووینەوە جۆگەیەکی بچووکی پێدا دەهات. لەو گردانەوە هەڵدەقولا و دەڕژایە ئاوی لەیلانەوە. هەرکە دیمەنەکەمان چاوپێکەوت، کۆمەڵەکە بە گەشکە و شادییەوە هاواریان لێ بەرزبووەوە. جۆگەیەکیش، ئاشێکی بچووکی دەگێڕا. لەولایشییەوە چەند کۆڵێتێك هەبوون، دارستانێکی چنار و بیی و هەنجیر و هەمەجۆر گوڵ دایان پۆشیبوون، کە لقوپۆپیان بە بەروبووم قورس ببوون. دارستانەکەش پڕی بلبل بوو، چریکەیان تێکەڵ خوڕەی ئاوی جۆگەکان دەکرد. هەرچۆنێك بێت، لەم گەردوونەدا کەسێك نییە ئەگەر هەستیشی کەم بێت، یان هەر نەیبێ، جوانیی سروشت کاری تێ نەکات، من وای دەبینم کە هۆی سەرەکی بۆ دەستبەرداربوونی کوردان، لە سەرۆکەکانیان، لە کاتی ناخۆشیدا، ترس و وەڕس بوونیانە لە کۆچکردنیان، لە نیشتمانی خۆیانەوە بۆ چۆڵەوانیی قێزەونی بەغداد.

ئەو تورکانەی لەگەڵم بوون، پێیان ناخۆش بوو ئەم دۆڵە جێ بهێڵن تا قاوەیەکی تێدا نۆش نەکەن. ئیتر منیش شتێکی وام هەست پێنەکرد بۆ جێبەجێکردنی ئارەزووەکەیان ڕێم لێ بگرێ. بەمجۆرە لەم جێگە خۆشەی پێی دەڵێن (حوسێن ئیسلام)، نیو سەعاتی خۆشمان بەسەربرد... پاشان رووەو هەوارەکەی (یوسف ئاغا) کەوتینە ڕێ، کە لە دۆڵی لەیلاندا نیو سەعاتێك دەبوو. ئیتر لە هەشتدا گەیشتینێ. قۆناغی ئەمڕۆمان بەدوو سەعات و نیو بڕی. جگە لەو نیو سەعاتەی تیایدا حەساینەوە... (یوسف ئاغا)، حاکمی ئێستای ناوچەی (قەرەحەسەن)ە و گورجیە، لە هاوڕێ دێرینەکانمە، هەر ئەوکەسەشە، کە لەکاتی ئەو شۆڕشەدا کە (سەعید پاشا)ی تێداکوژرا و (داوود پاشا)ی زاوای تێدابوو بە جێگیر، نامە و فەرمانگەلی بۆ هەوارەکەم بۆ دەهێنام. لە هەوارە خنجیلانەکەیدا خۆی زۆر چاك بۆ پێشوازی و میوانداریم ئامادە کردبوو و میواندارییەکی زۆر تێروتەسەلی کردین...

چادرەکانمان لەسەر بەرزاییەك هەڵدان، بەسەر دۆڵی لەیلاندا دەینواڕی. وەك ئەوەی (حوسین ئیسلام)یش ئەمبەروبەری بە گیا، یان بە بەهەشتێکی نەشمیلە داپۆشرابوو. جێگاکەش یەکجار دڵگیر بوو. هەندێ گوڵی پەرژینمان لە دۆڵەکەدا بینی، لەوانەی ئینگلتەرە دەچوون. ئەو گەشکە و شادییەش ئەم گوڵە کێوییانە لە دەروونددا دروستیان دەکرد، هەموو بۆنەخۆشەکانی خۆرهەڵاتی دەهێنا.

تاوێ دوای گەیشتنم، ئاگاداریان کردم کە نێردراوێك لای (مووسا ئاغا)ی حاکمی کەرکووکەوە هاتووە، کە چوار سەعاتێك، یان دوازدە میلێك لێمانەوە دووردەبوو. نامەیەکی ناسکی لای گەورەکەیەوە بۆ هێنابووم، تیایدا داوام لێدەکات کە چەند ڕۆژێك لای میوان بم. بیستیشم کە خۆی بۆ پێشوازی لێکردنێکی یەکجار گەورە ئامادە کردووە، بەڵام ناچارم دەست بەڕووی بانگهێشتنەکەیەوە بنێم... لەوانەشە بەڕێی کەرکووکدا بگەڕێینەوە...

## ٤ی ئایار

سەعات (٤) ی ئەم بەیانییە بەدەم ژانەسەرێکی زۆرەوە خەبەرم بۆوە، لەو جۆرەی کە مرۆڤ لەپڕێکدا یەك بین شەربەتێکی لیمۆی بەفراویی بخواتەوە. تا گەرمای ڕۆژێش زیاتر لێی دەدام، ژانەسەرەکەم بەری دەدام...

لە پێنج و نیوی بەیانیدا سواری ئەسپەکانمان بووین و رووەو بەو دۆڵەی رووباری لەیلانی پێدا دێت، بەڕێ کەوتین. جاروباریش بەپەڕینەوە لە ئاوە کەمەکەی، ناچار دەبووین دابەزین. دولەکە تەنگ و پێچاوپێچ بوو، تا زیاتریش دەچووین، هەر جوانتری دەنواند. گەلێ جار بەناو گژوگیای چڕ و تەنگەی پڕ لە هەنار و توو و داری بەری و هەمەجۆر گوڵدا تێپەڕ دەبووین. ئەگەریش بمانەوێ بەگوێرەی پانتایی دەراو و ڕێڕەوی رووباری (لەیلان) قسە بکەین، کە خەریکە پڕاوپڕی دۆڵەکە بێ و ئێستا هەر جۆگەیەکی بچووکە، ئەوا دەبێ لەکاتی باراناودا سێلاوێکی گەورە بێ. تا سەریش دەکەوتین جۆگەیەکی زۆری تێدەڕژا. لەمبەروبەریشەوە تا ماوەی سێ میلێك دارودرەختی لێ نێژرابوو، بە لاپاڵی زوورگەکەشەوە هەندێ رەزمان بینی. زەوییەکەشی بە جاترە کێویلە و مۆرت و نووسەنەکی گوڵ کردوو و چەندان ڕووەکی ناو گیاکە داپۆشرابوو. تا بەرەو ژوورتریش دەبووینەوە ، هەست دەکرا زەوییەکەش بەرزتر دەبێتەوە.

پێش هەشتی بەیانی، سەمتی رۆیشتنەکەمان (٧٥) پلە بەرەو باکووری خۆرهەڵات بوو، لێرەوە ئیتر لە نزیك سەرچاوەی (لەیلان) دووردەکەوتینەوە. رووەو باکوور زوورگەکەمان بڕی.

لە بەرزایی ئەم زوورگانەوە چەم و جۆگە بەرەو کوردستان شۆڕدەبنەوە. لێرەش بەدواوە دەسەڵاتی (قەرەحەسەن) دوایی هات دەسەڵاتی (سلێمانی)دەستی پێدەکرد٥٢.

لەنزیك نۆدا بەڕاستە ڕێگایەکدا شۆڕبووینەوە، ناخۆش نەبوو. ئەگەر بشێ بڵێم لە ماوەی بیست دەقیقەدا گەیشتینە یەکەمین ئێستگەمان. لای راستمانەوە لەسەر بەرزاییەك خانوویەکی بچووك هەبوو، مەزار بوو، پێیان دەوت (مەزاری خۆر ئەلیاس)(٥٣) جێگایەکی پیرۆزە لای کورد و پێیان وایە راوکردن لە نزیکیدا حەرامە.

---

٥٢- مەبەست لە دەسەڵاتی میرنشینی (بابان)ە، کە شاری سلێمانی پایتەختەکەیەتی (م).

٥٣- یان مەرقەدی ئەلیاس پێغەمبەر. موسڵمانەکانیش پێیان وایە (ئەلیاس) نەمردووە و هێشتا لەسەر زەوییە و تا (مەسیح)یش دێت هەر لەسەر زەوی دەبێت. بە (ئەلیاس)یش دەڵێن (خچر)، واتە هەمیشە (سەوز)، کە بۆ ژیانی هەمیشەییە، یان نەمرە، کە خۆی هەیەتی و وای لێکردووە لەبارێکی هەمیشە گەشەکردوودابێ و بەردەوام لە باخێکدا بێ، دەڵێن هەر خودی (بەهەشت) بێت. لەم بڕوایەوە شاعیرێکی تورك، شیعرێکی وتووە، ئەمە ماناکەیەتی:

(وریا بە. وا تێنەگەیت ئەم دنیایە نیشتمانتە،

نیشتمانەکەت هەر تەنیا بەهەشتە.

لەبەرئەوە پابەندی بەرزێتیی بە،

بۆ ئەوەی بگەیتە ئەو نیشتمانەی کە

(ئەلیاس) تیایدا دەژی و شوێنی تۆش لەوێیە.

ئەم بەسەرهاتە خۆشەش کە لە کتێبی (کتێبخانەی خۆرهەڵاتی biblioteque orientale) لە نووسینی (دیربی لو - D’herbelot) وەرگیراوە، دەبێ هەموو دیانێك بەخۆشیی و گرنگییەوە بیخوێنێتەوە:-

(کاتێ عەرەبەکان، لەساڵی شازدەی کۆچیدا دەستیان بەسەر (حەلوان)دا گرت و (٣٠٠) سوارەی ئەم هێرشەیان بە سەرکردایەتی (فچلیە) گەڕانەوە و ئێوارە لەنێوان دوو کێودا، لە سوریا، هۆردویان خست، ئاگاداری (فچلیە) کرا، کە نوێژی ئێوارەیە. ئەویش بەدەنگێکی بەرز کەوتە وتنەوەی (اللـه اکـبر) و ڕستەکانی تری دەقی بانگدان و دەنگەکەی کەوتە دەنگدانەوە و تا دوای بانگدانەکەش، دەنگەکە هەر دەنگی دەدایەوە. دوای ئەوەی (فچلیە) لە نوێژەکەی بووەوە، هاواری کرد: هۆ ئەو کەسەی قسە دەکەیت، ئەگەر فریشتەیت خوا پشتیوانت بێ و ئەگەر گیانداری تریت، ئەوا دەربەست نیم. بەڵام ئەگەر وەك من مرۆڤیت، خۆتم نیشاندە، بەڵکو کەڵك لە ئامۆژگارییەکانت وەربگرم. هێشتا قسەکانی تەواو نەکردبوو کە پیرێکی سەر ڕووتاوەی گۆچان بەدەست، وەك دەروێش دەرکەوت و دوای ئەوەی سڵاویان لە یەکترکرد، فچلیە - لە پیرەکەی پرسی: کێیت؟ پیرەش پێی وت: من لەسەر فەرمانی حەزرەتی (مەسیح) لێرەم، کە بەتەنیا جێی هێشتووم، تا دووبارە بۆی

دێتەوە. لەبەرئەوە من چاوەڕێی حەزرەتی مەسیح دەکەم، کە چاووگەی هەموو بەختەوەرییەکە. لەسەر فەرمانی ئەویش لەوبەری ئەو کێوانەوە دەژیم. کاتێ (فچیلە) گوێی لەم قسانە بوو، هەواڵی کاتی گەڕانەوەی مەسیحی لێ پرسی، کە پیرەکەش وەڵامی دایەوە: (لەو دنیا و لە نزیکبوونەوەی ڕۆژی حسابدا دەردەکەویتەوە)، لاپرەسەنی زیادی کرد و کەوتە پرسیارکردن و داوای لێکرد نیشانەکانی ڕۆژی دوایی پێ بڵێ. خچر ئەلیاسیش بەدەنگێکی پێغەمبەرانە وەڵامی دایەوە: (ئەوکاتەی ژن و پیاو پلەوپایەی خۆیان لەیاد دەچێ و دانەوێڵەش زۆر دەبێ و نرخی هەرزان نابێ و خوێنی بێ تاوان دەڕژێ و هەژاران داوای یارمەتی دەکەن و وەڵامیان نابێ و چرای خۆشەویستیی دەکوژێتەوە و نووسراوی کتێبە پیرۆزەکان نامێنن و دەبنە گۆرانی و مزگەوتەکان کە بۆ خواپەرستی دروستکراون، پڕ دەبن لە بت، ئەوکاتە ئیتر ڕۆژی دوایی نزیك دەبێتەوە). هێشتا پیرە قسەکانی تەواو نەکردبوو. کە گوم بوو - لە کتێبی (کتێبخانەی خۆرهەڵاتەوە، ل ٧٤٢)، خاریچ.

ئەم بیروباوەڕە ئیسلامییانە لە جوولەکەوە وەرگیراوە، چونکە ئەوان (مەسیحیان لە جێی ئەلیاس) داناوە، کە حەوت سەدە دوای ونبوونی دەردەکەوێتەوە. ئەم پێشبینییە وای کردووە کە بڕوا بکرێ ئەلیاس (قَبْلَ يَوم أَلمُخّوف) دەربکەوێ و هێشتا پەیامەکەیشی لەسەر زەوی تەواو نەکردووە. ژیرترین (حاخام)ەکانیش وتوویانە (ئەلیاس) لە بەهەشتدا لەژێر درەختی ژیاندا دانیشتووە و کردەوە باشەکانی جوولەکەکان تۆمار دەکات، بەتایبەتی ڕێزگرتنیان بۆ پیرۆزیی ڕۆژانی شەمووان. بڕواشیان وایە کە ئەنجامدانی کاری روحیی، ئەنجامدانێکی چاکە و دەشێ ببێتە هۆی دەرکەوتنی، یان ئامادەبوونی و دەرگا دەخەنە سەرپشت، تا پیایدا بێتە ژوورەوە. ویردخوێندنەکانیشیان لە کۆتایی ڕۆژانی شەمووان‌دا پڕە لەناوهێنانی و پاڕانەوە لێی و تا پیرۆزیان بکات و کاتی خەتەنەکردنی منداڵانیشیان بەلاوە لەو شتانەیە کە لای ئەو، گرنگییەکی تایبەتی هەیە و لەمجۆرە کاتانەدا داوای ئامادەبوونی دەکەن و جێگایەکیش لەناو جێگاکاندا بەچۆڵیی بۆ دەهێڵنەوە و گومانیان لەوەدانییە، کە ئەگەر هەموو کاروبارەکان وەك خۆیان ئەنجام بدرێن، هەر دەبێ لێی دابنیشێ. لە ناویشیاندا وا بڵاوە کە (حاخام)ی هودا، کاتێ لە ئاهەنگێکی خەتەنەکردندا، لە (رابتسبون) ئامادە بووە، بەچاوی روحیی دیویێتی کە جێگەی (ئەلیاس) چۆڵە. ئیتر نوقڵانەی ئەوەی لێداوە، کە منداڵەکە لەداهاتوودا پیاوچاك دەبێ، هەر بەڕاستیش لەدواییدا منداڵەکە بۆتە دیان. بڕواشیان وایە کە ئامادەبوونی (ئەلیاس) لەمجۆرە ئاهەنگانەدا، کارێکی فەرمان پێکراوە، ئەویش لەبەرئەوەی زۆر بەتەنگ خەتەنەکردنی منداڵەوەیە. هەر ئەمەش وای لێکردووە گازندە بکات : (... لِأن بَني إسرائيل قَدتَرَكُو عَهدكَ...)، المـلـُوك، ص١٤-١٩)، مەبەستیش لە (عَهد-پەیمان) لێرەدا پەیمانی خەتەنەکردنە. دیسان هەر بە هۆی ئەمانەشەوەیە کە بە (ئەلیاس دەوترێ: فریشتەی پەیمان).

ئەوەیشی جێی سەرنجە، ئێمە ئەگەر تێگەیشتنی جوولەکە، بۆ دەرکەوتنی ئەلیاس بە (قَبلَ يَوم الرَّب) لەگەڵ چیرۆکی باسکراوی ئیسلامیدا بەراورد بکەین، دەبینین مانای ئەوەیە دەرکەوتنەکەی، سەرەتایە بۆ دەرکەوتنی حەزرەتی (مەسیح). لەهەمان کاتیشدا مانای وایە کە دەسەڵاتێکی یەزدانییە و ئاماژەکردنە بۆ زەمینە خۆشکردنی ئەو

هەر لێرەوە بە لێژاییەکی زۆرکەمدا ڕووەو باکووری خۆرهەڵات، بەرەو (چەمچەماڵ) شۆڕبووینەوە، چەمچەماڵیش گردێکی بەرزی تووەرەکەرێژە، ناوەکەیشیان یان لەو دەورەی خۆیەوە وەرگرتووە، یان دەوروبەرەکەی ناوەکەی لەمەوە وەرگرتووە. بەدەم ڕۆیشتنمانەوە بەرەو ئەم گردە، بەلای پەڵە جۆیەکی زۆردا تێپەڕ بووین، کە زۆر جوان بوون، بەڵام هێشتا نەگەیشتبوون و وەختی دروێنەیان نەهاتبوو. هەروەها بەلای مەزرایەکی زۆری نیسك و لەوەڕێکی بەرفراواندا تێپەڕین.

لە دەی پێش نیوەڕۆدا گەیشتینە هەوارەکەمان، کە چادرەکان لەسەر گردەکەی (چەمچەماڵ) هەڵدرابوون، جێگاکەش شوێنی هەوارێکی زۆر فراوانتری لەوەی ئێمەی تێدا دەبووەوە. دەشتەکە هەر رووەو خۆرهەڵات شۆڕدەبووەوە. لەبەرئەوە گردەکە وای دەنواند، کە لای خۆرهەڵاتییەوە لەچاو لایەنەکانی تریدا بەرزترە. بە بەرزاییەکی وەك شێوە شاقولی، سەد پێیەك زیاتر دەبوو. ناشتوانین تەمەنێکی بۆ دیاری بکەین، یان سەردەمێکی بۆ بیگێڕینەوە هەندێ لەتە گۆزە و دیزەی چاکمان چنگ کەوت، ڕەنگیان سوورێکی تێر بوون، بەردی گەورەشمان تێدا دییەوە، بەڵام شتێکی وامان چنگ نەکەوت، گردەکەمان بۆ دەستنیشان بکات، کە بەلای کەمەوە دەبێ ساسانیی، یان ڕەنگە لە سەردەمی ساسانی کۆنتریش بێت. لەسەر تەوقە سەرییەوە ئەم وشانە دەنووسم: بەسەر دیمەنێکی جوانی چیاکانی کوردستاندا دەنوارم، کە لە سەرووییەوە (کۆیسنجاق)ە، لە باشووری خۆرهەڵاتیشەوە (سەگرمە)یە.

دەشتەکە تا لای شیوی گردەکە، هەر شۆڕدەبێتەوە، ئیتر لەوێوە چەمی (جای)، یان چەمی (چەمچەماڵ)ە، دوای ئەوە دووبارە وردە وردە هەڵدەکشێتەوە و پاشان تا زنجیرە چیاکەی (بازیان) دەبێتە هەوراز و نشێوی. لەوێشدا هەردوو دەربەندی (سەگرمە- و - دەربەند) هەن، کە ئەمی دواییان یەکسەر بەرامبەرمانە. لە پشتیشەوە کێوی (پیر عومەر گودرون- پیرەمەگروون) بەرزدەبێتەوە، کە بەشێکی تری زنجیرەیەکی بەرزتر پێکدەهێنێ و وەك دەردەکەوێ بەردەڵانی و رووتەنە. گودرون بەرزترین کێوی ئەم ناوچەیەیە. دەڵێن گەنجینەیەکی بەفری تێدایە، سەهۆڵ، یان بەفرەکەی بەشی هەموو کوردستان دەکات. گەنجینەی ئەم بەفرەی نەدوایی دێت، نەدەتوێتەوە. لەنێوان هەندێ چاڵاییەکانیشیدا بەفرم بینی.

---

سەردەمە، مانای تەواوکردنی پەیامەکەیەتی. لەبەرئەوە لە خۆرئاوابوونی هەموو ڕۆژانێکی شەمموواندا، دەپارێتەوە کە لە شەممەی داهاتوودا دەربکەوێ، تا نیشانەکانی دەرکەوتنی (مەسیح ڕابگەیەنێ . بڕوانە لاپەڕەکانی (٨٠ و ٢٥٥)ی Synagoga Judica نووسینی Boxtrf) چاپی باسل ١٦٤١ز - خاریچ.

ئێستاش هەوڵ دەدەم ئەوەندەی لە (چەمچەماڵ)ەوە دەیبینم، باسێکی ئەم بەشەی زنجیرە چیاکانی کوردستان بکەم. ئەو هێڵەی کە راستەوڕاست بەرامبەرمانە و لە باکوورەوە بۆ باشووری خۆرهەڵات درێژبۆتەوە. زنجیرەیەکی باریك و رووتەن و زۆر کوورە، ناوی چیاکانی (بازیان)ە. لە ژوور (دەربەندی بازیان)یشەوە، کە وتم لە بەرامبەرمانەوە لێمانەوە دیارە، چیاکان یەکسەر رووەو خۆرئاوا وەردەسووڕێنەوە و شاخەکانی (خاڵ خاڵان) پێك دێنێ، کە لەدامێنیانەوە بە سنووری پاشایەتی کۆیسنجاق دەگاتەوە. لەخوار تەنگەی (دەربەندی بازیان)یشەوە، چیاکانراست رووەو باشوور و کەمێکیش بەلای خۆرهەڵاتدا درێژ دەبنەوە. لەم بەشەی ئەم شاخەدا دەربەندێکی تر هەیە، ناوی (دەربەند باسەڕە)یە و دوای ئەمە شاخەکان بەهەمان سەمت، بەردەوام درێژدەبنەوە و ناویان دەبێ بە (قەرەداغ) و ئیتر چیاکان هەمووی لێڕەوارن. ئەمەش ئەو سێیەمین رێگایەیە، کە لە دەشتەکانی (ئاپوریا)وە دەچنەوە سەر کوردستان و ناوی رێگای (سەگرمە)، یان (پلەکان)ە. لەبەرئەوەش کە راستەوخۆ بەسەر کێوەکەدا سەر دەکەوێ، ئەم رێگایانە بۆ لەشکرکێشیی زۆرگرانە، یان هەر نابێ.

ئەوڕەحمان پاشای حاکمی پێشووی سلێمانی، کاتێ کە دەیویست سەربەخۆیی کوردستان بەدەست بهێنێ، هەموو ئەم دەربەندانەی قایم کردبوو، بەڵام کە (سلێمان بچکۆلەی پاشای بەغداد)، بەسەریدا سەرکەوت، هەموو قایمکارییەکانی تێکشکاند...

چیای (قەرەداغ) دەبێتە سنوور بۆ (دیالە). لە خوار (دەربەند باسەڕە)شەوە یەکسەر ڕووەو خۆرئاوا شاخەکانی (زەنگەنە) لە (قەرەداغ) جیا دەبنەوە، لە سەرەتادا بەرزاییەکەی کەمە، بەڵام کە بەلای باشووردا لادەکاتەوە، وەك ئەوە وایە بیەوێ لەگەڵ شاخی (قەرەداغ)دا زنجیرەیەکی هاوتەریب بێت، ئیتر بەرزتر دەبێتەوە و دەگاتە شانی ئەو و یەکسەریش لەپشت ئەم بەشەوە، یان بەلای خۆرهەڵاتیەوە، لووتکەی بڵندترم لێ دیارە، کە نازانم سەر بە چ زنجیرەیەکە، بەڵام بەشێکە لە ناوچەی (دەلۆ). پێش ئەم بەشە بەرزەش، راستەوخۆ، یان لای خۆرئاوایەوە، کە پێدەچێ کۆتایی زنجیرەی (زەنگەنە)(٥٤) پێك بهێنێ، هەندێ وردە زوورگی تر دیارن، کە باش نابینرێن. ئیتر (ئیبراهیم خانچی) و (کیللی) لەسەر سنووری تورکیان. لەوە دوورتریش ڕووەو خۆرئاوا، هێڵی زوورگەکانی (کفری) و (توزخورماتوو) دەبینرێن، دەڵێی دەیانەوێ بێنە پێشەوە و بە زوورگەکانی (قەرەحەسەن) بگەنەوە، کە کەمێك رووەو

---

٥٤- کاتێ لەلاوە سەرنجی ئەم زوورگانەم دەدا، سەیرم کرد چینەکانی ئەم زنجیرەیە بەهەمان سەمتی چینەکانی(حەمرین)، هەموویان ڕوویان دەکردە خۆرهەڵات .

باکوور(٥٥)هەڵدەکشێن و پاشان کە بەلای خۆرئاوادا لادەکەنەوە، لەچاو دیار نامێنن و لە پشتیانەوە تا زوورگەکانی (خاڵ خالان) ئاسۆیەکی چۆڵ جێدەهێڵن.

لەسەر گردەکەی (چەمچەماڵ)ەوە هیچ گوندێکمان لێدەرنەکەوتن، چونکە هەموویان لە چاڵیدا و لەمبەروبەری چەمە بچووکەکان بوون. لەم کاتەدا گوندنشینەکان، گوندەکانیان جێهێشتبوو، چووبوونە ڕەشماڵەکانیانەوە کە لە مووی ڕەش دروست دەکرێ، بۆ لەوەڕاندن و چاودێریی خەلە و خەرمانیان. لە کوردستاندا هەموو کشتوکاڵێکیان تەنیا بە ئاوی باراناو(٥٦) دەکرێ چونکە بەراویان نییە.

گەرما لە پێنجی بەیانیدا (٤٠) پلە و لە دووی دوای نیوەڕۆدا (٧٩) پلە و لە دەی شەودا (٥٩) پلە بوو. لە باکووری خۆرهەڵاتیشەوە (با) هەبوو، شەوێکی هێمن بوو. دوێنێ شەو دنیا ئەوەندە سارد ببوو، کاری لە کۆمەڵەکەمان کردبوو، کە ماندوو بوون و خۆیان کردبۆوە. گەرماش لە دووی دوای نیوەڕۆدا (٧٩) پلە بوو، بەڵام ئەم پلەیە هەر نیو سەعاتی خایاند...

## 5ی ئایار

ئەم بەیانییە باران زۆر باریبوو، چەند ساڵێك دەبوو بەوجۆرە نەمدیبوو. دوای تاوێکیش کە خۆر هەڵهات، کردی بە پەلکەزێڕینە، لەناو تەمی بەیانیدا چریسك و هوڕی خۆری لێدەدا. لەبەرەبەیاندا زنجیرەی (قەندیل - باخ)مان لێدەرکەوت، کە (١٩) پلە بەلای باکووری خۆرهەڵاتدا دەیڕوانی هەر ئەم زنجیرەیە بوو کە کێوەکانی (ڕەواندز) و (ئاکۆ) و (سی کەنە) و (ساووق - بولاق)ی پێك دەهێنا، کە لەڕاستیشدا ئەمانە بە هەموویان هەر بەشێك بوون لە کێوەکانی (زاگرۆس)، کە سنووری گەورەی نێوان ئێران و تورکیا پێك دەهێنن و تا ئەو دامێنەش کە لێمانەوە دیاربوو، بەفر داپۆشیبوو، بەڵام ترۆپکەکانی گرنج گرنج و دەرچووبوون.

لە پێنج و نیودا ئاسایی دەستمان بە ڕۆیشتن کردەوە. بۆئەوەش بچینە سەر ڕێی کەرکووك، رووەو باکووری خۆرهەڵات دەچووین. ڕێگایەکی راستتر لەنێوان (چەمچەماڵ) و

---

٥٥- ئەو ڕێگایەی لە کەرکووکەوە بۆ (دەربەند) دەچێت، پێی دەوترێ ڕێگای (کێشەخان) و بەسەر بەرزاییەکانی ئەم زوورگانەشدا تێپەڕ دەبێ.

٥٦- ئەو کشتوکاڵەی بە باران دەکرێ، خەڵك پێی دەڵێن(دێم)، کە وشەیەکی عەرەبییە بەڵام لەو وڵاتانەدا کە بارانی ئیستوائی تێدا نییە، مەرەزە و لۆکە، بە ئاوێژە دەکەن.

(دەربەند)دا هەیە، ماوەی سەعاتێك دەبێ، بەڵام ئێمە ڕێگاکەی کەرکووکمان پەسەند کرد، چونکە ئاسانتربوو، تا زیاتریش بۆ پێشەوە دەچووین، زەوی زیاتر پڕ توونکەتوونکە دەبوو. خاکەکەیشی کە لە دوورەوە سەیرت بکردایە ڕەنگی ئاڵ دەینواند. بەڵام دۆڵەکانی زۆر قووڵ بوون و چەمی بچووك و زۆر، دڕیبوونی و لە هەموو کەلێنێکەوە پیایدا دەڕۆیشتن، رووی زەویش گژوگیای هەمەجۆرە داپۆشیبوو. جۆمان زۆر کەم بینی.

لە نۆی پێش نیوەڕۆدا گەیشتینە گەرووی (دەربەند). ئەو ڕێگایەی لێی نزیك دەبووەوە، دەتوت زۆنگاوە، کە دیارە لە زستاندا زۆر ناخۆش دەبێ، لە شانی لای چەپی تەنگەکەدا خانێکی بچووك هەیە، ڕاستەوخۆ لە بەرایشیدا کەلاوەیەکی چوارگۆشەی بچووك، یان سەکۆیەك هەیە، هێشتا ئاسەواری گومەزی خڕی لێیە و هەندێ بیرە ئاویش. ئەمەش هەر لە سەکۆکانی قەسری شیرین و (حۆش کەڕوو)(٥٧)دەچوو، کە بێگومان دەبێ وەك ئەوانیش هەر ساسانی بێت. من هەروا بە لاپرەسەنی لە پاسەوانەکەی(٥٨) (دەربەند)م پرسی: ئەمە کێ کردوویەتی؟ بێ سێ و دوو وەڵامی دامەوە: (خوسرەو).

ئەم تەنگەیەی (دەربەند) هەر تەنیا خەرەندێکە، یان بەربەستێکە بۆ بەستنی دۆڵەکە. لێژاییەکەیشی زۆر کووڕە و هەر ئەوەندە بۆشایی دەهێڵێتەوە کە بۆ پێدا تێپەڕ بوون بشێ، چونکە بەربەستێکی تەواوی ئەو ڕێگایەیە کە دەچێتەوە سەر کوردستان. ئەم بەربەستە لە چینگەلێکی تەنك دروستبووە، کە ڕووەو دەرەوە، یان رووەو خۆرئاوا و کەمێك لێژە، بەلای باری شاقولی ئێستایەوە، لار بۆتەوە.

وەك پێشتریش وتم ئەم تەنگەیە، کاتی خۆی (ئەوڕەحمان پاشا) قایمی کرد و وارش و دەروازەیەکی بۆ دروستکرد و سێ چوار تۆپیشی لێ دانا، دووانیانی لە بەرزاییەکان بۆ تۆپبارانکردنی لەشکری تورك، لە چاڵاییەکەدا دانا ، سلێمان پاشاش بیویستایە هێرش بکاتە سەر، تەقەڵلاکەی بێهوودە دەبوو، ئەگەر سەرکردەیەکی کورد نەبووایە، بەناوی (مەحموودبەگی خالید پاشا)، کە لەگەڵ تورکاندا ڕێککەوت و بەخۆی و هەندێ کوردەوە، سەرکردایەتی تیپێکی تورکی کرد و لە کەلێنێکەوە شاخەکانی گرت، کە ژمارەیەکی کەم لە کورد پێیان دەزانی. ئەوڕەحمان پاشاش ئەو شوێنەی گوێ پێنەدا و پێی وابووە بۆ ئەوجۆرە

٥٧-بڕوانە پاشکۆکە.

٥٨- لە تەنگەی (دەربەند)پاسەوان هەیە، کە بۆ هەر بارێك دوازدە پارە وەردەگرێ. بەڵام ئەم باجەیان لە ئێمە نەسەند.

شتانە دەست نادات، بەمجۆرە بۆی دەرکەوت سەنگەرەکانی لەپشتەوە لێگیراوە و تۆپە دابەستراوەکانی سەر بەرزاییەکانیشی، لەسەرووترەوە نیشانیان لێگیراوە، لەبەرئەوە ناچار بوو پاشەکشێ بکات. سلێمان پاشای بەغداش وارشەکەی تێکدا و پاشان بەرەو سلێمانی کشا.

پاش ئەوەی لە (دەربەند)(٥٩) قاوەیەکمان خواردەوە، لە نۆدا دەستمان بە ڕۆیشتن کردەوە. لێرەوە دۆڵەکە بەرینتر و پێچاوپێچ دەبووەوە، بەناو زنجیرەی (بازیان)دا تێپەڕ دەبوو. لێرەدا چینگەلی چیاکان هەموویان روویان لە خۆرهەڵات دەکرد. پێم وایە ئەم کێوانە پێشتر (کلس - Calcare Ous) - بوون. کەمێکی تری لای چەپی زوورگەکانەوە، کەلاوەیەك هەیە، ناوی (شەیتان بازاڕ)ە و، بریتییە لە ڕیزە گومەزێکی بچووك، ئەم کەلاوەیە و کەلاوەکەی تریش کەناوی (گەورە قەڵا)یە و ئەویش هەر دەکەوتە لای چەپەوە و لەنێوان زوورگەکەدایە، بەپێی شێوە و هەڵکەوتیان، گومانیان تێدا نییە کە هەردووکیان ساسانین. کێوی (گودرون - گورون)یش کەمێك لای چەپمانەوە، یەکسەر بەرامبەرمانە.

لە دەی پێش نیوەڕۆدا بەلای بەشێکی دۆڵەکەدا لامان کردەوە، کە لەوێدا زۆر پانتر دەبۆوە و لە گوندی (دەرگەزێن)یش نزیکتر دەبووەوە، کە دوای نزیکەی چارەکە سەعاتێك گەیشتینێ. لە دەرگای چادرەکەمانەوە، بەلای باکووری خۆرهەڵات و لە دووری سێ چارەکە میلێکەوە گردێکی تری توورەکەڕێژمان لێ دیار بوو، کوتومت لە گردەکەی چەمچەماڵ دەچوو، ناویشی (کۆبارا)(٦٠) بوو.

دەسەڵاتی ناوچەی (بازیان) تا ئەو لووتکانە بڕ دەکات، کە لای باکووری خۆرهەڵاتی ئێمەوەن و لەژێر (گودرون) دان، ئیتر لەوێوە دەسەڵاتی (سورداش) دەست پێدەکات. لەم کێوانەدا شوور(٦١) و بزنەکێوی و ورچ و پڵنگێکی زۆریش هەیە.

---

٥٩- دەسەڵاتی حکوومەت، یان لیوای (بازیان) لە دۆڵێکەوە، یان لە چەمێکی بچکۆڵەوە دەست پێدەکات، پێی دەڵێن (دۆڵە سوور)، کە نیو سەعات لە خۆرئاوای گەرووی (دەربەند)ەوە دوورە - پەراوێزەکە دوایی هات - ناوی ئێستای (شیوە سوور)ە - ع.

٦٠- (گۆپاڵە) وەك ئێستا پێوەی ناسراوە-ع.

٦١- زۆرم تەقەللادا ناوی تری ئەم ئاژەڵە بزانم، کە لە توخمی (ئاسك)ە و بە ئاژەڵێکی بەسزمان و بێ وەی ناسراوە، تەنانەت لەڕاوچییانی شارەزا و ناسراویشم پرسی، ئەوانیش پێیان وایە، کە (وعل)ی عەرەبی، هەر (شوور)ە. بەڵام (شێخ مارفی نۆدێ) لە قاموسە بەناوبانگەکەیدا: (ئەحمەدی)، وشەی (وعل)ی عەرەبی، بە (نێرە بزنی کێویی) ناوهێناوە. ئەوەی شایانی باسە ئەم ئاژەڵە، شێوەی شاخەکانی وەك ئاسك نییە، بەڵکو

کشتوکاڵی دەوروبەری (دەرگەزێن)(٦٢) بەشێوەیەکی تایبەتی بریتییە لە مەرەزە و لۆکە و کونجی و تووتن. چەند چەمێکی بچووکیش لە زوورگەکانەوە بۆ نزیك گوندەکە، بۆ ئاوێژەی دۆڵەکە شۆڕدەبوونەوە. هەروەها هەندێ ڕەزیش لە زوورگەکاندا هەبوون.

گەرما لە پێنجی بەیانیدا (٥٦) پلە و لە دووی نیوەڕۆدا (٧٨) پلە و لە دەی شەودا (٥٤) پلە بوو. لە خۆرهەڵاتیشەوە (با) هێمن و لەسەرخۆیە.

## ٦ی ئایار

لە پێنج و نیودا دەستمان بەڕۆیشتن کردەوە. بەیانییەکی هێمن و هەوراوی بوو. لەبەرئەوەش ڕێگاکە بەهۆی قوڕەوە پێچی زۆری تێدەکەوت، نەمتوانی سەمتی ڕێگاکەمان دیاری بکەم، تا نەگەیشتینە سەر ئەو ڕێیەی بۆ سەر سلێمانی دەچێتەوە، چونکە دەمزانی ئەو گوندەی جێمان هێشتووە، لەم شوێنەوە دیار دەبێ، کە تیایدا گەیشتووینەتە سەر ڕێگاکە(٦٣).

دەڕۆیشتین و دۆڵەکەمان لەبەری خۆرئاوایەوە دەبڕی و (دەرگەزێن) دەکەوتە بەری زوورگەکانی خۆرهەڵاتەوە، کە بەلاپاڵەکانیاندا دەڕۆیشتین. بەهۆی ئەم قوڕولیتە و زۆنگەوە کە جۆگەلەی زۆر لە هەموولایەکەوە دروستیان کردبوو، زۆر لەسەرخۆ ڕێمان دەکرد. تاوێ دوای جێهێشتنی دەرگەزێن لە چەمێکی جوانماندا، کە لە بن بەردەکانەوە هەڵدەقوڵا، کەمێك شۆڕدەبووەوە و تاڤگەیەکی بچووکی پێکدەهێنا. بە ئێرەیان دەوت (دۆڵی شەیتان).

لە شەش و نیودا بەلای گوندی (لازیان)، یان (لاجان)دا تێپەڕین، کە دەکەوتە لای راستمانەوە. دوای تاوێ گەیشتینە سەر ڕێگەی راستەوخۆی سلێمانی.

---

پەل پەلە و لقی لێ دەبێتەوە. بەرامبەر بەجۆرە ئاژەڵە، مامۆستا (کەمال جەلال غەریب) لە قاموسەکەیدا (أیل)ی لەبری (وعل) بەجۆرە باسکردووە: (شقن، ئەوور، شوول، گەوەزن، فیلەگێژە، ئافوور، هەفووری، گیانداریکی سمدارە، شاخی نێرەکەی لقی لێ دەبێتەوە، بەڵام مێیەکەی بێ شاخە. ئاسك)، كمال جلال غريب القاموس العلمي، الجزو الاول، ص ١٨٨، مگبعە کامەرانی، السلیمانیە، ١٩٧٣-م.

سەرنج: گەوەزن: ناوی فارسیی ئەم ئاژەڵەیە- م.

٦٢- ئەم شوێنە (دەرگەزێن)ی ناونراوە، چونکە لە بنەڕەتدا تورکمانە دەرگەزێنییەکانی تێدابووە.

٦٣- ڕێگایەکیش بۆ (سلێمانی) هەیە، بەدۆڵی (دەرگەزێن)دا تێپەڕ دەبێ و بەلێواری شانی خۆرئاوایدا دەڕوات. بەڵام پێیان وتین لەو ڕێیە قوڕاوی ترە، کە ئێمەی پێدا ڕۆیشتین.

گوندی (لازیان)یش ئەگەرچی مەڵبەندی ناوچەکەیە، بەڵام وەك تێکڕای ئەو گوندە کوردییانەی ترە، کە تا ئێستا دیومن، پیسە و لە قوڕ دروستکراوە و دەکەوێتە ژوور خۆرهەڵاتی ئێمەوە، بە لاپاڵی ئەو زوورگانەوەیە، نزیکەی دوو سەعات و نیوێك دوور دەبێ.

سەمتی ڕۆیشتنەکەشمان (٣٠) پلە بەلای باشووری خۆرهەڵاتدا بوو. گیایەکی بەرز و پاراویشی تێدابوو. ئەوەتەی پێمان ناوەتە کوردستانەوە، پەڵەی دانەوێڵەمان نەدیوە پێگەیشتبێ و کاتی ئەوەی هاتبێ داس بیدروێ.

بەلای ئەو زوورگانەدا تێپەڕ بووین کە لای خۆرهەڵاتەوە دەبوونە سنووری ئەو دۆڵەی لە نزیك چەپمانەوە بوو. دەمانویست بگەینە گوندی (تای ناڵ) کە دەکەوتە لای خۆرهەڵاتی دۆڵەکەوە و سێ سەعات و نیو لە (دەرگەزێن)ەوە دوور دەبوو. بەڵام گەیشتینە جێگایەك لە بەرامبەریدا، دەبوایە ئەو دۆڵە ببڕین کە دەچووە سەری. وەك میواننەوازەکە بەپێی هەندێ زانیاریی لە ناکاودا بەبیریدا هات، پێی چاك بوو سەمتی (تاسڵوجە) بگرینەبەر باشتربێ، کە لە لێژایی سلێمانی دایە. لەبەرئەوە لە نۆدا رووەو باکووری خۆرهەڵات وەرسووڕاینەوە و یەکسەر سەرکەوتینە سەر ئەو زوورگەی بە درێژایی رێکردنی ئەم بەیانییەمان بەلایدا تێپەڕ بووین، کەندولەندەکەش بەردەڵانی بوو. لە نۆ و نیودا گەیشتینە نشێوییەکەی سلێمانی، کە دەشتێکی پڕ لە گیا و جوان بوو، پانایی نزیکەی هەشتا میلێك دەبوو، لە درەخت نەبێ لە هیچی کەم نەبوو کە بەڕاستی جوانتری دەکرد...

(سلێمانی)ش لەژێر ئەو شاخانەدا لێمانەوە دیار بوو، کە لە خۆرهەڵاتەوە دەبوونە سنووری دۆڵەکە و کێوی (گودرون)یش یەکێك بوو لە زنجیرەکانیان.

ڕۆیشتنی ئەمڕۆمان هێواش و سەخت بوو، چونکە زەوی قوڕاوی و بەردەڵانی بوو. لە سەعات (١٠)دا گەیشتینە چادرگەکەمان، کە بە تەنیشت گردێکەوە بوو، ناوی (قەرەسپی تەپە)(٦٤) بوو، ماناکەیشی (گردە ڕەش) بووو. ئەمیش وەك هەموو گردەکانی (چەمچەماڵ) و (دەرگەزێن)ە و رێی تێدەچێ ئەو گردانە، خانووی پاشا بووبن و قۆناغی ڕۆیشتنی لەشکریان پێ دیاری کردبێ. ڕەنگیشە لەشکری (ئەردەشێر)، یان (دارا کشتاسب)(٦٥) بووبێ.

---

٦٤- ناوی ناسراوی گردەکە (کێلە سپی)یە، بە واتای پەیکەری سپی، وادیارە لای نووسەر ئاڵۆزییەکی تێکەوتووە و وشەی (قەرە)ی تورکی، کە بە مانای (ڕەش) دێت، لەبری وشەی (کێل)ی کورد داناوە، کە بە مانای بەرد، یان پەیکەر دێت - ع.

٦٥- ئاسەواری خانووبەرەی کاولیش لە جێگایەك هەیە بەناوی (کەڕوانان)ەوە لە ناو دەشتێکدا، لەسەر گردی - پەراوێزەکە دوایی هات - ئێستا ناوی جێگاکە (کەڵەوانان)ە-ع.

بەهۆی سەفەری دوێنێ و سەفەری ئەمڕۆمەوە، خەریکم سەر لە هێڵە گشتییەکانی ئەم وڵاتە دەردەکەم، ئەم وڵاتەی کە مەیدانێکی پڕبووە بۆ دیتنی ڕووداوگەلێکی مێژوویی خۆش، کە تا ئەمڕۆ لای ئێمەوە نەزانراوە، لەبەرئەوە بەچاکی دەزانم ئەنجامی سەرنج و دیتنەکانم تۆمار بکەم.

ئەم بەشەی کوردستان، لە خۆرئاواوە، کە کەوتۆتە نێوان شاخەکانی (بازیان) و زنجیرەی قەرەداغ و لە خۆرهەڵاتیشەوە کەوتۆتە نێوان (گودرون)ەوە، دەبێتە چەند دۆڵێك کە هەموویان لە تەنگەی (دەربەند)دا، کۆتاییان دێت، کە وەك تەنیا دەروازەیەکیانە. ئەم دۆڵانەش لە زنجیرە زوورگی بچووکتر پێك دێن، کە پشتیان داوە بەو زنجیرە کێوە گەورانەی باسیان کرا، ئەگەر چیش ئەوەندەی ئەوان درێژ نابنەوە. یەکەمینی ئەمانەش دۆڵی (دەرگەزێن)ە(٦٦) کە لە خۆرئاواوە زنجیرەی (بازیان) جێدەهێڵێ، پاشان دۆڵی (سلێمانی) دێت، کە بە هێڵێك لەوی تر جیادەبێتەوە. ئەوەندەی بەرزایی شاخەکانی (بازیان) بەرز نییە. دۆڵی (دەرگەزێن)یش چەند زنجیرە زوورگێکی نزمتر بەشبەشی دەکردن، کە زۆر بەرەو باشوور ناکشێن. لای (سلێمانی)یشدا هێڵی زوورگێکی تریان لێ دەبێتەوە. کە دۆڵێك لەنێوان زنجیرەی (گودرون)دا دەهێڵنەوە. بەرەو باشووریش شاخەکانی (بازیان) بەرزتر دەبنەوە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا شاخەکانی(قەرەداغ) بەرزتر دیارن. قەرەداغ دەبێتە سنووری ڕووباری (دیالە)، کە لەوێوە ناوچەی پاشایەتی (زەهاو) دەست پێدەکات. دەشتی (سلێمانی)ش ڕووەو باشوور لەبەرچاوترەو لەوێشەوە بە چیاکانی (هەورامان)ەوە دەلکێتەوە(٦٧)، کە بەفر داپۆشیون و بەشێکن لە چیاکانی (تەورۆس) و (زاگرۆس).

ئەوبەشە شاخەی (گودرون) کە ڕاستەوخۆ دەکەوێتە سەروو (سلێمانی)یەوە، ناوی شاخی (ئەزمڕ)ە و (قەڵاچوالان) دەکەوێتە خۆرهەڵاتییەوە، کە گوندێکی دڵگیرە لەو ناو شاخانەدا و شەش سەعات لە (سلێمانی)یەوە دوورە. بۆ ئێمەشیان دیاریکرد تا بیکەینە هاوینەهەوارمان. گودرون(٦٨).

---

٦٦- میواننەوازەکە لە دەشتی (دەرگەزێن) ئاماژەی بۆ چەمێك، لە لاپاڵی زوورگەکانی خۆرئاوا کرد، کە لەگەڵ چەمگەلێکی تردا یەك دەگرنەوە و بە (دەربەندباسەرە)دا تێپەڕ دەبێ و دەڕژێتە (تاووق جای- ڕووباری تاووق)ەوە. پەراوێزەکە دوایی هات - ئێستا بەم چەمە دەڵێن (ڕۆخانە) - م.

٦٧- ئەم کێوانە دەبنە سنووری قەڵەمڕەوی هەردوو میرنشینی (سلێمانی) و (سنە)، کە ئەمی دواییان میرنشینێکی کوردییە و لەژێر دەسەڵاتی حکومەتی ئێرانیدایە.

٦٨- میواننەوازەکە سووربوو لەسەرئەوەی کە چیای (ئەزمڕ)، یان چیاکانی (گودرون) تا (کۆیسنجاق) و (ئامێدی) و (ماردین) درێژدەبنەوە. ڕەنگیشە ڕاست بکات.

ڕەنگەکەی تاریکە و بەردەڵانی و پڕ لە چاڵ و چۆڵییە، لە ترۆپکەکەشیدا، چاڵاییەك، یان حەوزێك هەیە(٦٩)، بەفری تێدا کەڵەکە دەبێ و دەیبەستێ(٧٠).

ئەگەرچیش ئەم هێڵە سەرەکییانە، لە وردەکارییەکانیدا تەواویش نەبن، بەڵام بەلای کەمەوە بیرێکی گشتیمان لەبارەی وڵاتەکەوە دەداتێ، کە لە داهاتوودا دەتوانرێ بکرێتە بنچینە بۆ لێکۆڵینەوە.

گەرما، لە پێنجی بەیانیدا (٥٥) پلە و لە دووی دوای نیوەڕۆدا (٦٦) پلە، لە دەی شەودا (٦٠) پلە بوو. ڕۆژێکی هێمن و هەوراوی بوو، دوای نیوەڕۆش بارانێکی توندباری و تا دوای نیوەشەو هەر ڕشێنەی کرد.

## ٧ی ئایار

لە پێنج و پەنجا دەقیقەدا سواربووین و بۆئەوەی خۆمان لەو قوڕە بپارێزین، کە پێیان وتبووین لە شوێنە نزمەکاندا قووڵترە، لابەلا ڕوومان لە (گودرون) کرد ... بەیانییەکی ساماڵ بوو، سروەیەکی سازگاریش لە باکوورەوە دەهات. کەمێك دوای ئەوەی لە هەوارەکەمان دەرچووین، تووشی (عەبدولڕەحمان ئاغا) بووین، کە پیاوێکی ناوداری (مەحموود پاشا) بوو. گەورەکەی بۆئەوەی ناردبوو تا لەجیاتی (میواننەواز)ەکە، بمانگەیەنێتە (سلێمانی). دە، دوازدە گزیریشی لەگەڵدا بوو. ئیتر دوای چاك و چۆنی، پێکەوە دەستمان بەڕۆیشتن کرد.

ڕێگاکە بە زوورگێکدا تێپەڕ دەبوو، لە (گودرون) جیاببووەوە، دۆڵێکی زۆری دەکەوتە نێوان و چەمگەلێکی زۆر و بچووکیشیان تێدەڕژا. لە هەندێ جێگایدا بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی ئاوەکەی و گەیاندنی بەمەرەزە، بەستیان لەبەردا دروستکردبوو. پەڵە جۆیەکی زۆریشمان بینی، هێشتا قەرسیل بوون. لە هەشتدا لە چەمێکی پان و ڕوونمان دا، لە (گودرون)ەوە دەهات، کە لە هاویندا وشکی دەکرد، ناوی (چاق چاق) بوو. چاو ساغەکەم پێمی وت بۆیە چەمەکە وای ناونراوە، چونکە بەردەکانی بنی، ئاگریان لێدەبێتەوە(٧١).

---

٦٩- پێم وایە دەمی گڕکان بێت. چاکتریش وایە خۆم لەنزیکەوە ببینم.

٧٠- بەجۆرە ئەوەندەی بەفر تێدا دەکەوێ کە لە بڕانەوە نایەت بۆ بەکارهێنانی لە هاویندا لەلایەن خەڵکی سلێمانییەوە بۆ ساردکردنی میوە و شەربەت و ئاو و... هتد.

٧١- ڕەنگە وشەکە (چاقماق) بێ، نەك: چاق چاق - وشەی (چاقماق گاشی)ش لە تورکیدا مانای (بەردەئەستێ)یە. لەوە ناچێ وشەی (چاق چاق) داتاشراوی (چاقماق) بێت. یەکەمیشیان وشەیەکی دەنگدارە، کە لە ناوجەرگەی زمانی کوردییەوەیە - ع.

له هەشت و پێنج دەقیقەدا گەیشتینە (سەرچنار)، کە کانیاوێکە لە نزیك ڕێگاکەوە و لە پەنجا لاوە زیاتر کانیاوی بچووك هەڵدەقوڵێ و بە هەموویان چەمێکی گەورەیان پێك دەهێنا. خوڕەخوڕی ئاوەکەی کە بەسەر بەردەکاندا دەڕۆیشت، دەنگێکی خۆشی لە گوێچکەمدا هەبوو. ئەم چەمە لە ناوچەیەکدا



**فەرمانبەرێکی گەورەی پاشای سلێمانی**
**(عومەرئاغای خەزنەدار)**

دەڕژایە (چەمی تانجەرۆ)وە(٧٢)،کە مەرەزەیەکی زۆری لەبەردایە. پاشان دەڕژێتە (دیالە)وە. لە ڕاستیشدا دەتوانرێ بوترێ ئەمە یەکێکە لەو چەمانەی ئەو ڕووبارە پێك دێنن. بەدەم ڕەوتیشیەوە لە چالآیی سلێمانی دا دەبووە مولّکی تەنیا پیاوێك، کە (یونس بەگ) بوو، پاشای ئێستا دابوویە. داهاتی ئاوێژەکردنی سالآنەیشی زیاتر لە (٥٠) هەزار قرۆش دەبوو. ئاوەکەی مەرەزە و کێلّگەی لۆکە و کونجی و توتنێکی زۆری ئاوێژە دەکرد.

سەرچاوەکانی چەمەکە، گردێك بوو، دوو درەختی لەسەر بوو، دەلّێن نیشانەی شەڕێکن لە سەردەمی کۆندا، کە لێرەدا، ڕوویداوە. کوردەکان دەلّێن (ئیمامی عەلی) دوای شەڕێك لەگەلّ کافرەکاندا، نێزەکەی لەم شوێنەدا چەقاندووە، بەلآم (عەبدولڕەحمان ئاغا) دەلّێت ئەم چیرۆکە هەر تەنیا ئەفسانەیەکی هەلّبەستراوی کوردییە. ئەو، ئەگەرچی گومانی لەوەدا نییە کە شەڕێك لەم ناوەدا ڕوویدا بێ، بەلآم نازانێ ئەو دوولایەنە کێ و کێ بوون، کە لێرەدا بەشەڕ هاتوون. لەسەر خواستی (پاشا) چادرەکانمان لەبەری لای چەپی (سەرچنار)دا هەلّدا بۆئەوەی دەرفەتی خۆئامادەکردنی هەبێ، تا بچینە پایتەختەکەیەوە، کە دیاری کردبوو سبەی بەیانی بێت. لێرەدا (مەحموود ئاغای میواننەواز)ی پێشوومان مۆلّەتی رۆیشتنی لێ خواستین. ئەو ماوەیەی لەگەلّ ئێمەدا ئەرکەکەی لە ئەستۆ گرتبوو، بەجۆرێك خۆی شیرین کردبوو، کە نیشانەی ئاکار بەخشندەیی و ڕەوشتی بەرزی پێوە دیاربوو.

تاوێ دوای چادر هەلّدانمان، دیارییە زۆر و هەمەجۆرەکانی (پاشا) بۆ خۆم و بۆ کۆمەلّەکەمان گەیشت.

لە نیوەڕۆشدا (عومەر ئاغا)(٧٣) هاتەلامان، کە ئەفسەرێکی تری کورد بوو.

ئەرکی ئەم بەرێزە ئەوە بوو، تا لە کوردستاندا بین لەگەلّماندا بمێنێتەوە. دوای یەکتر دیتن و ڕاوێژ لەبارەی ئەو شتانەی لە ماوەی مانەوەماندا لە سلێمانی، کە پێویستیمان پێیان دەبێ. گەڕایەوە بۆ شار، بۆ ئەوەی پێویستیی پێشوازیمان ساز بکات...

ئێستاش دوای دیتنی ئەو کوردە بەرێزانەی، چ لە بەغدا و چ لەو کاتەوە کە هاتووینەتە نیشتمانەکەیانەوە دیومن، هەست دەکەم تا ڕادەیەکی زۆر، هەلّسوکەوت و رەوشت و میواننەوازی و نەریتیانم لا پەسەندە.

---

٧٢-(تانجەرۆ) شێواندنێکی کوردییانەی وشەی (تاج ڕود)ی فارسییە. دووری شار، یان گوندی، (تانجەرۆ)ش لە سلێمانییەوە، سەعاتێکە.

٧٣- بڕوانە (وێنەی فەرمانبەرێکی گەورەی پاشای سلێمانی).

دوای نیوەڕۆ بەنیازی دیتنی دەوروبەرم، دەستم بەپیاسە کرد... لە سەرچنارەوە ئاو لە هەموولایەکی زەوییەوە هەڵدەقولا(٧٤)، لەهەر جێگەیەکدا خاکت لابردایە، ئاو دەردەچوو، بنی چەمەکەش پڕبوو لە کووزەڵە. چەمەکەش ماسییەکی زۆری هەمەجۆرەی تێدابوو، لەناویاندا ماسی (گاشینە - TROUT). ئەمە بەگوێرەی قسەی ئەوانەی خۆمان، کە بە قولاپ ڕاوە ماسییان کردبوو، ماسییەکی زۆریان لێ دیبوون. سەرنجیشیان دابوو نایانەوێ لە قولاپەکانیان نزیك بکەونەوە.

نێوانی (سەرچنار)(٧٥) و (چاق چاق)، هەر بەرزاییەکی بچووك بوو، لەوە دەچوو دەمێك بێت چۆل کرابێت. کە بەسەرسوڕمانەوە بەناو کەڵەکە بەردەکانی ئەم گۆڕستانە مات و تەنگەدا دەگەڕام، ئەو وەسفە جوانەی گۆڕستانی دێرینەم هاتە یاد، کە لە سەرەتای قەسیدەی (جێگا دێرینەکە)دا هەیە... زەوییەکەیشی بەگوڵی کێوی داپۆشرابوو. سێ و چوار درەختێك ئەم بەرزاییەی دەڕازاندەوە، کە زانیشم داربەڕوون، دڵخۆشبووم، هەرچەند لە ڕاستیشدا لەوجۆرە داربەڕووە بەناوبانگانەی (ئینگلتەرا)ش نەبوون، بەڵام جوان بوون و بەس بوون بۆئەوەی بیرەوەری زۆرخۆش بورووژێنن . گەڵاکانیشیان گرنج گرنجییەکەیان کەمتر و تەنکتر و سەوزتریش بوون، لەو گەڵا بەڕووانەی کە لە ئینگلتەرا هۆگریان بووم، لەدار بەڕووە بچووکەکانیش نەبوون. پێشیان وتین کە هەموو دەوروبەری سەرچنار، لێڕەوارێکی زۆری لەم دارەی تێدابووە، بەڵام لە دروستکردنی (سلێمانی) دا بڕدراون.

گەرما، لە پێنجی بەیانیدا (٥٣) پلە و لە سێی دوای نیوەڕۆدا (٧٦) پلە و لە دەی شەودا (٦٤) پلە بوو. لە باکوورەوە سروەیەکی سازگار هەبوو. کەشوهەواش بێگەرد بوو.

---

٧٤- پلەی گەرمای هەموو ئەم کانیاوانە، کە گەرمای زۆریانم پێوا، (٦٢ پلەی. ف.) بوون. بەڵام پلەی گەرمای هەوا (٧٦ پلە) بوو.

٧٥- چەمێکی تریش لە خۆرهەڵاتی (سەرچنار) هەیە، کە گردۆڵکەیەك لە (سەرچنار)ی جیادەکاتەوە، وەك چۆن لە خۆرئاواشەوە بەگردێکی تر (چاق چاق) جیادەکاتەوە، ئەم چەمەیان لە هەردوو چەمەکەی تر بچووکترە و ئەمەش و چەمی (چاق چاق)یش هەرتەنیا ئاوەڕۆن و وەك من بزانم لە هاویندا وشك دەکەن. چەمەکانیش هەموویان لە دەشتەکەدا بەیەك دەگەن.

## ٨ی ئایار

سەعات پێنج و چل دەقیقە لەسەرخۆ دەستمان بەڕۆیشتن کرد. تاوێ دەکەوتینە سەر لاپاڵی گردەکان و تاوێکیش شۆڕدەبووینەوە، تا لە سەعات شەش و چل دەقیقەدا گەیشتینە چادرگەکەمان لە نزیك سلێمانی. لەوێ گەلێ لە گەورە پیاوانی کوردی سەر بە مەحموود پاشا، پێشوازییان کردین. دوای پێشوازیکردنمان، دوانیان نەبێ، کە بۆ کارگوزاری و خزمەتکردنمان لامان مانەوە، ئیتر ئەوانیتر، بەپەلە ڕۆیشتن، لەکاتێکدا ئێمە چاوەڕێمان دەکرد بەهۆی ئاپوورەدانمانەوە بێزارمان بکەن، چونکە کورد، وا ناسراوە حەز بە لێوردبوونەوە و پرسیارکردن و ئارەزووی شت زانینی هەیە. ئێمەش یەکەمین کۆمەڵە ئەوروپاییەك بووین کەزۆربەیان شتی وایان نەدیبوو، لەگەڵ ئەوەشدا لەوانە زیاتر کە بەئیشی پێویست دەهاتن، کەس لێمان نزیك نەبووەوە. وەك بۆم دەرکەوت ئەمە بەهۆی فەرمانی توندوتیژی مەحموود پاشاوە بووە، کە نەیهێشتووە کەس بێزارمان بکات...

ئەمرۆ نەمتوانی زۆر بحەسێمەوە، چونکە هەستم کرد لەشم ئەوەندە قورسە، خۆم لەژێریدا ناگرم. هەر کە چوومە ناو چادرەکەوە و دانیشتم، تەتەرێکی(٧٦) پەلە، لە ئەستەمبوڵەوە هات. حەزم دەکرد لە وەختێکی تردا بهاتایە، بەڵام لەبەرئەوەی پرسەنامەی خاوەن شکۆی تێدابوو، دەبوایە بەپەلە وەڵامی نامەکان بنێرینەوە(٧٧).

دوای هاتنی تەتەرەکەش هێشتا نەهاتبوومەوە سەرخۆم، (عەبدوڵڵا پاشا)ی دۆستی دێرینە و گەورەپیاو، هاتەلام و بەدوای ئەویشدا (مەحموود مەسرەف)ی سەرۆك وەزیرانی پاشای سلێمانی هاتەلام، ئەمیش پیاوێکی ناسراوبوو لە کوردستاندا و لە بەغداش زۆرم لەبارەیەوە بیستبوو، بۆئەوەش هاتبوو، ئاگادارم بکات لەوەی کە عەسر، سەردارەکەی(٧٨)،

---

٧٦- واتە (تەتەر) و تورکەکانیش کاتی خۆی لەناردنی پۆستەدا (تاتار)یان بەکاردەهێنا. بەجۆرە وشەی (تاتار) لە تورکیدا بۆ ئەوانە بەکار هات، کە پۆستەیان دەهێنا و دەبرد-ع.

٧٧- بۆ روونکردنەوەی ئەو ترس و گومانەی لە مێشکی فەرماندەیەکی خۆرهەڵاتیدایە، دەتوانین بڵێین (داود پاشای والی بەغدا) زۆر لەو سەفەرەی میستەر ڕیچ ترساوە، کە بۆکوردستان چووە و هەموو ئەو هۆیانەش قایلی نەکرد. کە بۆم باسکرد، چونکە تورك بڕوا بە گەشتوگوزار و ئارەزوومەندی نواندن ناکات. لەوەش دەچوو پێی وابێ خراپەی ئەوی تێدایە. دەشڵێن گەیشتنی تەتەرەکە لە ئەستەمووڵەوە و لەو ڕۆژەدا کە میستەر ڕیچ - ی تێدا گەیشتۆتە کوردستان، ئەوەندەی تر ترسی لێ نیشتووە و بۆتە بەڵگەی ترس بۆی - خاریچ.

٧٨-یەکێکە لە مامەکانی (مەحموود پاشای میر)ی سلێمانی.

یەکەمین سەردانم دەکات و پێخۆشحاڵیی خۆی بەبۆنەی هاتنمەوە بۆ نیشتمانەکەی دەردەبڕێ. ئەمەش ڕێزلێنانێکی چاوەڕوان نەکراو و بەڵگەیەکی گەورەبوو بۆ ئەو گیانی خۆشەویستییەی هەیەتی. لە ڕاستیدا بەهیوای ئەوە نەبووم ئەو، سەردانم بکات. لەبەرئەوە ئەم دەست پێشکەرییەی، لە شتە کوتوپڕ و چاوەڕوان نەکراوەکان بوو.

بۆیە لای خۆمەوە ئەوەی لە دەستم هات بۆ خۆ ئامادەکردن و پێشوازیکردنی مەحموود پاشا، کردم و تۆزێك دوای عەسر، هاتنیان ڕاگەیاند. دیمەنی هاتنەکەیشی، دیمەنێکی سەرەتایی و دڵخۆشکەرەی هەبوو. هەر بەتەنیا ئەو، بەسواری ئەسپ هاتبوو، لەبەرئەوەش کە پیاوێکی کورتەبنە و بچووك بوو، بۆیە لەناو ئەو جەماوەرە کوردە باڵابەرزەدا لەچاو دیار نەبوو...

جەماوەرەکە هەمووی، جلوبەرگی ئاڵ و واڵایان لەبەر کردبوو، ئاڵ و زەرد و سوور. ئەم ڕەنگانە لە ڕەنگە زاڵەکانی مێزەر و (سەربەست)یان بوون. هاتنەکەیان بێدەنگ و دەنگی پێیان لە دوورەوە دەبیسترا، کاتێکیش پاسەوانەکانم، سڵاوی ڕەسمییان بۆ کرد، پاشا دەستی خستە سەرسنگی و بە ویقارێکی گەورەوە وەڵامی دایەوە. هەندێ لە یاوەرەکانی لای خۆمم لە پێشەوە نارد و خۆمیش بۆ پێشوازی، لە چادرەکەم هاتمە دەرێ، ئیتر هەرکە چاوی پێم کەوت، دابەزی و لەناو هیتافی یاوەرەکانیدا بە هەردوو دەست تەوقەی لەگەڵ کردم و پێکەوە چووینە ناو چادرەکەمەوە و لەسەر ڕایەخێك دانیشتین، کە بەتایبەتی بۆ ئەم بۆنەیەم ئامادە کردبوو. زۆر بەگرانیش توانیم ڕازی بکەم، تا چوار مەشقی دابنیشێ، چونکە سووربوو لەسەرئەوەی لەسەر چۆك دابنیشێ، بۆئەوەی شێوەی دانیشتنەکەی جۆرە ئەرك کێشانێکی تیابێ، تا نیشانەی ڕێزلێنانی زۆرتری تێدابێ. پەیتا پەیتاش بەخێرهاتن خۆشحاڵی خۆی بەرامبەر بە هاتن و سەردانم بۆ کوردستان، دووبارە دەکردەوە. ئەوەیشی لەگەڵدا دووپات دەکردەوە کە نیشتمانەکەی، نیشتمانمە و زووزووش قسەی شیرینتری دەکرد و نەوازشی ڕۆژهەڵاتییانەی دەردەبڕی. ئیتر بێگومان زۆر قسە و ڕستەی ناسکیشمان گۆڕییەوە، لەوانە: پۆزشی بۆ باری وڵاتەکەی هێنایەوە و ستایشی منیش بۆ نیشتمانەکەی. بەکورتی بەدڵسۆزییەوە هەستی خۆم بەرامبەر نیشتمانەکەی دەردەبڕی، چونکە بەڕاستی شەیدای ئەو چیا سەوزانەی بووم و دڵخۆشیش بووم لە بەغدا دوورکەوتوومەتەوە.

دوای ئەمانە کە لەبەر چاوی دەستە و یاوەرەکانیدا نامەکەی والی بەغدام پێشکەش کرد و نامەکەش چونکە نامەیەکی زۆر ناسك و پڕ سۆزبوو، بۆم دەرکەوت هەستی بەوە کرد، کە

بەلامەوە پیاوێکی شایستەیە، بۆیە بە تەنگمەوە هات و کەوتە سکالاَ دەربڕین سەبارەت بەگوزەرانی میرنشینەکەی و ئەو گیروگرفتانەی کە میرنشینەکەی بەدەست ئەوەوە دەیکێشێ کە کەوتۆتە سەر سنووری دوو دەسەلاَتی دژ بەیەك، چونکە یەکەمیان کە (ئێران)ە، بەناوی داواکردنی باج و سەرانەوە، دەستبەرداری چەوساندنەوەی نابێ و دووەمیشیان کە دەسەلاَتدارێتیی (تورکەکان)ە و میرنشینەکەی ئەم پابەندێتی، بە بیانووی ئەوەی کە خزمەتی ئێران دەکات و باجیان دەداتێ، زۆر سەردەکەنە سەری... کەچی کە شازادەی کرماشان دەستدرێژیی کردەسەری و ئەوەی مەبەستی بوو، بە تۆپزی هێنایە دی، تورکەکان نەبەرگرییان پێکرا و نەمەبەستیشیان بوو بەرگری بکەن. چونکە ئەمیشیان خۆش نەدەویست. بۆیە بەسنگ فراوانیی و لێزانییەوە، باسی ئەنجامە ناهەموارەکانی ئەم بەڕێوەبردنە دوو فاقییەی کرد، کە چەند زیان بە سامان و گەشەکردنی میرنشینەکەی دەگەیەنن... بەدڵسۆزییەوە ئارەزووی خۆیشی بۆ پابەندێتی داواکارییەکانی والی بەغدا دەربڕی. لە راستیشدا من پێم وابوو بەهۆی لایەنی ئایینییەوە لە تورکەکان نزیکتر بوو، بەلاَم بە ئاسانی و وەکو خۆی بۆی نەدەسەلماندن... زۆربەی زۆری دانیشتوانی میرنشینەکەش، عوسمانییەکانیان خۆش نەدەویست و بڕواشیان پێ نەدەکردن. عوسمانییەکانیش شایستەی ڕێز و خۆشەویستی نەبوون، چونکە بەڕێوەبردنە سیاسییەکەیان، بەڕێوەبردنێکی کوێرانە و لووت بەرزانە و فێلاَویی بوو، لەبەرئەوەی ئەگەر تۆزێ زیرەکی و دڵ ڕاگرتن و ڕێزگرتنی هەستی توندی سوننەچێتی کوردیان ڕابگرتایە، کە زۆر رقیان لە شیعەچێتیی ئێرانییەکان دەبووەوە، دەیانتوانی پێوەندی ئەم نزیکایەتییە، لە خۆیان و ئەم نەتەوە ئازا و زۆرەدا بەتین بکەن، کە لە شوێنە گرنگەکانی سەرسنووری تورکدا بوون و لەکاتی خۆیشیدا دەبنە پارسەنگی ئەولایەی لەگەڵێدا دەبن. ئێستاش چاوڕاوێکی تەماویی وا لە ئارادایە، کە پەردە لەڕوو هەڵدانی فێڵ و تەڵەکەکانی ئاسان نییە... بەلاَم ئاشکرایە، مەسەلەکە (یەکتری خەڵەتاندنە)، چونکە لەکاتێکدا والی بەغدا دەیەوێ میری کوردستان بخەڵەتێنێ، لەهەمان کاتدا، شازادەی کرماشانیش دەیەوێ والی بەغداد بخەڵەتێنێ... بەهەموو لایەکیشیان، بە کۆمەڵ و بەتاکیش، دەیانەوێ فێڵ لە (بابیعالی) بکەن، کە لەم مەسەلەیەدا لە هەموویان زیاتر زیانی پێدەگات و لە هەموو کاروبارێکیشدا هەوڵ دەدات دوژمنێکی ناوکۆیی بێت. ئەگەرچی ئەم مەسەلەیە هیچی منیشی تێدانییە، بەلاَم لەو پێچاڵەوە کە منی تێدام، ئەگەر بەشێوەیەکی نابەدڵیش بێت، ناچارم لایەنی تورکیا بگرم، هەوڵم دا لە وەلاَمەکانیشمدا ئەمە ئاشکرا بکەم...

دوای تاوێك بێدەنگیی، تێگەیشتم ئاشکرا کردنەکەم زۆرکاری لە میرکردووە، بۆیە وتی: خوالێخۆشبووی باوکم زۆر خاتری تۆی دەویست و ئەگەر بەچاوی خۆی، ئەم ڕۆژەی بدیبایە، کە زۆر چاوەنواڕی بوو، زۆر زۆر دڵشاد دەبوو، حەزیشم دەکرد، لەجیاتی من، ئەو، پێشوازی لێ بکردیتایە. پێم وت: (ئەورەحمان پاشا) یەکجار خۆشەویستم بوو، زۆر بەڕێزیشەوە یادی دەکەمەوە، بەڵام چاکترین وەجاخی لە دوای خۆی بەجێ هێشتووە.

دوای قەننە کێشان و شەربەت خواردنەوە و بخوور سووتاندن و گوڵاو پرژاندن، میر، چۆن هاتبوو، بەهەمان شێوە و لەگەڵ داروودەستەکەیدا گەڕایەوە. بەڵام پێش ئەوەی لە چادرەکە بێتە دەرەوە، ئاگاداری کردم کە ئەگەر پێم خۆش بێت، دووسبەی بەیانی، سەعات نۆ، حەز دەکات بچم بۆ سلێمانی. ئیتر یەکسەر تێگەیشتم کە هۆی ئەوە، دەبێ لێکدانەوەیەکی پووچی ئەستێرەگەریی بێت، دیارە شتێکی ئاساییە. منیش بەدڵی ئەو دەکەم.

مەحموود پاشا، لە هەڵسوکەوت و ئاخاوتن و رەوشتیدا، شتێکی ئەوەندە تایبەتی تێدا نەدەبینرا، کە لە خەڵکی تری جیا بکاتەوە، ئەوەندە نەبێ کە پیاوێکی سادە و ئازابوو، لەهەمان کاتدا خۆش مەشرەف و ڕۆح سووك بوو. وەك مرۆڤـێکیش دەڵێن پیاوێکی بێگەرد و بێ لەکەیە. ئەمەش لەو شتانە بوو، کە لەناو کوردەکاندا شتێکی ئاسایی نەبوو.

ئەمرۆش بەگشتی، ڕۆژی تاقیکردنەوەیەکی گەورەبوو بۆ دەمارەکفت و ماندووەکانی مێشکم. بەڵام ڕۆژێکی ناخۆشیش نەبوو، ئەگەر هاتنی ئەو تەتەرەی تێدا نەبوایە... دیمەنێکی جوان و دڵگیربوو، کە پێشتر شتی وام نەدیبوو. کوردەکانیش لەوە دوورتر بوون لێمانەوە، کە ببنە مایەی سەرئێشە و بێزاریی. هەندێ زانیاریشم لە زۆریانەوە وەرگرت. میریش لەگەڵ سەردانەکەیدا، دیارییەکی گەورەی لە مەڕ و خواردەمەنی تر و ئازووخە، بۆ هەموو دەستە و کۆمەڵەکەم هێنابوو، بڕیاریشی دا، تا لە ناوچەکەیدا بم، نەیەڵێت هیچ پێویستییەك بکرم، بەڵام بڕیارمدا لەدوای ئەوەی پێشوازی کردنە ڕەسمییەکەی کۆتایی دێت، سنوورێك بۆئەوە دابنێم.

## ٩ی ئایار

سەرلەبەیانی ئەمڕۆم بە نووسینی نامەی ڕەسمی و تایبەتی و ناردنەوەی تەتەرەکە بەسەربرد. دوای نیوەڕۆش هاوڕێی دێرینەم (عەبدوڵڵا پاشا) سەردانمی کرد. دیاربوو نەخۆشییەکی قورسی گرتبوو، بەجۆرێك کاری تێکردبوو، خەریك بووم نەیناسمەوە. بەپەلە و بەپەرۆشەوە باوەشی پێداکردم و تا ماوەیەکیش لەتاو نەخۆشییەکەی قسەی بۆ نەکرا. منیش کە بینیم نەخۆشیی وا بێ هێز و لاوازی کردووە، حەپەسام... لەسەرەتادا بە ماتیی یەکترمان بینی. ئەوەی کە تۆزێك بوژاندییەوە، بەیادکردنەوەی ڕۆژانی ڕابووردوومان بوو. بەئاسانی هەستت دەکرد کە کاربەدەستانی بەغدا و بەتایبەتیش (داوود پاشا)ی بەدڵ نییە، ئەمەش جێی سەروسوڕمان نەبوو، چونکە تورکەکان زۆر بەرەقی لەگەڵیدا جووڵابوونەوە. بێگومان ئەمیش لای خۆیەوە لە هەلێك دەگەڕا، کارێکی لەوە خراپتریان پێ بکات. زۆر بەڕێز و گەورەییەوە باسی میری سلێمانی دەکرد، کە برازای بوو، بەڵام پێم وایە کە باسی برازاکەیشی بەوجۆرە کرد، خۆیشی کەمێك شەرم گرتی. سەعاتێك زیاتر لام مایەوە و کە ماڵاوایشی کرد، زۆر بەسۆزەوە دەستگوشینی لەگەڵ کردم.

پلەی گەرما لە سەعات پێنجی بەیانیدا (٥٦) پلە بوو. لە سەعات دوو و نیوی دوای نیوەڕۆدا (٧٨) پلە بوو، لە سەعات دەی شەودا (٦١) پلە بوو. با، لە ڕۆژهەڵاتەوە دەهات، بەڵام مام ناوەندی بوو...

# بەشی سێیەم

عوسمان بەگ ـ چوونە ناو سلێمانی ـ سەردانی میر ـ باسی خانووەکەمان ـ پابەندیی کورد بە سەرۆکەکانیانەوە ـ هەندێ بەسەرهات ـ شەڕەکەو ـ ئەفغانیی لە شارەزووردا ـ زەینەفۆن و دە هەزارەکە.

## ١٠ی ئايار

وا دياربوو ئەم بەيانييە ئەو ڕۆژەبوو كە ئەستێرەگرەوەكان پێيان چاك بوو بچمە پايتەختی مير و لەویٚ پێشوازييەكی ڕەسمیم بكات، بۆيە نيو سەعات پێش كاتی دياريكراو، عوسمان بەگی بەناوبانگ و برا بچكۆڵەی مير و ئازاترينيان، كە زۆرم لەبارەيەوە بيستبوو، بەدوامدا هات، تا بۆ ناو شار بمبات. هەموو ئەندامانی ئەنجوومەنيشی بە سواری ئەسپ و كۆمەڵێكيش پيادەی لەگەڵ خۆی هێنابوو. عوسمان بەگ زۆر شۆڕەسوارانە، سواری ئەسپێكی عەرەبی لە تيرەی (عەنزە)ی عەرەب ببوو، دەيانوت (١٣) هەزار قرۆشی پێداوە.(٧٩)

جلوبەرگی هەموو خەڵكەكە ڕەنگاوڕەنگ و ئاڵ و والأبوو، چونكە زۆر كەتە و قەبە نەبوو، بەڵكو چوارشانەيەكی داڕێژراو بوو، دەموچاوێكی يەكجار ڕێكوپێكی پێوەبوو، ڕيشی ڕەش و لوول بوو، برۆ و برژانگەكانيشی ڕەش بوون، چاوەكانی شينێكی تۆخ بوون، سيمايەكی پياوانە و ڕەنگ ڕەشتاڵەيەكی مەيلە و پەمەيی بوو، بەشێوەيەكی گشتی لاوێكی زۆر قۆز بوو، وتيشيان لە سوارچاكيی و چاكترين مەشق و ياری سەربازيی لای خۆياندا، كەس نييە شان لەشانی بدات، لەهەمان كاتيشدا بە ئازايەتی و بەخشندەيی بەناوبانگە، لەلايەكی تريشەوە دەڵێن گوايە لە ڕەوشتدا، داوێن پيسە و تا ڕادەيەكيش ئارەزووەكانی بەزۆرەملیٚ دێنێتەدی.

بیٚ زۆر لەخۆكردن و زۆر بە ناسكی، دەستی بەقسەكردن لەگەڵمدا كرد، بەجۆرێك دڵسۆزيی تێدا بەدی دەكرا، بەبێئەوەی هيچ ڕەقيی و وشكييەكی تێدابێت. هەستم كرد زۆر بەنەزاكەتە، هەروەها هەستم كرد خۆيشی سيفاتەكانی پياوەتيی خۆی دەزانیٚ، جلوبەرگێكی يەكجار نايابيشی لەبەر كردبوو، كە لەگەڵ زەوقی كوردانەدا دەگونجا: كەواكەی لە قوماشێكی نايابی هيندی بوو، گوڵی زێڕچنی تێدا نەخشێنرابوو، شەدەكەی سەريشی كە بەشێوەيەكی لار و سەير بەستبووی، شاڵی كشميری بوو، ڕيشووەكانی بە سيمی زەرد هەڵبەسترابوون، بەڵام عاباكەی بەری قوماشێكی سووری (ڤينيسی) بوو، قۆپچەكانی لە زێڕ دروستكرابوون،

---

٧٩- وەرگێڕ نرخی (قرۆش)ی لە مامۆستا - يەعقوب سەركيس - پرسيبوو، لە وەڵامدا وتبووی (زۆرجار قەوارە و كێشانە و نرخی قرۆشی عوسمانی، لە سیٚ سەدە زياتردا گۆڕاوە و وەك لە حسابی بازرگانێكی بەغدا بۆم دەركەوتووە كە لە سييەكانی سەدەی نۆزدەهەم بووە، ئەگەر ئەم قرۆشە لەگەڵ دراوی ئێستاماندا بەراوردی پیٚ بكەين، دەكاتە ١١ فلس بەو پێيەی ئەگەر (دينار) بەزێڕ حساب بكریٚ، لەبەرئەوە (١٣ هەزار قرۆش) دەكاتە ١٤٣ ديناری زێڕ، يان پاوەنی ئەسترلينی)-ع

تەمەنیشی هەر (٣٢) ساڵێك دەبوو، بەڵام تەمەنی میری برای (٣٥) ساڵ بوو، دایکیشیان خوشکی خالید پاشا و بە نەژاد لە بنەماڵەی (بەبە)(٨٠) بوو.

عوسمان بەگ زۆر حەزی دەکرد بەرەهایی و سەربەستییەکی واوە باسی کاروباری کورد بکات، لەو سنوورەی تێپەرێنێ، کە پێویست بکات من هانی بدەم، زۆر بەئاسانی هەستت پێدەکرد کە چارەی تورکەکانی ناوێت، لەکاتی قسەکردنیشدا خێراخێرا سەیری کاتژمێرەکەی دەکرد، وا دیاربوو زۆر پابەندی کاتە دیاریکراوەکە بوو، بۆ سواربوون و رۆیشتن. لەدواییدا کە ئاگاداریان کرد کاتی رۆیشتن هاتووە، پێکەوە هەستاین و بەم شێوەیە ڕیزبووین:

یاوەرێك، کەڕەناژەنێك، ئاڵا هەڵگرێك(٨١)، دوای ئەوانیش سێ ئەسپی بێ سوار، کە ڕایان دەکێشان، بەدوایانەوە میرئاخورەکەی لای من و دوای ئەویش پیادە پۆشتە و پڕ چەکەکانم، دوای ئەمانیش سەربازەکانم بە تەپڵ و مۆزیکیانەوە، خۆمیش لە دوای ئەمانەوە سواری (فینفار) بووم. لەهەردوو لای ئەسپەکەشمەوە دوو کەس بە زرێ و تەورزینەوە، هەریەکەیان جڵەوی ئەسپێکی رادەکێشا. ئینجا میستەر (بەل لی نۆ) و دکتۆر (موران دو) و پاشان عوسمان بەگ بەسواری ئەسپە عەرەبییە جوانەکەیەوە، تیپێکی (٣٠٠) کەسیی پیادەش بەدوایەوە. دوای ئەمانیش ئەندامانی ئەنجوومەنی میر و خەزنەدارەکەم، ئینجا هەندێ سوارەی تر، ئەگەر بشێ بڵێین ڕێکوپێك بەرەو شار ڕۆیشتین، کە هەر چارەکە میلێك دوور دەبوو. خەڵکێکی زۆریش بۆ بینینی ئەم دەستە و دایەرەیە کۆببوونەوە. بڕوام نەدەکرد ئەم شارە ئەوەندە خەڵکی تێدابێ، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ڕێکوپێکییەکە تێك نەچوو، ئەفسەرانی پۆلیسی (دارۆغا)ش(٨٢) پەیتاپەیتا بە کوتەکە قورسەکانیان بەربوونە ئەوانەی دەوروپشتیان، بەبێئەوەی تێبگەم لەسەر چییە! هەر کوتەکێکیش کە دەیان وەشاند، لە گا بدرایە، دەکەوت، کەچی لەوە دەچوو هەر من ئەم شێوەی رێگا پێ چۆڵکردنەم پێ ناخۆش بێت، چونکە ئەو کوردانەی یەك لەسەر یەك ئەم کوتەکانە بەر سەر و شانیان دەکەوت و دەتوت چەکوش بە دەسگادا دەکێشرێ، گوێیان نەدەدایە. بەجۆرە گەیشتینە کۆشکەکە، کە دەروازەیەکی نزم و تەسك و داتەپیوی هەبوو، بە ئەندازەیەك پیس بوو، لام وابێ شایستەی

٨٠- ئەمە ناوی عەشیرەتی میری سلێمانییە و ئەمەیان لە (بەبە سلێمان)ی باپیریانەوە بۆ ماوەتەوە.

٨١- ئاڵای چوار مێخەکە، تورکێك هەڵی گرتبوو، مۆزیکی رۆیشتنە ئینگلیزییەکەش ئێرانییەك لێی دەدا و لێدانەکەشی خراپ نەبوو. (مەبەست لە ئاڵای چوارمێخ- ئاڵای بەریتانیایە-ع).

٨٢- دارۆغا: سەرۆکی پۆلیس (وشەیەکە مەبەستی لە پلەیەکە کە سەرپەرشتیاری بەڕێوەبردن، یان باجە_ع).

فەرمانداریك نەبێ، بەڵکو لە خانووی پیاوێکی ڕەشۆکی دەچوو، بەڵام تێگەیشتم ئەم داروبارە، لەمجۆرە جێگایانەدا کەڵکی خۆی هەیە، چونکە لە تەنگانەدا دەتوانرێ بەرگری لە کورسی فەرمانڕەوایی پێ بکرێ. دەروازەکەش ڕاستەوخۆ بەرامبەر کۆشکەکە نەبوو، بەڵکو لە تەنیشتیدا پێچی دەکردەوە(٨٣).

لێرەدا ناچار بووم دابەزم، چونکە ئیتر نەمتوانی بەسواری ئەسپ پیایدا تێپەڕ بم، پاشان بە پلیکانەیەکی جواندا بۆ ژووری میوان سەرکەوتین، کە ئەگەر دەستێکی پیادا بهێنرایەتەوە، ژوورێکی ڕێکوپێك و قەشەنگی لێدەردەچوو، رووی پێشەوەیشی بەرەڵابوو، بە کۆڵەگە ڕاگیرابوو(٨٤).

میر، لەبەر دەرگا پێشوازی کردم و بردمی لەسەر کورسییەك داینام، کەمێك لەملای ناوەڕاستی ژوورەکەوە لەسەر کورسیەك دانیشتین. ئەندامانی ئەنجوومەن و عوسمان بەگیش لە سەرروویانەوە لەسەر (نیم مەد)(٨٥)، یان لبادێکی پان و ئەستوور، لەوبەرەوە دانیشتن. دەستەکەی من و ئەوی میریش بەدوو ڕیزی تێکەڵ لەپاڵ دیوارەکەدا دانیشتن. پەردەداریش (ئیشق باشی) لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا وەستابوو، خۆی بەسەر باستۆنەکەیدا دابوو، بەڵام داڵان و ڕاڕەوەکانی ژێر تەلارەکە، جمەی دەهات لەو کوردانەی جوانترین جلوبەرگیان لەبەرکردبوو. دوای بەخێرهاتن و چاك و چۆنی، میر هەستی کرد ژوورەکەم بەدڵە، وتی: (خوالێخۆشبووی باوکم ئەم ژوورەی دروستکردووە، بەڵام پێویستی بەدەست پێداهێنانەوەیەك هەیە، پاشان لەسەر قسەکەی ڕۆیشت و وتی: کێ جێگایەك چاك دەکاتەوە، ئەگەر بزانێت تیایدا ناحەسێتەوە؟ هاکا تورکەکان، یان ئێرانییەکان، چەند ڕۆژێکی تر وێرانی دەکەنەوە). پێیشی وتم هۆی هەڵکەوتنی کۆشکەکەش بەو شوێنە بەرزەوە، هی ئەوەیە: جێگاکە خۆی پێشتر شوێنەواری گردێکی توورەکەڕێژی مێژینەی زۆر کۆن بووە(٨٦).

---

٨٣- دەروازەیەکی تری باش هەیە - هەرچەندە ئەویش هەر قێزەوەنە و لە دیوی دەرەوەی کۆشکەکەیە، ئەوکاتە چاکیان دەکردەوە.

٨٤- ئەم جۆرە ژوورانە پێیان دەوترێ (تەلار).

٨٥- وشەیەکی فارسییە و مانای (نیو ماوە)یە. لە خوارووی عێراق پێی دەڵێن (مودە) و (مەدات) و بە تورکیش پێی دەڵێن (یان)، بە مانای تەنیشت - ع. لە پەراوێزی کتێبەکەدا بەم شێوەیە بوو: (لاکێشی لبادی باریك و ئەستوور، نەرم، کە ڕەنگاوڕەنگێکی جوان کراوە. لە ئێران و کوردستان لەجیاتی کورسی و قەنەفە بەدەوری ژووردا رادەخرێ.

٨٦- ڕەنگە ئەم گردە هەر لەو چەشنە گردانە بێت کە لە (چەمچەماڵ) و (دەرگەزێن) و (تاسلۆجە)دا باسیان هاتووە.

کۆشکەکە بەسەر گەلیٚ دیمەنی ڕەنگیندا دەینواڕی و دڵیان دەکردەوە. ویستم خۆم لە قەرەی سیاسەت نەدەم و وابکەم میر باسی کاروباری ئابووری ولاٚتەکەی و وردە شتی وابکا. لە سەرەتادا مەبەستەکەم بەسەرکەوتوویی هاتە دی و پێم وت: بیستوومە والی (سنە) لە بنەماڵەیەکی (گۆران)ە، گۆرانەکانیش وەك پیاوی خێڵەکی بەڕێز نەبوون. ئیتر دەستبەجیٚ ورتەورتێکی ڕەزامەندیی بەناو دانیشتوانی ژوورەکەدا بلاٚوبووەوە، دەرکەوت لای کوردانی خێڵەکیی خۆشەویست بووم، بۆیە میر گورجتر بووەوە و کەوتە باسکردنی مێژووی بنەماڵەکەیان و لەسەرەتاوە وتی مێژووی بنەماڵەی فەرمانداری (سنە)، بنەماڵەیەکی گەلیٚ ڕەسەنە، بەلاٚم گۆرانەکان خێڵەکی نین. ئیتر دەستی بە باسکردنی خۆی کرد، کە نەوەی بنەماڵەیەکی رەسەنە و لە هۆزێکی بەخشندەیە... هەر لەسەر قسەکانی رۆیشت و وتی ناوی هۆزەکەی لە نەژاد دا (کرمانج)ە، بەلاٚم وشەی (بەبە) نازناوی بنەماڵەکەیانە و ئەندامانی ئەم بنەماڵەیە سەرداری پشتاوپشتی ئەو خێڵەن، لەبەرئەوە ئێستا هەموو ئەو ناوچانەی تیایدا دەژین و دانیشتوانی ناوچەکەش پێکەوە، بە حکوومەتی (بەبە)، یان (بابان) ناودەبریٚ، هۆزەکەش لە بنەچەدا لە (پشدەر)، لە شاخەکانی باکووری نزیك (سی کەنە)ی سەرسنووری ئێران دروستبووە. هەروەها وتی لەکاتی شەڕی نێوان عوسمانی و ئێرانیدا، یەکێك لە باپیرەکانی، خزمەتێکی باشی سولٚتانێکی عوسمانی کردووە، لە بەرامبەر ئەم چاکەیەدا بەوە خەلاٚتی فەرمانداریێتی هەموو ئەو ناوچانەیان داوەتیٚ، کە بەشەڕ لە ئێرانی داگیرکردبوو، بەمجۆرە وردەوردە خۆی و ئەوانەی دوای خۆی هاتن، توانیویانە دەست بەسەر ئەو ناوچانەدا بگرن کە ئێستا بەدەستیانەوەیە و ئەو ناوچانەش لەوساوە لە ئێرانییەکانیان سەندۆتەوە، ئیتر هەموو ئەم ناوچانەش کەوتنە ژێر دەسەلاٚتی بابانەکان، یان (بەبە) و بە فەرمانداریێتی (شارەزوور)یان سپارد، کە پایتەختەکەی کەرکووك بووە.

بەلاٚم میر، لەم گێڕانەوەیەیدا نەیتوانی مێژووی هیچ رووداوێکیانم بۆ دەسنیشان بکات، هەر ئەوەندە نەبیٚ وتی باپیرانی ئەم، ماوەیەکی دوور و درێژ سەرداری ولاٚت بوون و نزیك سەد ساڵێك لەمەوبەر فەرمانداریێتی دوو ناوچەیان درایە. دوایی وتی گۆرانەکان بەسەروسیما و شێوەزمانە کوردییەکەیاندا بەئاسانی دەناسرێنەوە. لەم بارەیەوە قسە و باسی زۆرمان کرد و لە دواییشدا بەخۆشی و برایەتی لەیەکتر جیابووینەوە. بۆشم دەرکەوت ئامۆزاکانی میر، واتە ئەندامانی خێڵەکەی، بەچاوی رەزامەندییەوە سەیریان دەکردم.

کە لە کۆشکەکەش دەرکەوتم، ئەسپێکی جوان و جوان پۆشتەم بینی، وەك دیارییەك بۆم ئامادە کرابوو، کە نەم دەتوانی وەری نەگرم و لەپێش خۆمەوە رایان دەکێشا...

دوایی چووین بۆ سەیری ئەو خانووەی لە نزیك کۆشکەکەوە بۆ من سازکرابوو، بەڵام کە سەیرمان کرد، خانوویەك بوو، ئەوەندە پیس بوو، دڵی تیادا دەگوشرا، خانووەکە هەرچەند گەورە و فراوانیش بوو، بەم حاڵەشییەوە خانووی ئەفسەرێك بوو، یان کاربەدەستێکی میربوو، کە لەبەر ئێمە پێیان چۆڵ کردبوو. لام وایە بە ئاشکرا قێزوبێزم لەو خانووە پێوە دیاربوو، بۆیە پسەپسێك کەوتە نێوان کۆمەڵەکەی لای خۆم و کوردەکانەوە، میریش سەرۆك وەزیرانی ناردبوو، تا تکام لێ بکات و رێگە بە خەزنەدارەکەی لای خۆم و یەکێك لە کاربەدەستانی میر بدەم، بچن بۆ ناو شار، هەر خانوویەکیان بەدڵ بێت، دەستبەجێ بۆمانی چۆڵ بکەن و تێی بچم. بەڵام ئەم پێشنیارەم بەلاوە پەسەند نەبوو، چونکە سەرباری ئەوەش کە بەدڵم نەبوو، حەزیشم نەدەکرد کەسی تر بێزار بکرێ. جگە لەمە، من پێم وابوو خانووەکانی ناو شاریش جیاوازییەکی ئەوتۆیان لەنێواندا نەبێ. دیارە هەر لە سەرەتاوە میریش ئەوپەڕی توانای بۆ زامنکردنی حەسانەوەمان خستبووە گەڕ، لەبەرئەوە بڕیارم دا بچمە ئەم خانووە و هەستیشم کرد بڕیارەکەم بەشێوەیەکی گشتی جێی ڕەزامەندی بوو. بۆیە لەسەرئەمە (میناس)م بەشوێن هاوسەرەکەمدا نارد، تا لەگەڵ خۆیدا بۆ ناو شاری بیهێنێ، چونکە کوردەکان هەرگیز بەچاکیان نەدەزانی ئەمڕۆ بۆ چادرگەکەمان بگەڕێمەوە. بە ئاسانیش ئەو بڕوا پووچەیان تیادا بەدی دەکرا، کە ئەگەر شارەکە بەجێبهێڵم، بەشتێکی شوومی دەزانن. لەبەرئەمە تا گەیشتنی هاوسەرەکەم، دوو سێ سەعاتم بەبێزاریی و وەڕسی و بە پیاسە بەسەر برد، ئەمیش بووە هۆی زیادکردنی ئەو ژانەسەرەی لە بەیانییەوە تووشم ببوو.

بۆ ئاگاداربوونیش لە شێوەی خانووە باشەکانی ناو سلێمانی، بەچاکی دەزانم باسی ئەم خانووە بکەم، کە خانوویەکی چوارگۆشەی یەك نهۆمییە و لەسەر عەمارتەیەك دروستکرابوو، کە بەرزی عەمارتەکە نزیکەی (٣) پێ دەبوو، لە خشتی کاڵیش دروستکرابوو، دیوارەکانی عەمارتەکە بە قوڕی تێکەڵ بە (کا) سواخ درابوون، یەك دوو ژووری کۆشکەکە لەسەر سواخی قوڕەکەوە بە (قسڵ) سواخ درابوو، بنمیچەکەیشی تەخت و دارەڕا و رایەڵی رێك و جوانی کرابوو، لەسەروو ئەمەشەوە گڵەبان کرابوو، هەموو خانووەکەش لەناو حەوشەیەکی گەورەدا، یان وەك لە هیندستان دەڵێن لە ناوەڕاستی مەیدانێکدا دروستکرابوو. ئەم حەوشەیە بە دیوارێك، لەمسەر بۆ ئەوسەر، کرابوو بەدوو بەشەوە، کە دیوارەکە، لە نزیك ناوەڕاستی

خانووەکەدا لە هەردوو بەری حەوشەکەی دەدایەوە وکردبووی بەدوو بەشی پاش و پێشەوە، یەکێکیان کرابوو بە حەرەم(٨٧) ، ئەویتریان کرابوو بە دیوەخان(٨٨). وەك تیکرِای خانووی تورکەکان نەبوو، کە لەیەك دەرگاوە دەچوویتە سەر هەردوولایان، بەڵکو دەبوایە لە دەرگای ئەو دیوارەوە بچوویتایەتە ژوورەوە، کە حەوشەکەی دەکرد بە دووبەشەوە، ئەمەش بەتایبەتی بۆ ئەوکاتانەی هەوا ناخۆش دەبوو، بۆ هاتووچۆ. هەردوو حەوشەکە سەوزەگیایەکی زۆری لیَ رِوابوو. داری بیی و چنار و تووی لیَ نێژرابوون. گوڵی هەمەچەشنەش لە گوڵدان و دوکانی بچکۆلەدا نێژرابوون، لە حەوشەی ماڵەکانی سلێمانی دا جۆگەلەیەکی بچکۆلەی ئاویشی تیادایە، کە بە کارێز لە شاخەکانەوە رایان کێشاوە. وا دیاربوو لە دروستکردنی ژوورەکاندا پشتیان بە نەخشە و شتی وا نەبەستبوو. بەڵام هەرچۆنی بێت، من خۆم نەمتوانی یاسایەك لە شێوەی دروستکردنی خانووەکەدا بەدی بکەم، جگە لەو تەلارەی لەهەردوو بەشی حەرەم و دیوەخانەکەدا هەبوو، ئەم تەلارانەش، ئەو ژوورانەن کە لە رووی دەرەوەی خانووەکەدان و بەری پێشەوەیان بەرەلاَیە و تایبەتن بۆ پێشوازی میوان و بەشێوەیەکی گشتیش بۆ خەوی هاوینان، جگە لەو هەژارانە زیاتر، کە ماڵەکانیان تەلاری تیادا نییە، کەس لەسەربان ناخەویَ، لە رۆژانی گەرمای بەتینیشدا کە لە مانگێك زیاتر تێناپەرِیَ، هەندیَ کەس لە حەوشەکانیاندا سەکۆی نزم دروست دەکەن و لەسەری دەخەون. هەندێکی تریش کەپر و سابات، لە قامیش و زەل و لقوپۆپی درەخت، لەسەر حەوزێکی بچکۆلەی ناو حەوشەی خانووەکانیاندا دروست دەکەن و لەسەری دەخەون. یان بۆ خۆ رزگارکردن لە کێچ، کە لە شتە هەرە بێزارکەرەکانە و لە هەموو ناوچەکانی رِۆژهەڵاتدا و بەتایبەتیش دەڵێن لەم ناوچەیەدا، کە بیَ ئەندازە زۆرە، کوللە و پەردە دروست دەکەن.

لە دیوەخانەکاندا دالاَن، یان هەیوانێکی گەورە و تاریك هەیە، کە بەچەند کۆڵەگەیەك راگیراوە، دەڵێن لە هاویندا پەنایەکی فێنکە، بەڵام دیارە ئەویش هەر دەبێتە مەڵبەند بۆ کێچ. جگە لەم، بەلاَیەکی تریش هەیە، ئەویش دووپشکە، دەڵێن گەورە و زۆر و ژەهردارن. هەروەها هەزارپێش هەیە، بەڵام پێم وایە ئەمیان زۆر ترسناك نەبیَ. جگە لەمە ماری گەورەو زۆریشی هەیە، دەڵێن ئەمانیش زۆر ژەهردارن.

---

٨٧- حەرەمخانە: ئەو بەشەی لەناو ماڵدا تایبەتە بە ئافرەت.

٨٨- دیوەخان: بەشێکە لەناو ماڵەکەدا، لەوێدا خاوەن ماڵ پێشوازی میوان دەکات و نۆکەر و پیاوەکانیشی تێدا نیشتەجیَ دەبن.

ژووره زستانییەکانی تری خانووەکەش، لە ڕاڕەوی درێژ و تاریکەوە دەچوویتە سەریان و دیمەنیشیان وا نەبوو لە نزیکەوە ئارەزووی دیتنیان بکەیت. لەڕاستیدا منیش زۆر تیایاندا نەدەمامەوە و ئەوەندەی پێم بکرایە، هەوڵم دەدا لە دەرەوەبم.

خانووە ئاساییەکانی تریش لە گەوڕێکی قوڕین دەچوون. شارەکەش هەمووی لە گوندێکی گەورەی عەرەبی دەچوو، کە ناومالەکانی بە دەرەوەن، لەوەش دەچوو خەڵکەکە خۆیان دەربەستی ئەمە نەبن، چونکە ئافرەتەکانیانمان دەدین بەبێ پەچە و رووپۆش، بێباکانە، لەگەڵ پیاواندا ، بۆ جێبەجێکردنی کاروباری ناومالیان بۆ بازاڕ دەچوون ، سەرەڕای ئەمانەش ئەم شارە دیمەن ناشیرینە، پێنج خان و دوو مزگەوتی رێك و جوان و حەمامێکی زۆر پۆشتەی تیادایە، باشترین شارەزاش لە کوردەکان خۆیان، ئاماری دانیشتوانی شاری سلێمانی، بە هەموو فەرمانبەرانی میری و دارودەستەی میرەکانەوە، بە (١٠/٠٠٠) دەهەزار کەسێك داناوە، بەڵام دانیشتووانی ئاسایی شار، لە بنچینەدا بریتی بوون لە جووتیاری گوندنشین.

هەر کە بارخانەکەم گەیشتەجێ، چادرێکی دوو ئەستووندەگیم هەڵدا و کردم بە دیوەخان، یان ژووری میوان. پاشان ڕازاندمەوە و چەکەکانی خۆمم پێداهەڵواسی و ئەو رایەخە جوان و لبادانەشم تێدا راخستن، کە میر بۆمی ناردبوون، ئیتر بوو بە ژوورێکی میوانی گاڵتە پێنەکراوی رۆژئاوایی بێ هاوتا، کە بێ هیچ گومانێك لە هەموو شارەکەدا ژوورێکی وانەبوو. سەربازە هیندییەکانیش لە حەوشەی خانووەکەدا چادریان هەڵدا و هەندێ لەوانەی کۆمەڵەکەی لای خۆمیش، کە جێگاکانیان بەدڵ نەبوو، چاویان لەوان کرد و لای ئەوان چادریان هەڵدا.

لەشەوی یەکەمدا، بۆ دامەزراندنی ژووری حەرەم، وەك پێویست، سەرکەوتوو نەبووین و چاکترین ژوورمان بۆ نووستن تاقیکردەوە، بەداخەوە لەبەر گەرما و بۆنی پیس و پۆلە کێچ، هەموو ماندووبوونەکەمان بە هیچ دەرچوو. لەبەرئەوە نوێنەکانمان هەڵگرت و چووینە تەلارەکەوە، لەوێش هەر خۆمان لەدەست ئەو بێزارکەرە(٨٩) کوردییانە حەشار دا و تا بەرەبەیان خەو نەچووە چاومان، خۆ ئەگەر بەو هەموو ماندووبوونەمەوە، چەند سەعاتێك خەوم لێ بکەوتایە، دیارە شتێکی خۆش دەبوو.

پلەی گەرما لە سەعات (٥)ی بەیانیدا (٦٢) پلە بوو، لە سەعات سێ و نیوی دوای نیوەڕۆدا (٧٥) پلە بوو، لە سەعات دەی شەویشدا (٦٨) پلە بوو، لای باشووریشەوە تاوتاو (با)ی هەڵدەکرد. رۆژێکی ناخۆش و کەمێکیش باران هەبوو.

---

٨٩- بێزارکەری کوردی، هەر مەبەستی لە کێچە - م.

## ١١ی ئایار

ئەمڕۆ زۆر خانەدانی کورد بۆ دیدەنیم هاتن. گەلێ زانیاریی هەمەجۆرەم لەبارەی نیشتمانەکەیان کۆکردەوە. یەکێکیان بۆمی گێڕایەوە، کە جارێکیان (ئەمانوڵڵا)ی والی سنە، داوا لە (ئەورەحمان پاشا)ی سلێمانی دەکات هۆی ئەوەی بۆ ڕوون بکاتەوە، کە بۆچی دەستە و دایەرە و پیاوەکانی، لەکاتی ئاوارەبوون و لێقەومان و تەنگانەیدا شوێنی ناکەون! وەك چۆن کوردانی بابانی، بەرامبەر سەردارەکانیان دەیکەن! لەکاتێکدا ئەم، زۆریش باشە لەگەڵیاندا!. ئەورەحمان پاشای گەورەش، وەڵامێکی زۆرتوندی دەداتەوە و دەڵێت: (چونکە تۆ سەرۆك هۆز نیت و پیاوەکانیشت پیاوی هۆزەکەت نین... ڕەنگە نانیشیان بدەیتێ و پۆشتەیان بکەیتەوە و پارەشیان بدەیتێ، بەڵام هیچیان ئامۆزات نین، بەڵکو خزمەتکارن).

لەڕاستیشدا پابەندیی کوردان بە سەرۆکەکانیانەوە، شتێکی زۆر بەهێزە، چونکە ئەمانە لە بەغدا لەگەڵ سەرۆکەکانیاندا، لە حاڵێکدا دەژین، تەواو دەستبەرداری خۆیان دەبن و تاڵترین ژیان بەسەر دەبەن و هەموو کوێرەوەری و نەبوونییەك دەچێژن، بەبێئەوەی ورتەیەك لە دەمیانەوە بێت. زۆرجار لەشاری بەغدادا، چەندان خانەدانی کورد، بە جلوبەرگی شڕەوە دەبینیت، لەکاتێکدا هەریەکە لەمانە، لە نیشتمانەکەی خۆیدا، ئەسپی پۆشتە و خزمەتکاری هەبووە. بەڵام ئەمانە بەوە ناسراون کە لە تەنگانەدا بە کۆڵ هەڵگری و ئاوکێشیی پارە پەیدا بکەن و بیدەن بە سەرۆك و سەردارەکانیان، تاپێی بژین... لەکاتی مردنی براکەی ئەورەحمان پاشادا لە بەغدا، کوردێکی داروەستەی خۆی، لە تەلاری ئەو خانووەوە، یان ئەو ماڵەی کە تیایدا بوون، لەوساتەدا کە سەرۆکەکەی دوا هەناسەی ژیان دەدات، هاوار دەکات و دەڵێ (ئەوە چی قەوماوە؟ بەگ مرد؟ کەواتە منیش دەبێ ساتێك دوای ئەو نەژیم). ئیتر لەسەر بەرزایی خانووەکەوە خۆی فڕێ دەداتە خوارەوە و دەمرێ. زۆرجاری تریش لە بەغدا ئەم بەسەرهاتەیان بۆ گێڕاومەتەوە... لەگەڵ ئەوەشدا کە ئاوارەبوون لە بەغدادا، شتێکە، کورد یەکجار زۆر لێی دەترسێ، کەچی بەڕادەیەك وابەستەییان بە سەرۆکەکانیانەوە توندە، سامیی ئەو ئاوارەبوونە نایان ترسێنێ، چونکە بەرگەی هەرچی هەژاریی و نەبوونییە دەیگرن، بەبێئەوەی ئاخ و ئۆفێك دەربڕن. هەر بەڕاستیش چۆڵەوانیی و گەرمای بەتینی ئەو وڵاتی عەرەبە، شتێکە وەك دەیانوت ناتوانن تێدا بژین...

(سلێمان پاشای کوردی)ش سەرەڕای ئەوەی کە چەندان جار فێڵ و تاوانی والی بەغدای تاقیکردبۆوەوە، کەچی ساویلکەیەتی خۆی وای لێکرد جارێکی تریش بەغدا بۆ لای خۆی

رای بکێشێتەوەو یەکێك لە بەگزادەکان، یان خانەدانە هەرە ناودارەکانیان، چووبووە لای و پێی وتبوو هەموویان ئامادەی هەر فەرمانێکن لە پێناویدا بیکەن، تەنیا بەرگەگرتنی سامیی ئاوارەیی دوورودرێژی بەغدا نەدا نەبێت. پێیشی وتبوو: ئەگەر ڕێگای دەدات حەز دەکەن بەخۆیان و هەموو خاوخێزانیانەوە کوردستان بەجێ بهێڵن و لەگەڵیدا بڕۆن و کاسبی بۆ بکەن...

که یەکێك لەم سەرکردانەش جڵەوی فەرمانداریێتی دەستگیر دەبێ، بەپیتترین زەوی بە دڵسۆزترینی ئەو دەست و پێوەندانە دەدات، جگە لە ئەسپ و چەك و پێبەخشینی بەردەوامیان...

جارێکیان خالید پاشا بۆمی گێڕایەوە، کاتێ فەرمانداریێتی (کۆیسنجاق)یان لێ سەندۆتەوە، پیاوەکانی هاتوونەتە لای و کەلوپەلی ئەسپ و زین و ئەو زیوانەش کە بە ئەسپەکانیانەوە بووە، هەموویان خستۆتە بەردەمی و پێیان وتووە مادام بۆ بەغدا ئاوارە دەکرێ، ئەمانیش بۆ ئەوێ بۆلای دێن و لەوێ پێویستیان بەم شتانە نامێنێ و دەبێ ئەم شتانەیان بکات بەپارە، تا بەکەڵکی بێت.

لە چاکترین سەرچاوەی باوەڕ پێکراوەوە ئەوەم بۆ دەرکەوت، کە خۆمیش زۆر دەمێك بوو بڕوام وابوو، کە گوندنشینەکان کۆمەڵە خەڵکێك پێك دەهێنن سەروەر جیاوازییەکی تەواویان لەگەڵ کوردانی خێڵەکیدا هەیە، کە بەدەگمەن خێڵەکییەکان کشتوکاڵ دەکەن، یان هەر نایکەن. لەلایەکی تریشەوە ئەم جووتیارانە، کەم جار سەربازیی دەکەن. کوردانی خێڵەکیی بۆ خۆ جیاکردنەوەیان لە گوندنشینەکان، خۆیان ناوناوە (سوپا)، یان (کوردی جەنگاوەر). بەڵام گوندنشینەکان ناوێکی جیاواز و تایبەتییان لەم ناوچانەدا نییە، لە (مسکێن) و کۆیلە زیاتر.

جارێکیان کابرایەکی خێڵەکی بۆمی باسکرد کە خێڵەکیی بەچاوێك سەیری گوندنشین دەکەن، وەك ئەوەی ئەمانە، هەر بەتایبەتی بۆ خزمەتکاریی دروست بووبن. لە ڕاستیشدا ئەم جووتیارە کوردانە زۆر کڵۆڵ و بێچارەن، تا ڕادەیەکی زۆریش ژیانیان لە ژیانی کۆیلە ڕەشەکانی هیندی ڕۆژئاوا دەچێ. لەوەش ناخۆشتر ئەوەبوو، نەمدەتوانی وا لەو ئاغایانەی کورد بکەم شەرم لەو توندوتیژیی و دڵڕەقییە بکەن کە بەرامبەر ئەو مسکێنە(٩٠)

---

٩٠- ئەو جیاوازییە زۆرەی نووسەر، لەنێوان کوردی خێڵەکی و گوندنشینانی کورددا هەستی پێکردووە، لەجێی خۆیدا بووە، چونکە ئەوەی لای هەمووان ئاشکرایە، ئەوەیە کە کوردانی خێڵەکی بریتین لە یەکێتییەکی کۆمەڵایەتی، یان ڕەمزێکی پاڵاوتەی ئەو نەتەوە هیندی و ئارییانەی لە ڕۆژگاری کۆچ و ڕەوە گەورەکەوە، واتە هەزار و پێنج سەد ساڵ بەر

بەسزمانانەی هەیانە. هەمووشمان لەسەر ئەو ڕایەین کە ئەم جووتیارانە بەشێوەی قسەکردن و وسەروسیمایاندا، بەئاسانی لە خێڵەکی جیا دەکرانەوە، مافی ئەوەشیان نەبوو وەك خانەدانەکانی نیشتمانەکەیان، خۆیان بنوێنن.

جارێکیان مەحموود ئاغا پێمی وت: (تورکەکان بێئەوەی لە یەکمان جیابکەنەوە، بەهەموومان هەر دەڵێن: کورد. لەگەڵ ئەو لادێییە گەمژانەدا زۆر جیاوازین، کە تورکەکان پێیان خۆشە بەسەرماندا دابڕن...)(٩١).

مەبەستیش لەوهەڵس و کەوتەیە کە لەگەڵ لادێیدا دەکرێ و بەگەمژە دادەنرێن. بەڵام هەرخودی زەبروزەنگ، لادێییەکەش و زۆردارەکەش پێکەوە گەمژە و گێل دەکات و لێرەشەوە سەیر نییە ئەگەر کوردی خێڵەکی و کوردی لادێیی، هەروا بەگێلی و گەمژەیی بمێنێننەوە و هەست و هۆشیان نەبێ.

لە گفتوگۆیەکدا سەبارەت بە بنەماڵە گەورەکانی کورد، یەکێك لە دانیشتووان وتی: (شوورەیی نییە بۆ سەرۆکەکانمان رازی بن بە بەغداد، لەوێ بۆ تورکێك ملکەچ بکەن ، کە هەر پێش ماوەیەك، وەك وڵاخ. بەچەند سەد قرۆشێك فرۆشراوە، لەهەر کامێکیشمان تووڕە دەبێت، پێمان دەڵێ: (کوردی کەر!).

یەکێکی تر لە دانیشتووان هەڵیدایەوە وتی: (رقەبەریی نێوان میرەکانمان، خۆیان، خۆیان لەناو دەبات، ئەگینا نەتورك و نە ئێرانی، ئەگەر دووبەرەکی و ناکۆکی نێوان بنەماڵەکانی سەرۆکەکانمان نەقۆزنەوە ، ناتوانن بەسەرماندا زاڵ بن، ئێمە ئەمە باش دەزانین، کەچی سەرەڕای ئەمەش تورکەکان هەمیشە و بەم فێڵەنا، بەیەکێکی تر، دەتوانن بەسەرماندا زاڵ بن، بەڕاستیش ئێمەی کورد، درەنگ تێدەگەین).

---

لە هاتنە دنیای عیسا بۆ ناوچەی کوردستانەوە هاتوون. بەڵام گوندنشینەکان ئەوەی لەبارەیانەوە زانراوە، ئەوەیە ئەمانە پاشماوەی خەڵکی ناوچە رەسەنزادەکەن و بنەچەیان دەچێتەوە سەر نەتەوەکانی (زاگرۆس) و لەگەڵ تێپەڕبوونی رۆژگاردا تێکەڵی ئەو خێڵانە بوون، کە هاتوونەتە ناویان و هەریەکەشیان دابونەریت و سیفاتی خۆی پاراستووە، ئەگەرچی ئەو سیفاتانە خەریکن لەناودەچن. گوندنشینەکان بەدوو جۆر ناو دەبرێن، کە تائێستاش بۆ جیاکردنەوەیان لە خەڵکی خێڵەکیی بەکاردەهێنرێن، ئەو دووجۆرەش یەکێکیان (دێکانی)یە و مانای خەڵکی لادێکانە و ئەوی تریان (مسکێن)ە و مانای جووتیارە. ئەمەی دووەمیان شێوە گاڵتەپێکردنێکی تێدایە. سەرۆك خێڵەکان هەندێ مافیشیان بەسەر گوندنشین و جووتیارەکانەوە هەیە، کە هەر بەڕاستی وایان لێدەکات بەپێی تێگەیشتنی ئێستا(مسکێن) و کڵۆڵ بن.

٩١- مەبەست لەو قسەیەیە، کە لەناو تورکەکاندا باوە و دەڵێن (وەك کوردی کەر).

کاتێ باسی رووخاویی و پیسیی ئەو خانووەشم کرد کە تیایدام، هەر هەمان پیاو وتی: (راست دەکەیت، خانووەکەت پیس و رووخاوە، بەڵام بۆچی خانووی چاك دروست بکەین و هەموو دەمێکیش چاکی بکەینەوە، ئەگەر دڵنیا نەبین لە ژیانی خۆمان و لەوەی تادوا هەناسەمان تیایدا دەحەوێینەوە؟ نازا بۆ نەوەکانمان، ئەم پاشایە دەڕوا و یەکێکی تر لەهەمان بنەماڵە(٩٢)، بەخۆی و دۆست و خزمەکانییەوە دێت و هەموومان لەماڵ و حاڵ و زەویوزارمان دەردەپەڕێنێ و بەوانی دەدات. هۆی سەرەکی کاولبوونی ئەم نیشتمانە ئەوەیە کە ئاسایشی تێدانییە و میرەکانیش فەرمانڕەوایەتییان زۆر ناخایانێ. فەرمانڕەواش هەرچۆنێ دەبێ، با ببێ، بەڵام ئەگەر دڵنیابێ لەوەی تا دوایی ژیانی حوکم دەکات، کەڵکی لێ وەردەگیرێ.

نیوەڕۆ مەحموود مەسرەف بۆ ئەوەی (شەڕەکەو)م نیشان بدات، هات بۆلام. لای کوردەکان ئەمە جۆرە رابواردنێکی خۆشە. مەحموود مەسرەف خۆی، کە وەرزشکارە، زانی من تا ئەوکاتە، شتی وا سەیرم نەدیوە، حەزی کرد کەوە شەڕکەرەکانیم نیشان بدات، کە کۆمەڵە کەوێکی زۆر نایاب بوون. مەحموود مەسرەف لەپێشدا خۆی لەگەڵ چوار کوڕی، هاتنە لام، هەرچواریان لاو و باڵابەرز و رێکوپێك بوون، هاوڕێکەم دیمەنێکی زۆر شکۆداری لەناویاندا هەبوو، دڵیشی بەوە زۆرخۆش بوو، کە کوڕەکانیم بەلاوە شەنگ و شۆخ بوون، بۆیە وتی: (بەڵێ قوربان، سێ و چوارێکی تریشم لەماڵەوە هەن، رۆژێك دەبێ بگەنە ئەو تەمەنەی بێنە خزمەتت و دەستت ماچ بکەن). سەیرم لێهات کوڕەکان لەبەرچاوی باوکیان، ئازادیی خۆیان بەجۆرێك پەیڕەو دەکەن، زیاد لە ئازادیی رۆژهەڵاتییانەیە. هەریەکەیان بە ئارەزووی خۆی دەجووڵا و قەننەی خۆی دەکێشا. ئەوەی تا ئێستا من سەبارەت بە نەریتی عەرەب و تورك دەیزانم، تا باوك دانیشتبێ، کوڕەکانیان دانانیشن.

دوای خواردنەوەی چەند فنجانێك قاوە و قەننەکێشان، هاوڕێکەم بە قاقبە قاقبی کەوەکاندا، هەواڵی گەیشتنی لەشکری راگەیاند، وەك خۆی ئەو ناوەی لێنابوون، کە لە مەودایەکی دوورەوە دەنگیان دەبیسترا. دوای تاوێ کۆمەڵێ کوردی توندوتۆڵ هاتن و بەهەموویان ژمارەی (٣٢) قەفەسیان خستبووە سەرشان، کە هەر قەفەسێکیان نێرەکەوێکی تێدابوو. قاقبەقاقبی بەکۆمەڵ و بەردەوامیی ئەم کەوانە، هەراو ژاوەژاوێکی سەیریان دروست کردبوو. دەتوت دەنگی هەزار سەعاتی گەورەن پێکەوە. تا نەکەوتنە شەڕیش، یەك تۆز بێدەنگ نەبوون. بەدوای قەفەسەکانیشەوە

٩٢- ئەوەی لێرەدا شایانی باسە ئەوەیە کە میرانی (سلێمانی) هەموویان دەبێ سەر بەبنەماڵەی (بابان) بن.

کۆمەڵێکی تری کەوبازیان لەگەڵ بوو، کە شەیدای دیتنی دیمەنەکە بوون. ئەگەریش نەم وتبایە دەرگاکە لەسەر ئەوانە داخەن کە بەزەبری کوتەك نەبوایە، دابین نەدەکران، خەڵکێکی زۆر دەهاتنە ژوورەوە. پاشان قەفەسەکانیان لە شێوەی بازنەیەکدا ریزکردن و بینەرانیش لەپێشەوە وەستان و من و مەحموود مەسرەف و کوڕەکانیشی لای چادرەکەوە بازنەکەمان تەواوکرد. دیمەنەکە ئەوەی دەهێنا وێنەیەکی بکێشم. بەڵام ئەگەر چەند جارێکم نەدیبایەوە، تا هێڵە گشتییەکانی وێنەکە لە مێشکمدا دەچەسپا، کارێکی ئاسان نەبوو.

یەکێك لە پیاوەکان دەرگای قەفەسێکی کردەوە و کەوێکی بەرەڵاکرد، کەوەکەش خۆی گیف کردەوە و دەستی بە لەنجەولارکردن و چاوەڕێکردنی دوژمنەکەی کرد، کاتێکیش دووەمین کەو بەرەڵاکرا، شەڕەکەو دەستی پێکرد. دیمەنێکی خۆش بوو، هیچ توندوتیژییەکی تێدانەبوو. دیتنی ئەم باڵندە بچووکانە زۆر جێی خۆشیی بوو. کەوەکان لەسەر نووکی پەنجەی پێ رادەوەستان، بۆ یەك دەچوون و بازیان دەدا و دەنووکیان لەیەك دەگرت و فێڵیان لەیەك دەکرد، تا جێگایەکی باشی دوژمنەکەی بگرێ و خۆیشی لەژێرکەوتن بپارێزێ. وەك سەرنجیشم دا گرنگیی سەرکەوتنەکە لەوەدایە کە یەکێکیان ملی ئەویتریان بگرێ. خۆ ئەگەر یەکێك لە باڵندەکان بەو شێوەیە ئەوی بەزاند، ئەوە وەکو سەگی (بوول دۆگ)، یەك دووجار بەناو بازنەکەدا دەیسووڕاندەوە. هەندێ جاریش کەوێك دەبەزی و هەر زوو رایدەکرد و مەیدانی شەڕەکەی بەجێ دەهێشت. ئیتر شتەکە لەوێدا ساغ دەبووەوە و تایەکی تەرازووەکە قورستر دەبوو، بەڵام کەوە بەزیوەکە تا دوو سێ مانگی تر، خۆی لە قەرەی شەڕەکەو نەداتەوە. هەریەکە لەم کەوانەش ناوی خۆیان لێنراوە و باڵیشیان نەکرابوو. ئەم کەوانە بەجۆرێك ماڵیی کرابوون، دەستەمۆ ببوون و بەئاسانی بەدەست دەگیران. بۆ گرتنی کەوێکی تری بەرامبەریشی نەبێ، هێرش و پەلامار نادات.

کوردەکان بەتاسە و گەشکەیەکی زۆرەوە سەیری شەڕەکەوەکەیان دەکرد. دوای ئەوەی کەمێك سەیرم کرد، تازە بابەتییەکەی نەما و ئیتر لەبەرچاوم بووە یارییەکی منالانە. کورد نەتەوەیەکی وەرزشکار و سەرگەرمی سواریی و شەڕەکەو، شەڕەبەران و شەڕەسەگن... (**محەممەد**)یش وەك عەرەب نەژادێك، پێشبڕکێ و گرەوی لەسەر سواریی حەڵاڵ کردووە. بەڵام ئەم کوردانە لە سنووری ئەم رێگاپێدانەشیان تێپەڕاندووە و رێگایان بەخۆیان داوە، گرەو لەسەر کەو و شەڕە سەگیش بکەن.

دوای تەواوکردنی شەڕەکەو، دوو ئەفسەر هاتنەلام و ئاگاداریان کردم کە (دارۆغا) فەرمانی پێکردوون، بەپازدە سەربازەوە، بەدرێژایی شەو، ئێشکچی دەوروپشتی خانووەکەم

بن، بۆ ئەوەش ئەم ئێشکچییانە، بتوانن بەلای پاسەوانەکانی مندا تێپەڕن، دوو وشەی ئینگلیزی: (کێی زەلام) و (خۆمانین)م فێرکردن. شتێکی سەیریش بوو لەشاری سلێمانی دا ببیستین کورد ئەو وشانە بە ئینگلیزی بڵێنەوە... ئەم شتانە لە سەربازی هیندی موسڵمان و لە دەستە و دایەرەی بەریتانیای مەزنەوە فێرببوون. هەرئەوانیش ئاگاداریان کردم لەوەی کە کوردەکان لە مەبەستی (نهێنی شەو) گەیشتوون، چونکە وەختی خۆی لەئێران فێری بوون.

ئێشکگرەکان هەر لەخۆیانەوە لەسەربانی ماڵە دراوسێیەك جێی خۆیان چاك کرد و بەسەر هەموو سەربانەکانی تردا، کە بەو سەربانەوە نووسابوون، دەستیان بە هاتوچۆ کرد و بێ باکانە بەسەربانی ماڵی خەڵك و بەناو ماڵ و ژندا، کە لەو سەربانانە خەوتبوون، هەر کاتێ خۆیان ئارەزوویان لێ بوایە، دەهاتن و دەچوون. نارەزایی دەربڕینیش لە بەرامبەر ئەم زوڵم و زۆرەدا، هیچ دادێکی نەدەدا، چونکە زۆردار و زۆرلێکراوەکەش هۆی ئەم دەست درێژییەیان نەدەزانی. تۆ بڵێی مرۆڤ بەم هەموو زوڵم و زۆرە سەرکوێر بکرێ و لێشی بێدەنگ بێت!؟.

وا رێکەوت (ئاغا میناس) لە یەکێك لەو ئەفسەرە ئێشکگرەی پرسی: ئەرێ چرپایەکی نووستنمان بۆ پەیدا ناکرێ؟ ئەویش وتی چۆن پەیدا ناکرێ و دەستوبرد چووبوو بۆ یەکەمین (خان: کاروانسەرا)ی نزیك و پڕیدابووە سێ چرپای ئەو بازرگانە بەغداییانەی لەوێ دابەزیبوون و زۆر بە ئازایی و سەرکەوتنەوە هێنانی. دیارە پێویست ناکات بڵێین دەستبەجێ چرپاکانم بۆ خاوەنەکانیان گەڕاندەوە.

پلەی گەرما، لە سەعات پێنجی بەیانیدا (٦٦) پلە و لە سەعات دوو و نیوی نیوەڕۆدا (٧) پلە و لە سەعات دەی شەویشدا (٦٨) پلە بوو. (با)ش لە باشووری خۆرئاواوە هەڵیدەکرد، هەندێ رشێنەی باران و هەورە بروسکەیەکی کەمیش هەبوو.

## ١٢ی ئایار

ئەم بەیانییە چووم بۆ حەمام و سەیرم کرد زۆر جوان و پاك و خاوێن بوو، زۆر باشیش رووناك کرابووەوە، کارگوزارەکانیشی باش بوون و لە هەموو حەمامەکانی وڵاتی عوسمانی چاکتر بوو، کە هەتا ئێستا دیومن، جگە لە حەمامەکانی شام و ئەستەموول و قاهیرە، کە لەهەندێ رووەوە ئەم لەوانیش باشتر بوو. دیوارەکانی بەرەنگێکی بریقەدار و لەسەر شێوەی عەرەبیی، سپی کرابوون. پڕیش بوو لە حەوز و فوارە. ئەم حەمامە لەلایەن میری ئێستای سلێمانییەوە، دوو وەستای بەتایبەتی لە ئێرانەوە بۆ دروستکردنی لەسەر حسابی خۆی بۆ

هێنابوون. دەڵێن شێوەی دروستکردنەکەی لەوەی کرماشان دەچێت. هەروەها یەکێکی تریشی هەر لەسەر ئەم شێوەیە لەماڵەکەی خۆیدا دروستکردووە.

موسڵمانەکان پارەیەکی زۆر لە حەمامدا خەرج دەکەن، چونکە بەجۆرێك لەخواپەرستیی دەزانن، تەنانەت لەشکری دوژمنیش هەرگیز بیر لەوە ناکەنەوە زیان بە حەمام بگەیەنن. بۆیە بۆئەوەش بپارێزرێ و لەناونەچی، وەقف(٩٣ ) دەکرێ. ئەمڕۆ ئاووهەوای سلێمانی خۆش بوو، چونکە لە سەعات شەشی بەیانیدا (٦٦) پلە بوو، سەعات دوو و نیوی دوای نیوەڕۆ (٧٨) پلە بوو. لە سەعات دەی شەویشدا (٦٩) پلە بوو. با لای خۆرئاواوە هەڵیدەکرد، هەندێ گرمە و ڕشێنەی هەبوون، لە شەویشدا بارانەکە زیاتری کرد و هەورەبروسکەشی دەدایەوە.

## ١٣ ی ئایار

سەردانی هاوڕێی دێرینەم (عەبدوڵلا پاشا)م کرد و وامزانی تەندروستی کەمێك چاکتربووە، بەڵام هێشتا هەر زۆر لاواز و کەم هێزبوو، زۆر بەماتیی دەستی بە گێڕانەوەی بیرەوەری خۆی لە بەغداد کرد... کە ناوی خالید پاشای خزمیشی هاتە ناو ناوان، وتی: (تا ئەمڕۆ ماوەیەکی زۆری لە بەغدا بەسەربردووە و هەموو رەوشتێکی خێڵەکییانەی خۆی لەیاد کردووە و ئێستا کوتومت لە بازرگانێك دەچێت). عەبدوڵلا پاشا لەوانە نەبوو بەتەنگ هەواڵ زانینەوە بێت، کەچی ئەمڕۆ، بۆ یەکەمین جار بەپرسیار دایگرتمەوە و لەپێشەوە بە (چین و ماچین) دەستی پێکرد ، کە وەکو موسڵمانەکان بۆ (چین) بەکاری دێنن و هەر بەردەوام بوو تاگەیشتە باسی هەڵوێستی وڵاتانی ئەوروپا و هێزی هەریەکەیان. دیاربوو ئەم باسە لەناو بنەماڵەی باباندا پێشتر، لە دانیشتنێکدا شتێکی لێ باس کرابێ و هاوڕێکەم بیەوێ خۆی ئامادە بکات تا بۆ دووەمین جار لێی بدوێتەوە. دوای گەڕانەوەشم بۆ ماڵەوە، پێش ئەوەی بچمە حەرەم، پێشوازیم لە هەندێ هاوڕێیانی کورد کرد، یەکێك لەوانە (محەمەد ئاغا) بوو، وتی: (هۆی سەرەکی کاول بوونی ئەم وڵاتە، نەبوونی ئاسایشە لەهەموو ناوچەکەماندا، چونکە ئێمەی خێڵەکیی، ئەگەر دڵنیا نەبین لەوەی ئەو ناوچانە، هی خۆمانە، ئەوسا خۆشمان بۆ کشتوکاڵ تێداکردنی تەرخان ناکەین و بەم رەنگە وڵاتەکەش گەشە ناکات و پێش ناکەوێ،

---

٩٣ وەقف: مەبەست لەوەیە میر بەمەبەستی کاری خێر و ئایین پەروەریی دەستی بەسەردا بگرێ، لەم بارەدا واتە ئەو (وەقف) کردنە شتێکە هەر بۆ ناو.

بۆ وێنە: من ئەگەر بزانم سەرۆکەکەم جڵەوی فەرمانڕەوایی بەدەستەوە نامێنیٚ و خۆمیش تا وەرزی هەڵگرتنی خەلەوخەرمان، زەوییەکەم بەدەستەوە نامێنیٚ، یەك تەغار تۆو ناکەم. لەبەرئەوە لەجیاتی ئەوەی خۆم زەوییەکەم تۆو بکەم، دەیدەمە دەست لادێی، ئیتر خۆیان چۆنی دەکەن، بابیکەن و من بەشی خۆمیان بەشێوەی زەکات، یان (دەیەك)یان هەر لیٚ دەسێنم، سەرباری ئەمەش بەهەر شێوە و پەڵپ و بیانوویەك بێت، شتێکی تریان هەر لیٚ دەسێنم). کاتی خۆی (ئەوڕەحمان پاشا) دەیویست کارێك بکات، راستەوخۆ وڵاتەکەی باج بە (بابیعالی) بدەن، بە مەرجیٚ سەربەخۆ بیٚ و سەر بە هیچ والیەکی دەوروپشتی نەبێت، لە بەرامبەر ئەمەشدا قایل بووە (بابیعالی) ساڵانە داوای چەندی لیٚ بکات.



**ئەوڕەحمان پاشای بابان (؟ - ١٨١٣ز)**

ئەم وێنەیەم لەم کتێبە فارسییە وەرگرتوە: ((سفارتخانهای ایران))، نووسینی:. **محمد امین ریاحی**، چاپ اول، تهران ١٣٦٩ هەتاوی- ١٩٨٩ بەڕێکوپێکی بیدات و بۆ ئەمەش هەر بەتەنیا گوێڕایەڵی فەرمانەکانی (بابیعالی) بێت و لەکار نەخرێ و دوورنەخرێتەوە و دەست لە کاروباری ناوخۆی ناوچەکەی وەرنەدرێت، مەگەر لەکاتی سەرپێچی و یاخی بووندا نەبێت، بەڵام (پاشا) هەرگیز نەیتوانی ئەم شتانەی بۆ بێتەدی، چونکە لەکاتی یاخی بوونەکەی سلێمانە بچووکی والی بەغدادا، لە (بابیعالی)یەوە - رەئیس ئەفەندییان بۆ لابردنی سلێمانە بچووك ناردبوو، داوایشی لە ئەوڕەحمان پاشا کردبوو، کە لەجێی سلێمان پاشا ببێتە والی بەغدا، کەچی ئەوڕەحمان پاشا زۆر مەردانە و بەتوندی داواکەی رەت کردبووەوە و وتبووی (راستە من بەوە، پلەی یەکەمی وەزیریم دەدرێتێ، بەڵام قومێك لە ئاوی چیاکانی کوردستان بەهەموو تەخت و بەختی دەوڵەتی عوسمانی ناگۆڕمەوە، رەنگە چوونیشم بۆ بەغدا، گوزەرانم زۆر خۆشتر بکات، بەڵام ئەنجامەکەی دەبێتە هۆی لەناوچوونی بنەماڵەی بابان).

دوای نیوەڕۆش سەردانی عوسمان بەگم کرد. دەست و پێوەند و کارگوزارانی زۆر رێکوپێك بوون، خانووەکەیشی وەك خانووەکەی ئێمە وابوو. بەڵام ئەوەی ئەم، رێکوپێکتر و لە جێگایەکی کەمێك بەرزتریشدا دروستکرابوو. عوسمان بەگ لەوانەبوو، کە سەردانی زۆردەکرا، شان و شکۆیشی پێی کەم نەدەبوو. بەڕاستیش تابڵێی پیاوێکی خۆش مەشرەب بوو. هەروەك چۆن پرسیاری زۆر بەجێی لێ دەکردم، هەر بەو شێوەیەش وەڵامی پرسیاری منی بەجۆرێك دەدایەوە، کە زیرەکیی تێدا بەدی دەکرا. پۆزشی بۆئەوەش دەهێنایەوە کە ئارەزووی زانینی هەیە و پرسیار زۆر دەکات و وتی: (رەنگە بێزارت بکەم، بەڵام ئەوەت لەبیر نەچێ کوردێك چەند بەلایەوە سەیرە کە لەگەڵ ئینگلیزێکدا دەدوێ و چەند ئارەزوو لە سنگیدا دەجۆشێ بۆ قۆستنەوەی ئەو قسانە و زانینی ئەوشتانەی کەڵکیان لێ وەردەگیرێ و رێگەی تریشی نییە بۆ فێربوونیان). منیش حەزم دەکرد لە پرسیارکردندا بەردەوام بێ و دڵنیاشم کرد لەوەی منیش لە وەڵامەکانمدا وەکو ئەو، سەربەست دەبم. پرسیاری زۆری لەبارەی ئینگلتەرە و فەرەنسا و روسیا و رژێمەکەی ئێمە و شێوەی سەراپەردەی وڵاتەکەمان و چۆنێتی رێکخستن و بناغەی دروستبوونی سوپاکەمان و گەلێ پرسیاری تری سەبارەت بە سوپاکەمان کرد، کە لەوەدەچوو شتەکەی بەلاوە مەبەست بێ و شتیشی لێ بزانێت. بەپێچەوانەی تورکەکانیشەوە زۆر گوێی بە کاروباری سوڵتان و ئەستەمووڵ و تورکەکان نەدەدا. لەبارەی شەڕەکەی (واتەر لو)وە، بە دوور و درێژیی پرسیاری زۆری لێکردم، بەبێئەوەی ناوی شەڕەکەی بیرمابێ، کە رەنگە هەر لە

ئێرانییەکانی بیستبێ. سەبارەت بە (بۆناپارت)، یان وەك ئەو دەیوت: (ئیمپراتۆل)یش، شتی بیستبوو. دوایی هاتە سەرباسی (چین) و هەر هەمان ئەو پرسیارانەی دووبارە کردەوە، کە سەرلەبەیانی ئەمڕۆ، عەبدوڵلا پاشا، لێی کردبووم و ئەمەش بووە هۆی ئەوەی دڵنیابم لەوەی هەبێ و نەبێ، ئەم بابەتەیان لەناوخۆیاندا باسکردووە، بەتایبەتیش پرسیاری ئەوەی لێکردم کە ئاخۆ دەیەڵێن بیانی سەردانی (چین) بکات؟ بەڵام کە پێم وت: لەم دواییەدا باڵوێزێکی ئێمە لە چین بووە، سەرسامتربوو.

لەسەر پێشنیاری یەکێك لە دانیشتووانیش، بە وریاییەکی ئاشکراوە، باسەکەی بۆ باسی هیندی بەریتانیا گواستەوە و بەم تێبینییە دەستی پێکرد: (شتێکی سروشتییە، پاشایەك سوپایەکی بەهێزی وەکو سوپای ئێوەی هەبێ و بەپێی ئارەزووی خۆی بەکاری بهێنێ و سەیریش نییە بەلامەوە، کە ئێوە هەمیشە هەوڵ بدەن دەرفەتی دەست بەسەراگرتنی وڵاتانی ترتان بۆ بڕەخسێ). تێگەیشتم دەیەوێ چی بڵێ، بۆیە وتم: ئەو سوپا مەزنەی ئێمە، لەسەر خواستی پاشا پێك نەهاتووە، ئەو هێزەش کە هەیەتی، هەر بۆ بەرگری کردنە لە خۆمان و ئێمەش لەسەرمان پێویستە سوپایەکی گەورە بۆ خۆمان دروست بکەین، ناشمانەوێ دەست لە کاروباری خەڵکی تر وەربدەین و هەر بەوجۆرەش نایەڵین کەس دەست لەکاروبارمانەوە وەربدات. ئێستاش ئەوەندەمان سامان و دارایی و زەویوزار هەیە، لەخۆمان زیادە و هەندێکیان دەپارێزین و ناتوانین دەستبەرداری بین، نەوەك بکەونە دەست خەڵکی تر و لەدژی خۆمان بەکاریان بهێننەوە. سەبارەت بەمە وتی: (ئەگەر وابێ وەك تۆ دەیڵێیت، ئەی چۆن ساڵ دوای ساڵ لە هیندستان دەست بەسەر شوێنی زیاتردا دەگرن و دەست بەسەردا گیراوەکانتان فراوانتر دەکەن؟). دیسان لەسەر قسەکەی رۆیشت و وتی (تکا دەکەم پرسیارەکەم بەنابەجێ وەرنەگریت). پێم وت: (ئەو دەست بەسەراگرتنەمان لە هیند، دەگەڕێتەوە بۆ هەمان ئەو هۆیەی ئێستا باسم کرد، چونکە ئێمە یەکەمین ئەوروپایی نەبووین دەست بەسەر هەندێ ناوچەی هیندا بگرین و هەندێ لەو ناوچانەش کە ئێستا داگیرمان کردووە، لە ئەنجامی سەرکەوتنماندا بەشەڕ، لەو ئەوروپاییانەمان سەندۆتەوە، کە لە ئەوروپا هەندێ بەشی تریشیانمان کڕیوە و چەند بەشێکی تریشمان لە ئەنجامی رێکەوتندا لەگەڵ خەڵکی ناوچەکەدا بەرامبەر هەندێ خزمەتگوزاری و کەڵکی ترمان بۆیان، چنگمان کەوتوون. ئا بەمجۆرە ئەو ئیمپراتۆریەتە، لە ناوکێکی بچووکەوە پێکهات و بوو بەو ئیمپراتۆریەتەی سنووری دەگاتە سنووری گەلێ هەرێمی فەرمانڕەوای بەهێز، هەندێکیش لەمانە دۆستمان بوون و کەڵکیان لێ

وەرگرتین، بەڵام هەندێکی تریان ئیرەییان بەهێز و توانامان دێت و چاویان پیاماندا هەڵنایەت، لەو خێروخۆشییەی تیایداین و خۆشیان ئەوەندەیان لەباردا نییە، شتی وایان دەست بکەوێ، ئێ ئەگەر خەڵکیش بوو بە دراوسێی یەکتری، ئەوا زۆرجار روودەدات بەرژەوەندییان بەیەکدا هەڵپژێ و دیارە ئەو بەیەکدا هەڵپژانەش دەبێتە هۆی ناکۆکی نێوانیان و لەگەڵ ئەوەشدا کە ئینگلیز خۆی بەرامبەر ئەوانەی وەك خۆی وان، ئاشتیخوازە، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە بۆ خواستی خەڵکی تر ملکەچ بکات، زۆرجاریش لەبەر پێویستی بەرگریکردن لە ماف و پاراستنی شەرەفمان، بۆتە هۆی شەڕ هەڵگیرساندن، بەڵام سوپاس بۆ خوا کە هەمیشە پشتیوانمان بووە و ئێمەش لە هیچ یەکێك لەم شەڕانەدا دەست پێشکار نەبووین).

دیاربوو ئەم باری سەرنجەم زۆر کاری لێکردبێ و ددانی بەوە دانا، کە پێشتر وای زانیوە ئینگلیز هەروا لە ناکاوێکدا سوپایەکی گەورەیان بۆ داگیرکردنی هیند ناردبێ و هەرکاتێکیش ئارەزوویان کردبێ، بێ هۆ و بێ بیانوو، دەستیان بە داگیرکردنی وڵاتان کردووە.

پاشان لەبارەی (باڵۆن)ەوە پرسیاری کرد و وتی: (پێی وایە ئەوە ئامێرێك بێت بۆ هەر جێگایەك بتەوێ سەربازی پێ بگوێزرێتەوە). پاشان دووبارە هاتینەوە سەرباسی ئینگلتەرە. هیچ شتێ ئەوەندەی ئەوە دڵخۆشی نەکرد، کە زانی لای ئێمەش هەندێ خێڵ هەن و زۆر ورد و بە سەلیقەش بوو لەو پرسیارانەیدا کە سەبارەت بە شێوە و زمان و رەوشتیان دەیکرد و تکایشی کرد ناوی هەندێ لەو خێڵانەی پێ بڵێم و مەسەلەی ئەوەش کە خێڵەکانی لای ئێمە خۆیان هێزێکی سەربازییان پێك هێناوە و جلوبەرگی میللی خۆیان لەبەردایە و ئەفسەرەکانیشیان هەر لە خۆیانن، زۆر گەشکەی پێهات. بەڵام ئەوەی بەلاوە سەیر بوو، کە دەسەڵاتدارێتی ئینگلتەرە بەدەست ئەو ئینگیزانەوە بێت کە خێڵەکی نین و خەڵکی ناو شارەکانن، ئەوەندەی تریش سەرسوڕمانەکەی زیاتر بوو، کە زانی لەهەمان کاتدا خەڵکی ناو شارەکان لە سەربازیشدا ئازان. ئەو پرسیارەش کە خۆی کردبووی لەبارەی ئەو شوێنانەی برنجیان لێوە دەهێنن و بووە هۆی ناوهێنانی (جیهانی تازە)(٩٤) زۆر سەری سوڕماند، بۆیە دەمودەست پرسیاری چۆنێتی دۆزینەوەی ئەو کیشوەرە تازەیەی کرد. منیش پێم وت (کە زاناکانی ئاسماننناسی و ئەندازیاریی، سەلماندبوویان، زەوی وەك پرتەقاڵ خڕە، لێرەدا فەرەنگستانە و ئەویشیان هیندستانە، ئەوەش ئەو رێگایەیە، کە لە فەرەنگستانەوە بۆ هیند دەچێ، بەڵام هەندێ کەس دەیان پرسی: ئەی بۆ ناتوانن بەدیوی ئەودیوی ئەو رێگەیەدا بڕۆن،

---

٩٤- جیهانی تازە: مەبەست لە ئەمەریکایە - م.

که بۆ هیند دەچیّ؟! لێرەدا هەندێ ئەمەیان سەلماند و هەندێکی تریشیان ئەمەیان نەسەلماند، تا یەکێکی لە هەموویان ئازاتر بڕیاری دا ئەو ڕێگایەش تاقی بکاتەوە. بۆیە فەرماندەرێك ئامادەیی خۆی نواند، کە پاپۆڕ و کەلوپەلی ڕێگای بۆ ساز بکات، تابتوانیّ کارەکەی ئەنجام بدات. ئەویش کە ئەو ڕێگا تازەیەی بەرەو هیند لەبەرگرت، کیشوەرە تازەکەی دۆزییەوە).

ئیتر زۆر بەباشی لەمە گەیشت. کاتێکیش کە جۆری ئەو کۆمارەی ئەمەریکام بۆ ڕوون دەکردنەوە، وتی: ئەمەیان لە خێڵەکانی خۆشناوەتی(٩٥) دەچیّ، کە هەر گوندێکیان سەرۆکی خۆی هەیە و هەموشیان بۆ بەرژەوەندی تێکڕای خێڵەکە کۆدەبنەوە و ڕاوێژ دەکەن.

که پێم وت لای ئێمە، کەس پرکێشی ئەوە ناکات لە بەرامبەر شادا دابینشیّ، وتی: (چی؟ تەنانەت پیاوی ئایینیش؟) پێم وتەوە: (بەڵیّ ئەوانیش) لێرەدا ڕووی لە هەندیّ لە دانیشتوان کردو بەزمانێکی پڕ لە ڕەزامەندییەوە پێی وتن: (چاوتان لێیە لە وڵاتی ئەمان، مەلاکان دەستیان ناڕوات!).

ئیتر زۆر باسی باری کوردستانی کرد و وتی: (وڵاتەکەمان لەبارێکی زۆر ناهەموار دایە، چونکە ئەگەر خزمەتی تورك دەکەیت، بەسووك سەیرت دەکەن و هەرکاتیّ ئارەزوویان کرد، لەسەر کار لات دەبەن. ئەگەریش خزمەتی ئێرانی دەکەیت هەمیشە، بە داواکردنی پارە، بێزارت دەکەن).

بەڕاستی کوردێکی تەواو بوو، بەڵام لە هەڵبژاردنی ئەو دوو هێزەدا، وا دیاربوو ئێرانییەکانی پیّ باشتر بیّ. لەکاتی جیّ هێشتنیدا بۆم دەرکەوت، ڕووخۆش و دڵسۆزە، چونکە

---

٩٥- هۆزەکانی (خۆشناو) سیانن: میر مەحمەلی و میر یوسفی و پشدەری. دووانەکەی یەکەمیان هەمیشە لە شەڕدان کە لە بەرژەوەندی (میر)ی بابانییە و ئەگەر بەهۆی وریایی خۆیەوە نەبوایە، نەیدەتوانی دەسەڵاتی بەسەریاندا بسەپێنیّ و کەڵك لەو دووبەرەکییەی ناوخۆیان وەربگریّ، وەك تورك و ئێرانییەکان بەهەمان هۆ دەسەڵاتی خۆیانیان بەسەردا سەپاندووە. چەمێکی بچکۆلە لەنێوان ئەم دوو هۆزەدا هەیە و مزگەوتێکی هاوبەشیان هەیە، ڕۆژانی هەینی بۆ نوێژکردن تێدا کۆدەبنەوە و پاش ئەوە بڵاوەی لێدەکەن و بۆ شوێنی خۆیان دەگەڕێنەوە، لای چەمەکە دیسان دەست بە تەقەکردن لەیەکتری دەکەنەوە. جارێکیان لە مزگەوتەکەدا لێیان ببوو بەشەڕ، بیست، یان سی کەسیان لەیەکتر کوشتبوو.

جلوبەرگیان وەك هی (ئامێدی) وایە و زمانیشیان لە شێوەزمانی بابانی و بادینانی تێکەڵە. هەمان سەرنج بەسەر ئەو کوردانەی (ڕەواندز)یشدا دەچەسپیّ، کە نەمتوانی ناوی هۆزە سەرەکییەکەیان بدۆزمەوە. پێم وایە لەنێوان (خۆشناو) و (ڕەواندز)یدا دێکانی و جووتیار نین.

پێمی وت وەك یەكێك لەخێڵەكەی خۆیم دادەنێ و هیوادارە هەمیشە دۆستایەتیمان لەنێواندا پتەوبێ...

لەگەڕانەوەمدا سەیری شەڕە سەگێكی خۆشم كرد، سەیركردنی گەشكە و شادی كوردەكانیش هەرخۆش بوو، كە هاواریان دەكرد و سەگەكانیان هان دەداو قاچیان بەزەویدا دەدا، بەجۆرێك زیاد لە دەنگی سەگەكان، ئەو ناوەیان پڕ لە هاوار و ژاوەژاوكردبوو. سەگێكیان هی هاوڕێی وەرزشكارم مەحموود مەسرەف بوو. ئەم سەگەی لە (كۆیە) پەیدا كردبوو، كە بیستبووی سەگێكی بەناوبانگ لە (كۆیسنجاق) هەبووە، پیاوێكی خۆی بەتایبەتی بۆ داواكردنی ناردبوو، تا لێرە لەگەڵ سەگێكی تردا شەڕی پێبكات، كە ئێستا یەكێكە لە سەگە هەرە دڕەكانی ناوچەكە.

زۆربەی خانەدانە كوردەكانیش بۆ سەیری شەڕە سەگەكە هاتبوون. یەكێكیان پێمی وت: (تۆ، یەكەمین ئینگلیزیت لێرە چاومان پێت دەكەوێ، لەبەرئەوەی تۆ دەبیت بە قسەی سەرزاری نەوەكانی دوای خۆمان و زۆریشمان پێخۆشە لەناو خۆماندا دەتبینین). خەڵكەكەش تێكڕا ئەم هەستەیان دووبارە كردەوە.

پلەی گەرما، لە سەعات پێنجی بەیانیدا (٦٢) بوو، لە سەعات دوو و نیوی دوای نیوەڕۆدا (٧٦) بوو. شەماڵێكی خۆش لە خۆرئاواوە هەڵیكردبوو. ڕۆژێكی خۆشیشبوو.

## ١٤ی ئایار

سەرلەبەیانی میر سەردانی كردم. نزیكەی سەعاتێك لام مایەوە. هەستم كرد پیاوێكە هەتا لە نزیكترەوە بیناسیت، هەموو ئەو شتانەی تێدایە كە دەبنە مایەی دڵخۆشیی، هەر لە هەڵسوكەوتییەوە، تا نەرمیی و بنەوەشیی و رووخۆشیی. ئەمیش وەك دوێنێی براكەی، پرسیاری زۆری لەبارەی وڵاتانی ئەوروپاوە لێكردم. پرسیارەكانیشی یەكسەر بە پرسیاركردن سەبارەت بە (چین) دەستی پێكرد. وا دیاربوو لەناو خۆیاندا زۆر بەگرنگییەوە لەسەر چین مشتومڕیان كردبوو. باسی هەر شتێكیان دەكرد، زۆر بەكراوەیی و بەسنگێكی فراوان و لێزانینەوە لێی دەدوا. پاشان باسەكەم گۆڕی بۆ (كوتاندن) دژی (ئاوڵە)، كە زۆر مەبەستم بوو لە كوردستاندا بڵاوی بكەمەوە، چونكە ئەم نەخۆشییە كوشندەیە گەلێ كەسی لەناوبردبوو، بۆیە زۆری پێخۆشبوو لەناو هاونیشتمانییەكانیدا بڵاوی بكەمەوە و منیش بەڵێنم دایە و دەستبەجێ بۆ بەغدام نووسی، كە هەندێ داوودەرمانی ئەم نەخۆشییەم فریا بخەن.

له عەسردا هاوڕێی وەرزشکارم ((مەحموود مەسرەف)) وەکو پیشەی هەمیشەی سەردانی کردم و ئەمیش هەمدیسان سەبارەت بە (چین) پرسیاری دەست پێکرد.

وەك من بزانم کورد، تاقە نەتەوەیەکە لە رۆژهەلاتدا، تا درەنگانێکی شەو دەمێننەوە و ناخەون و بەیانیانیش درەنگ لەخەو هەلدەسن و ژمارەیەکی کەمی خانەدانەکانی سلێمانی، تا سەعات دوو، یان سێی دوای نیوەشەو دەچنە ناوجێ و بەیانیانیش تا سەعات نۆ و دە، ناچنە دەرەوە و سەردان و میوانداریشیان هەر لەشەودا دەبێ. هەر تاریك دایەت، لەماڵ دێنە دەرەوە و سەردانی یەکتری دەکەن و شەو بە قسەی خۆش و قەننە و سەبیل کێشان و مۆزیکژەندن بەسەر دەبەن. جاری واش هەیە لە شەوێکدا فریای چەند سەردانێك دەکەون. ئێوارانیش سەعاتێك پێش خۆرئاوابوون، کۆڕێکی گەورەی لە شێوەی یانەدا، لە بەردەمی ماڵەکەی (مەحموود مەسرەف دادەبەستن)، کە شوێنێکی پان و خۆشە و پێی دەوترێ: (مەیدان)، لەوێ دەستە هاوڕێیان کۆدەبنەوە و دەکەونە باسی هەمەجۆر، یان نیشاندانی ئەسپ و چەك و هەندێ جاریش هەر لێرە زۆرانبازی، یان شەڕەکە و شەڕە سەگ دەکرێ. پێم وایە کورد، خەڵکێکی زۆر رووخۆش و تاڕادەیەکی زۆریش کۆمەلایەتین. بەربەرەکانی کەس ناکەن و ئیرەیی بەکەس نابەن، لێشم نەبیستوون جوێن بدەن، یان چەندیش رقیان لەیەك بێت و ناکۆکییان بەتین بێت، قسەی سووك و ناشیرین بەیەك ناڵێن.

ئەمڕۆ، کە میرم لابوو، بەهەلم زانی راسپاردەی هاوڕێیەکمی پێبگەیەنم کە نەمتوانی داواکەی نەگەیەنم، ئەویش ئەوەبوو لەو رۆژانەی دواییدا کوردەکان، داری بازرگانێکی بەغداییان زەوت کردبوو، کە دەمێك بوو هەر لە کێوەکانی کوردستان، داری دەبڕی. میریش لەسەر تکای من، فەرمانی کرد: دارەکە، بەکابرا بدەنەوە و ئەگەریش بۆی پەیدا نەکرێتەوە، دەبێ ئەوەندەی ئەوەی خۆی داری بۆ ببڕن و بیدەنەوە. بەم بۆنەیەوە لەنگەرێکم لای بازرگانێتی داربڕین گرت، کە پێم وایە شایانی ئەوەبێ، شتێکی لەبارەوە بزانرێ: تەختەی (سووره چنار)، یان چنار، کە درەختێکی جوان و بۆنخۆشی خۆرهەلاتیانەیە، لەو ناوچە شاخاویانەی کە (سنە) لە کوردستانی تورکیا جیادەکەنەوە، بەتایبەتی لە ناوچەکانی (جوانڕۆ) و دۆڵی (هاوار)، کە دۆڵێکی چیاکانی (هەڵەبجە)یە، دەبڕدرێن و دەقڵیشێنرێن...

دارستان لە خۆرهەلاتدا، سامانی گەلە، بەلام سەرکردەکانی دەوروبەری ناوچەکە، بۆئەوەی ئەو بازرگانانەی دار، ناچار بکەن، هەندێ شتیان بەناوی دیارییەوە بۆ بێنن، بەفرۆفێڵ، گەلێ کوسپ و تەگەرە، دەخەنە رێگایان. لەپێشدا دارەکان دەبڕن و رووتیان دەکەن و ساڵێك، دووساڵ وازیان لێ

دەهێنن، تا وشك دەبنەوە، ئەوسا لەکاتی ئاوهەڵساندا، لە نزیکترین جێگایەکدا دەیانخەنە ئاوێکەوە، کە تا لای (دیالە) سەرئاو بکەوێ، دیارە لەمبەر و ئەوبەری ئاوەکەشەوە چاودێر دەوەستێ و ئاگاداریی دەکەن، تا بەرەو جێگای مەبەست بچن. ئیتر کە دەگەنە (دیالە)، وازیان لێ دێنن، تا لای ئەو پردەی نێوان بەغدا و (تاقی کیسرا)، لەوێ خەڵك بۆیان وەستاوە و دەیان گرنەوە. بێگومانیش تا دەگاتە شوێنی خۆی، بەشێکی لەناودەچن. داریش لە بەغدا گرانە و دەبێ قازانجێکی زۆر بهێڵنەوە... لە کوردستان داری گوێز و تووش دەبڕدرێن، بەڵام ئەمان هەر لەباخدا دەکڕدرێن و دەبڕدرێن. سپی داریش(٩٦).لە (جزیرە)(٩٧)و (ئامێدی)یەوە دەهێنرێن، بیی، یان (سکود)یش لە (فورات) و سەرووی (عانە)وە دەهێنرێن.

ئێستا، بەو هۆیەوە کە خەڵك بە هەدەر داری زۆر لە شاخەکانی لای (سنە) دەبڕن، دار زۆر کەم بووە و بەرەبەرەش کەمتر دەبێتەوە، وەك لە هەواڵدەرەکەمەوە زانیم، ئەو شوێنانەش کە پێشتر داریان لێ دەبڕین، نەك هەر داریان تێدا نەماوە، بەڵکو لقی بچووکیشیان لێ نەماوە. کابرایەکی تریش لە (کرماشان)ە، خەریکی دارِشتنی قاڵبی نەخش و دراوە. ئەویش دەورێکی زۆری لە وێرانکردنی دارستان و چنار و سوورە چناردا هەیە. بەو خەیاڵەی گوایە هەر خەڵووزی ئەم دارانە، کارەکەی بە ئەنجام بگەیەنن. دیارە ئەمە زیانێکی زۆر لە دارستان دەدات، چونکە ئەم، لقوپۆپ و دەوەنیش دەبڕێ!.

---

٩٦- سپیدار: وشەیەکی کوردییە، بە عەرەبی پێی دەڵێن (حور) و مانای درەختی سپییە لە هەندێ جێگاشدا پێی دەڵێن (چنار)-ع. لە هەندێ جێگادا زۆر بەهەڵە (سپیدار )یان کردووە بە (سپیندار) و (ئەسفیندار)-م.

٩٧- بۆ تێگەیشتن لە هەندێ جێگای (جزیرە) و ئەو زەویوزارە گرنگەی دەوروبەری کە هێشتا شتی زۆر کەمیان لەبارەوە زانراوە. بڕوانە پاشکۆی تەواوی کتێبەکە. لەو جێگایانە: قەڵای -فێنك-ە، کە چوار سەعات لە سەروو جزیرەوە دوورە و لە ساڵی ١٤٦١ەوە ناوبانگی لە مێژووی کوردا هەیە، چونکە ساڵی ١٤٦٠ میر خالاپی، میری (سەعرد) ئابلۆقەی داوە و لەساڵی ١٤٥٩دا ئەو میر ئەحمەد بۆتانییەی کێوەکانی (کوردوشیان)ی داگیرکردووە، وەك (ئاسسەمانی Assemanni) دەڵێت: جزیرەی لە میر ئیبراهیم سەندۆتەوە، کە لە قەڵای (فێنك)دا خۆی قایم کردووە. لە ساڵی ١٤٦١ لە لێرەکانی جزیرەدا شەڕێك لەنێوان سەرۆکەکانی (حەسەن کیف) و (بۆتان)دا روویداوە. لە هەمان ساڵیشدا (ئەحمەد بۆتانی)ی زۆرداری جزیرە، فێنکی داگیرکردووە و فەرمانی سووتانی ئیبراهیم و کوڕەکانی دەرکردووە - ئەوەی شایانی باسە (ئەمیانوس مارسل لینوس) لە لاپەڕەکانی ١٥ و ١٦ و ٢٦ی سەفەری بیستەمیدا ئاماژەی بۆ (بەزاب دە Bezabde یان جزیرە، یان (فێ نیك Phoenica) کردووە.

کرێکار و دەڵاڵی دار، لەکاتی چوونە ناو دارستاندا، ناوێرن پارە لەگەڵ خۆیاندا هەڵگرن و هەر لە (هەڵەبجە)(٩٨)، کە نزیکترین شاری ناوچەکەیە، پارەی کرێکارەکان دەدەن. دەڵێن خەڵکی ئەم ناو شاخانە و بەتایبەتی خەڵکی (جوانرۆ)، لەوپەڕی دواکەوتوویی و دڕندایەتیدان و بەناویش سەر بە والی (سنە)ن، بەڵام لەڕاستیدا لە هەموو کەس سەربەستترن. لەناو دارستان و جێگاکانی خۆیاندا دەژین و شتێکی واشیان نییە، تا خەڵکی وا لیّ بکات بۆ لایان بچێ و کشتوکاڵیش ناکەن. دەڵێن هەر بەڕوو خواردن و بەری داری کێوی دەخۆن. لەناو ئەم خێڵە ڕەمەکییەدا، ژن دەسەڵاتێکی باڵای هەیە و زۆر ناکۆکی و شەڕ و بەیەکدا هەڵپژانیان، ژن دوایی پێ دێنێ، ئەگەر وانەبێ، بەخوێن ڕشتن نەبێ، کۆتایی نایەت، چونکە ئەندامانی ئەم خێڵە، وەك هەموو خێڵێکی دڕندە، هاروهاج و قیناوین و مرۆڤـ لای ئەمان هیچ نرخێکی نییە. زۆرجاریش ڕقی بازرگانێکی بەغدایی بەوە هەڵدەسێنن کە بەردەوام لێی دەپرسن: ژنەکەت ناوی چییە؟ چی لەبەر دەکات؟ و شتی تر.

سەرم سوڕما لەوەی ئەو هەواڵدەرە پێمی وت و ئەو کوردانەش کە سەردانی ئەم ناوچە شاخاوییە دوورانەیان کردبوو، سەلماندوویانە، کە لە ناوچەی (شارەزوور)، هەندێ گوند هەن، ئەفغانییان تێدایە. ئەم ئەفغانیانە لە ئەنجامی کوشتنی (ئازاد خان)دا روویان لەم ناوچانە کردووە و دەڵێن تا ئێستاش لەناو خۆیاندا بەزمانی خۆیان قسە دەکەن و زۆر هەژارن و سەپانیی دەکەن. هەر لە کوردستاندا هەندێ خێزانی (ئەفشاری)یش(٩٩) هەن، کە خۆم ئاغایەك، یان خانەدانێکی ئەم خێڵەم بینی، ناوی (عیسا خان) بوو، پیاوێکی بەساڵاچووی سەروسیما جوان و بێ وێنە بوو، باڵایەکی بەرز و روویەکی خۆشی پێوە بوو. ئەگەرچی لە کوردستانیشدا گەورەببوو، بەڵام بە قسەکردنیدا یەکسەر هەست دەکرا کە کورد نییە، چونکە کەس ناتوانێ بەتەواوی بە کوردییەکی پاك بدوێ، مەگەر ئەو کوردانەی کە خۆیان لە کوردستاندا لە دایك بوون، ئەمە تاڕادەیەکیش بۆ زمانی ئینگلیزی هەر وایە و گرانییەکەشی لەوەدایە، کە لەکاتی قسەکردندا چۆن ددان بە پیتەکاندا دەنێیت و چۆن بڕگەی وشەکان تێکەڵ بەیەکتری دەکەیت...

---

٩٨- هەڵەبجە: دەکەوێتە نشێویی شارەزووری ڕووە و چیا و باشووری خۆرهەڵاتی سلێمانی.

٩٩- ئەفشاری: ناوی هۆزەکەی (نادر شا)یە.

## ١٥ی ئایار

دوێنێ شەو، تەتەرێك لە بەغداوە بۆلای میر هاتبوو، ڕێگاکەی بەسێ ڕۆژ بڕیبوو. بۆ ئەوەش هاتبوو میر لەوە گادار بکات، کە والی بەغدا، زۆر بە جوانیی پێشوازی دایکی میری کردووە و لەوەش دەچێ بە پێشنیارەکانی والی رازی بووبێت، چونکە هەر لە سەرەتای دیدەنییەکەدا، ناوچەی (قەرەحەسەن)ی داوەتێ و حەسەن بەگیشی(١٠٠) داوەتەوە و بەڵێنی داوەتێ بیکات بە فەرمانداری هەولێر و ئاڵتوون کۆپری- پردێ، بە مەرجێ(باقرخان) بەربدەن، کە نێردراوی شازادەی کرماشانە و ماوەیەکە لە سلێمانی هێڵدراوەتەوە و کاتی خۆی بۆ ئەوە نێردرابوو تا (٣٠٠٠٠) هەزار تمەنی بدەنێ.

محەمەد ئاغا گەلێ چیرۆکی سەیروسەمەرەی بۆ گێڕامەوە، بەتایبەتی ئەوەی پێوەندی بە راکردنی پاری (حەسەن بەگ)ەوە هەبوو، هەمووشی بریتی بوو لە باسی تاوانکاریی و سیاسەتی ناڕاستی تورکیا.

دوای نیوەڕۆ (باقرخان) سەردانی کردم، پیاوێکی گێل و سادەیە، ریشێکی ئەوەندە سەیری هەیە، ناچێتە عەقڵەوە. خۆیشی کورد نەژادە و لە هۆزی (مافی)یە، کوردی قسەکردنەکەی لە هەموو زمانێکی تر باشتر دەزانێ. سەبارەت بە کەلاوەکانی (هەرسین) لێم پرسی، دڵنیای کردم کە لە عەماراوێك زیاتر هیچی تر نەبووە و لە بەردێك هەڵکۆڵراوە و وێنە و نووسینیشی لەسەر نەبووە.

ئاهەنگی عەسری ئەمڕۆ، هەموو جلوبەرگی سلێمانی دەرخست، کە نزیکەی بیست و پێنج، یان سیی لە پیاوماقوڵانی سلێمانی لەبەریان کردبوو. هەر بۆ خۆشیش ژمارەکی زۆر (کەو)یان بۆ مەیدانەکە، بۆ شەڕەکەو هێنابوو، کە لەجاری پێشوو زیاتر بوو، هەراوهوریاشیان لەجاری پێشوو زیاتر بۆ دەکرد. باشترینی ئەم کەوانە دەبوایە لەناو هێلانەکانیاندا (بگیرێن)، ئەوسا مەشق پێ بکرێن و ڕۆژی شەڕەکەوەکەش دەبێ برسی بکرێن و هیچیان نەدرێتێ، بەڵام لە هاویندا بۆ شاخ ببرێ، ئەگینا ئەم خووەی لەکیس دەدات.

---

١٠٠- حەسەن بەگ: برا بچکۆلەی (مەحموود پاشا)یە، پێش ساڵێك بۆ بەغدا رایکردبوو.

## ١٦ی ئایار

سەرلەبەیانی ئەمڕۆ، سەردانی میرم کرد و جار دوای جاریش کە دەیبینم، هەست دەکەم زیاترم خۆشدەوێ. ئەمجارەیان پەیمانی دامێ ئەوپەڕی توانای خۆی بخاتە گەڕ، بۆ ئەوەی کتێبی **مێژووی کوردستان،** کە بەناوی مێژووی کورد بەناوبانگە، بۆم پەیدا بکات. منیش چیرۆکی (زەینەفون) و دە هەزار کەسەکەم بۆ گێڕایەوە، کە یادگارێکی پڕ لە سەروەری نەتەوە نەمرەکەیەتی. ئاگام لێبوو، خۆی و هەموو ئەو کوردانەش کە لەوێ بوون، بەپەرۆشەوە گوێیان بۆ قسەکانم شل کردبوو. جگە لەوەش هەستم کرد زۆر بەگرنگتر و سەرسوڕمانەوە، گوێیان بۆ گێڕانەوەکەم شل کردبوو. دیمەنەکەشیان ئەوەندە جوان بوو، بەکەڵکی ئەوە دەهات وێنەیەکیان بکێشرێ.

میر، زۆر بەسادەیی، کە نیشانەی دڵسۆزیی تێدا بەدی دەکرا، وتی: (خۆزگە بمزانییایە ئاخۆ بنەماڵەکەی ئێمە. لەو سەردەمەدا چ دەورێکی هەبووبێ؟).

لەناو ئامادەبووەکاندا (کەیخوسرەو بەگ)ی سەرۆکی خێڵی جافیش دانیشتبوو، کە خێڵێکی بەهێزی جەنگاوەرن و بەگ خۆیشی پیاوێکی قۆز و سەروسیما جوان بوو. بەدڵنیاییەوە دەڵێم من یەکەمین ئەوروپاییم کە تا ئێستا چاوی پێی کەوتبێ. وا دیاربوو دیتنەکەمی پێ سەیربوو، بەڵام وا لێم ورد نەبووەوە، هەست بکەم هیچ نەدیوە.

## ١٧ ی ئایار

ئەمڕۆ خۆم ئامادەکرد بۆ لای (باقرخان) بچم، کە لە خانووەکەی (دارۆغا) دایە و خانووەکەشی وەکو ئەو خانووە پیسە وایە کە منی تیادام. باقرخان، پێمی وت لە هۆزی (مافی)ی کوردە و لە خۆراسان نیشتەجێن، بەڵام هەندێ خێزانیان لە کرماشان دادەنیشن. شێوەزمانەکەیشی، لە شێوەزمانی سلێمانی جیاوازبوو، بەڵام شێوەیەکیشە زۆر بەجوانی تێی دەگەیت. باقرخان یەکجار شارەزای خۆراسان و ئەفغانستان و هەندێ ناوچەی تورکستان بوو، گەلێ دەنگوباسی سەیریشی لەبارەیانەوە دامێ و ئاگاداریشی کردم کە لە (نیشابور)، کانی (پیرۆزە) هەیە. پیرۆزەش لە وردە دەماری نێوان دوو چینی بەرد دایە... هەروەها ئاگاداری کردم کە (مەحموود رەحیم خان)ی سەرۆکی ئێستای (خوارزم)، نەوەی (عەبدولغازی خانی بەهادور)ی(١٠١) مێژوونووسی بەناوبانگی (تاتار)ە. ناونیشانی ڕاستەقینەی سوڵتانی (بوخاری)یش، سوڵتان نەبووە، بەڵکو (تورا)یە.

---

١٠١- عەبدولغازی خانی بەهادور: میری بنەماڵەی جەنگیزخانە و لە دەوروبەری سەدەی هەڤدەدا فەرمانڕەوایی کردووە و مێژووی بنەچەی (تاتار)ی نووسیوە، کە بۆ چەند زمانێکی ئەوروپایی وەرگێڕدراوە.

# بەشی چوارەم

وتوویژ لەگەڵ میردا ـ کەیخوسرەو بەگ ـ هۆزی جافی کورد ـ ئاووهەوای سلێمانی ـ ناشتاکردن لەگەڵ میردا ـ ژمارەی دانیشتووانی سلێمانی ـ نیشانەنانەوە ـ تەختی سلێمان ـ هەڵکۆڵراوی مێژوویی ـ ئاهەنگێکی مۆزیك ـ زۆرخانە، یان یاریگە ـ شێوکردن لەماڵی عوسمان بەگ ـ نوێژی خۆرهەڵاتییانە ـ سلێمان بەگ ـ چابووکیی لە بەکارهێنانی شمشێردا ـ کشتوکاڵ.

## ١٨ی ئایار

سەعات و نیوێکم لەگەڵ میردا بەسەر برد، لەکاتە هەرە خۆشەکانم بوو. پیاوێکی زۆر ڕەوشت بەرز و بێ فیزە، ئەوەندە سادەیە، حەزدەکەی لەگەڵیدا دابنیشیت، بەتایبەتی پاش ئەوەی ئاشنای ڕەوشتی زۆربەی پیاوە ناسراوەکانی خۆرهەڵات دەبێت، کە چۆن خۆیان لێ گۆڕراوە و درۆزن و فشەکەرن. لێم پرسی: (بۆچی زرێی ئاودامان لەبەر ناکەیت، کە لای کورد، جلێکی جەنگیی خۆشەویستە؟). لە وەڵامدا وتی: (چونکە توانای هەڵگرتنیم نییە!). خۆ ئەگەر ئەم پرسیارەت لە زۆربەی سەرکردەکانی خۆرهەڵات بکردایە، پێیان دەوتیت حەزی لێ ناکەین، یان بێزمان نایە لەشەڕدا خۆمان بپارێزین... لەبەرئەوە هەر کەسێك بیەوێ هۆی سەرسوڕمانم تێبگات، دەبێ پێشەکی ماوەیەکی زۆر لەناو تورکەکاندا بژی و شارەزاییەکی تەواو لە قسە و بیرکردنەوەیاندا پەیدا بکات.

ئەمڕۆ سەبارەت بەو دەمەتەقێیەمان شتێکی ئەوتۆم نییە تۆماری بکەم، چونکە زۆربەی قسەکانمان لەبارەی خۆمەوە بوون. بەڵام میر پرسیارێکی زۆری لەبارەی سوپاگەلی ئەوروپاوە کرد و تێبینی زۆر ژیرانە و هوشیارانەیشی لە قسەکانیدا نیشان دەدا.

ئێوارەش جگە لەو کۆمەڵە خەڵکەی تر، کە دەهاتنە لام، کەیخوسرەو بەگ میوانم بوو. خێڵی جاف، کە کەیخوسرەو بەگ سەرۆکیانە، لە بەرزایی چیاکانی(١٠٢) قەڵەمڕەوی والی (سنە)دا دەژین. پیاوگەلی ئەم خێڵە، سەروسیما جوان و ئازان. تەنانەت لای کوردەکان خۆیشیان، لەخێڵە هەرە جەربەزە و دواکەوتووەکانن. شێوەزمانیشیان جیاوازییەکی زۆری لەگەڵ شێوەزمانی کوردانی بابانی هەیە. سیمایان ئەوەندە جیاوازە، بەئاسانی دەتوانرێ بناسرێتەوە. ئەم خێڵە بەئاسانی دەتوانێ چوار هەزار پیادەیان چەك هەڵبگرێ. چاکترین جەنگاوەری ناو سوپای کوردن. ئەمانە لەکاتی شەڕدا کە میری سلێمانی سەرۆکە دەرەبەگەکانیان بانگ دەکات، دوو هەزار سوارێك پێکدێنن. هەر لەبەر ئازایەتی و زەبروزەنگیان، هەندێ دەستە و کۆمەڵە خەڵکی تری ڕاونراو و تەنگ پێ هەڵچنراوی وەك (فەیلی) و کەڵهوڕ، لەناویاندا دەبینرێن، کە زۆرجار ئەمانە ناوی خێڵەکە سووك دەکەن. ئەم خێڵە، ئەگەر سەرۆکەکانیان بمرێ و کوڕی بچووکی لەپاش بەجێ بمێنێ، نایکەن بەجێگری باوکی، چونکە هەرگیز هەرزەکار ناکرێ بە سەرۆك هۆز. بەڵکو لەم کاتانەدا برا، یان خاڵی کۆچکردووەکە، لەجێی دادەنرێ.

---

١٠٢- ناوچەی (جەوان ڕۆ)، کە لە سەرەوە باسکراوە، بەشێکە لەم کێوانە.(تا ئێستا بە جوانرۆ- ناودەبرێ-م).

جافەکان هەموویان لە رەشماڵدا دەژین(١٠٣) و هاوینان لە چیا بەرزەکانی (حاجی ئەحمەد)ی سەرسنووری (سنە) هەڵدەدەن و بەناوچەی شارەزووردا بڵاودەبنەوە، زستانانیش لەمبەروبەری ئاوی (سیروان)، لەنزیك (شیروانە) هەڵدەدەن.

## ١٩ی ئایار

سەرلەبەیانی شتێکی وانەبوو، شایانی باسکردن بێ. دوای نیوەڕۆش عەبدوڵلا پاشا هاتە لام، ئەویش لەبەرئەوەی زۆر شارەزای کاروباری وڵاتەکەی نەبوو، بۆیە شتێکی بەکەڵکم لە قسەکانی هەڵنەکڕاند. زۆر باسی ئاووهەوا و سەرمای سلێمانی کرد، کە لە زستاندا سارد دەبێ، بەتایبەتی لەو کاتانەدا کە لە خۆرهەڵاتەوە رەشەبای توند هەڵدەکات. بەفریش نزیکەی شەش هەفتە، تا دوو مانگ، زەوی دادەپۆشێ. چونکە بەفر، دوای بەفر دەبارێ و بواری ئەوەی پێشووتر نادات بتوێتەوە. پێرار بیست و سێ جار بەفر باریوە. بەڵام ئاووهەوای سلێمانی لە هاویندا خۆشە، ئەگەر رەشەبای تێدا هەڵنەکات. ئەم رەشەبایە زۆرجار ماوەی هەشت ڕۆژ، لەسەریەك زۆرتوند هەڵدەکات و لە هاوینیشدا بە ئەندازەی سەرما کوشندەکەی زستانی دەبێت. سەیریش لەم ڕەشەبایەدا ئەوەیە: دووسێ سەعاتێ دوور لە سلێمانی، لە هیچ لایەکیدا، ئەم رەشەبایە نییە. دەڵێن ناوچەی شارەزووریش (١٠٤) کە مەرەزەیەکی زۆری تێدا

١٠٣- کوردەکان بەو هۆزە کۆچەرییانە، یان بەو هۆزانەی لەژێر ڕەشماڵدا دەژین، دەڵێن (خێڵ) و بە یەکێکیشیان دەوترێ (خێڵەکیی).

١٠٤- ناوچەی شارەزوور، تا نزیك کێوەکانی (ئاورامان - هەورامان) دەکشێ و پایتەختەکەشیان وەك تورکەکان پێی دەڵێن (گوڵ عەنبەر)، یان (غول ئامبەر)ە. دانیشتووانی لەهاویندا ناچار دەبن بۆ (کۆچەل) بچن، کە جێگایەکی ساردەو بەلاپاڵی کێوەکانی هەورامانەوەیە. ماوەی نێوان (ئاربەت- عەربەت) و (سلێمانی)، سێ سەعاتە. ئیتر لێرەوە ناوچەی شارەزوور دەست پێدەکات. لە (ئاربەت)یشەوە بۆ (گوڵ عەنبەر)، کە لەوێ ناوچەکە کۆتایی دێت، هەشت سەعاتە، ئەوڕەحمان پاشا، خشتێکی زۆری بێ نووسینی لە (ئاربەت) دەرهێنا، هەندێ دراویشی تێدا دۆزییەوە. بەڵێنیشیان بەمن دا نموونەیەکم بدەنێ. لە (گوڵ عەنبەر)یش دوو لوولە تۆپیان لەژێر داروپەردوودا دۆزیبووەوە. ناوچەی شارەزوور پڕە لە شوێنەواری کۆن، وەك تەپۆلکە و گردی توورەکەڕێژی لە چەشنی (گەورەقەڵا)ی سەر ڕێی زەهاو و ئەو کارێزانەش کە تائێستا کەڵکیان لێ وەردەگیرێ، نموونەیەکی زۆریش لە سواڵەت و گۆزەو دیزە لە هەندێ جێگادا دۆزراوەتەوە.(ئاربەت)یش ئەو جێگایەیە، کە زۆرترین ئاسەواریان تێدا دۆزیوەتەوە. هەر لە (ئاربەت) گردێك

دەکرێ، یەکجار گەرم و نادروستە. پڕێتی لە مێشوولە و کێچ و بەتایبەتیش مار، بەڕادەیەك زۆرە، بەڕۆژی نیوەڕۆ، بە ئاشکرا بەسەر ڕێگاکاندا دێن و دەچن.

## ٢٠ی ئایار

ئەمڕۆ لەگەڵ ئەوانەدا، کە ڕۆژانی ئاسایی سەردانیان دەکردم، پیاوێکی (گورجی)ش بەناوی (تەمیرئاغا- تەیمورئاغا) هاتەلام. ئەم پیاوە، کاتی خۆی لە داروودەستەی ئەو (ئەحمەد کەهیا)یە بووە، کە دوای مردنی (عەلی پاشا) لە بەغدا، هەڵهاتبوو، هاتبووە سلێمانی و بەهۆی زرنگیی خۆیەوە، ئەو ماوە زۆرە لە سلێمانی ماوەتەوە و ئێستا بۆتە یەکێك لە ئاغا، یان یەکێك لە خانەدانەکانی کورد و چەندان گوندی دەوڵەمەندیشی لەلایەن میری ئێستای سلێمانی و پێشووەوە، دراوەتێ. لەبەرئەوە ئێستا ئەگەر چاکترین پایەوپلەیشی بدەنێ، ئارەزووی بەغدا ناکات. وا دیارە ئەم حاڵەی ئێستای زۆر بەدڵ بێ.

هەر ئەمڕۆ پیرەپیاوێکی کورد سەردانی کردم، کە لەم دواییەدا لە (مەککە) گەڕابووەوە. هەر کوردێکیش کە لە حەج بگەڕێتەوە، مێزەرێکی سپی لەسەر دەنێ. لەم سێ ساڵەی دواییدا نزیکەی دووهەزار کەسێك لە ناوچەی سلێمانی حەجیان کردووە.

دوای ئەویش عوسمان بەگ هاتەلام و تا نیوەڕۆ مایەوە و زۆر بەتاسەوە گوێی بۆ ئەو چیرۆکانە گرتبوو، کە سەبارەت بە لەشکرەکانی ئەورووپا و شەڕەکانیان بۆم گێڕایەوە...

زۆربەی ئەو پلەوپایانەی بەکاربەدەستە نزیکەکانی میر دەدرێن، بەمیراتی بۆیان دەمێنێتەوە، یان بەلای کەمەوە لەسەردەمی میرێکدا دەیاندرێتێ. ئەم (مەحموود مەسرەف)ەی کە ئێستا سەرۆك وەزیرانە، ئەو پلەوپایەی بەدوای یەکدا، لە عوسمان پاشا و ئەوڕەحمان پاشاوە بۆ جێماوە، وەك خۆیشی ئاگاداری کردم، ڕەنگە هەر کوڕەکەیشی لە جێگاکەی دابنێن. سیلاحدار، یان شمشێر هەڵگرەکەی ئێستاش، کە منداڵێکە، پیاوێکی لەو بەهێزتر فەرمانەکەی ئەم منداڵە، بەجێدەهێنێ، تا گەورە دەبێ و خۆی پێی ئەنجام دەدرێ.

---

هەیە، شوێنەواری شارێکی گەورەی بەدەورەوەیە. لام وایە ئەو پاشماوانە، شاری شارەزووری کۆن بێت، بەلام کوردەکان تێکڕا پێ لەسەر ئەوە دادەگرن، کە لەکۆندا شارێك نەبووە ناوی شارەزوور بووبێ. سووریشن لەسەرئەوەی ئەم ناونانەی ئێستاش وەك زانراوە، هەر ناوچەکە بووە. لەم ناوچەیەدا یەك دەسەلاتیش کاروباری بەڕێوە نابات، بەڵکو چەند دەسەلاتێك لەناوخۆیاندا، بەشیان کردووە.

ئەم پیاوە، هەموو یاسا و دەسەڵاتێکی ئەو پایەوپلەیە لە ئەستۆ دەگرێ، کە ئەو منداڵە لە باوکییەوە بۆی ماوەتەوە.

خۆ ئەگەر ئاسایش و ئاشتی لەم وڵاتەدا هەبێ و میراتگریش دۆخی سروشتیی خۆی وەربگرێ، ئەم وڵاتە زۆر گەشەی دەکرد.

دوای نیوەڕۆ خۆم گەیاندە لای کۆمەڵەکەی مەحموود مەسرەف، کە لەبەردەمی ماڵەکەی خۆیدا چادریان هەڵدابوو، زۆربەی پیاوماقوڵانیش لەوێ بوون. دوای تاوێ کەیخوسرەو بەگیش هات، کە زۆر بەگران و هێواش خۆی بە چادرەکەدا کرد، یان بە واتایەکی تر، لەسەرخۆ و بێ ئاگا هات و قسەکانیشی پچڕپچڕبوون. ئەگەرچیش وام لێ هاتبوو لە شێوەزمانی بگەم، کەچی ئەو، بە زمانێك دەیکرد، نەمدەتوانی تێی بگەم. کەیخوسرەو بەگ کیتەڵەیەکی باروتی بچکۆڵەی پێبوو، نەیدەزانی چۆنی بەکاربهێنێ. داوای لە من کرد چۆنێتی بەکارهێنانی تێبگەیەنم. وەك تێگەیشتم کورد وشەی (دەرمان) لەجیاتی وشەی (باروت) بەکاردێنێ. ئەمەش بەکارهێنانێکی تەواوە و لەجێی خۆیدایەتی.

دوایی وەك پیشەی ئاسایی، شەڕە کەومان بینی... بێگومان لێهاتوویی ئەم باڵندە بچووکانە و ئازایەتی و زیرەکییان، لەو شتانە بوو، کە جێی سەرسوڕمان بوو، وەك پێشتریش باسم کرد، ئەم باڵندانە لە شەڕدا هەر هەوڵی ئەوە دەدەن، وەك سەگ توند ملی بەرامبەرەکانیان بگرن و باڵی پێوەبگرێ و بیفڕێنێ و بیسووڕێنێتەوە و دواییش بەزەویدا بکوتێ. ئەم سووڕاندنەوەیە، هەموو چێژ و خۆشییەکی ئەم شەڕە کەوەیە... وا ڕێکەوت کەوێك چەند جارێك هەڵمەتی بۆ سەر بەرامبەرەکەی دەبرد، تا لە هەڵمەتێکی توند و تووڕەدا، بەهەڵە پەلاماری باڵی دا و بەجۆرێ گرتی، نەدەیتوانی وەك پێویست هەڵیسووڕێنێ و نەدەیشی توانی وازی لێ بهێنێ. بەمجۆرە بۆی دەرکەوت مەبەستەکەی نەپێکاوە.

لە گەڕانەوەمدا بۆ ماڵەوە، مەحموود مەسرەف ئەسپێکی بەدیاری بۆ ناردبووم. بەو کابرایەیشی وتبوو، کە پێیدا ناردبوو، هیچم لێ وەرنەگرێ، بەڵام بەزۆر گرتمان و شتێکم بە خەڵات دایە، کەچی سەیربوو، کابرایەکی وا هار و قژن و درێژ، کە درێژییەکەی شەش پێ دەبوو، دەگریا و ئەو دیارییەی ڕەت دەکردەوە، کە بەزۆر دابوومانێ. بۆیە چەند پیاوێکی خۆم لەگەڵیدا ناردەوە، تا مەحموود مەسرەف هێمن بکەنەوە و پێی بڵێن لە پیاوەکەی تووڕە نەبێ، لەسەر ئەوەی دیارییەکەی وەرگرتووە.

## ٢١ی ئایار

سەرلەبەیانی ئەمڕۆ، لەسەر بانگهێشتنی میر، سەعات دە، لەگەڵ میر، ناشتامان کرد، بەڵام زۆرتر لە نانی ئێوارە دەچوو وەك لە نانی بەیانی، چونکە هەموو جۆرە گۆشتێکی وشك و تەڕ و هەمەجۆر خواردەمەنی تریشی تێدابوو، کە لە خۆرهەڵاتدا باوە، لەوانە: ئەوەی پێی دەڵێن (بریانی). خواردنەکانیشیان لەسەر شێوەی فارسییانە ڕازاندبووەوە، کە ئەوەندەی تر لێهاتوویی کوردانەی جوان کردبوو. چونکە خواردنەکە لە هەموو ئەو جۆرە خواردنانە بەتامتر بوون کە لە بەغدا و لە هەر کاتێکدا خواردبێتم. زۆریش چەور نەبوون. لەگەڵ میردا، لەپێشەوەی هەیوانەکە دانیشتبووین، خواردنەکەش لەسەر سینییەکی لاکێشەی (تەختە)ی ڕەنگکراو دانرابوو، چەند قاچێکی چەند گرێی لە زەوی بەرزی کردبووەوە، خواردنێکی زۆری هەمەجۆری لەسەر ریزکرابوون، ئەو خواردنانەش، کە لەسەر ئەمجۆرە سفرانە جێگەیان نەببووەوە، لە دەفری تردا لەسەر زەوی دانرابوون کە بریتی بوون لە هەمە جۆر شەربەت و بەستەنی و هەندێکیان تابڵێی بەتام بوون. پیاوێکی قەڵەوی بۆرەقنەش لەولای میرەوە لەسەر ئەژنۆیەك دانیشتبوو، سەرقاڵی ئەوەبوو پەیتاپەیتا شتێکی سپی لە کاسەیەکی گەورەی پڕ لە بەفرەوە دەکرد. میریش تاوناتاوێ رووی تێدەکرد و کەوچکێکی گەورەی لەو شتە سپییە دەخواردەوە. چاوە وریا و زیتەکانی ئەم کابرایە، کە کەوچکە گەورەکەی هەڵدەبڕی و بەدەمی سەردارەکەی خۆیەوەی دەکرد، بەجۆرێ جێی پێکەنین بوو، ئیتر جارێکی تر نەمتوانی سەیری بکەمەوە. کابرایەکی تری هەڕەمەکیش لەپاڵ مندا بۆ خزمەتکردنم دانیشتبوو، منیش وەك میر، کە لام بۆ لای کردەوە، کەوچکێکی گەورەی لەو شتە سپییە بەدەممەوە کرد، تمەس ئەمە (دۆ)ی ساردە و فەریکە هەڵووژەی(١٠٥)جنراوی تێکراوە، ئەوەندە ترش بوو، هەرچی بیخواردایەتەوە، ئاوی لە چاوی دەهێنا، لەبەرئەوە جارێکی تر داوای (دۆ)م لە هاوڕێ (کوردۆکی)یەکەم نەکردەوە. بەڵام کاربەدەستانی میر، کە پیاوگەلێکی زۆر بۆ خزمەتکردنیان بە دیاریانەوە وەستابوون، ئەوانیش لەوبەری هەیوانەکە بەدەوری خوانی لاکێشەییدا دانیشتبوون و زۆر بەپەرۆشەوە خواردنەکەیان دەخواردو ریشیان لەگەڵیدا دەجولاند، ریشیان دەتوت لەسەر ئاوازێکی شیرین دێت و دەچێ.

---

١٠٥- بەڵکو ئەوە (قەزوان)ە، واتە: فەریکە قەزوان - ع.

ئەوا خۆشیی بڵاو بووەوە بەناو خەڵکا

لەو ساتەوە کە ڕیشیان لە خۆشی و بەزما، سەما دەکا

کە بەڕاست و چەپدا دەمڕوانی، ئەم دێرە شیعرەم بیرکەوتەوە: خەریك بووم لە پێکەنیندا لەنگەری خۆمم لەدەست دەرچێ. سەرنجم دا کورد، وەك تورك هەڵپە بۆ خواردن ناکەن، بەڵکو لەسەرخۆ نان دەخۆن، بەدەم نانخواردنیشەوە گاڵتەوگەپ و قسەی خۆش دەکەن. خۆراکەکەش هەمووی پێکەوە و بەجارێ لەبەردەمیاندا دادەنرێ. پێش دەستکردنیش بە خواردنەکە میر قسەیەکی خۆشی کرد، دڵی (وەڵەدبەگ)ی پێ گەشایەوە، کە یەکێك بوو لە سەرۆکەکانی جاف و لەو کاتەشدا قسەی دەکرد، ئیتر وەڵەدبەگ هەڵسا و ئەگەرچی بە سەروسیما جوان بوو، بەڵام لەبەر کەتەیی و قەڵەویی، خۆی دەلەنگاند و قورس بوو، هەر بەدەم قسەکردنەوە هات، تا گەیشتە بەردەم هەیوانەکە، بۆ لای میر، میریش دەستی پانکردەوە و ئەویش ماچی کرد و چۆن هاتبوو، هەر وا بۆ شوێنی خۆی گەڕایەوە. بەڵام ئەندامەکانی ئەنجوومەن دیاربوو بەوپەڕی سەربەستیی خۆیانەوە، سەبیل و قەننەیان دەکێشا و هەرچۆنیان حەزیان بکردایە، بە ئارەزووی خۆیان قسەیان دەکرد. کەچی راوێژکارانی والی بەغدا، هەرگیز پڕکێشی ناکەن لەبەردەم والیدا سەیری ئەملاولاش بکەن بەڵکو سەر دادەخەن و ورتە لە خۆیان دەبڕن و بۆ هەر قسەیەکیش کە (والی) دەیکات، دەچەمێنەوە و تا والی رێگایان نەدات، ناتوانن قسە بکەن.

ئێوارەش لەگەڵ مەحموود مەسرەف دا سەبارەت بەنەژادی ئەسپ قسەمان کرد، ئەسپی عەرەبی لە کوردستاندا وەك پێویست زاووزێ ناکات ئەگەرچی نەژادیشیان رەسەن بن و هی (نەجد)یش بن،ماینیشیان لە ئاسایی زیاتر، شتێکی تری لێ دەرناچێ. خێڵی جافیش توخمی وڵاخی بچووك و بەهێزیان هەیە، ناوبانگێکی زۆری، بە گورجوگۆڵی توانایانەوە دەرکردووە.

## ٢٢ی ئایار

ئەمڕۆش دیسانەوە بۆ یانەکەی لای مەیدان چوومەوە، وەك جاران ئاسایی خەڵکەکەی لێبوو. مەحموود مەسرەف بۆمی گێڕایەوە، کە بیرێتی چۆن (٣٢) سیی و دوو ساڵ لەمەوبەر، سلێمانی دروستکراوە، کاتێ کە فەرمانداریێتی ئەوسای کوردستانی باشوور (ئیبراهیم پاشا)ی باوکی سلێمان پاشای کوردی کە یەکێك بووە لە خزمەکانی میری ئێستای سلێمانی، ویستوویەتی پایەتەختی میرنشینەکەی لە (قەڵاچۆالان)ەوە، (کە دەکەوێتە تەنیشتی دووەمی

لای خۆرهەڵاتی چیاکانی ئەزمڕەوە)، بۆ جێگاکەی ئێستای سلێمانی بگوێزێتەوە، چونکە یەکەمین: حەزی لە ناوبانگ کردووە، دووەمیش: زۆر ئارەزووی راووشکاری هەبووە. جێگەکەی قەڵاچوالانیش بە کەڵکی ئەمجۆرە ڕابواردنانە نەدەهات، چونکە کەوتبووە دۆڵێکی تەنگەوە. ناوی شارەکەیشی بەناوی سلێمان پاشای والی ئەوسای بەغداوە ناوناوە، کە باوکی سەعید پاشای کلۆڵ بووە. پێشتریش لێرە گردێکی کۆن هەبووە(١٠٦)،لەکاتی تەختکردنیدا بۆ بناغە هەڵکەندنی ئەو کۆشکەی لەسەردەمی ئەورەحمان پاشادا دروستکراوە، هەندێ دراویان تێدا دۆزیوەتەوە.

سلێمانی دەکەوێتە ناوچەی سەرچنارەوە و بەپێی باشترین زانیاریی کە چنگم کەوتووە (٢٠٠٠) دوو هەزار خانووی موسڵمان و (١٣٠) سەدوسیی خانووی جوولەکە و (٩) خانووی دیان و کلدانی تێدایە، کەنیسەیەکی بچکۆلەی داڕووخاویشیان هەیە، (٥) پێنج خانووی ئەرمەنیشی تێدایە، بەڵام ئەمان قەشە و کەنیسەیان نییە، (٥) کاروانسەرا و (٥) حەمامیشی تێدایە، ئەمیش یەکێکیان زۆرباشە.

## ٢٣ی ئایار

عەسری ئەمڕۆ، میر ئاهەنگێکی نیشانە شکاندنی سازکرد، بەڵام لەبەرئەوەی رەشەبایەکی توندبوو، ناچاربووین وازی لێ بێنین. بۆیە بۆ ئەوەی عەسر بەسەربەرم، بۆ لای عەبدوڵلا پاشا چووم، کە لەوێ ئەندامانی یانەکە، بۆ دیتنم کۆدەبوونەوە. کەیخوسرەو بەگیش بۆ ئەوێ هات. دیاربوو لەبەر من ئەرکی هاتنی کێشابوو، هەرچەندە هیچیشمان لە یەکتر نەدەگەیشتین، بەڵام وەك جاران خۆی کێش کردبوو، هاتبوو. دوای تاوێکیش منجەمنجێکی کرد، کە نەمزانی لەگەڵ منێتی، بەڵام کە منجەمنجەکەی دووبارە کردەوە، رووم تێکرد، سەیرم کرد چاوی تێبڕیوم، ئەوسا مەحموود مەسرەف بێئەوەی بتوانێ زەردەخەنەکەی بشارێتەوە، بە زمانی

١٠٦- گوندێك لە دەوری ئەم گردە بووە، ناوی (مەڵکەندی) بووە. واتە (مەلیك هیندی)، یان گوندی مەلیك هیندی. میر ئاگاداری کردم لەوەی لەکاتی تەختکردنی گردەکەدا، چەند کووپەیەکی گەورەیان تێدا دۆزیوەتەوە. خاکە ئێسکیان تێدابووە. لەوحێکی نووسراویشیان دۆزیوەتەوە، فڕێیانداوە، چونکە کەس نەیتوانیوە بیخوێنێتەوە. هەروەها ئاگاداری کردم ئەو کرێکارانەی پێش ماوەیەك ئەم کۆشکەیان چاککردووە، لە چاڵێکی قووڵدا، لەتە کووپە و خاکە ئێسکیان دۆزیوەتەوە.

تورکی دواندمی و پێمی وت (بەگ - دەیەوێت پێت بڵێ لەناخی دڵیەوە، حەزدەکات لەناو خێڵەکەیدا چاوی پێت بکەوێ - کە شەش رۆژەڕێ بوو، لەسەروو کێوەکانی سنوورەوە- و لەوێ جوانترین پێشوازیی و میواندریت بکات). من دڵنیام لەوەی ئەمەی لە دەست دێت و کەمێکیش ئارەزووی بەجێهێنانی داواکەیم هەبوو.

## ٢٤ی ئایار

سەعات سێی دوای نیوەڕۆ، لەگەڵ میردا چووین بۆ سەیری نیشانە شکاندن. مەیدانی نیشانە شکاندنەکە، لە چالآیی بەردەم ڕێگەکەی ئەزمڕدا بوو، میل و نیوێك لە شارەوە دووردەبوو. من و میر و عەبدوڵلا پاشا، لەژێر چەترێکدا دانیشتبووین، سەیری نیشانەکەمان دەکرد. عوسمان بەگ لە هەرە ئەنگێوەکان بوو. بەڕاستی لە بەکارهێنانی تفەنگی قورسدا باشترین ئەنگێو بوو. جگە لەو، خەڵکی تریش نیشانەکەیان شکاند.

## ٢٥ی ئایار

ئەمڕۆ میر سەردانمی کرد و نزیکەی سەعاتێك لام مایەوە. بەڵام لەبەرئەوەی تەندروستیم شێوابوو، دڵم زۆر لای قسەکانی نەبوو. لەڕاستیدا قسەکانیشی زۆرخۆش نەبوون. دوای نیوەڕۆش بۆلای عوسمان بەگ چووم، کە زۆری پێخۆشبوو ستایشی دەستونیشانی دوێنێی بکەم، زۆریش حەزی دەکرد شەڕە شمشێر و نیشانە شکاندنیشی بە دەمانچە فێر بکەم، چونکە خۆرهەڵاتیگەل ئەم یارییە نازانن.

## ٢٦ی ئایار

ئەمڕۆ تەندروستیم زۆر شێوابوو، پێشوازیی کەسیشم نەکرد.

## ٢٧ی ئایار

چووم بۆ دیدەنی (عومەر خەزنەدار)، کە خانەدانێکی خۆش مەشرەف بوو. ماڵەکەیان لەولای ماڵەکەی ئێمەوە بوو. سەبارەت بە شتە عەنتیکەکانی کوردستان، باسی (تەختی سلێمان)ی بۆکردم، کە هەردە و بانێکە و دەڵێن بەرزترین بەشی شاخەکانی (سنە)یە و وتیشی هەندێ

پشکنینیان تێداکردووه لەوانە: ئەو پشکنینەی پێی دەڵێن شاری ژێر زەوی - بەڵام ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتوان باسی هەندێ جێگەی تریان کرد، کە لەمەی یەکەم فراوانترە و لە جێگەیەکدایە، ناوی (دەلۆ)یە و لە گردێك لەنێوان قەرەداخ و ئیبراهیم خانچی دایە. دەڵێن زارکی ئەم شوێنە پشکێنراوانە، زۆر تەسکن، بەڵام لە ناوەوە ڕاڕەوەکانی زۆر فراوانن و چەندان ڕاڕەوی تریان لێ دەبێتەوە، لەبەرئەوە چوونە ناو ئەم ڕاڕەوانە، بەبێ خۆ ئامادەکردن و خۆ کۆکردنەوە، شتێکی زۆر سامناك و ترسناکە، چونکە خەڵکێکی زۆریان تێدا سەرنگوون بوون. وتیشیان ئەم ڕاڕەوانە، یان هەندێکیان، بەلای کەمەوە بەئەشکەوت، یان ژوور و خانوودا تێپەڕ دەبن. لەم دواییەدا نزیکەی پەنجا کەسێك بۆ تاقیکردنەوەی ئەم جێگایە چووبوون، بەڵام چەند سەعاتێك تیایدا سووڕابوونەوە، بەبێئەوەی بگەنە ئەوسەری ئەم گەرووانە. کوردەکان دەڵێن وەختی خۆی ئەمە شاری (جنۆکەی کوڕی جنۆکە)، یان (شاری جنۆکان)(١٠٧) بووە.

لەگەڵ (عومەر ئاغای خەزنەدار)دا بەرنامەیەکمان بۆ سەردان و پشکنینی ئەم جێگایە دانا، بەمەرجێك هەرچیمان پێویستە، بۆئەوەی بتوانین ماوەی چوار، پێنج ڕۆژ، ئەگەر پێویستی کرد، تیایدا بەردەوام بین، لەگەڵ خۆماندا بیبەین. جگە لەمە، شاخی (دەلۆ)، گۆگرد و نەوت و زاخ و خوێ و سەرچاوەیەکی ترش و زەردیشی تێدایە.

ئێوارەم لەگەڵ عوسمان بەگدا بەسەربرد و تیپێکی مۆزکیشی بۆ رابواردنمان ئامادە کردبوو، کەچی ئەندامانی تیپەکە، وەك ئەو پەندەی دەڵێ: (بەبێ سرکە و بەبێ مەی سەرخۆش ببوون). ئەمانە لە گۆرانیبێژەکانی پلەی دووەمی شاری بەغدا بوون، بەڵام من و عوسمان بەگ هەر خەریکی قسەی خۆشی خۆمان بووین.

---

١٠٧- موسڵمانەکان پێیان وایە پێش ئەوەی ئادەمیزاد دروست ببێ، (جانی کوڕی جان)ی میری جنۆکان، شای دنیابووە، هەرئەویش (هەرەم)ەکانی میسری دروستکردووە، فەرمانڕەوایی نەتەوەیەکی کردووە، لە ئاگر دروستکراون، لەبەرئەوە قایل نەبووە کڕنۆش بۆ ئادەمیزاد بەرێ، کە لە خۆڵ دروستکراوە، وەك لە قورئاندا باسیکراوە موسڵمانەکان بڕوایان وایە، کە ئەو نەتەوەیە دنیایان پڕکردووە و پێش ئەوەی (ئادەم) دروست بێ، ماوەی (٢٠٠٠) هەزار ساڵ فەرمانڕەواییان کردووە و دوای ئەوەی ڕازی نەبوون گوێڕایەڵی بکەن، دەرکراونەتە پارچەیەك زەوی دوور، پێی دەوترێ (کێوی قاف). لە سزای ئەو سەرپێچییەشیاندا فەرمانیان پێکراوە هەر لەوێ بمێننەوە - بڕوانە ل ٥٩ی پێشەکی قورئانی وەرگێڕدراو - نووسینی - سەل - ٣٩٦ & ٨٢٠ و... هتد لە کتێبی (کتێبخانەی خۆرهەڵاتییانە)ی - دێربی لو-.

سەرۆك خێڵێكی جافیش لەوێ بوو، بەهەڵم زانی هەندێ پرسیاری لەمەڕ شێوەی فەرمانڕەوایی نێوان جافەكان و خۆ ڕێكخستنیان لێ بپرسم، پێمی وت كەیخوسرەو بەگ خۆی سەرۆكی تێكڕای جافە و هەرخۆیشی دەتوانێ بكوژێ و ببڕێ و ئەنجوومەنی ڕاوێژكارانیشی نییە و هیچ پێویست ناكات ڕاوێژ و پرس بە هیچ دەم سپییەكی خێڵەكەی بكات١٠٨

خۆ ئەگەر میریش داوای هەندێ پارە، یان جەنگاوەریان لێ بكات، سەرۆك تیرەكانی خێڵەكەی كۆدەكاتەوە و داخوازییەكەی میریان وەك یەك بەسەردا دابەش دەكات. سەرۆك تیرەكانیشی، هەریەكەیان پیاوەكانی خۆی كۆدەكاتەوە و ئەركەكانیان بەسەردا دابەش دەكەن. پێشیان وتم خێڵی جاف لە بەڕێوەبردنی كاروباری كوردستاندا بەشدار نەبوون، تا لەسەردەمی ئەوڕەحمان پاشادا بەشداری كران.

## ٢٨ی ئایار

بەیانیی زوو چووم بۆ زۆرخانەكەی عوسمان بەگ. منیش لەو باسەی (نیبۆر Niebuhr) زیاتر، كە لەسەر زۆرخانەكەی (شیراز) نووسیوێتی و باسی چەندان یاریی و مەشقی جۆراوجۆری یاریزانەكانی ئەو زۆرخانەیەی كردووە(١٠٩)، شتێكی ترم لەسەر ئەم زۆرخانەیە نییە.

دوای نیوەڕۆش عوسمان بەگ و كەیخوسرەو بەگ و مەحموود مەسرەف سەردانمیان كرد و ئەمی دواییان باسی ئەو سەفەرەی خۆی بۆ كردم، كە دوای ڕووداوەكەی (شێخ توێنی) عەرەب لە (مونتەفیك)، لەگەڵ (١٣٠٠) سوارەی تردا بە تۆپزی لە وەرزی گرەبادا، لە بەغداوە بۆ سلێمانی نێردراوەتەوە و لە ماوەی دووشەو و دوو ڕۆژ دا نزیكەی دووسەد كەسیان بە ئەسپەكانیانەوە لێ مردووە و لە ڕۆژی سێیەمدا گەیشتوونەتە سلێمانی، چونكە سلێمان پاشای والی بەغدا، عوسمان پاشای سلێمانی لابردووە و ئیبراهیم پاشای لەجێی داناوە، بەڵام عوسمان پاشا ڕازی نەبووە مل بۆ ئیبراهیم پاشا بدات، بۆیە ئەو بەناچاریی بۆ كوردستان ڕایكردووە، كە ئەوڕەحمان پاشای لێ بووە. هەڵبەتە بۆ ئەمەش ئەركێكی زۆریان كێشاوە.

---

١٠٨- دوای ئەوەی لە سەرچاوەیەكی ترەوە (كە پێم وایە زیاتر جێی متمانەیە)، زانیم كە سەرۆكی جاف، بەبێ ڕاوێژی دەم سپییەكانی خێڵەكە، ناتوانێ كەس بكوژێ، یان دەست بۆ كەس درێژ بكات.

١٠٩- ل ١٤١ی بەرگی دووەمی (گەشتێك بە وڵاتانی عەرەب)دا - نووسینی (نیبور).

## ٢٩ی ئایار

دیسانەوە لە مەیدان چاوم بە هاوڕێکانم کەوتەوە، بەڵام دوێنێ شەو بەڕاستی شەوێکی خۆشبوو، چونکە بەدرێژایی ڕۆژ، (با) لە باشوورەوە بوو، کەچی لە پڕێکدا لە ئێوارەدا گۆڕراو لە باکووری خۆرهەڵاتەوە رەشەبا هەڵیکرد، ئیتر خێرا بووە ڕەشەبایەکی توند و هەرچی هەبوو، رایماڵی و گەردەلوول و هەورێکی لە تۆز و خۆڵ بە ئاسمانەوە دروستکرد و مێشوولەیەکی زۆریشی لەگەڵ خۆیدا هێنا، کە بڕوام نەدەکرد ئەم مێشوولەیە لەم ناوچەیەدا هەبێت، بۆیە بەدرێژایی شەو، خەومان لێ زڕابوو. رەشەباکە ئەوەندە گەرمیش بوو، خاوی کردبووینەوە، ئەم رەشەبایە، ئەو (با) ترسناکەیە، کە لە خۆرهەڵاتەوە هەڵدەکات و نازانین لە خۆرهەڵاتەوە، یان لە باکووری خۆرهەڵاتەوە هەڵدەکات؟. کوتومت لە بای (سیروککو) دەچێ(١١٠)، کە لە ئیتالیا هەڵدەکات. ئەم بایە، لەبەر توندییەکەی، ترس و لەرزێکی زۆر دەخاتە دڵی دانیشتووانی سلێمانییەوە، چونکە هەرچی حەسانەوە و چالاکییە، نایهێڵێت. هەرچەندە من نەمتوانی هۆی ئەم بارە بزانم، بەڵام سەیرەکەی لەوەدایە، وەك هەموو دانیشتووانی ئێرەش ئەمەیان بۆ سەلماندمەوە، دوو سەعاتەرێ، بەهەرلایەکی سلێمانی دا دووربکەویتەوە، شوێنەواری نامێنێ.

## ٣٠ی ئایار

ئەم بەیانییە سەعاتێك لەگەڵ میردا پێکەوە دانیشتین و زۆری لێکردم کە پەیمانی بدەمێ هەموو ساڵێك سەردانی سلێمانی بکەم و ئەگەر رازی بم، خانوویەکی خۆشیشم بۆ دروست دەکات... وا چاوەڕوان دەکرا دووسبەی، برا ترسنۆکەکەی میر، حەسەن بەگ و رۆستەم ئەفەندی خەزنەداری پێشووی بەغدا بگەنە سلێمانی و خەزنەدار خەڵاتیش لەگەڵ خۆیدا بۆ مەحموود پاشا بهێنێ، لەبەرئەمە ئامادەبوونێکی باشیان، بۆ پێشوازی ئەم خەڵاتە سازکردبوو.

ئێوارەش لەگەڵ عوسمان بەگدا شێومان کرد و هەموو پیاوماقوڵانی شاریشی بۆ دیدەنیم بانگهێشتن کردبوو، کە ژمارەیان چواردە کەس بوون. خواردنەکەش تابڵێی خواردنێکی وەك ئەوەی لای میر، نایاب بوو. لەسەر شێوەی ئێرانی و لەسەر خوانی لاکێشەیی دایاننابوو، کە پێیان دەوت: (خوانچە Khuwan- che)، خواردنەکانیان لەسەر ریزکردبوو، خواردنەکەشمان لەبەر دەرگا، لەسەر

---

١١٠- گومانی تێدا نییە ئەم وشەیە نزیکایەتییەکی لەگەڵ وشەی (شەرقی)دا هەیە، کوردەکان پێی دەڵێن (بایەڕەش)، پەراوێزەکە دوایی هات، ڕاستییەکەی (ڕەشەبا)یە-ع.

سەوزەگیایەکدا خوارد. من و عوسمان بەگ لەسەرووی خوانەکە دانیشتبووین، ئەوانی تریش لەمبەروبەری خوانی ترەوە دانیشتبوون. هەر کە دەستمان بە خواردن کرد. کەیخوسرەو بەگیش لەسەرخۆ گەیشت و بە ورتەورتیش کە تێی نەدەگەیشتن، پۆزشی هێنایەوە. ئیتر یەکسەر لەوپەڕی خوانێك دانیشت و بە تاسوقەوە دەستی بەگۆشت خواردن کرد. کوردیش وەك ئێرانی لەسەرخۆ نان دەخۆن و بەدەم نانخواردنیشەوە قسە دەکەن و ماوەی خواردنەکەشیان وەك لای ئێمە، درێژە دەکێشی. ئەوان قێز لە شێوەی خواردنی بەپەلەی تورکەکان دەکەنەوە. تورکەکان تەنیا خواردنێك لەسەر خوانەکە دادەنێن و پاش ئەوەی میوان چەند پاروویەکی لێدەدات، ئەوە لادەبەن، خواردنێکی تر دەهێنن. لەوەدەچێ ئەم شێوەیە، شێوەی کۆنی تەتەرەکان بێت. بەڵام وەك دیارە ئێرانییەکان لەسەرخۆو بەکاوەخۆ نان دەخۆن.

دوای نانخواردن هەندێ لە میوانەکان چوون بۆ دیوەخانی میر و هەندێکیان بۆ گوێگرتن لە ئاهەنگێکی مۆزیك مانەوە، کە عوسمان بەگ بانگی کردبوون، مۆزیکژەنەکان، هەرهەمان مۆزیکژەنەکانی جاری پێشوو بوون و زۆریش شارەزا نەبوون. من و عوسمان بەگ گفتوگۆیەکی خۆشمان سەبارەت بەباری سیاسی کوردستان کرد، هەستی خۆیشی لێ نەدەشاردمەوە، کە چەند رقی لە تورکەکان بوو، چونکە پێمی وت: (ئەمانە، هەر خەریکی فڕوفێڵ و تەڵەکەبازین، کەس ئەوەندەی من نایانناسێ، بۆیە من لای خۆمەوە، هەر رقم لێیان دەبێتەوە و هەرگیز متمانەیان پێناکەم، چونکە ئەمانە هەتا چاوترسێنیان نەکەیت، یان بەتوندی لەگەڵیاندا نەجووڵێیتەوە، لە خۆیانەوە چاك نابن). منیش هەرچەند لەگەڵ هەموو بۆچوونەکانیدا نیم، هەست دەکەم هەندێ لە قسەکانی راستن.

عوسمان بەگ بۆ سبەی نیوەڕۆ ئاهەنگێکی زۆرانبازی سازکردبوو، حەزی دەکرد لەماڵەکەی ئێمەدا بکرێ، چونکە پێی وابوو، چوونی من بۆ ماڵی ئەوان، بەئەرك بزانێ، بەڵام حەوشەکەی ماڵی ئێمە جێگەی ئەوجۆرە ئاهەنگانەی تێدا نەدەبووەوە، بۆیە تکام لێکرد کە لە پێوەندیی دۆستایەتی داهاتووماندا ئەمجۆرە شتە رەسمی و زۆر لەخۆکردنانە، بایەخ پێنەدات.

هەر ئەمڕۆ دەرفەتی ئەوەم بۆ رەخسا، سەرنجی شتێ بدەم، کە پێشتریش زۆر سەرنجی راکێشابووم، ئەویش مەسەلەی نوێژی خۆرهەڵاتییانە بوو. وەکو بۆم دەرکەوت لەوە زیاتر کە شتێکی خوو پێوەگرتووە، شتێکی وا نییە، چونکە ئەم ئێوارەیە، کە لەگەڵ بانگی ئێوارەدا، نوێژی بە کۆمەڵیان دابەست، عوسمان بەگ پێش ئەوەی دەست بەنوێژ و کڕنوش بردنێکی مەزن بکات، چەند دەقیقەیەك لەبەرخۆیەوە هەندێ ورتەورتی کرد و هەندێ ویردی خوێند،

کەچی لە نوێژەکەدا و لەکاتی (رکوع)ەکاندا، کە گوێی لە تێبینییەکی بێبایەخی من بوو، کە لەگەڵ کابرایەکدا دەدوام، لەکاتی نوێژەکەدا ئاوڕی لێ دامەوە، تا وەڵامم بداتەوە و فەرمانی بەو گزیرانەی کرد کە خەریکی ئامادەکردن و گواستنەوەی نانی شێوبوون، پاش ئەوە دووبارە (رکعە)ی تری دەست پێکردەوە. زۆرجاری تریش ئەم بێ دەربەستی و گوێ پێنەدانەم لە موسڵمانەکان دیوە، کە لەکاتی نوێژ و چوونە (رکوع)دا، قسە دەکەن و گلەیی لەیەکتر دەکەن و سەیری ئەملاولای خۆیان دەکەن. هەر بەڕاستیش ئەم نوێژانە، بەڕادەیەك لە شێوە خۆنواندنێکی بێدەنگ دەچێت. میریش کە لەنوێژ گەڕایەوە، هەر بەدەم ناوهێنانی خوا و تەسبیحات و ویرد خوێندنەوە گەڕایەوە، کەچی جاروبار بۆ هەندێ وردە سەرنجی زۆر بێ بایەخ دەیبڕی و پاشان دەستی پێ دەکردەوە.

## ٣١ی ئایار

سەرلەبەیانیم لەگەڵ عەبدوڵلا پاشادا بەسەربرد و دوای نیوەڕۆش بۆ سەیری زۆرانبازییەکە چووم، ڕێگاش بە هەموو کەسێك درابوو، بۆ سەیری زۆرانبازییەکە بێت، بۆیە گۆڕەپانەکە و هەندێ گوێسەبانەش پڕببوون لە خەڵك. دەست بەزۆران کرا و هەندێ زۆرانباز، نەشارەزایانە و لەسەر شێوەی کۆنی لادێیانە زۆرانیان گرت، کەچی کوردەکان بەگشتی و عوسمان بەگیش لەسەروو هەموویانەوە، زۆر گەشکەیان بە سەیرکردنەکە دەهات. دووان لە زۆرانبازەکان پیاوی (عەزیز ئاغای کوڕی مەسرەفی گەورە) بوون. عەزیز ئاغاش لاوێکی ئێسك سووك بوو، منیشی زۆر خۆش دەویست. منیش زۆر هانی پیاوەکانیم دا و دژی پیاوەکانی عوسمان بەگ پشتم گرتن ، بەڵام بەختم یارنەبوو، چونکە هەردووکیان بە زەویدا کوتان.

کورد لەو گەلانەیە کە یەکجار حەزی لە وەرزشە، سا ئیتر گەورەبن، یان بچووك، لاوبن، یان پیر، لەبەرئەوەی وەرزش خولیای شیرینی هەموویانە. عوسمان بەگ دەستەیەکی کۆکردبووەوە بۆ ئەوەی بێن بۆ ماڵی ئێمە و لەوێ شمشیربازی خۆیانمان بۆ بنوێنن.

کە گەڕامەوە ماڵەوە باشترین دەمانچەی خۆمم بەدیاری بۆ نارد، ئەویش ئەو دیارییەی زۆر پێخۆش ببوو، بەڵام بیستم هیچ دیارییەك لە مانگێ زیاتر لای نامێنێتەوە، چونکە هەر شتێکی هەبێ، کە داوای لێ بکەن، دەیبەخشێ، لەگەڵ ئەوەشدا من گفتم لێ سەند کە دیارییەکەم لەناو نەدات و وەکو یادگارێك لای خۆی بیپارێزێ.

## ١ی حوزەیران

ئەم بەیانییە رۆستەم ئەفەندی کە لە بەغداوە هاتبوو، بەشێوەیەکی رەسمی (فەرمیی) پێشوازی کرا و میر ماوەی میلێك لە شاری سلێمانی بۆ پێشوازیکردنی دەرچووبوون. رۆستەم ئەفەندی لەگەڵ خۆیدا، حەسەن بەگیشی هێنا بووەوە و خەڵاتیشی لای والی بەغداوە لەگەڵ خۆی بۆ مەحموود پاشا هێنابوو، وا دیاربوو والی بەغدا پێشتر، حەسەن بەگی بەلای خۆیدا فریو دابوو، کەچی ئەو پابەندی و لایەنگیرییەی حەسەن بەگی هەروا زوو هەرزان فرۆش کردبۆوە و بێ هیچ مەرج و چەندوچوونێك، رادەستی برا رەنجاوەکەی کردبووەوە. بەڵام بۆ بەختەوەریی حەسەن بەگ، مەحموود پاشای برای، نەتورکخواز و نەئێرانیخواز بوو. حەسەن بەگیش بەگیراوی و قۆڵ بەستراوی و لەژێر چاودێری (١٠٠ سەد) پاسەوانی (گورجی)دا، کە شەو و رۆژ بەدیارییەوە بوون، بۆ سلێمانی هێنرابووەوە. سەروسیمایشی نیشانەی تێشکان و داتەپیویی پێوە دیاربوو، کە لەڕاستیدا لە نیشانەی گێلێتی بەولاوە، هیچی تری پێوە دیارنەبوو... هەرچۆنێك بێت ئەو شێوە ناشیرینەی تورکەکان لە بەڕەڵلاکردنیدا کردبوویان، تا رادەیەك لە چاکەی ئەم بوو، تێکڕای خەڵکی سلێمانیش سەبارەت بەو بەدەستەوەدانەوەیەی، بۆ بێزاریی دەربڕین لە ماڵ هاتبوونە دەرێ.

دوای نیوەڕۆی ئەمڕۆش، لە مەیدان چاوم بە (سلێمان بەگ)ی برابچووکی میر کەوت. ئەم و عوسمان بەگ و میر، لە دایکێکن، کە خوشکی خالد پاشایە کە لە بنەماڵەی بابانە. بەڵام حەسەن بەگ، خوشکەزای کەیخوسرەو بەگی خێڵی جافە(١). سلێمان بەگیش تەمەنی هەر (٣٠) ساڵ دەبێت، ئەگەرچی بەڕواڵەت گەورەتریشی دەنواند. لە براکانی تریشی کەڵەگەتترە و ڕواڵەت سادە و جوان و هەست ناسك و سەنگینە، هیچ زۆر لەخۆکردنێکیش لە هەڵسوکەوتیدا نییە.

(باقرخان)یش لەناو ئەوانەدا بوو، کە بۆ مەیدان هاتبوون، سەرەڕای ئەو ئاڵوگۆڕە و ئەو رووداوانەی ئەمڕۆ، کە لە چاکەی تورکەکان بوو، کەچی ئەم هەر گورجوگۆڵی و گەشکەیەکی ئاشکرای پێوە دیاربوو، مانەوەیشی لە سلێمانی دا، هێشتا هەرکەمێك نادیار و تەمومژاوی بوو، کە سەرم لێی دەرنەدەکرد.

---

(١) وەك براو نووسەری هێژا: کاك عەلی بەگی جاف ئاگادارمی کرد: حەسەن بەگ، خوشکەزای (وەڵەد بەگی جاف)ە، نەك کەیخوسرەو بەگ. واتە: ئەوڕەحمان پاشای بابان، خوشکی وەڵەد بەگی جافی خواستووە، نەك کەیخوسرەو بەگی جاف(م).

کەمێك باسی بەختیارییەکانی کرد، کە بێگومان کوردن و خۆمیش پێشتر رام هەر وا بووە. زۆر جاری تریش لەگەڵ کوردەکانی ئێرە لەگەڵم باس کردوونەتەوە. باقرخان خۆیشی هەر کوردە و لەناو بەختیارییەکانیشدا زۆر ژیابوو، دەڵێ زمانەکەیان شێوەی لوڕییە و کاتێ قسەی پێدەکەن، دەتوانێ تێی بگات. ئەمەش لەگەڵ بۆچوونەکانی مندا یەکیان دەگرتەوە.

## ٢ی حوزەیران

دانەوێڵەی (جۆ) دەستی بەهاتنە ناو شارەوە کرد. ئەمساڵ بەهۆی دواکەوتنی بارانەوە، درەویش دواکەوت. سەرەتای ((ئاروو ــ خەیار))ش لە بازاڕدا دەرکەوت، بەڵام زۆر کەمە و گرانیشە. ((توو))ش هەندێکی پێگەیشتبوو. بەڵام گەنم هێشتا نەگەیشتبوو، کە ڕەنگە لە ناوەڕاست، یان کۆتایی حوزەیراندا بدوورێتەوە.

ئەمڕۆ، کە بۆ پیرۆزبایی لێکردنی میر، بەبۆنەی خەڵاتکردنییەوە سەردانیم کرد، سەیرم کرد لە سەوزاییەکی تەختی تەنیشت کۆشکەکەیدا زۆر دڵخۆش دانیشتبوو. پێمی وت لەبەر خاتری من فەرمانی کردووە هەندێ یاری زۆرانبازیی ساز بکرێ، بەڵام خۆی هەرگیز چێژی لەمجۆرە شتانە نەدەبینی.

حەسەن بەگی برایشی کە هەڵهاتبوو، لای بوو... سەروسیمای ئەم، ئەوەندەی هی براکانی سەرنجی ڕانەکێشام. بەدرێژیی ئەو ماوەیەی پێکەوە دانیشتبووین، هەر خەریکی ویرد خوێندن بوو، وا دیاربوو دوای ئەو تەنگانەیەی تێی کەوتبوو، هاتبۆوەوە سەرخۆی و دۆخی جارانی خۆی، تەنگانەکەی ئەم دواییەیشی ئەمە بووە: ئەم، نزیکترین برای مەحموود پاشا بووە، بەڵام سەرەتای ساڵی پار، داوود پاشای بەغدا، لەژێرەوە بەنهێنی، بەنیازی فریودان و هەڵگێڕانەوەو سەرپێچی کردنی براکەی، کەوتبووە نامە نووسین بۆی، تا لە دواییدا تەقەڵلاکەی والی سەری گرتبوو، حەسەن بەگیش بۆ بەغدا هەڵهاتبوو، لەوێ پێشوازییەکی زۆر تایبەتمەند و بێ وێنەی کردبوو. دوای ماوەیەکیش فەرمانداریێتی (کۆیسنجاق)ی دابوویە، بەڵام هەر دوای چەند هەفتەیەك بانگکراوەتەوە و ئەو پلەوپایەیان لێ سەندۆتەوە، چونکە والی بەغدا بۆی دەرکەوتبوو هەتا مەحموود پاشا، لای ئێرانییەکانەوە پشتگیری بکرێ، بەربەرەکانێکردنی بێهودەیە. دواییش کە لە لێنەهاتوویی و بێخێریی حەسەن بەگ گەیشتبوو، رادەستی براتووڕەکەی کردبووەوە، بێئەوەی چارەنووسی حەسەن بەگ لێك بداتەوە.

بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی ئەم ئاڵوگۆڕەی سەرەوە، منیش ئەم تۆزە ڕوونکردنەوەیەی تری بەپاڵ دەخەم: نزیکەی ساڵێك لەمەوبەر، ئەفسەرێکی مەحموود پاشا، بۆ هەندێ کاروبار، قسەی لەگەڵ

داوود پاشا کردبوو. لە سەرەتای قسەکردندا، داوود پاشا کەمێك پێی داگرتبوو، بەڵام لەدواییدا بەڕواڵەت، بەگوێرەی دڵی سەردارە کوردەکە-واتە مەحموود پاشای کردبوو. بە نێردراوەکەیشی وتبوو: (سوێند بەخوا و بەسەری یوسفی کوڕم، مەحموود پاشا وەك یوسفی کوڕم سەیر دەکەم و ئەوەندەی جگەرگۆشەیەکی خۆم، خۆشم دەوێ و پڕ بەدڵ حەز بەچاکەی دەکەم). کەچی لای خۆیەوە بڕیاری دژایەتی و بەربەرەکانێکردنی دابوو، لەهەمان کاتیشدا سەرقاڵی ئەو نامە گۆڕینەوانە بوو، کە بەنهێنی لەگەڵ حەسەن بەگدا هەیبووە و نیازی پاشقول لێگرتنی ئەو پیاوەی هەبووە، کە (وەك یوسفی کوڕی سەیری دەکرد!)، تا لەناوی بەرێ. ئەمە چیرۆکێکە، کە بە بەرچاوی خۆمانەوە ڕوودەدا و یەکێکە لەچەندان چیرۆکی لەم بابەتەی، کە دەتوانم لە داوود پاشای بگێڕمەوە و لە هەموو ئەو سەرکردە تورکانەش دەوەشێتەوە، کە من ناسیومن.

عوسمان بەگ و گەلێ لاوی تری چاونەترس، دوو ڕۆژە خەریکی مەشق کردنن بە شمشێر، بۆ ئەوەی سبەینێ لەپێش چاوم بیکەن، کە دەبوایە ئەمڕۆ ئاهەنگەکە بکرێ، بەڵام بە هۆی چوونی منەوە بۆ لای میر، دواخرا.

## ٣ی حوزەیران

سەرلەبەیانی بەبۆنەی هاتنی ڕۆستەم ئەفەندییەوە بۆ سلێمانی، بۆ بەخێرهاتنی چووم. لە عەسریشدا شمشێربازەکان هاتن بۆ ماڵەکەی من. لبادێکیان هێنا و بەچل قەدیی بەگوریس بەستیان و لە ئاویان هەڵکێشا و هەڵیانواسی، ئەوسا عوسمان بەگ بە یەکەمین داوەشاندنی شمشێرەکەی، لبادەکەی بە کەرتەوە کرد. دوای ئەویش لاوێکی ڕووخۆش کە ناوی حەسەن بەگ بوو، کردی بە دوو لەتەوە. ئینجا عەزیز ئاغا، وەك هاوڕێکەی کردی بەدوو لەتەوە. پاشان بەستەکێکی تریان هێنا، بەڵام ئەمجارەیان عوسمان بەگ بۆی لەت نەکرا، ئەگەرچی لبادەکە هەر دوو سێ قەدیشی مابوو، عەزیز ئاغا و سلێمان بەگیش هەربۆیان لەت نەکرا. دیسانەوە عوسمان بەگ شمشێرێکی تریشی داوەشاند، بەڵام ئەمجارەیان هەڵچووبوو، کەچی لەجاری پێشوو خراپتربوو... لەدواییدا عەزیز ئاغا پارچەیەك لە لبادەکەی بڕی و لەسەر زەوی پانیکردەوە، بەیەك شمشێر کردی بەدوو لەتەوە. ئەوڕەحمانی برایشی چاوی لەم کرد و لەتیکرد. پێم وابێ ئەمجۆرە لەتکردنەیان کارامەیی زۆرتری تێدایە، وەك لەوەی هەڵواسرابێ. عوسمان بەگ پرسیاری ئەوەی لێکردم کە ئاخۆ ئەمجۆرە لەتکردنە، لەوەی لای ئێمە چاکتر نییە؟ منیش پێم وت شتێکی خراپ نییە ئەگەر بەرامبەرەکەت وەك ئەو لبادە، ئاوا لەبەردەمتدا بکەوێ.

ئەوەشم نیشان دا ئەگەر هەڵە بکات، چۆن دەکەوێتە بەر زەبری شمشێری ئەو بەرامبەرەی کە بزانیٚ شمشێرەکەی بەکاربهێنیٚ، وەك ئەو شێوازەی لای ئێمە دەیکەن. دیاربوو لەدواییدا کە بۆی دەرکەوت قسەکانم راستە، سەلماندی، بەڵام عەزیز ئاغا نەیسەلماند.

## ۸ی حوزەیران

لە چواری ئەم مانگەدا میستەر (بەل)(١١١) گەیشتبوو، منیش لەو رۆژەوە هەر خەریکی سەردانی هاورێیانی کوردم و کاتی خۆشیان لەگەڵدا بەسەر دەبەم. شتێکی واشم نییە شایستەی باسکردن بیٚ. رەشەباش وای لێکردووم زۆر ئارەزووی نووسینم نەبیٚ.

دوای نیوەڕۆ لەگەڵ عومەر ئاغا و مەحموود ئاغای مەسرەفدا سەبارەت کشتوکاڵی کوردستان دواین. گەنم لە کاتی ئاساییدا یەك و پێنج و یەك و دەو هەندیٚ جاریش ئەگەر گەنمەکە جیاوازتربوو، یەك و پازدە دەبڕیٚ، داهاتی ساڵی پاریش زۆر کەم ببوو، چونکە هەر یەك و دووی بڕیبوو. گەنم و جۆش بەروودوا، لە یەك پارچە زەویدا دەکرێن و لەم کشتوکاڵانەشدا پشت بەئاوی باران دەبەستن و بەمجۆرە کشتوکاڵانەش دەوتریٚ: (دێم)(١١٢) جۆرێکی تریش لەگەنم کردندا هەیە، پێی دەڵێن: (بەهارە). کە لە بەهاردا تۆو دەکریٚ و پێویستی بە ئاوێژە هەیە. لە دەشتەکانیشدا زەوی بە بەیاری ناهێڵنەوە، بەڵکو بەروودوا، گەنم و جۆی تێدا دەکەن، بەڵام لە گردۆڵکەکاندا بە بەیاری دەیهێڵنەوە. لۆکەش هەرگیز وا ناکەن دوو ساڵ لەسەریەك لە جێگایەکدا دووبارە بێتەوە، لەبەرئەوە لەگەڵ تووتندا نۆرەی پێدەکەن. لۆکەش هەمووی لە جۆری (سینویٚ)یە و پێویستی بە ئاوێژە هەیە، بەڵام هەندێکی لە گردۆڵکەکاندا بە دێم دەکەن. هەرتەنیا بۆ بەهێزکردنی رەز و تووتنیش، پەیین بەکار دەهێنن. چەند ساڵێکیش لەسەر یەك، مەرەزە لەیەك جێگادا ناکەنەوە، بەزۆریش لە شارەزووردا دەیکەن. ئەو ساڵانەی ئەو شوێنانەی مەرەزەی تیادا ناکەن، شتی تری تیادا دەکەن. لە کوردستاندا (کەتان) و

---

١١١- میستەر (بەل) لەلایەن حکوومەتی (بومبا)یەوە، وەك نەشتەرگەر (جراح) یاریدەدەری بنکەی نشینگەیی بەغدا دامەزراوە، بەڵام لەبەرئەوەی تەندروستی تێکچووە، بۆ کەڵك وەرگرتن لە ئاووهەوای شاخ، پێوەندی بە میستەر (ریچ)ەوە لە کوردستان کردووە. رەوشتی بەرزی و سروشتی سەنگینی و ئارەزووی گەشتوگوزاری و تێنوێتی بۆ زانیاریی و دەنگوباس کۆکردنەوە، وای لێکردووە، ببێتە یەکێك لەو خۆشەویستانەی دەستەکەی میستەر ریچ. لەدواییدا میستەر ریچ کەڵکی لە بەهرە چاکەکەی و دڵنەرمییە رەسەنەکەی وەرگرتووە- خاریچ.

١١٢- دەبیٚ ئەوەمان لەیادبیٚ، زۆربەی ئەو کشتوکاڵەی لە خۆرهەڵاتدا دەکرێن، بەهۆی ئاوێژەی وەك: جۆگەی هەڵگیراو و کەنداوەوە ئاو دەدرێن.

(گوش) تۆو ناکەن، بەڵام عومەر ئاغا پێمی وت ئەمساڵ هەندێ تۆو کەتانیان چنگ کەوتووە، کە حاجییەك لە میسرەوە هێناوێتی و وەشاندوویانە. هەروەها لە کوردستاندا گەنمەشامی هیندی و گەنمەشامی سپی و نیسك و نۆك و هەرزن و جۆرێك، یان دووجۆر ماشیش تۆو دەکەن، بەڵام بۆ هەر دۆنمێك، جووتە گایەك لە رۆژێکدا جووت دەکات.

لە کوردستاندا داری پرتەقاڵ و لیمۆ ناڕوێن، چونکە لەڕاستیدا لە هاویندا پلەی گەرما، لە پلەی مام ناوەندی تێدەپەڕێنێ و لە زستانیشدا لەوە ساردترە ئەم درەختانەی تێدا بژی. لەم دواییەدا میر، هەندێ دار پرتەقاڵی (ئەشبیلی) و لیمۆی شیرینی لە بەغداوە بۆ کۆشکە تازەکەی خۆی هێنابوو، بەڵام هەر یەکەمین زستان هەمووی سەرما بردبوونی. لەهەموو جێگایەکی کوردستاندا دار (گەرچەك) بەجیا، یان لەگەڵ لۆکەدا پێکەوە دەڕوێنرێ.

## ١٠ی حوزەیران

ئەم دوو رۆژەی دوایی، تەندروستیم زۆر تێکچووبوو، لام وایە بەلای زۆرەوە هی گەرماکەیە. تا ئێستا لە چادردا دەژین و بەهیوای ئەوەین خانوویەکی هاوینەی کوردەوارییانەمان بۆ بکەن، کەسابات و کەپرە، چونکە گڕەی گەرمای زۆر بەتین لە چادرەکەوە دێتە ژوورەوە، کە دەگاتە (١٠٣ و ١٠٠). بەڵام لە ژێر کەپر و ساباتدا لە (٩٢) پلە زیاتر تێناپەڕێ.

میر بەبۆنەی گەڕانەوەی ئەو ئەسپانەیەوە کە لە لەوەڕگا بوون، پێشنیاری کرد ئاهەنگێکی سواریی و پێشبڕکێ و جریدبازی ساز بکرێ، بەڵام پۆزشم هێنایەوە، کە ناتوانم ئامادەبم، چونکە لەوەدەچوو لە قرچەی گەرمای نیوەڕۆدا سازی بکەن، بۆیە ئاهەنگەکەیان دواخست، کە بڕوام نەدەکرد نیاز لەم ئاهەنگە هەر لەبەر خاتری من بووبێ، لەبەرئەوە ئەگەر بمزانیایە هەر بەتەنیا لەبەر منە، تەقەللام دەدا ئامادەی ئاهەنگەکە ببم. میریش کە زانی تەندروستیم شێواوە، بە پەلە و بێئەوەی ئاگادارم بکات و دەرفەتی ئەوەم بدات پاسەوانەکانم بۆ پێشوازی بچنە بەردەرگا، سەردانی کردم و نزیکەی سەعات و نیوێك لام دانیشت و ئاگاداریشی کردم کە (والی بەغدا) داوای لێکردووە قەڵایەك دروست بکات، پەیمانیشی داوەتێ کە تۆپ و کەرەسە و پێویستییەکانی بۆ ئەم مەبەستە بداتێ، لەبەرئەوە تکای لە من کرد سواری ئەسپەکەم ببم و جێگایەکی نزیك و لەبار، بۆ دروستکردنی قەڵاکە هەڵبژێرم. هەروەها داوای لێکردم لە نەخشەکێشاندا یاریدەیان بدەم. منیش پەیمانم بۆ دوای چاکبوونەوەم دانێ. ئیتر میر چووە سەرباسی (ئاسمانناسی) ئەوروپایی، کە پێشتریش گەلێ جار ئەم باسەی دووبارە کردبووەوە و بەتایبەتی پرسیاری لەمەڕ شاخەکانی ناو مانگ کرد و وتی لە رێگای ئایینەوە بۆی دەرکەوتووە، کە مانگ پارچەیەك ئاسنە و خوای گەورە بۆ

ئەوەی بەرزکردۆتەوە تا تیشکی هەتاو لە زەوی بداتەوە. فەرمانی بە ئەستێرەناس (منجم باشی)، یان بە سەرۆکی ئاسمانناسی و ئەستێرەناسەکەش کرد تا لەسەر شێوەی خۆرهەڵاتییانە نەخشەیەکی جیهانم بۆ بکێشێ، ئەویش کردی و دایمێ و لەڕاستیشدا نەخشەیەك بوو، باش دروستکرابوو.

میر داوایشی لێکردم سبەینێ بۆ ئامادەبوون لە ئاهەنگی شمشێربازیدا بۆ کۆشکەکەی بچم، چونکە لە دوای ئاهەنگی رابوردووەوە، عوسمان بەگ خۆی بۆ ئەم ئاهەنگە ئامادە دەکات و ئەویش هەر تکای لێکردبووم هەندێ مەشقی سەربازییانەی سەربازە هیندییەکانی نیشان بدەم.

## ١١ی حوزەیران

ئەمڕۆ کەپر و ساباتەکەمان بۆ دروستکرا، کە درێژییەکەی (٣٠پێ) و پانیشی نزیك (١٥ پێ) دەبوو. لەڕووی نەخشە و چۆنێتی دروستکردنییەوە، شتێکی کۆن و سەرەتایی بوو، سێ ریز کۆڵەگەیان بۆ چەقاندبوو، هەر ریزەی چوار کۆڵەگە بوو. سەرەوەی کۆڵەگەکان دووفاق (دووپەل)بوون و بەرزیشیان نزیکەی (٧ پێ) دەبوو، کۆڵەگەکان رایەڵ و داری تریان خرابووە سەر و لەسەر ئەمانیشەوە بە بەرزی دوو و سێ پێ، چرپی و لقوپۆپ و گەڵای بەڕوویان لەسەر دانابوو، لەسەر ئەمانەشەوە هەندێ خشتیشیان دانابوو، تا گەڵاو گۆڵەکە بنیشن و جێی خۆیان بگرن. دوای دروستکردنی ساباتەکەش، زەوییەکەیان تەختکرد، کاری زەوی تەختکردنەکەش بریتی بوو لەوەی بەچینێك قوڕی ئاسایی سواخی بدەن، پاش ئەویش گڵەسووری وشك و کا، تێکەڵ دەکەن و سواخێکی تری دەدەن و هەرچوار دەوری ئەم زەوییەش بە سەکۆیەك دەور دەگرن، کە بەرزیی شەش گرێیەك دەبێ. ئەمجۆرە و جۆری قەوارە جیاوازی تری ئەم سابات و کەپرانە، ئەو خانووە ئاساییانەن کە کورد لە مانگە گەرمەکاندا تیایاندا دەژین. بەشەویش جێگە لەسەریان رادەخەن و بۆئەوەش لەبەرچاو نەبن. بە شوورەیەکی لە قامیش چنراو دەوری دەگرن کە پێی دەڵێن (چیغ)، ئەم چیغە لە قامیشی باریك دروست دەکرێ و هەوایشی لێوە دێتە ناوەوە. لە حەوشەی هەندێ ماڵیشدا رەشماڵ هەڵدەدەن. لە ناوەڕاستی گەورەترین و رێکوپێکترین رەشماڵیشدا حەوز و فوارەیەك دروست دەکەن، کە ئاووهەوا خۆش دەکات و فێنکی دەکاتەوە.

ئەمشەو لە کۆشکەکەی میردا ئاهەنگی شمشێربازییەکە ساز کرا، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو. جارێکی تریش لەگەڵ میردا سەبارەت بە ئاسمانناسین دواینەوە. ئەستێرەناسەکەی میریش دەمگۆیەکی سەبارەت بە من بڵاوکردبۆوەوە، کە لە زیرەکیدا بە (مەسکەلاین)، یان بە (هەرشەل) ناگەم.

دەبوایە لە ١٢ی مانگدا (ڕۆژوو)ی ڕەمەزان دەست پێبکات، بەڵام میرم دڵنیا کرد، کە مانگ هەڵهاتووە و ئەو سەعات و دەقیقەیەشم پێوت کە تیایدا هەڵهاتووە. ئەویش کە لێی جیابوومەوە، فەرمانی دەرکرد: لە سبەینێوە بیکەن بە ڕەمەزان.

## ١٥ی حوزەیران

لەبەرهاتنی مانگی ڕەمەزان، لە سەعات نۆی دوای خۆرئاوابوونەوە، تا نیوەشەو لەماڵەوە بووم. پێشوازی میوانم کرد، چونکە موسڵمانەکان لە مانگی ڕەمەزاندا، بەڕۆژ دەخەون و ڕۆژووگرتنەکەیان بە خەڵوەت کێشان و قورئان و ویرد خوێندن بەسەردەبەن، شەویش بۆ خواردن و پێشوازی میوان تەرخان دەکەن.

دوێنێ شەومان لەگەڵ دوو بلوێرژەنی کورددا بەسەربرد، کە بلوێرەکانیان لە قامیش دروستکرابوو، هەردووکیشیان پێکەوە لەسەرخۆ و خەمگین بە ئاوازێکی دڵتەزێن بلوێرەکەیان دەژەند، بەڵام کەمێك دووبارەکردنەوە و ساردیی تێدابوو. باشترین ئاوازیان گۆرانییەك بوو، ناوی (لەیلێ گیان) بوو، گۆرانییەکی تریش بە (ئەز دەناڵم)( ١١٣) دەستی پێدەکرد. یەکێك لە دەستەکەی منیش ویستی گۆرانی بڵێ و بەسرووودێکی ناخۆش دەستی پێکرد، کە لە چەند تاکە شیعرێك پێکهاتبوو، لەنێوان هەر تاکە بەیتێکیشدا هەناسەیەکی کوڕوزانەوە و ناڵەناڵی هەڵدەکێشا، بەڵام گۆرانییەکە خۆی هەر لە لووره لوورێك دەچوو.

بلوێری شوانی کوردیش شمشاڵی پێدەڵێن، کە لە دارێکی خڕ دروست دەکرێ و دەنگی بەرزە و ناخۆشیش نییە، بەتایبەتی کە لەناو شاخاندا دەنگ دەداتەوە. شوانیش جۆرە هاوار و بانگکردنێکی تایبەتی خۆی بۆ بانگکردنی مێگەلەکەی هەیە، دەڵێن ئەو مەڕانەش لەو دەنگانە دەگەن و تەواو هەستی پێدەکەن. ئەم شمشاڵانە پێویستیان بەپشووی درێژ هەیە، بۆیە شمشاڵژەن بۆئەوەی پشووەکانی نەپچڕێن و لە لێداندا بەردەوام بێ، پیش دەخواتەوە و هەناسەکانی لێك دەدا، لەم کاتانەشدا دەنگی نزمتر دەبێتەوە. لە شێوەی گۆرانی (سنە)ش گۆرانییەکی سنەییان بۆ وتین، کە لە هاوارێکی خەمناك دەچوو، بەڵام ئەوانەی سلێمانی وایان دەرخست کە کەمێکی لێ تێگەیشتوون.

---

١١٣ جگە لەمانە، گۆرانی تری بەناوبانگی کوردی وەك (مەمکوژە بەناز) و (مەلەکێ جان) و (ئازیزێ)یان بۆ وتین.

# بەشی پێنچەم

سەربازێکی ئازای رووسی  ـ دڵڕەقیی شازادەی کرماشان ـ موسڵمانێکی گەورەی خواپەرست ـ بەروبوومی سروشتیی کوردستان ـ خواپەرستیی مەحموود پاشا ـ بەسەرهاتێك ـ گرتنی عەبدوڵلا پاشا ـ جەژن ـ هۆزەکانی کورد ـ بەسەرهاتێك ـ هۆزەکانی بڵباس ـ بنەماڵە فەرمانڕەواکانی کوردستان ـ گەیشتنی دەلی (شێتە) سەمعان لەگەڵ وردە شتەکاندا.

## ٢٤ی حوزەیران

ئەم ماوەیە لەدوای ئەو رۆژانەوە کە ئەو یادنامانەم تێدا تۆمارکردن. لەگەڵ مەحموود پاشا و عوسمان بەگ و هاورێکانی ترمدا، شەوانە سەردانی یەکترمان دەکرد، شتێکی ئەوتۆم لەیاد نییە، شایانی تۆمارکردن بێ، تەندروستیم تێکچووبوو، لەبەرئەوە کەمتر خۆم لە قەرەی نووسین دەدا. ئەوەتەی رەمەزانیش داهاتبوو، زۆربەی هەڤپەیڤنیەکانی میر، لەمەڕ ئایین بوو. بە پێچەوانەی هەر تورکێکەوە کە خواپەرستییەکەی لەمیش کەمتر بێ، ئەم بێ هیچ فیز و زۆر لەخۆکردنێك، تا ئاستێکی لە رادەبەدەر، دڵبەستەی ئایین و خواپەرستی بوو.

جارێکیان میر بۆی گێڕامەوە: (ئەوکاتەی شازادە محەمەد عەلی میرزا، وڵاتی- گورجی- داگیرکرد، منی لەگەڵدابووم. ئازاترین کەسێك لە ژیانمدا ناسیبێتم، سەربازێکی بەسزمانی رووسی بوو، ئەم سەربازە هەندێ نامەی پێبوو، ئێرانییەکان بەدیل گرتبوویان و بۆ لای شازادەیان هێنابوو، ئەویش لێی پرسی: چ کارەیت؟ سەربازەکەش وتی: کاری من لەو نامانەدا دەردەکەوێ کە پێمن و بەزمانی رووسین، ئەگەر دەتوانیت بیانخوێنەرەوە. شازادە کە بۆی دەرکەوت ناتوانێ هیچ دەنگوباسێکی لێ وەربگرێ، داوای لێکرد ببێتە موسڵمان، بەڵام سەربازەکە بە قسەی نەکرد، شازادەش هەڕەشەی لێکرد ئەگەر نەبێتە موسڵمان، گەورەترین ئازاری دەدات، کەچی سەربازەکە ورەی بەرنەدا، بۆیە شازادە فەرمانی کرد گۆڕێك هەڵکەنن، کابرای سەربازیش لە ماوەی هەڵکەندنی گۆڕەکەدا، زۆر ئاسایی و بێ گوێ پێدان، هەر پێدەکەنی و قسەی لەگەڵ ئەوانەی دەوروپشتیدا دەکرد. دوای هەڵکەندنی گۆڕەکەش شازادە سەرلەنوێ داواکەی دووبارە کردەوە، ببێتە موسڵمان، کابرا هەر ملی نەدا، ئەوسا شازادە فەرمانیکرد هەر بە زیندوویی بینێژن! منیش هەرچەندم کرد ئەوکارە دڕندانەیە نەکات، کەڵکی نەبوو... بەڕاستی شتێکی ناخۆشە یەکێکی چاك و ئازا لەبەرچاوت ببێتە قوربانی ئایینەکەی... باشە شازادە هەقی چی بوو بەسەر ئایینی ئەو کابرایەوە؟).

منیش کە گوێم لەو چیرۆکە دڵتەزێنە بوو، هیچم بۆ نەکرا لەوە زیاتر بیر لەوە بکەمەوە کە ئەگەر من سەرکردەی سوپایەکی رووسی بوومایە و شازادەم بە دیلیی بەردەست بکەوتایە، بێ سێ و دوو، بە یەکەمین درەختدا، کە تووشمان دەبوو، جەنابیم هەڵدەواسی.

دوێنێ شەویشم لەگەڵ میردا بەسەر برد، باسی هەمەجۆر شتمان کرد، ئاگاداریشی کردم کە خەڵکی کوردستان تووشی (گەرانی تێ - Gherani te)(١١٤)وون، کە مانای (تایە) و

١١٤- گەرانی تێ: ڕاستییەکەی (گرانەتێ)یە، یان (گرانەتا)یە-ع.

سێ چوار ڕۆژ دەخایەنێ و دوایی(تا)یەکی زۆر لە نەخۆشەکە دەهێنێ و زۆر لاوازی دەکات. ئەم (تا)یە زۆرتر لە بەهاراندا دەردەکەوێ و هەرکەسیش بیگرێ، بەدەگمەن چارەی دەکرێ.

سلێمانی سۆفییەکی گەورەی لێیە، ناوی (شێخ خالید)ە، کوردەکان پێیان وایە ئەگەر لە (حەزرەتی مەولانا) کەمتری پێ بوترێ، نەنگییە و وتەکانیشی بە (فەرموودە) دادەنێن. لە خێڵی جافە و لەسەر ڕێبازی نەقشبەندییە، لە (دەهلی) لەسەر دەستی سۆفی بەناوبانگ (سوڵتان عەبدوڵلا)دا بۆتە سۆفی. لەسەراسەری تورکیا و وڵاتانی عەرەبدا (١٢٠٠٠) مریدی هەیە. کوردەکان هەموویان بە (وەلی) دەزانن، زۆری تریشیان لە ڕیزەی پێغەرەکەیاندا دایدەنێن. عوسمان بەگ پێمی وت: خۆی و مەحموود پاشا و زۆربەی سەرانی کورد مریدی ئەون، چونکە بەلای کەمەوە لەگەڵ (شێخ عەبدولقادر)ی١١٥ بەناوبانگ لەیەك پلەدان.

## ٢٥ی حوزەیران

شەوی ڕابووردوو من و عومەر ئاغا سەبارەت بە بەروبوومی کوردستان زۆر دواین. شاری کەرکووك ئەو بازاڕەیە کە هەموو بەروبوومی ئەم بەشەی کوردستانی بۆ دەبرێ، نەك هەر لەلایەن کوردەکانی دەرەوەی کەرکووکەوە، بەڵکو لەلایەن ئەو کەرکووکیانەشەوە کە بۆ ئەم مەبەستە بۆ سلێمانی دێن و پارەی پێشەکی بە چەڵتووك و هەنگوین و شتی تر بە

١١٥- لە یادداشتێکی پێشتری میستەر ریچ دا، کە لە بەغداد نووسیوێتی، ئەم باسەی خوارەوەی لەبارەی پیاوێکی تری کۆمەڵێکەوە، لە کۆمەڵە دەروێشە سەیرەکانی موسڵمانان نووسیوە: (ئەمڕۆ- ٧ی کانوونی دووەمی ١٨٧١ز - مریدێکی سوڵتان حەسەن، هاتەلام، کە دەروێشێکی بەناوبانگە، سەبارەت بە شێخەکەی قسەی کرد، کە هەر ستایشێکی بکردایە، کوێرانەبوو، وتی: (قوربان- مەبەستی لە شێخەکەی بوو- بەهۆی موعجیزەوە، هەموو شتێك دەزانێ، ئەگەر بەزمانەکەی خۆشت قسەی لەگەڵ بکەیت، کە پێشتریش قسەی پێنەکردووە، تێدەگات، بەبێ دەرس خوێندنیش شارەزای هەموو زانیارییەکە، تەنانەت دەشزانێ چی لە دڵتدایە، ئەگەر نیازی ئەوەشت هەبێ راوێژی پێ بکەیت، پێش ئەوەی دەم هەڵبێنیتەوە، یەکسەر دەزانێ چیت دەوێ. ئا ئێستا ئاگاداری ئەوەشە کە باسی دەکەین، دەچێتە خەونی خەڵکیش. تەنانەت لە زیندە خەونیشدا، ئیتر لە هیند بن، یا لە ئێران). کابرا هەر ئەمڕۆ، کە ڕۆژی ٧ی کانوونی دووەمە، بە دڵسۆزییەوە ئەوەی دووپات کردەوە، کە ئەو (خچرئەلیاس)ی دیوە و قسەیشی لەگەڵ کردووە، کە موسڵمانەکان بڕوایان وایە هێشتا زیندووە و بەسەر زەویدا دەسووڕێتەوە و زۆرجاریش خۆی نیشانی دەروێش دەدات، هەر ئەویش ڕابەر و پارێزەری تایبەتیانە. هاوڕێکەم ئەوەی سەلماندەوە، کە (خچر ئەلیاس) بۆئەوەی ڕێی نیشان بدات دوو ڕۆژ لەگەڵ خۆی بردوویەتی.

جووتیارەکان دەدەن. کوردستان هەنگوینێکی زۆرباش بەرهەم دەهێنێ و هەنگیش لە شانەی قوڕیندا دەپارێزن. هەر لە کوردستاندا لێڕەواره بەڕووەکانی قەرەداخ، مازوویەکی زۆر بەرهەم دەهێنێ، ئەم مازووە بۆ کەرکووك و لەوێشەوە بۆ مووسڵ دەنێرن. ئەو درەختانەش کە کەتیرەی عەرەبی بەرهەم دەهێنن، لە چیاکانی کوردستان دەڕوێن و گوڵەکانیشیان وەك دەنکە ترێ وان و پێیان دەوترێ گەوەن - Ghewun.

گەزۆش لەسەر داری بەڕوو دەبارێت، دەڵێن گەڵێ داری تریش گەزۆی لەسەر دەبارێ. بەڵام گەزۆکەی زۆر نییە و جۆرەکەیشی باش نییە. بۆ کۆکردنەوەی گەزۆش دەبێ گەڵای ئەو درەختانە کۆبکرێنەوە و پاشان وشك بکرێنەوە و دواتر زۆر لەسەرخۆ، لەسەر پارچە قوماشێك بتەکێنرێ و دواییش بکوڵێنرێ و لە شێوەی تۆپەڵدا تێکەڵ بە وردە گەڵادا بۆ بازاڕ دەنێردرێ. جۆرێکی تری گەزۆ هەیە دەوەرێتە سەر بەرد، سپی و بێگەردە و لەو گەزۆیە چاکترە کە دەوەرێتە سەر درەختەکان. وەرزی گەزۆ، لە کۆتایی حوزەیراندایە. کوردەکان دەڵێن ئەگەر لەو وەرزەدا، هەر شەوێك لە شەوانی ئاسایی ساردتر بێ، گەزۆ دەباری و بەیانیانی ئەوجۆرە شەوانە، لە هەموو کاتێ زۆرتر کۆدەکەنەوە. عومەر ئاغا ناوی گەڵێ درەخت و ئاژەڵی بە کوردی پێ وتم، لێرە لەگەڵ ئەو وشانەدا کە ماناکانیان فێربووم، دەیاننووسم، وادیارە زۆریان فارسی بن: گۆیژ Goizh، خوژلیك Khuzhilk ، نەسرین، شیلان Shilan- سێپەڕە- Seipra، هێرۆ Heiro، گوڵ رۆژیان پەرست - Gul Rozhian parast، (کە ڕاستییەکەی گوڵە بەڕۆژەیە Gul Ba Rozhd وەرگێڕی عەرەبی) و لولان - Lulan، (کە ڕاستییەکەی لاولاوە- وەرگێڕی عەرەبی)، دیزلك - Dizlik، کەوەر Kiwar، کە ڕاستییەکەی کنگەرە(١١٦) ودارەبەن لە شاخ دەڕوێ و ئەگەر بیانەوێ بنێشتە تاڵی لێ بگرن، لە بەهاردا قەدەکەی بریندار دەکەن و کیتەڵەیەك بە بەردەمی برینەکەوە دەنێن، تا بنێشتەکەی تێ بچۆڕێتەوە، ئەمەش لە جۆرە هەرە چاکەکانی بنێشتە. لای ئەوان بە چۆلەکەی بەر گەردن سووریش دەڵێن (فەندەگولە - Fandagula) (کە ڕاستییەکەی فیڕنەگولەیە-وەرگێڕی عەرەبی)، هەروەها (کیسەڵ و ماسی گاشینە)شیان هەیە، کە ئەمی

---

١١٦- کوردەکان دوای ئەوەی ئەم کنگرە زۆرباش دەهاڕن و دەیبژێرن، بە وڵاخەکانیانی دەدەن، بەتایبەتی لەوکاتانەدا کە (جۆ) نابێت. دەڵێن ئەمە بۆ وڵاخ خۆراکێکی باشە.

سپیدار -Spidar، شۆڕەبی - Shorabi و داری بەن - Dariban. زۆرجاریش بەهەڵە بە قەزوان ناودەبرێ، بەڵام داری بەن زڕە و بەرناگرێ -وەرگێڕی عەرەبی).

دواییان لە زۆربەی جۆگە و چەمەکانی کوێستانەکاندا زۆرە، هەروەها (قەوارە - Karawara ) هەیە (کە راستییەکەی کەڕەواڵەیە - وەرگێڕ عەرەبی). جۆرە باڵندەیەکی لە کەو بچووکتریان هەیە، رەنگی مەیلە و شینکییە، یان بۆرە، ناوی (سوێسکە Soi Ske)یە، بە (ژن)یش دەڵێن (یایە)، بەڵام ئەو ژنانەی لە بنەماڵەی فەرمانڕەوان، بەخۆیان دەڵێن (خانم) و نازناوی هەموو ژنە کوردێکی تر (یایە)یە و وا دیارە ئەمە ئەو نازناوە رەسەنە کوردییەیە، کە بۆ ژن بەکاردێ. پیاوانیش هیچ نازناوێکیان نییە، چونکە هەموویان (بەگ و خان و ئاغا)ن.

## ١ی تەمموز

ئەمڕۆ میر سەردانی کردم، کە بێگومان و بێ سێ ودوو، یەکێکە لەو موسڵمانانەی بێ لەخۆگۆڕان و بەڕاستی ئیسلامەتیی بکات. ئەمشەو چیرۆکێکی بۆ گێڕامەوە، نەك بۆ خۆهەڵکێشان بێ، بەڵکو بۆ ئەوە گێڕایەوە، تا کەڵکی ئایین و خواپەرستی تەواوی خۆی نیشان بدات، منیش ئەوەندەی بتوانم هەوڵ دەدەم خۆی چیرۆکەکەی چۆن بۆ گێڕامەوە، بەو جۆرە بیگێڕمەوە، چونکە ئەگەر دوور لەو ساکاریی و چۆنێتیی ئەو شێوەیەی ئەو گێڕایەوە، بیگێڕمەوە نرخێکی زۆری لە دەست دەچێت.

پێمی وت: (کاتێ لە کرماشان، لەبری باوکی خوالێخۆشبووم بارمتە بووم، باوکم لەبەر رووداوەکانی رۆژگاردا ناچار بوو هاوکاری تورکەکان بکات. بەمجۆرە ژیانی منیش کەوتە مەترسییەوە. شازادەی کرماشان شەوێکیان داوای کردم بمکوژێ، منیان بە دەست بەستراویی بۆ برد و شازادەش خۆی لە هەیوانێکدا دانیشتبوو، ناوەڕاستەکەی پڕ بوو لە مۆمی داگیرساو. جەللادیش بۆ بەجێهێنانی کارەکەی بەپێوە ساز و ئامادە وەستابوو، بۆیە ئەمە دەڵێم چونکە زۆربەی ئەوانەی لە مەیدانی شەرەفدا بە دەست بەستراویی دەبرێنە بەردەم جەللاد، ترس دایان دەگرێ. بەڕاستی دیمەنێکی ترسناك بوو - یاخوا نەیبینیت - من خۆم ددان بەوەدا دەنێم کە لەو دەمەدا جەستەم شل و خاو ببووەوە. بەڵام لەم تەنگانەیەمدا هۆشم بە ئاگای هێنامەوە، تا هاواری خوا بکەم. ئیتر یەکسەر دڵنیایی هەموو دەروونمی گرتەوە و ئەم وشانەش لە مێشکمدا زرنگانەوە: (ئەی من نەبووم تۆم لە سکی دایکت دەرهێنا و تا ئێستا پاراستوومیت؟ ئەی هەرخۆمیش ناتوانم هەر ساتێك بمەوێ لەناوت بەرم؟ کەواتە ئەم ترسە بۆ؟ ئەگەر هەر منیش دەسەڵات نەدەم بەو پیاوە، دەتوانێت دەستت بۆ بهێنێ؟). لێرەدا هەستم بە حەسانەوە کرد، دڵم ئەو بارە ناخۆشەی لەسەر هەڵگیرا و بەرامبەر شازادە بێ ترس و لەرز وەستام، لەبەرئەمە سوپاسی خوا دەکەم، کە دڵی ئەو شازادەیەی نەرم و

پەشیمان کردەوە، کە داوای کردبووم و بڕیاری کوشتنمی دابوو، لەدواییشدا بێئەوەی دەستم بۆ بێنن، فەرمانی کرد بۆ بەندیخانەم ببنەوە).

دوێنێ شەو لەماڵی عومەر خەزنەدار دانیشتبووم، شەوێکی هێمن و گەرم بوو. خەڵکەکەش سەرقاڵی قسەکردن بوون، لەوکاتەدا کە مانگ لە سەعات (١٠)دا هەڵهات، رەشەبایەکی توند و گەرمیش لە باکووری خۆرهەڵاتەوە هەڵیکرد، خەڵکەکە دەستبەجێ وەك هەست بەبوومەلەرزە بکەن، بەدەنگێکی نائومێد وتیان (ئەوا رەشەباکە هەڵیکردەوە...)١١٧

بەڕاستیش ڕەشەباکە، ڕەشەبا ترسناکەکەی لای خۆرهەڵاتەوە بوو، ئیتر لەوساتەوە بەپەلە و توند، لە خۆرهەڵات و باکووری خۆرهەڵاتەوە هەڵیکرد، گڕەکەی، لە گڕەوسەبوونی بەغدا دەچوو، بەڵام من پێم وابوو ئەوەی بەغدا، ئەوەندەی ئێرە توند نییە و زیاتریش مایەی تەمەڵییە. ئەم ڕەشەبایە بەڵای ئەم ناوچەیەیە و ئەگەر سلێمانی ئەم ڕەشەبایەی نەبوایە، ئاووهەوای زۆرخۆش و فێنکتر دەبوو.

سلێمانی دەکەوێتە ئەو نزمایییەوە، کە نزیکەی دوو میلێك لە دامێنی ئەو زوورگانەی خۆرهەڵاتەوە دوور دەبێ، کە لاپاڵە پڕەوەبووەکانی بەرەو سلێمانی لێژدەبنەوە و شارەکەش لەسەر یەکێك لەم لاپاڵە تەختانە دروستکراوە. بەڵام گردەکانی تەنیشتی، زۆر لێژ و ڕووتن و بەرزایییشیان نزیکەی (٣٠٠) سێ سەد یارد دەبێ و شێوە ئاوێنەیەکیان دروستکردووە، بۆ ئاوەژووکردنەوەی تیشکی خۆر، کە بەدرێژایی ڕۆژانی هاوین هەر لە سەعات حەوتی بەیانییەوە تا خۆرئاوابوون لەسەریانە و ئەم گەرمایەش لەگەڵ ئەو ڕەشەبایەدا بۆ ناو شار دەنێرنەوە، کە لە خۆرهەڵات و باکووری خۆرهەڵاتەوە لەم لاپاڵانەی دەدا. لای خۆرهەڵاتیشەوە ئەم گردانە کەمێك بەرەو دواوە لادەکەنەوە و نابنە هۆی ناسازکردنی ئەو بایەی لە باشووری خۆرهەڵاتەوە هەڵدەکات و وەك ئەو ڕەشەبا دژوارەی لە باکووری خۆرهەڵاتەوە هەڵدەکات. ئەم بایەی خۆرهەڵات (ڕەشەبا) لەبەرئەوە گەرمە، بەدرێژی ئەو زوورگانە، جۆرە خاوبوونەوە و سستییەك دەبەخشێ، بەڵام تاوی ئەم ڕەشەبایە لە خۆرئاواوە لە ڕووباری (تانجەڕۆ) بەولاوە زیاتر بڕ ناکا. خۆ ئەگەر لەو گردانەش تێپەڕبکەیت، بەیەکجاری تین و تاوی نامێنێ. ئەم دیاردە سروشتییە لە (کۆیسنجاق)یشدا هەیە، کە کەوتۆتە دۆڵێکی تەنگەوە و بەڕواڵەت لە دۆڵی سلێمانی دەچێت، بەڵام گردەکانی ئەوێ بەرزترن و بای خۆرهەڵاتییەکەیشی توند و گەرمترە.

---

١١٧- کە ڕەشەباکە هەڵیکرد، گەرما (١٠ پلە) بەرزبووەوە، واتە لە (٨٠ پلە)وە بووە (٩٠ پلە).

لێرە زۆر بەدەگمەن بای باکوور هەڵدەکات. بەڵام بەشەکانی لای خۆرئاوای هەموویان ئاووهەوایان سازگارە. لێرەدا پێویستە ڕاستییەك بڵێم کە لە چاو خۆیدا شتێکی سەیرە و ماوەیەکی زۆریش تووشی سەرەخولێی کردبووم، تا تەواو لێی دڵنیابووم: بەربەیان هەوا کپە١١٨و دوای خۆر کەوتنیش سروەیەك لە خۆرهەڵاتەوە هەڵدەکات و تا پێش نیوەڕۆ بەردەوام دەبێ، لە نیوەڕۆشدا لە باشوورەوە بایەکی تۆزێ توندتر هەڵدەکات. بەڵام هەرئەوەندەی تینی خۆر بشکێ، ئیتر ڕەوتی بایەکەش بەرەو خۆرئاوا دەچێ. لەبەرئەمە بەیانیانم بەدڵ نەبوو، بەڵام عەسرانی زۆر خۆشە، کە تیایدا شەماڵێکی فێنك لە خۆرئاواوە هەڵدەکات، ئەم دیاردەیەم بەتەواوی لەو ڕۆژانەدا بۆ دەرکەوتووە، کە ڕەشەبای تێدا هەڵ ناکات، بەڵام گەرمای ڕۆژ، لە نیوەڕۆدا دەست پێدەکات و لە سەعات سێی دوای نیوەڕۆ کۆتایی دێت.

## ٦ی تەمووز

دوێنێ شەو لەگەڵ عوسمان بەگ بووم، هەرچەندە زۆریشی لە خۆی کرد بمدوێنێ و لە بیرم بباتەوە، بەڵام دیاربوو زۆر دڵتەنگ و خەیاڵ بڵاو بوو، پێرێ شەوێش کە لای میر بووم، هەر هەمان شتم لەویشدا هەست پێدەکرد. دواییش لە دەوری سەعات یازدەدا، تاوێ دوای ئەوەی دیوەخانەکەی عوسمان بەگم بەجێهێشت، عەبدوڵلا پاشا دەستگیر کرابوو، خستبوویانە ژوورێکی جیاوازی دوور لە حەرەمی کۆشکەکەوە، لە هەمان کاتدا دەستەیەکی تریش بۆ گرتنی براکانی عەبدوڵلا پاشا چووبوون، کە لە ناوچەکەی خۆیان لە خۆرئاوای سلێمانی دەژیان. هۆی ئەم کارەش وەك دوایی زانیم ئەمە بووە:

ماوەیەکی کەم بەر لە ئێستا، دوای ئەوەی مەحموود پاشا، بڕیار دەدا خۆی بداتە پاڵ تورکەکان، خۆی و عەبدوڵلا پاشای مامی و عوسمان و سلێمانی برای، چووبوونە لای خواناسی مەزن (شێخ خالیدی سلێمانی) و هەرسێکیان سوێندیان خواردبووە کە لایەنگیر و پشتیوانی مەحموود پاشا بن و لەبەرئەوەش کە لە دوای ئەم هەڵوێستەیان چاوەنواڕی ئەوە دەکرا شازادەی کرماشان، تەقەللای بدات یەکێکیان بەلای خۆیدا داشکێنێ و لە دژی تورکەکان هانیان بدات، بۆیە سوێندیان بەشمشێر و قورئان و تەڵاق(١١٩) خواردبوو، کە ئەگەر هەر کامێکیان نامەیەکیان لەلایەن تورك، یان ئێرانەوە پێبگات،

---

١١٨- مەبەستی ئاووهەوای سلێمانییە-ع.

١١٩- ئەمە دەقی سوێندەکەیانە: (ئەگەر لەم سوێندە لابدەم، تەڵاقم کەوتبێ).

دەبێ لەماڵی (شێخ خالید) و لەبەر چاوی چەند کەسێك، کە خۆیان لەسەری ڕێك دەکەون،نامەکە بکاتەوە. لەم بوارەدا عوسمان بەگ یەکەمین کەس بووە تاقی بکرێتەوە، چونکە هەر دوای ماوەیەکی کەم، نامەیەکی لە شازادەی کرماشانەوە پێگەیشتووە، تیایدا داوای لێدەکات لە کرماشان سەردانی بکات و پەیمانیشی داوەتێ بیکات بەفەرمانداری سلێمانی. عوسمان بەگیش هەر کە نامەکەی پێدەگات، دەستبەجێ هەردوو براکەی (مەحموود پاشا و سلێمان) ئاگادار دەکاتەوە. دوای ئەمیش عەبدوڵلا پاشا، بەهەمان ناوەرۆك نامەیەکی تری پێدەگات، بەڵام بەپێچەوانەی ئەو سوێند و پەیمانەی لە سەری ڕێکەوتبوون، ئەم، نامەکە دەشارێتەوە. مەحموود پاشاش بەمەی نەزانیوە، تا (والی بەغدا)، ئەم هەواڵەی بە تەتەرێکی خێرادا پێدەگەیەنێت و داوای لە مەحموود پاشا کردووە، کە عەبدوڵلا پاشای مامی بگرێت. مەحموود پاشاش لە سەرەتادا بڕوای بە هەواڵەکە نەکردووە و بەتوندیش ئەوەی ڕەتکردۆتەوە کە هیچ لەگەڵ عەبدوڵلا پاشادا بکرێ، لە هەمان کاتیشدا بڕیاری داوە بەوردی چاودێری هەڵسوکەوتی بکرێ، تا لە ئەنجامدا خەزنەدارەکەی عەبدوڵلا پاشا، ئاگاداری دەکاتەوە، کە مامی خەریکە خۆی بۆ کرماشان ئامادە دەکات، بۆیە گەیشتۆتە ئەوەی بیگرن.

ساڵی پاریش والی بەغدا، عەبدوڵلا پاشای بەدەستەوە دابووەوە، یان بەواتەیەکی تر، تەڕنێکی گەورەی لێکردبوو، کە رادەستی مەحموود پاشای کردبۆوەو کەوتبووە ژێر بەزەیی ئەو برازایەی، کە ئەگەر نیازی تۆڵەسەندنەوەی هەبوایە، بەئاشکرا، یان بەنهێنی، بێ ترس و دواکەوتن لەناوی دەبرد، بەڵام مەحموود پاشا ئەو شتانەی بەبیردا نەهاتووە و زۆر بەچاکی لەگەڵی جووڵاوەتەوە و باشترین ناوچەی کوردستانیشی دابوویە، تا پێی بژی. سەرەڕای ئەمانە هەموو ئەو قەرزانەیشی بۆ دابووەوە، کە لە کاتی مانەوەیدا لە بەغدا، لەسەری کەڵەکە ببوون و هەموو پێویستییەکانی خۆی و خێزانەکەیشی دابین کردبوو. لە راستیدا لەوە زیاتریشی دابوویە کە پێی رەوا دەبینرا. کەچی ئەم هەموو چاکەیەی بەو کارە ناشیرینە دایەوە، کە نیشانەی دڵڕەشیی دەردەخات.

## ١٠ی تەمموز

ئەمشەو میر تاوێك لام مایەوە، بەڵام زۆر دڵتەنگ بوو، بەدڵگیریشەوە کردەوەی مامەکەی و ئاشکرابوونی تاوانەکەی باسکرد. دیاربوو ئەم هەستەش کە دەری بڕی (بێگومان بووم لەناخیشەوە بوو) نیشانەی دڵسۆزیی و نیازچاکیی و خاوێنیی بووە. پێم وایە ئەمجۆرە کەسانە هەرگیز لە خۆرهەڵاتدا وێنەیان نییە و ترسی ئەوەم هەیە لە وڵاتانی پێشکەوتووشدا نموونەیان کەم هەبێ...
میر سەبارەت کاروباری تایبەتی خۆیشی زۆر قسەی بۆ کردم و راوێژی پێکردم.

## ١١ی تەممووز

لەگەڵ عومەر ئاغای هاوڕێی زرنگ و وریامدا بەدرێژیی باسی گەلێ شتمان کرد، کە پێوەندی بە کورد و نیشتمانەکەیانەوە هەبوو، وا لێرەدا بەپێی گونجان تۆماریان دەکەم:

خۆشناوەتی و ڕەواندزی یەکجار کێوی و نەزانن و هیچ شتێکیش لە کوشتن و بڕین نایانگێڕێتەوە، هەرچەندە وا ناسراون کە لە مزگەوتیشدا یەکتر دەکوژن، بەڵام سەریان بچێ نوێژیان ناچێ. چەند ساڵێك دوژمنایەتییەکی خوێناویی لەنێوان دوو ناوچەدا، لەسەر سەگێك ڕوویدابوو، کە نزیکەی حەفتا کەسیان لە یەکتر کوشتبوو، لەمانە (٣٠) کەسیان لە مزگەوتێکدا کوژرابوون، کە هەردوو دەستەکە پێکەوە نوێژیان کردبوو، ئەمانە تا ئێستاش جار ناجارەیەك لەسەر ئەمجۆرە شتە هیچ و پووچانە، یەکتر دەکوژن... شەڕەکانیشیان بەیەکتر کوشتن نەبێ، دوایی نایەت.

سەرۆك خێڵێکی خۆشناوەتی هەیە، ناوەکەیم لەیاد نییە و هێشتا لە ژیاندایە، ڕۆژێکیان مێشێك بەچاوییەوە دەنیشێتەوە، بێزاری دەکات، دەری دەکات و دووبارە و سێ بارە پێوەی دەنیشێتەوە، تا تووڕەی دەکات، ئیتر دەست دەداتە خەنجەر و لێی دەدات و چاوی خۆی کوێر دەکات... بەجۆرێ خەریك دەبێ بمرێ.

هەموو پیاوێکی هۆزی (بڵباس)یش(١٢٠) پلەوپایەی هەرچییەك بێ، دەتوانێ بیروڕای خۆی سەبارەت بەهەموو کاروبارێکی گشتی دەربڕێ، جاری وا دەبێ سەرۆکێکی بڵباسی لەسەر شتێکی بازرگانیی، ڕێکەوتننامەیەك بکات، کەچی یەکێك لە پیاوەکانی هۆزەکەی رادەپەڕێ و دەڵێ: من بەمە رازی نیم. ئیتر هەر ئەو قسەیە بەسە بۆ هەڵوەشاندنەوەی تێکڕای ڕێکەوتنەکە. بۆ وێنە: جارێکیان دوای ئەوەی ئەوڕەحمان پاشا، شەڕێك لەگەڵ بڵباسەکاندا دەکات، دوایی لە گەڵیاندا ئاشت دەبێتەوە و ڕێك دەکەونەوە. بەپێی ڕێکەوتنەکە دەبێ (کاکە حەسەن)، یان براحەسەنی سەرۆکی بڵباسەکان سەردانی سلێمانی بکات، بەرامبەر بەم سەردانەش (سەلیم بەگ)ی برای ئەوڕەحمان پاشا، لای بڵباسەکان بارمتە بێ. ئیتر کاکە حەسەن خەریك دەبێ بڕوات، پیاوێکی هۆزەکە دەست دەخاتە سەر خەنجەرەکەی و زۆر لەسەرخۆ دەڵێ ئەگەر کاکە حەسەن بگرن، بێ چەندوچوون دەیکوژن و دواییش شانازی بەوەوە دەکەن کە سەرۆکێکی بڵباسیان کوشتووە، لەبەرئەوە چاکتر وایە هەر لێرە خۆم بیکوژم... تەقەللایەکی زۆر لەگەڵ کابرا دەدەن، بێ کەڵك دەبی و لە کەلی شەیتان نایەتە خوارەوە. لەسەرئەمە سەلیم بەگ سواری

---

١٢٠- ئەمە ناوی چوار هۆزی بڵباسە: (ڕەمك، مەنزوور، پیران، مامش).

ئەسپەکە دەبێ و بڕیار دەدا بۆ جێگاکەی خۆی بگەڕێتەوە، بێئەوەی بەپێویستی بزانێ قسە لەگەڵ کاکە حەسەندا بکات. دوای ئەوەی سەلیم بەگ کەمێك دووردەکەوێتەوە، کابرای دڕندە پەشیمان دەبێتەوە و هاواری لێدەکات کە بگەڕێتەوە و دەڵێ: کاکە حەسەنیش لەگەڵ خۆت ببە و پێکەوە بڕۆن، ئێمە بارمتەشمان ناوێ، ئەگەر پیاوبن، لەگەڵێدا چاك دەبن(١٢١)...

ئیتر بڵباسەکان ئەم قسەیە پەسەند دەکەن و سەلیم بەگ و کاکە حەسەن پێکەوە بۆ سلێمانی دێن(١٢٢).

---

١٢١- نازانین! دەشێ وشەی (دڕندە) بە کابرایەکدا بلکێنین، کە ئەمە هەڵوێستی بێت لەسەر سەربەرزیی هۆزەکەی و ئەمە بیرکردنەوەی بێت لە هەڵسەنگاندنی کاروبار و تاوتێ پێکردن و چارە دۆزینەوە بۆیدا؟ - ع.

١٢٢- ئەمە هەندێ زانیاری ترە، تایبەتە بە بڵباسەکانەوە کە لێرەدا دەینووسین، لە زمانی بڵباسێکەوە وەرگیراوە و لەناو کاغەزە پەرش و بڵاوەکانی میستەر ریچ دا بووە، لێرەدا دەینووسین: بڵباسەکان لەم هۆزانە پێکهاتوون:-

١- کابایز: بنەماڵەی فەرمانڕەوایە و نزیکەی دووسەد کەس دەبن.

٢- مەنزوور.

٣- مامش.

٤- پیران.

٥- رەمك.

٦- مسن و قاقا: ئەم دووانە، هەردووکیان هۆزێك پێك دێنن، سەرۆك هۆزەکەیان پێی دەوترێ (مەزن) و هەر سەرۆکێکیش هەندێ دز و جەردەی هەیە، بۆ ئەوی دەکەن. ئەندامانی هۆزەکەیشی، هەریەکە لەجێی خۆیانەوە ئازووقەی بەدیاری بۆ دەنێرێ. ئەمە هەموو داهاتەکەیەتی. لەناو بڵباسەکاندا (خوێن بایی) بیست و دوو گایە. ئەمە بەشتی تریش دەگۆڕدرێ، ئەگەر بیانەوێ مەسەلەکە بەخۆشیی ببڕێتەوە، بەمەرجێ ئەو شتەی دەدرێ، دووقاتی نرخەکەی خۆی ناوی لێ بنرێ، بەڵام یاساکانیان، یاسای خێڵەکییە و بەدەست سەرۆك و ئەنجوومەنی دەم سپییانیش یاریدەی دەدەن. تاوانەکانیشیان جگە لە دەستدرێژیی کردنە سەر ناموس و تەفرەدان، سزای مردنیان بەسەردا نادرێ. بڵباسەکان ژن و ژنخوازیش لەگەڵ هۆزی تر ناکەن و کچ بەبیانە نادەن. لە ژیانی کۆمەڵایەتیشدا دڵداری و خۆشەویستی هەیە. رەدووکەوتنیش لەناویاندا شتێکی بڵاوە، ئەگەر سەرۆکەکەیان بمرێ، چاکترین پیاویان، یان ئازاترینیان، جێی دەگرێتەوە، بەڵام ئەگەر کوڕە گەورەکەی ئەوەی لەباردا نەبێت، کاروباری سەرۆکایەتی بەڕێوە ببات، برایەکی تری لێهاتووی، لە جێی دادەنرێ. کە سەرۆکێکیش دانرا، ناتوانرێ لاببرێ. دەسەڵاتی سەرۆکیش دیار و چەسپاوە و کەسیان نەیانویستووە لێی لابدەن. بڵباسەکان لەجێی خۆیاندا مل بۆ دەسەڵاتی کەس نادەن، ئیتر ئەگەر تورکیا بێ، یان ئێران. بەڵام کە

لەناو بڵباسەکاندا خەڵکی گوندنشین، یان دەست و پێوەندیش هەن، مافی بیروڕا دەربڕینیان نییە لە کاروباری هۆزەکەدا و هۆزەکەش بەچاوێکی سووك سەیریان دەکەن، ئەمجۆرە کەسانە لەهەموو ناوچەیەکی کوردستاندا هەن و ئەمانە نە سەر بەخێڵێکن و نە سەر بەتیرەیەکن. خەڵکی ناو خێڵەکانیش بە (کلاوسپی) و (گۆران) ناویان دەبەن. ئەم ناوەی دواییان نازناوی ڕاستەقینەی خەڵکی (سنە)یە وخێڵەکییەکان بۆ لاقرتی و توانج گرتنە خەڵکی ترسنۆك بەکاری دێنن. ئەی ئەمانە خۆیان لەبنەڕەتدا دانیشتوانی وڵاتەکە نەبوون و خێڵە شاخاوییە هارەکان بەسەریاندا زاڵ بوون؟ هەندێ خێڵی پەرەوازەش هەن، سەر بەفەرمانداریێتی سنەن، بەڵام خەڵکە دانیشتووەکە هەر هەموویان گۆرانن(١٢٣).

لەناو بنەماڵە فەرمانڕەواکانی کوردستاندا بنەماڵەی (بەهدینان)یش هەیە، کە پایتەختەکەیان (ئامێدی)یە(١٢٤)و لە بنەماڵەی هەرە خانەدانەکانن، چونکە نەوەی خولەفاکانیشن(١٢٥)و لای خەڵکی زۆر پیرۆز و بەڕێز و مەزنن. بەڵام لەبەرئەوەی ناوی بنەماڵەکە ئەوەندە کۆنە، ڕەنگە هی سەدەی پێش خولەفاکانیش بێ، کەسیش پڕکێشی ناکات لەو سەبیل و گڵێنانە بەکاربهێنێ، کە میری بنەماڵەکە بەکاری دەهێنێ، تەنانەت قەننەدارەکەش کە داوای قەننە داگیرساندنی لێدەکات، ناوێرێ وەك ئەو بەکاری بهێنێ. میر خۆیشی ئەوەندە پیرۆزە، لە سەختترین شەڕیشدا، کاتێ لە خێڵەکان نزیك دەبێتەوە، یەکسەر چەك دادەنێن، لەگەڵ ئەوەشدا دەسەڵاتی لەناو ئەو خێڵە سەرسەخت و شەڕکەرانەشدا نییە، کە دەست و پێوەندەکانی پێك دەهێنن، یان کەمە. بەروبوومی زەویوزارەکانی خۆیشی کۆناکاتەوە، بەڵام هەرکاتێ بیەوێ بۆ هەر شتێ پارە کۆبکاتەوە، سواری هێسترەکەی دەبێ و

---

بۆ (قەرەجوق) دێنە خوارەوە - و چەندساڵێکە وازیان لەمەش هێناوە - وەك باج، هەندێ سەر مەڕ بۆ بەگ دەبەن. چەکیان یەکجار زۆرخۆشدەوێ. زۆر لە گەورەکانیشیان جبەخانەی تەواوی خۆیان هەیە.

١٢٣- بڵباسەکان چارەسەرێکی سەیریان بۆ زامداربوون هەیە. زامدارەکە دەخەنە ناو پێستە گایەکی گووراوەوە و پێوەی دەدوورن و هەر سەری بەدەرەوە دەبێت تا پێستەکە بۆگەن دەکات - دەڵێن ئەمجۆرە چارەسەرە هەمیشە سەردەگرێ و چارەی گۆشتەوزوونکردنی گەورەترین زامی نێزە و شمشێریش دەکات.

١٢٤- ئامێدی: خەڵك بە (عەمادیە) دەڵێن (ئەك بادان)، یان (ئەك بەدەن)... بەسەر چیایەکەوەیە و نزیکەی (١٠٠٠) هەزار ماڵی موسڵمان و (٢٠٠) دووسەد ماڵی جوولەکە و (٥٠) پەنجا ماڵە دیان و هەندێ خانەوادەی (یاقوبی) و (ئەرمەنی) تێدایە. (ئێستا کورد، بە (عەمادیە) دەڵێن (ئامێدی) و بە (عەقرە)ش دەڵێن (ئاکرێ) - ع).

١٢٥- پێم وایە (زورو ئاستەر) خەڵکی ئامێدی بووبێ.

شەوانە بەسەر دەست و پێوەندەکەیدا دەگەڕێ و هەر شەوەی لای سەرۆك خێڵێك لادەدا و ئەویش لەبەر شەرمی میوانداریێتی، ناتوانێ دەست بەڕووی داواکەیەوە بنێ و بۆ بەیانی، کە میوانەکەی خەریك دەبێ بڕوات، شتێ پارەی دەداتێ.

ئەم میرە وەك دوایین خولەفاکانی عەباسی هەڵسوکەوت دەکات بەوەی بە گۆشەگیریی ڕۆژ بەسەردەبات و گزیرەکەی کە خواردنی بۆ دەبات، جێی دەهێڵێ، تا تەواوی دەکات، کە تێریش دەخوات، ئەو خواردنەی لێی دەمێنێتەوە، ڕوەکەی تەخت دەکاتەوە، تا کەس نەزانێ لە چ لایەکییەوە لێی خواردووە. ئینجا گزیرێك بانگ دەکات بۆئەوەی خواردنەکە لابەرێ و مەسینە و دەستشۆری بۆ دەهێنێ و پاش ئەمەش قەننەی بۆ دەهێنن و جێی دەهێڵن. میر لە جلوبەرگ لەبەرکردندا، ڕێکوپێکە و لە شێوەی مووسڵییەوە نزیکە و فێستیش لەسەر دەنێ و لەسەر ئەم فێستەشەوە شاڵێکی کشمیریی تێوە دەئاڵێنێ، هەرکاتێکیش بیەوێ ئەنجوومەنەکەی کۆبکاتەوە، کەهیا(١٢٦)،یان سەرۆکی وەزیران، لە شێوەی ئێرانییەکان، دێتەلای و بەچەمینەوەوە سڵاوی لێدەکات و بۆ ڕێزگرتن کەمێك دوور لەولایەوە دادەنیشێ. دوای ئەمیش سەرۆك هۆزی (مەزوری) بەهەمان شێوە دێتە ژوورەوە و لە تەنیشت سەرۆك وەزیرانەوە دادەنیشێ. ئینجا ئەو سەرۆك هۆزانەی تر دێنە ژوورەوە، کە بەپێی پلەوپایەی هۆزەکانیان لەو جێیە نیشتەجێن کە میری لێیە(١٢٧)، ئیتر میر فەرمان دەکا قەننە ئامادە بکەن و بۆ ئەمەش لە قەننەدارەکە زیاتر، کەسی تر نایەتە ژوورەوە بۆ دابەشکردنی، بەڵام ئەگەر میر بیەوێ دیوەخانەکە چۆڵ بکات، قاوەچییەکە بانگ دەکات، قاوەچییەکەش لە پەنجەرەکەوە سەیردەکات و بەپێی ژمارەی دانیشتوان فنجان تێدەکا، ئەوسا لەسەر سینییەك بەڕیز بە دیوەخاندا دەیگێڕێ، دوای قاوە خواردنەکە، جگە لەوانەی میر خۆی دەیەوێ بۆ وتوویژ لەبارەی هەندێ کاروبار لەگەڵیاندا بمێننەوە، ئەوانیتر هەموو دەڕۆن. گەورەیی شان و شکۆی میرانی بادینان لەوەدایە بەپێی توانا خەڵوەتنشین و گۆشەگیرن، بەڵام میرانی بابان بەپێچەوانەوەیە. چونکە وا پێویست دەکات ئەوەندەی پێی بکرێ بێتە بەرچاو و ناو خەڵك، لەبەرئەوە من پێم وایە ئەوەندەی کات بۆ خۆی بۆ نامێنێتەوە، تا تیایدا بحەسێتەوە.

---

١٢٦- کەهیا: کوێخای ئێستای سەرۆك هۆزی (نی رووی)یە. (ڕاستییەکەی (نەروە)یە-ع).

١٢٧- هەندێ لە سەرۆك هۆزەکان هەمیشە لە ئامێدی دەژین، یان لەهەر کوێ بێت، ئەوانیش لەوێ نیشتەجێن. بەڵام هۆزەکانی تر، ناوبەناوێك هەر سەرۆکەکانیان بۆلای میر دەنێرن، لەگەڵ هەندێ دیاریدا. هەر ئەوانەش ئەمە دەکەن، کە ڕێزێکی تایبەتیان بۆ میر هەیە.

هەندێکیش لە میرانی بادینان بەتایبەتی میری ئێستای بادینان ئەوەندە لە گۆشەگیریی و خۆچەپەك گرتندا پێ دادەگرێ، بەجۆرێ بۆ سەفەرێك رووپۆشێك بەسەر خۆیدا دەدا، تا لەچاوی پیس بەدووربێ.(١٢٨)

ئەمەش خوویەکی دوا دوای خولەفاکانی عەباسی بوو، وەك (بنیامین ئەلتەیولی) دەیگێڕێتەوە، جلوبەرگی ئەفسەر و دەستودایەرەی میری بادینان لەجبەیەکی رەش پێك دێت، سوورمەچنە و لە مووسڵ دروست دەکرێ، شەرواڵەکانیشیان میلمیلێکی رەنگاورەنگە، ئەم جۆرە جلە، ئەو جلوبەرگەیە کە لە ئامێدی و جۆلەمێرگ باوە، میر کاتێ بۆ راویش دەچێ، لەنزیك راوەکە، لای ئامێدی جلەکانی دەگۆڕێ و جلی شاخاوی خەڵکە رەشۆکییەکە لەبەردەکات، چونکە بەشاخدا سەردەکەوێ و لە زەویشدا بۆچوونە پارێزی دەرکەوتنی بزنەکێوی خۆی بەدەمدا دەدا و ئاگاداری ئەوەش دەکات کە نێچیرەکەی لە چوار ساڵان کەمتر نەبێ، لەبەرئەوەی خەڵکی شارەزا، بەئاسانی لە دوورەوە، بە شاخەکانیدا تەمەنی بزنەکە دیاری دەکەن. ئەمجۆرە راوەش بە داو و تەڵە و نیشانە لێگرتنەوە دەکەن و راوەکەیشی بە (باز) دەکەن، کە ئەمە لە ناوچەی ئامێدی دا تاقە وەرزشێکی باوە، چونکە شاخاوییە و راوی بەئەسپەوە تیا ناکرێ.

ئامێدی لە هاویندا هەواکەی گەرمە و نادروستە، بۆیە دەچن بۆ ئەو هاوینەهەوارانەی کە نزیکەی دووسەعات و نیوێك لە شارەوە دوورە و دەکەونە سەر ئەو بەرزاییانەی بەدرێژایی هاوین بەفریان پێوەیە. میر لەم کوێستانانەدا خانووی خۆی هەیە، کە خەڵکی تریش ساباتی تیا هەڵدەدەن. لەکاتی ئەم کوێستان کردنەدا، پاسەوانی بەهێز بۆ پاراستنی ساباتەکان، لە هێرشی (تەیارییەکان دادەنرێن، کە هۆزێکی سەربەخۆی (دیان)ی کلدانییە(١٢٩) و موسڵمانەکان هەموویان لێیان دەترسن.(١٣٠)

---

١٢٨- بەڵکو بەپێچەوانەی ئەمەوەیە و دەڵێن بۆئەوە دەموچاویان دادەپۆشن، تا چاویان بەشتی پیس و حەرام نەکەوێ، هەندێ سۆفی، یان بە واتەیەکی تر، هەندێ لەوانەی شتی لەڕادەبەدەریش دەکەن، پەیڕەوی ئەم شتە دەکەن-ع.

١٢٩- ئەم هۆزانەی دیان لەڕووی جوگرافیەوە لە سنووری ناوچەی (هەکاری)دا نیشتەجێن.

١٣٠- ((حەننا)) مەترانی ئاسوورییەکانی مووسڵ، کە بە (دیانی نەستوری) ناویان دەهێنێ، ناوی ئەم هۆزانەی پێ وتم:

تەیاری و تکوب، جەلودی - نەك لێ وینی - نەرووی - بەرواری، هۆزی نەرووی و بەرواری لە موسڵمان و دیان پێکهاتووە. بەڵام ئەوانی تریان هەموویان نەستورین. چوار گوندی تریش لە نزیك ئامێدی هەن، ئەو

جگە لە بنەماڵەی بادینان، بنەماڵەیەکی کۆنی تریش هەیە، کە پێشتر خاوەن هێز و دەسەڵات بوون و فەرمانڕەوایی گەلێ ناوچەی کوردستانیان کردووە. بنەماڵەی (بۆتان)یش کە دەسەڵاتداری ناوچەیەك بوون، هەر بەوناوەوە ناونراوە، بنەماڵەیەکی خانەدان بوون، بەڵام ناوبانگ و دەسەڵاتیان زۆر کەمتربۆتەوە. پایتەختی ئەم بنەماڵەیە (جزیرە) بووە، کە ئێستا هەر کەلاوەیە. ناوچەی (تور)یش دەکەوێتە نێوان (جزیرە و ماردین)ەوە، بەڵام لێیان جیایە و سەربەخۆیی خۆیشی هەیە.

بنەماڵەی (سۆران)یش لە بنەماڵە کۆنەکانە و رۆژێك لە ڕۆژانیش، نەك هەرتەنیا لە بەهێزترین بنەماڵەکانی کوردستان بووە، بەڵکو هەموو ناوچەی سۆرانیان بەدەستەوە بووە، پایتەختەکەیشیان (حەریر) بووە، کە ئێستا شوێنەواری ئەو بنەماڵەیەی تێدا دیارە و خانووسازییەکەیان لەسەر شێوەیەك بووە، لە هەموو خانووسازییەکانی سەردەمە جیاجیاکانی کوردستان پێشکەوتووتر بووە. ئەم بنەماڵەیە ئێستا پووکاوەتەوە و، لەجێی ئەوان، بنەماڵەی بابان و چەندان بنەماڵەی تر، لە ناوچەکەیاندا بڵاوبوونەتەوە، کە کاتی خۆی بنەماڵەکە هەموو سەرکردەکانیان دەرەبەگ بوون و بە فەرمانی سۆرانییان کۆدەبوونەوە.

بنەماڵەی (کۆیسنجاق)یش کە فەرمانداریێتی کۆیسنجاقیان بەدەستەوە بووە، هەر بەشێك بووە لەم بنەماڵەیە و پاشان لە (کۆی) دەرکراون و لەجێی ئەوان دەسەڵاتدارێتی بابان لەوساوە بەڕێوەی دەبات.

بابانەکانیش کاتی خۆی سەرۆك و دەرەبەگەکانی پشدەر بوون و بە فەرمانی سۆرانییەکان کۆدەبوونەوە و پایتەختەکەیشیان (دارشمانە) بووە، کە ئێستا گوندێکی پیسە و هەر هەژدە ماڵێك دەبێ. بنەماڵەی بابان لەکۆندا، زۆر لە ئێستا گەورەتر و بە دەسەڵاتتربووە، بەتایبەتی پێش ئەوەی سلێمان پاشا فەرمانداریێتی بەغدا بەدەستەوە بگرێ. سنووری دەسەڵاتیان تا لای (زەن کەباد) و (مەندەلی) و (بەدران) و (جەسان) دەڕۆیشت و (ئاڵتون کۆپری - پردێ) و (هەولێر)یش هەر لەژێر دەسەڵاتیاندا بووە، تەنانەت (سنە)ش ناوچەیەکی کوردیی ئەمان بووە، بەڵام زۆربەی کات بەدەست ئێرانییەکانەوە بووە.

بنەماڵەی (زەهاو)یش زۆر گەورە و خۆشەویست نەبوون و لە ناوچەی خۆیاندا دەسەڵاتی گەورە و زەبروزەنگیان نەبووە.

---

نەستوریانەی تێدان کە دەڵێن (گران مووسایی)ن و کلاوی لبادیان لەسەردایە - پەراوێزەکە دوایی هات - ناوی تەواوی ئەم هۆزانە، ئەمانەیە: (تخوما، نەك تخوب و چی لوو - نەك جەلوودی، لی ون- نەك لی وی نی و نەرو، نەك نەرووی و گرامون - نەك گران مووسا- ع.

## ١٦ای تەمووز

دوای راوێژ و پرسێکی زۆر، ناوچەی (قزڵجە)مان بەچاکترین شوێن زانی بۆئەوەی لە گەرمای ڕۆژانی داهاتوودا بیکەین بە هاوینەهەوارمان، چونکە هەستمان کرد تا دێت گەرما لەناو سلێمانی دا زۆرمان بۆ دەهێنێ، بۆیە بڕیارمان دا سبەینێ بچین بۆ ئەوێ. ئەمڕۆمان بەخۆکۆکردنەوە و ئامادەبوون و ماڵاوایی کردن لە میر و عوسمان بەگ و سەلیم بەگ و هاوڕێیانی تر بەسەربرد. لەگەڵ میردا باسێکی خۆشمان کردبۆوەوە، کە نزیکەی دوو سەعاتی خایاند و هەموویشی بریتی بوو لە باسکردنی کاروباری تایبەتی خۆی. لەبەرئەوەش کە پیاوێکی زۆر خۆشەویستە، لەناخەوە ئاوات دەخوازم پەژارەی نەمێنێ و بەخۆشی و ئاسوودەیی بۆخۆی بژی. جێهێشتنی هاوڕێیانی سلێمانیمان، بۆ ئەم ماوە کورتەمان، ئازارێکی زۆری داین. هەر بەڕاستیش ئەوەتەی لە ژیاندام، ئەوەندەی ئەمان، میوانداریی و بەخشندەییم لەکەس نەدیوە.

ئەم ئێوارەیە (دەللی سەمعان) (١٣١) لە مووسڵ گەڕایەوە و هەندێ وردە شتیشی لەگەڵ خۆی هێنابوو.

---

١٣١- دەللی سەمعان: یان شەمعونە شێت: دیانێکی ئاسووری بوو، میستەر ریچ چەند ساڵێك بەکرێی گرتبوو، بۆئەوەی وڵاتان بگەڕێ بۆ دراو کڕین و وردە شتی تر بۆی - خاریچ.

# بەشی شەشەم

دەرچوون لە سلێمانییەوە بەرەو چیاکان ـ دەربەندی گۆیژە ـ چادر هەڵدان لە (گەڕەدێ) ـ جوانیی ناوچەکە ـ دەنگەدەنگ و ژاوەژاو، لەکاتی بارکردندا ـ کێوی بەرز ـ دانەوێڵە ـ وڵاتی جوان ـ ئەفسەرێکی گەورەی ناوچەی (قزڵجە) ـ هەندێ هەڵەی پێکەنیناوی ـ سەرکەوتنێکی سەخت ـ کوڕەکانی خالیدبەگ ـ سەربازگەیەك لە (ئەحمەد کولوان) ـ دروێنەوانان گۆرانیی شیرین و فەرهاد دەڵێن ـ کولله ـ پلەی گەرمای کانیاوەکان ـ بۆقی سەوز ـ یارییەکی سەیرـ جێهێشتنی ئەحمەد کولوان ـ سەفەر بۆ (بییستان) ـ گردی تووورەکەڕێژ ـ نادروستیی بییستان ـ نەخۆش کەوتنی هەموو کۆمەڵەکەم ـ جێهێشتنی بییستان ـ پێنجوین ـ هەواری جاف ـ خێڵی کۆچەر ـ خانمێك و گزیرەکانی ـ جوولەکە.

## ١٧ی تەمموز

له سێ و چل دەقیقەدا (سلێمانی)مان جێهێشت و بەڕێی (گۆیژە)دا رۆیشتین، چونکە بۆ بڕینی زنجیرەکە، یان بۆ بڕینی ئەو شاخە رووتانە ئاسانتر بوو، کە لە خۆرهەڵاتەوە بوونەتە سنوور بۆ سلێمانی. گوێژەش ئەو دەربەندەیە کە راستەوخۆ لەوپەڕی باشوورەوە دەچێتەوە بەرزایی زنجیرەکە. لە سەرووترەوە (ئەزمڕ) دێت، کە ڕوودەکاتە شارەکە، یان بۆ شوێن مەڵبەندی (قەڵاچوالان)ی(١٣٢) کۆن. دوای ئەمیش لە سەرووترەوە رێگایەکی تر دێت، پێی دەڵێن رێگای (قەیوان).

کەمێك دوای چوار، گەیشتینە دامێنی چیاکان، لەوکاتەشەوە کە لە سلێمانی دەرچووین، تا دەهات لەسەرخۆ سەردەکەوتین، لەسەرەتادا سەرکەوتن یەکسەر لە چەمێکی وشکەوە دەستی پێکرد، پاشان بە لاپاڵە کووڕەکاندا بەرێگایەکی یەکجار باریکدا هەڵگەڕاین، زۆریش بەرزبوو، لە نزیك پێنجدا گەیشتینە سەر لووتکەکەی، کە لێرەدا بریتی بوو لە ریزە تەمۆخێك، دەلکایەوە بە دوو باسکی بەرزی شاخەکەوە، کە ئەمان پتەوتربوون. لێرە لووتکەکە، هەرچەندە پێیەك لێیانەوە بەرز دەبوو، بەڵام دیمەنێکی جوانی هەبوو، چونکە دەشتی (سرۆچك) و (شارباژێڕ) لەبەردەماندا بوون، دەڵێم: دەشت، بۆئەوەی لە شاخەکانی جیا بکەمەوە، ئەگینا لەم دەشتەدا جێگەیەکی تەخت نەبوو. ئەم دەشتە، لای راست، یان لای باشوورەوە، بە دەربەندێك کۆتایی دەهات، کە لە خۆرهەڵاتەوە شاخی بەرز ببووە سنووری، لەوکاتەشدا کە خۆر لەپشتیەوە هەڵهاتبوو، پێدەشتەکە وا دەهاتە بەرچاو، کە لای باکوریەوە، یان لای ناوچەی (شارباژێڕ)ەوە تەنگتر بێتەوە، ناوچەکە هەمووی سنوور ئامێز و بەشبەش بوو بەسەر دۆڵ و تەنگەی لە ژمارە نەهاتوودا، کە زنجیرە گرد و شاخەکانیانی دەوروپشتیان بۆیان دروستکردبوون و هەندێکیشیان زۆر گەورەبوون. ئەو زنجیرەیەی ئێمە بەسەریدا دەڕۆیشتین لە تەمۆخ پێکهاتبوو، چینەکانی رووەو خۆرهەڵات لێژببوونەوە و لاپاڵەکانی لای خۆرهەڵاتیان دەوەنە بەڕوویەکی زۆریان پێوەبوو، بەڵام ئەو زەویزارەی بەسەریدا دەمانڕوانی، وەك لێمان دیاربوو، بەجۆرێ گژوگیایان تێدا بڵاوببوەوە، دڵی دەکردەوە. پاشان رووەو باکوور بەلاپاڵی کێوەکانی بەری خۆرهەڵاتدا شۆڕبووینەوە، لێژاییەکەی لەچاو کووڕاییەکەیدا زۆر لێژ نەبوو. لە شەشدا گەیشتینە دامێنی کێوەکە، کە سەرکەوتنمان سیی و پێنج دەقیقە و هاتنەخوارەوەشمان سەعاتێك و دە دەقیقەی خایاند. سەمتی رێکردنی ئەمڕۆمان (٥٠) پلە رووەو باکووری خۆرهەڵات بوو.

---

١٣٢- لە دەقەکەدا بە (قەرەجوالان) هاتبوو، راستییەکەی (قەڵاچوالان)ە-ع.

پاش ئەوەی لە گەروویەکی تەنگەبەرمان دا، بە گوندێکی بچووك گەیشتین، ناوەکەیم نەپرسی. پاشان گەیشتینە گوندی (بناویلە)، کە لەولای کانیاوێکی جوانەوە بوو، ژمارەیەکی زۆری (سوورەماسی - Carp)مان تێدا بینی، ماسییەکان ماڵیی بوون، چونکە لادێییەکان ئازاریان نەدەدان، ئێمەش هەندێ وردە نانمان بۆ تێکردن، قۆستیاننەوە. لەو گۆماوەدا کە کانییەکە دروستی کردبوو. چنارێکی جوان و هەندێ سوورە چنار و بیی لەملاولایەوە هەبوون. ئەم جێگایە (قەرەحەسەن)ی بیر هێنامەوە...

کوردەکان راست دەکەن کە دەڵێن (سلێمانی) لە خراپترین جێگای کوردستاندا دروستکراوە. ئەم گوندە و زەویزارەکەی کە کەوتوونەتە لای خواروویەوە، سەر بەناوچەی (سرۆچك)ن، بەڵام ئەوانەی لای باکووری خۆرئاوایەوە، هی ناوچەی (قەڵاچوالان)ن.

دوای ئەوەی لە سێبەری چنارە جوانەکەدا قاوەیەکمان خواردەوە، لە شەش و چل دەقیقەدا سواری ئەسپەکانمان بووینەوە و لەسەرخۆ بەسەر زەوییەکی پڕ کەندولەندا دەستمان بەڕۆیشتن کردەوە، پاشان لە گردێکی نزم شۆڕبووینەوە و لە حەوت و نیودا گەیشتینە هەوارەکەمان لە گوندی (گەڕەدێ)، لەوێ سەیرمان کرد چادرەکانمان هەڵدراون، چونکە زوو مشووریم خواردبوو، هەر دوێنێ شەو لەگەڵ کەلوپەلەکاندا ناردبوومن، زۆر بەگرانیش لە شاخی گۆیژەیان دابوو، دوو و سێ هێستریان بەبارەوە هەڵدێرابوون، بەڵام ئەوەی باش بوو شتێکی وا گرینگیان بەسەر نەهاتبوو.

(گەڕەدێ) لە جێگایەکدایە، دارستانێکی گوێز و بیی و سوورەچنار، دایان پۆشیوە، چەمێکی زۆریش بەشیوەکانیدا دێتەخوارێ. هەر بەڕاستیش ئەم ناوچانە هەر کانیاویان زۆرە، کە ئەمڕۆ بەدەم ڕێکردنمانەوە، دوای ئەوەی لە (گۆیژە ) هاتینە خوارەوە، بەلای کانیاوێکی زۆردا تێپەڕبووین. (گەڕەدێ)، سەر بەناوچەی (شاربازێڕ)ە، دڵیشم بە دیمەنەکەی زۆرکرایەوە، چونکە سێبەری دارەکانی و خوڕەی چەمە بچووکەکانی و خوێندنی (بۆقژە) و (شالوور)، هەموویان کۆمەڵێك هۆ بوون، کە گوندەکەیان ئەوەندەی تر جوان و پاراو کردبوو.

سەرلەبەیانی ئەمڕۆ لە سەعات چوارەوە، کە لە سلێمانی دەرچووین، هەوا گەرم بوو، لای باشووریشەوە (با) هەبوو، کە لە زنجیرە شاخەکەش نزیك بووینەوە، شەپۆلە هەوایەکی گەرم دایگرتین، دەتوت لە تونێکەوە دێت، بەڵام کاتێ گەیشتینە سەر ترۆپکەکە، هەستمان کرد لە کەشوهەوایەکی تر داین، لەوەی پێشوو جیاوازترە، لەبەرئەوە دەمانتوانی سەعاتێك یا دوو سەعاتی تریش ڕێ بکەین، بەبێئەوەی گەرما بێزارمان بکات.

گەرما، لە دووی نیوەڕۆدا (٩٩) پلە و لەدەی شەودا (٧٥) پلەبوو. پێیان وتین ئەو ڕێگایەی لەبەرمانە، نالەبار و سەخت و سەر بەرەو خوارەکانیشی زۆر لێژن. لە هەندێ شوێنی شاخاویشدا تەنگەبەری وایان تێدایە بۆئەوە نابێ دوو وڵاخ بەپاڵ یەکەوە پیایدا تێپەڕبن، لەبەرئەوە ناچاربووین لەم سەفەرەماندا دەستبەرداری تەختەڕەوانەکە و کەژاوەکان بین و لە سلێمانی لەدوای خۆمان جێیان بهێڵین، بەڵام هەر دوێنێ شەو، کارەکەرەکان بەسواری ئەسپ لەگەڵ چادر و کەلوپەلەکاندا ناردبوومانن. هاوسەرەکەشم بەسواری ئەو ئەسپە بچووکەوە لەگەڵمان هات، کە (عوسمان بەگ) بەدیاری دابوویە. لەو شاخانەش کە بەسەریەوە بوو، جێی سەرسوڕمانمان بوو.

ئەمڕۆ (عومەر ئاغا)ی میواننەوازمان، پیاوێکی خۆی بانگ دەکرد، ناوی (پەرویز) بوو، پێمی وت ئەم ناوە و ناوی تری وا کۆن، هێشتا لەناو خێڵاتدا هەر باوە، وەك: خوسرەو، کوباد، بەهرام، پەرویز، پەریزاد. بۆ یەکەمین جاریش بوو لە کوردستاندا، لەم گوندە گوێمان لە دەنگی قومری بوو.

دوای نیوەڕۆ بەلاپاڵی چەمەکەدا چووینە پیاسەیەکی خۆش، بەناو ڕیزە درەختی سوورە چنار و سنجوێ و گوێژ و بیی و ناو رەز و باخی هەڵووژە و قۆخ و توو و هەنجیردا. دار زەیتوونێکی سەوز و جوان و کانیاوێکی زۆری بچووکیشمان بینین، لەو لاپاڵە لێژەوە هەڵدەقوڵێن.

## ١٨ی تەمووز

دوێنێ شەومان فێنك و سازگار بوو، بەڵام زۆرکەم تیایدا خەوتین، چونکە هێشتا نەببووە نیوەشەو. کە دەنگەدەنگی ناخۆشی کۆمەڵەکەمان لە هەموو لایەکەوە بەدەم بارکردنەوە دەستی پێکرد، دەنگە دەنگێك، کە ژاوەژاوەکەی لە هەراکەی (بابل) بڵندتربوو، بەجۆرێ کە ئیتر نەیهێشت خەو بچێتە چاومان. لەم وڵاتانەدا کارێك نییە، بەبێ هات و هاواری وا ئەنجام بدرێ، کە هەرگیز لەگەڵ ئەنجامدانی کارەکەدا ناگونجێ. وا دیارە لەو کاتانەدا کە وڵاخدارەکان دەست دەکەن بە جنێودان و بانگکردنی یەکتری و هاوار هاوار، وڵاخەکانیش بخرۆشێن و بەشداری دەنگەدەنگەکە بەوە بکەن، بەپڕمە و زەڕین و حیلە و جووتە وەشاندن، تا بارکردنەکە تەواو دەبێ و کاروانەکە بەڕێ دەکەوێت.

دوێنێ عومەر ئاغا، بۆ ئەنجامدانی هەندێ کاروباری خۆی، بۆ سلێمانی گەڕایەوە، ناشگەڕێتەوە لامان، تا ئێمە دەگەینە چادرگەکەمان.

لە چواردا دەستمان بەڕۆیشتن کردەوە و بەو بەرەو ژوورەکەیەیدا هەڵگەڕاین، کە بۆ چەمەکە لێوەی داگەڕابووین، پاشان بەرەو خۆرهەڵات، روومان لە گردەکان، یان بەواتەیەکی تر: کێوەکان کرد، کە وەك لێمانەوە دەرکەوتن، شایانی ئەم ناولێنانە بوون، ئەم کێوانە لە گۆیژەوە، یان لە زنجیرەی ئەزمڕەوە، بەشێوەیەکی کەوانەیی لە پشتمانەوە، درێژدەبنەوە و لە هەندێ شوێندا، بڕ دەبن بۆئەوەی لای چەپمانەوە هەمان زنجیرە دروست بکەنەوە. پێدەچی لەم سەمتە تازەیەیدا وردە وردە نەمێنێ. راستەوخۆش لای چەپمانەوە، لە دووریی سێ و چوار میلێکەوە کێوی (سەرسیر)(١٣٣) دیارە، کە بەشێکی جیایە لەو شاخانەی باسمان کردن.

ئەوڕەحمان پاشا زۆر پەرۆش بوو پایتەختی میرنشینەکەی بۆ ئەم کێوە بگوێزێتەوە، چونکە دابڕابوو، بەرگری لێکردنیشی ئاسان بوو، گەیشتنە سەر ترۆپکەکەیشی هەر تەنیا بە یەك رێگادا دەبوو، بەڵام ئاوی زۆری سەرکێوەکە بووە رێگر لەبەردەم ئارەزووەکەیدا.

لە چوار و نیودا بەبانێکدا تێپەڕبووین، شیوێکی بچووك دەکەوتە لای چەپیەوە، یەکێکی تریش دەکەوتە لای راستیەوە، پان و قووڵتریش بوو، کە چەند گوندێکی لە ئامێزدا بوو، هەڵکەوتی وا بوو بەرەو خۆرهەڵات و خۆرئاوا درێژ بوویێتەوە، بەڵام کۆتاییەکەی گەردەنەیەك لەبەریدابوو، کە لە شیوێکی تری وەك خۆی جیای کردبووەوە، بەڵام تەنیشتەکانی لای باشووری ئەم دوو شیوە، یەکسەر هەڵدەکشانەوە و کێوێکی بەرزیان پێکهێنابوو، رێگاکەشمان وردە وردە سەردەکەوت، زەوییەکەیشی سەرومڕ دەوەنە بەڕوو داپۆشیبوو. لە پێنجدا سەرکەوتینە سەر زوورگێك، لە چاڵاییەکی رێك وەك گەردەنەکەی بەرامبەریدا، یان تەنیشتی خۆرهەڵاتی ئەو شیوە وابوو، کە لای راستمانەوەبوو.

---

١٣٣- لە بنچینەدا (ساردەسیر) بوو، کە بەرامبەرەکەی (گەرمەسێر)ە، بەڵام کورت بۆتەوە و بۆتە (سەرسیر). (چوارتا)، کە مەڵبەندی ناوچەی (شارباژێڕ)ی ئێستایە، دەکەوێتە سەر لاپاڵی خۆرئاوای شاخی (سەرسیر)ەوە، کە ئێستا لە سێ ڕێگاوە دەتوانیت بۆی سەرکەویت. ئاسانترینیان و درێژترینیان ئەوەی لای خۆرهەڵاتیانە، کە لە خۆرئاواوە بەپێچاوپێچ بۆ بەرەو ژوور و خۆرهەڵات و باشوور سەردەکەوێ و بەناو داری بەڕوو و هەندێ ڕەزدا تێپەڕ دەبێ. بەڵام ئەوەی خۆرئاوایان نزمە و بەدۆڵێکدا دەڕوا و پاشان سەردەکەوێتە سەر شانێکی دابڕدابڕەوە، کە کانیاوێکی زۆر لەسەر ڕێگەکە دایە. ئەوەی لای باشووریش پێدا سەرکەوتنی سەختە و لێی نادرێ، مەگەر لەکاتی پێویستدا، یان زۆرجار شوان پیایدا دەڕوات. گەڕۆکیش لە تەختایی سەرگردەکەوە، بەڵکو لە بانووکەیەوە ئاسەواری خانوو دەبینێ، کە هاوینەهەواری بابانەکان بووە. بانووەکەیشی پڕە لە درەختی میوەی کێوی، وەك هەرمێ (کرۆسك) - ع.

هەر لێرەوە دەتوانم بیرێك لەسەر هێڵە گشتییەکانی ئەم ناوچەیە گەڵاڵە بکەم، کە خراپ نەبێ: (گۆیژە) و (ئەزمڕ) لای سەرەوە کۆتاییان دێت و پێش ئەوەش ئەزمڕ کۆتایی دێت، یان لە دامێنییەوە (گودرون) دەست پێدەکات. دۆڵی (مێرگەپان)یش، یان شیوەکەی دەکەوێتە نێوان ئەم دوو شاخەوە، بەڵام شانی لای راستی لە لێژاییەکەی قووتترە. رێگاکە سەرەوخوارکە و ژوورکە و لە هەندێ جێگاشدا چەم و دۆڵ دەهاتەبەری. لاپاڵی گردەکانیشی رەز داپۆشیبوون. هەندێکیان بەجێی وا بەرزەوە بوون، دەتوت هەڵواسراون، کە بێگومان ناشتنیان هەر بۆ ئەو جۆرە کەسانە دەبێت کە بەگوریس بۆی سەردەکەون و وەك ئەوانەی (شمر= گیای زەریا)(١٣٤) کۆدەکەنەوە.

کشتوکاڵی ئەم ناوچانە بریتییە لە رەز و تووتن. بەلای هەندێ مەزرای دانەوێڵەشدا تێپەڕین، هێشتا دروێنە نەکرابوون، بەڵام داربەڕوو، ئەوە لە هەموو جێگایەکدا هەر زۆرە و لە گوێ چەمی بچووك و هەموو دۆڵێکدا هەیە. لە زۆر شوێنیش ترێ کێویلە لەناو بییدا هەیە، بەڵام ترێ هێشتا پێنەگەیشتبوو.

لە شەش و بیست دەقیقەدا بۆ حەسانەوە لای گۆڕستانێك دابەزین و لەژێر سێبەری دار بەڕوودا لاماندا، چونکە تەندروستیم تەواو نەبوو، ئەم شوێنەش کە لێی دابەزیبووین، چەمێك بوو، چەند جۆگەیەکی دەهاتەسەر و دەبوونە چەمێك، دەڕژایە (تان کووزی)یەوە(١٣٥) ئاوەکەی زۆر خوڕبوو، یەکێك لەم جۆگایانە ئەگەرچی تاڤگەیەکی جوانیش نەبوو، ئاشێکی دەگێڕا.

لەسەر ئەو زوورگانە گڵەسپییەکی زۆرمان دی، لە گشت خولەکانی پێکهاتنیدا بوو، هەروەها بەردەئەستێیەکی زۆریشمان دی. بەڵام چینەکانی زوورگەکان بەگشتی وەك دیار بوون، روویان لە خۆرهەڵات کردبوو. لاپاڵەکانی بەری خۆرئاوای زوورگەکانیش یەکجار لێژبوون.

دوای ئەوەی تاوێ ماندوومان حەسایەوە، لە حەوتدا دەستمان بەڕۆیشتن کردەوە. رێگاکەی رووە و باکووری خۆرهەڵاتمان شتێکی وای نەمابوو. لە حەوت و بیست دەقیقەدا لە چەمی (تان کووزی)مان دا(١٣٦)، کە ئەوکاتە پانابییەکەی سێ و چوار یاردە و قووڵاییشی پێ و

---

١٣٤- پرسیارێکی زۆرم لەبارەی ئەم رووەکەوە کرد، مامۆستایەکی شارەزا و نووسەر (ك.ج.غ) لە سلێمانییەوە، بۆمی نووسیبوو، کە رەنگە (رازیانە) بێت-م.

١٣٥- ئەم ڕووبارە پێی دەڵێن (سیوەیل)، بەڵام وشەی (تاووق گۆزی)، نەك (تان گوزی) ناوی ناوچەیەکە دەکەوێتە باشووری خۆرئاوای (هەڵەبجە)وە و لەبەری لای چەپی ڕووباری (سیروان - دیالە)یە-ع.

١٣٦- بێگومان دەبێ نووسەر بەوە مەبەستی لە (زێی بچووك) بێت - ع.

نیوێك دەبوو، بەشێوەی رێڕەوەکەیدا لەوەدەچوو دەبێ لە هەندێ کاتدا هەڵسێ و ببێتە سێلاوێکی خوڕ، کە لە باکوورەوە دەهات. بێگومانیش دەبێ رووە و (کۆپری)، یان رووباری (ئاڵتون)(١٣٧) بچێت، ئەمە گەورەترین چەمێکە کە هەموو ئاوەکانی ئەم بەشەی کوردستانی تێدەڕژێ. لە رۆخی چەمی (تان کووزی)یەوە یەکسەر بە بەرزاییەکی کووڕدا سەرکەوتین، ئەگەرچی خێراش دەڕۆیشتین، بەڵام پێداهەڵگەڕانی نیو سەعاتی خایاند. لای راستیشمانەوە چەمی (تان کووزی) گەروویەکی بۆ خۆی لەو ناو کێوانەدا دروستکردبوو. هاتنەخوارەوەشمان کە لەپڕێکدا دەستی پێکرد (دوای ئەوەی بانەکەمان بڕی) نیو سەعاتی پێچوو، بەڵام لێژییەکەی زۆرتر و لەچاو کووڕایی سەرکەوتنیدا پلەپلەتربوو. لەبەرئەوەی دەبێ ئاستی بەرزایی ئێستامان زۆر بڵندتر بێت. ئیتر لێرەوە بەو زوورگە پێچ و پڕ لە بەرووەدا، تاوێ شۆڕ دەبووینەوە و تاوێکیش هەڵدەگەڕاین.

لە نۆ و چل دەقیقەدا پاش ئەوەی لە رێگاکەمان وەرسووڕاینەوە و بەرەو باشوور شۆڕبووینەوە و چەند دەقیقەیەکی تریش رێمان کرد، گەیشتینە گوندی (دۆڵە درێژ)، کە بە مانای دۆڵی درێژە.

سەرباری ئەوەش کە تەندروستیم تێکچووبوو، بەڵام خۆر بێزاری نەکردم، لە دووی دوای نیوەڕۆدا، کە قرچەی گەرمای رۆژە، گەرما ٩٨ پلە بوو، لە دەی شەودا (٧٤ پلە) بوو.

لەپاڵ ئەم گوندەدا (کە قۆناغی شەومان بوو) درەختێکی زۆری بیی، هەنجیر، هەڵووژە و هەروەها رەزی لێ بوو. دانەوێڵەش لە لاپاڵەکاندا هێشتا پێنەگەیشتبوون.

لای راستیشمانەوە بە تەریبی رێگاکەماندا شاخی (کاژاو)، یان (کوڕە کاژاو) بە بڵندیی دیار بوو، کە زۆر لێمانەوە نزیك نەبوو. ئەو زەوییەی ئەمڕۆ بەسەریدا تێپەڕین، خاکێکی شاخاوی جوان دیاربوو، لەملاولاشەوە لاپاڵی بەردینی شاخمان دەبینی. دیمەنی زەویش بەشێوەیەکی گشتی بەردەڵانی و سەخت نەبوو، بەڵکو هەوراز و نشێوبوو.

سەرنجمان دا رێگاکەی ئەمڕۆمان زۆرباش بوو، لە هەموو ئەو رێگایانە چاکتربوو کە لە ئاسیای بچووکدا دیومن. هەندێ دیمەنیشی لە دۆڵەکاندا، کێوەکانی (جورا)یان بەیاد هێنامەوە.

---

١٣٧- رووباری (تان گووزی) هەر هەمان رووباری (قەڵاچوالانە)ە، دێت و بە (قەڵاچوالان)دا تێپــەڕ دەبــێ و پاشان بە رووباری (حەریر) دەگات و دەڕژێتە رووباری (کۆپری)یەوە.

## ١٩ی تەممووز

شەویٚ زۆر ساردبوو، لە چوار چارەکێك کەمدا سواری ئەسپەکانمان بووینەوە. دوای چەند دەقیقەیەك ئەو دۆڵە بچووکەمان بڕی، کە گوندی (دۆڵە درێژ)ی لە ئامێزدا بوو. سەمتی گشتی رۆیشتنەکەشمان رووەو خۆرهەڵات و کەمێك بەلای باشووردا لای دەکردەوە، بەڵام بەدەم سەرکەوتنەوە پێچاوپێچێکی زۆرمان کردەوە، بەڕاستیش رێگاکە جوان بوو، درەختێکی زۆری بەرووی لیٚ روابوو، بەتایبەتیش لەم ناوەدا یەکجار زۆربوو، ناوبەناویش داری ترش و بیی و تریٚ کێویلە و هەنجیرە کێوی(١٣٨)تێکەلٚ بوون. هێشتا دووریش نەکەوتبووینەوە کە تووشی (فەتحوڵا ئاغای ئیشیق ئاغاسی)، یان سەرۆکی تەشریفاتی مەحموود پاشا بووین، کە لە (سنە) دەگەڕایەوە. ئەو رێگەیەی ئێمەی پیایدا دەڕۆیشتین، ئەو رێگا گشتییە بوو، دەچۆوە سەر (سنە). دوای تاوێکی کەم بە ئەفسەرێك گەیشین، یەکێك بوو لە ئەفسەرەکانی (خالیدبەگ)ی گەورەی ئەو ناوچەیەی ئێمە بۆی دەچین، دەستەیەك تفەنگ بەشانی لەگەڵدا بوو، بۆ پێشوازیمان هاتبوو. ئەم ئەفسەرە، کە دیاربوو بەتورکی نادویٚ، وا خۆی بۆ وەڵامی پرسیارەکانم ئامادە کردبوو، کە خۆی چاوەڕوانی دەکرد بەو جۆرەی لیٚ بکەم، بۆیە بووە مایەی لە یەکتر نەگەیشتنێکی پێکەنیناوی. یەکەمین پرسیاریشم لێی ئەوەبوو: (چەندمان لە رێگەکە ماوە؟). وەڵامی دامەوە: (پێریٚ چۆتە سلێمانی)!، تەمس پێی وابوو لەبارەی گەورەکەیەوە پرسیاری لیٚ دەکەم!.

پاش کەمێك بەملەیەکی زۆر کووڕدا هەڵگەڕاین، پێم وایە بەرزترین و سەختترین کووڕاییی بووە، کە تا ئێستا دیومە. دوای ئەوەی چل دەقیقە رێمان کردبوو، لە شەشدا گەیشتینە سەر ترۆپکەکەی. نیو سەعاتمان بەپێداهەڵگەڕانی ستوون ئاسایی تێدا بەسەربرد. لێرەوە ئیتر (کاژاو)مان لێدەرکەوت، لای باکوورەوە بوو. گودرونیش بەسەروگەردنە رووتەنەکەیەوە، بەسەمتی (٦٥) پلە بەلای باکووری خۆرئاوادا، بەسەر هەموو کێوەکانی تردا دەیڕوانی. پاشان یەکسەر بەرێگایەکدا دەستمان بەهاتنەخوارەوە کرد، چاکترین و جوانترین رێگابوو، بەپێچاوپێچ بەناو نزارێکی چڕوپڕی پڕ لە داربەڕوودا تێدەپەڕی، کە لەچاو سەرکەوتنەکەیدا زۆر کووڕیش نەبوو. دیمەنی دەشتەکەش لەبەرزاییەوە زۆر جوان بوو، کە بەناو زوورگە روخسار

---

١٣٨- هەنجیرەتوو = هەنجیرە فیرعەون Cycamore - لەم بەشەی کوردستان نییە، کە بێگومان دەبیٚ میستەر ریچ، مەبەستی لە (هەنجیرە کێویی) بوو بێت - ع.

جوانەکاندا پێچی دەکردەوە و دەوەنە بەڕوو داپۆشیبوون. چیاکانی ئێرانیش دەکەوتنە پشت ئەوانەوە. ئەم چیایانەش دیمەنیان هەرجوان بوو، چەمی (قزڵجە)ش بە پێچ پێچ دەهات و پاشان لای چەپمانەوە دەڕژایە دۆڵێکەوە کە رووی لە باکوور دەکردەوە و بە ناوچەی (سی وەیل)دا دەڕۆیشت و دەڕژایە (کۆپری سو)ەوە، بەڵام سەرچاوەکەی لە ئێراندا بوو١٣٩.

لە نزیکەی چل دەقیقەیەکدا گەیشتینە دامێنی شاخەکە، کە رووی لە باکوور و باشوور دەکرد، لێرەدا رێگاکە دەبێ بەدووڕیانەوە: ئەوی چەپیان روودەکاتە باکووری خۆرهەڵات، بەرەو (بییستان)ی ناوچەی قزڵجە، کە نزیکەی دووسەعاتێك لێمانەوە دووردەبێ، بەڵام ئەوی لای راستیان روو دەکاتە باشوور، بۆ لای (ئەحمەد کولوان)ی جێ قۆناغی پێشنیارکراومان.

لە بناری شاخەکەدا تووشی هەردوو کوڕەکەی (خالیدبەگ) بووین، سەرکردایەتی پاسەوانەکانی ئەویان دەکرد، کە ژمارەیان دووسەد سوار دەبوون بەتەواوی چەکەکانیانەوە، هەندێ لێپرسراویان لە پێشیانەوە بوون، بەخۆیان و داردەستە زیوچنەکانیان و تەپڵە بچووکەکانیانەوە، کە بەڵگەی پلەی سەرۆکە. قزڵجەش، سنجاق، یان پارێزگەیەکە، لە پارێزگاکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، لەکاتی بە یەکگەیشتنی ئەم هێزە و کۆمەڵەکەی ئێمەدا، دەنگەدەنگ و هەراوهاوارێك سازبوو، کەس سەری لێدەرنەدەکرد، مەگەر ئەوانەی کە شەرەفی پێشوازییان پێبڕاوە. ئەسپیش ئاژەڵێکە لە مانای پێشوازیی ناگات، چونکە ئەسپەکانمان لەو ئەسپە نامۆیانە بێزار بوون، کە تێکەڵیان بوون، ئەوانیش هەر وا بوون. ئەسپی کوردیش هەمووی هارن و خێرا دەخرۆشێن، بۆیە دیمەنەکە هەمووی بووە دیمەنی کۆڕژن و پڕمە و هاوار و حیلە و جووتە وەشاندن و شەڕ. لاوە بەگەکە هەوڵی دا بەفارسی بەخێرهاتنم بکات، بەڵام سەرنجم دا ئەسپەکانی کۆمەڵەکەی، لەو باشتر و چاکتری دەکەن، خۆئەگەر ئەسپەکان نەیانتوانیایە ئەم ئەرکە بەجێ بهێنین، چاکتر وابوو لەجیاتی ئەوان، هەندێ لە پیاوەکانی بەسەر بارگیرە پیسەکانیانەوە، کە تیپێکی موزیك، یان (مەهتەرخانە)یان پێك دەهێنا، بەدەهۆڵ و زوڕنا ئەرکەکەیان بەجێ بهێنایە. کاتێکیش ئەم ئەسپانە کشانە دواوە و بێدەنگ بوونەوە. ئێرانییەکی دەنگ گڕ، بەدەم دمبەك لێدانێکی ناخۆشەوە لەمەڕ زۆرانبازیی، دەستی بە گۆرانی وتن کرد، بەگیش هەوڵی دا قسە بکات و قسەکانی دەبینرا و نەدەبیسترا، بۆیە منیش هەر بەو شێوەیە وەڵامم دایەوە...

---

١٣٩- بەڵام سەرچاوەی (کۆپری سو)، لە (لاجان)ە.

بەرەوخوار بەلێواری شیوی زوورگەکەدا، کە قوولّ ببووەوە و وەك پلەپلەی شانۆی لیّ هاتبوو، دەستمان بەرِۆیشتن کردەوە، کاتێکیش گەیشتینە جێیەکی پانتایی، یاری جریدبازی و شەرِەنێزە دەستی پێکرد. ئەگەرچی کورد بەپێی بەرنامەش فێری سواریی نابن، بەلاّم سوارەی ئازان. لەکاتی یارییەکاندا دەهۆلّ و زورِناش لێدەدرا، کە ئەوەندەی تر دیمەنەکەی جوان و خۆش کردبوو. کوردێکیش ئەسپەکەی هەلّیگرت، یەکێکی تریش لەوپەرِی غارداندا خۆی و ئەسپەکەی گلان و ئازارێکی زۆری پێگەیشت، ئەگەرچی زۆریش کاریگەر نەبوو.

لە حەوت و نیودا گەیشتینە شوێنی قۆناغەکەمان لەبناری گردەکاندا، کە ماوەی میلێك لە باکووری خۆرهەلاّتی (ئەحمەد کولوان)ەوە دوور دەبوو. خالیدبەگیش لوتفی کردبوو، هەوارەکانمانی لای کانیاوێکی جوانەوە بۆ دروستکردبووین، کە بریتی بوون لەچەند ساباتێك، جۆگەیەکی بچووك بەنێوانی دووانیاندا دەرِۆیشت، حەوزێکی لەبەردەمدا دروستکردبوو. هەموو ساباتەکەش پەرژینێکی لە لقوپۆپی درەخت بۆ کرابوو، کە ورد و جوان چنرابوو، بازنەی پەرژینەکەش بە تەیمانێکی تر، کرابوو بە بەشی حەوشە و دیوی حەرەم و دیوەخان. لە تەنیشت هەریەکە لە دیوی حەرەم و دیوەخانیشەوە، پەلّەی دانەوێلّە هەبوو، درِۆینەوانانیش هێشتا خەریکی درِوێنەبوون و بەدەمیشەوە گۆرانی (چیرۆکی شیرین و فەرهاد)یان بە شیعری کوردی دەوت.

کورِی دووەمی بەگ مۆلّەتی گەرِانەوەی بۆ (بییستان) خواست، کە پێنج شەش پیاوێکی لەگەلّدا بوو، بەلاّم مەحموود بەگی کورِە گەورەی، لەگەلّ ئێمە مایەوە، بۆئەوەی لە هەوارەکەماندا فەرمانەکەی لە ئەستۆ بگریّ. ئەم شوێنە زۆر دەکەوێتە بەر پەلاماری خێلّە رِێگرەکانی سەر سنوور.

لۆکەی ئەم ناوە، بەهۆی ئەو کوللە زۆرەوەی کە هێشتا بەپۆل بەسەر زەوییەکەدا دەخشێن، زیانێکی زۆری لێکەوتووە، کوللەش هەرچی سەوز نەبیّ نایخوات. کەمێك دوای خۆرئاوا، پۆلە مێشوولەیەکی زۆر و گەورە و زۆر ژەهراویی بێزاریان کردین، شەویش ساردبوو، بەلاّم بەربەیانی ساردتریش بوو، شەونمیش زەوی تەرِ کردبوو، کەچی لەمجۆرە وەرزانەدا لە دەشتی سلێمانی دا شەونم نابینریّ.

## ٢٤ی تەمموز

گەرمای کانییەکی لای هەوارەکەمان (٥٧ پلە) بوو، بەدرێژایی رِۆژیش چەند جارێکم پێوا، هەروەك خۆی بوو. گەرمای کانییەك لە شاخەکانی (ئەحمەد کولوان - ٥٢ پلە) بوو. گەرمای کانییەك کە لە دۆلّێکی نزیکمان و لەهەمان ئاستی بەرزایی هەوارەکەمان بوو (٦٣ پلە) بوو.

لەسەر گردێکی لای خۆرهەڵاتی ئێمە و لەبەری ئەوبەری چەمی (قزڵجە) ئاسەواری قەڵایەك هەیە، ناوی (قز قەلعەسی)، یان (قەڵای کچان)ە، کە بەلای زۆرەوە ساسانییە. لە نزیك هەوارەکەشمانەوە چەند درەختێکی سوورەچنار هەن، ئەوەتەی لە ژیاندام درەختی وا گەورەم نەدیوە، چێوەی قەدی یەکێکیان شازدە پێیە، کە بەڕاستی درەختێکی یەکجار گەورەیە. دوو ــ سێیەك لەم درەختانە کەوتبوونە سەر زەوی. وەك زانیم دووساڵ لەمەوبەر بەهۆی بەفرەوە کەوتوون، کە زۆریان لەسەر باریوە و بەرگەیان نەگرتووە.

جارێکیان دوازدە بابانی، میلێك لەولای خۆرهەڵاتی (ئەحمەد کولوان)ەوە هەڵمەتێکیان بردۆتە سەر لەشکرێکی چەندان هەزار سەربازی ئێرانی، بەزاندوویانن، ئەمە لەسەردەمی سوڵتان (شاه حوسێن)دا بووە، کە هاوکات (سلێمان بەبە) ئەوکاتە سەرداری کوردستان١٤٠ بووە و ئەویش لەهەمان رۆژدا لە قۆڵێکی ترەوە بەسەر سوپای تورکیدا سەرکەوتووە.

لە کوردستان جۆرە بۆقێکی سەوز هەیە، بەسەر درەختدا سەردەکەوێ، وەك پشیلە بە نینۆکەکانی پێشەوەی، ڕاوی مێشوولە و کوللە دەکات، چاوم لێ بوو چەندجارێك ئەمەی کرد، لە هەموو روویەکیشەوە لە بۆقی ئاسایی دەچێ، جگە لە رەنگی، کە سەوزێکی سێوییە و پێستیشی نەرم و لووسە، لە شەویشدا دەمدی لەناو گژوگیادا دەخولایەوە. لە (ئەحمەد کولوان) ئامادەی یارییەك بووم، لەوانەبوو دەست و لاقی پیاوی پێوە دەربهاتبایە، مەگەر کوردێکی بەهێزبێ. باسەکەیشی ئەوەیە:

پیاوێك لەسەر زەوی دادەنیشێ و لاقێکی بەسەری گوریسێکەوە دەبەستنەوە و سەرەکەی تری کۆمەڵێك یاریزان بەدەستیەوە دەگرن و کابرا بەوسەر زەوییە بەردەڵانییە سەختەدا رادەکێشن و دەیسووڕێننەوە، وەك چۆن خلۆکەی پاپۆڕێك بەخلۆکەی لەنگەرەکەوە دەخولێتەوە، دەستیشی بەسەری گوریسەکەوە، کە سەرەکەی تری پیاوێك وەك پارێزەری، بەدەستیەوە دەگرێ و نایەڵێت کۆمەڵەکەی تر، ڕای بکێشن و هەوڵدەدات یەکێکیان لێ بگرێت و تا بێتە جێگاکەی ئەم و دابنیشێ و هێرشی بکرێتە سەر. ئەم یارییە بەدەم قیژە و هاوار و بازدانیشەوە دەکرا، بەڵام کارەکتەرەکە، یان یەکەمین یاریزانی ئەم دیمەنە، هەرەمەکییەکی خۆش بوو، ناوی (قادری گەورە)، (قادرە زل)ە بوو، بەردەوام لە خزمەتماندا بوو، پیاوێکی زۆر باش بوو، ڕۆژ دوای ڕۆژ، تا دەهات زیاتر هۆگرمان دەبوو. ئەوەی جێی سەرنج بوو، ئەوەبوو، هەمیشە کە ڕێی دەکرد، گالۆکێکی بەدەستەوەبوو، لەسەر ئەو هەموو گەرمایەشەوە کەوڵەبزنێکی چڵکنی بەسەر جلەکانیدا لەبەردەکرد.

١٤٠- لەبەرئەوە دەبێ ئەم رووداوە کەوتبێتە نێوان ساڵانی (١٠٨٨-١٠٩٢ ك -١٦٧٧ز-١٦٨١ز). بڕوانە پەراوێزی ژمارە (٢) لەبەشی سێیەم.

## ١ى ئاب

ئەو ماوەیەی لە (ئەحمەد کولوان) مابوومەوە، لەلایەکەوە لەبەر تێکچوونی تەندروستیم و لەلایەکی تریشەوە لەبەر تەمەڵیم، هیچم لە ڕۆژ ژمێرەکەمدا نەنووسیبوو. هێشتاش سەبارەت بە باری ورەی ئالۆزم، گەلێ شتم هەیە، کە دەبێ بینووسم.

پاش ئەوەی چەند ڕۆژێك لە ئەحمەد کولوان مابوومەوە، بڕیارم دا بەجێی بهێڵم. لەم بڕیارەشمدا زۆر نیگەرانی ئەو پێداگرتنەی کوڕەکەی بەگ بووم کە دەیویست تا لەوێ بین، لەگەڵمان بمێنێتەوە، لەبەرئەوە بەچاکم زانی بچمە (بیبستان)، یان (بیدستان)(١٤١)، کە ناوێکی فارسییە و مانای (نێژگەی بیی)، یان (بیبجاڕ) دەگرێتەوە و پایتەختی ئەو ناوچەیەیە کە ئێمەی تێداین. لە (بیبستان)یش بەگ، ماڵی هەیە، بەمەش ئەو ئەرکە گرانەی لەسەر سووك دەکرێت کە لە پێناوماندا دەیکێشێ. لەبەرئەوەش ئامادەی سەفەر بووین، بۆیە لە سەعات پێنج و چارەکی ئەم بەیانییەدا دەرچووین. کێوەکان دەکەوتنە لای چەپمانەوە. لە شەشدا گەیشتینە چەمی (قزڵجە)، کە دەراو و ڕێڕەوی بەو ناوشاخانەدایە. ئەم جێگایەش دەکەوێتە سەرووی ئەحمەد کولوان و تەنیشتی چەپی تەنگەکە، یان بەری لای چەپی رووبارەکە. لەسەر تاشەبەردێکی جیاواز، شوێنەواری قەڵایەك دەبینین، ناوی (قزڵ قەلعە)یە و دەڵێن زۆرکۆنە.

گوندی (قزڵجە)ی پایتەختی پێشووی ناوچەکەش دەکەوێتە نزیك ئەم قەڵایە، بەڵام چۆڵکراوە و بیبستان، کە لێوەی نزیکە، لەجێی ئەوە. وەك سەرنج دەدەم زۆربەی گوندەکانی کوردستان، دەکەونە شوێنی چەپەك و شاراوە و دۆڵی دووری نەدیوەوە، کە ڕەنگە بۆ خۆ ڕزگارکردن بێت لە سەردانی ئەو سوپایانەی بەلایاندا تێپەڕ دەبن(١٤٢).

---

١٤١- ئەم کۆچە شووم بوو، چونکە لە جێگەیەکی دروستەوە بۆ جێگەیەکی نادروست کۆچمانکرد و نەخۆشیی و ئەو (تا)یەش کە تا ڕادەیەك لەم وەرزەدا لە کوردستاندا بڵاودەبێتەوە، ئەم شوێنەی بەخەستی گرتبۆوەوە، بە ئەندازەیەك یەکەیەکە ئەندامانی کۆمەڵەکەمانی گرتبوو. بۆیە لە کوردستان بێزاربوون و تاسەی گەڕانەوەی بیابانە سووتێنەرەکانی بەغدایان دەکرد، کە وەك دیارە تەندروستیی بە خەڵکەکەی خۆی داوە- خاریچ.

١٤٢- من وای دەبینم کە ئەمە هۆ و سۆنگەی سەرەکیی نەبێ بۆئەوەی کورد، ئەو شوێنانە بۆ گوندەکانیان هەڵدەبژێرن، بەڵکو پێویستی کەشوهەوا و هۆی جوگرافیی (کە لەناویاندا بوونی سەرچاوەی کانیاو) بناغەی ئەوەن گوندنشینەکان ئەوجۆرە جێگایانە بۆ گوندەکانیان هەڵبژێرن. ئەم بارەش لەهەموو ناوچەکانی کورددا، وەك شتێکی گشتییە-ع.

زۆرجاریش ئەم چارەسەرە دادیان نادات، بەتایبەتیش لەناوچەی (قزلّجە)، چونکە ناوچەیەکی سەرسنوورە و لە جەنگەکانی خۆرهەلآتدا، لەبەردەم ئەم کلۆلّییە ئاساییەدایە. لەم بیست سالّەی دواییشدا ئێرانییەکان و (ئەمانولّلاخان)، چەندجار (قزلّجە)یان کاولکردووە. کاولکردنێکی وا، کە ژێرە و ژووریان کردووە. هەروەها ئەو کوردانەش کە دەبنە دژی یەکتر، ئەگەرچیش لەیەك نەتەوەن، بەلآم بەرامبەر گوندەکانی دوژمنەکانیان، زۆر بەرەحمەتتر نین، کەچی ناوچەی (سیی وەیل) هێمنە، لەبەرئەوەی هەلّکەوتی لە چالآییدایە و لە دەرەوەی هێلّی لەشکرکێشی هاتووچۆی سەربازیدایە.

ئێستاش ئیتر چیاکانمان جێهێشتن و هاتینە پێدەشتەوە و هێلّی بانێك کە لە چیاکان بەش بەش بوون، بەلای خۆرهەلآتدا، لەبەردەماندا دیارە، کە داربەڕوو داپۆشیوە. دوای ئەوەی ئەم بانەمان بڕی، هاتینە دۆلّێکەوە، چەمێکی پێدا دەڕوات، هەردوو بەرەکەی دار بیی داپۆشیوە. ئەم دۆلّە لە شانەکەی تریەوە دەبێتە سنوور بۆ هێلّی بانێکی وەك ئەویتر. هەندێ جار چەمی (بییستان)، پێی دەوترێ چەمی (تاتان)، ئەم ناوەش لەناوی گوندێکەوە وەرگیراوە، کە کەوتۆتە سەر هەردوو بەرەکەی. ئەم چەمە بەناو چیاکاندا دێت و لە دامێنی (قەلآچوالان)دا بەچەمی (قەلّاچوالان) و (قزلّجە) دەگاتەوە. ئەم چەمانەش هەموویان دەڕژێنە (کوپری سو)ەوە.

کە دەڕۆیشتین، ئەو کێوانەی ئێستا بڕیبوومانن، دەکەوتنە لای راستمانەوە. لە حەوت و نیودا گەیینە (بییستان)، کە گوندێکە چل خانووی تێدایە(١٤٣) لە بناری ئەم کێوانە و لە جێگایەکی قوولّ و سەیردا دروستکراوە، لە جێیەکیشدا بوو، جوانیی تێدا نەبوو، چونکە لەژێر بەردێکی گەورەی تەنیادابوو،، بەرزاییەکەی دووسەد پێ دەبوو، دۆلّەکەیشی لێ جیا دەکردەوە، کە چەمەکەی پێدا دەڕۆیشت و وای کردبوو شوێنەکەی شاراوە و گەرم بێت. چیاکانی لای خوارمانەوە، یان ئەوانەی کەوتبوونە لای ڕاستمانەوە، هەر بەرزتر دەبوونەوە، کە دیاربوون وەك چیاکانی تری ئەم ناوچەیە لە گەچۆڕ و ئاسن و هەندێ چینە قسلّ تێکەلّ بوون و داربەڕوو داپۆشیبوون. ئەم شاخانە کەوتبوونە لای چەپی ئەو گاشەبەردە رووتەنەی گوندێکی لەژێردایە و قەلآیەکی لەسەرە. ماوەی نێوانیشیان چارەکە میلێك زیاتر دەبوو، بەلآم لای خۆرهەلآتەوە ئەم نێوانە بەرینتر دەبووەوە و دیمەنەکەیشی لەو ڕووەوەی ئەو شاخە دەبوونە سنووری، کە لاپالّەکانی

---

١٤٣- چل خێزانی تێدایە، کە لەمە، پازدە خێزانیان جوولەکەن.

لە ئێمەوە نزیکن و ناوچەی (تەڕەتەوەن)ی لە کوردستان پێك دەهێنا، بەڵام لاپاڵە دوورەکان لە ئێمەوە، ناوچەی (سەقز)ی ، لە (سنە)، پێك دەهێنا کە سەر بە ئێرانە.

بییستان، بەپێی سەمتی قیبلەنما (١٠) پلە دەکەوێتە باکووری خۆرهەڵاتی (ئەحمەد کولوان)ەوە، بەڵام (بانە) جێگاکەی لە (بییستان)ەوە (٠١) پلە بەلای باکووری خۆرهەڵات و پێنج سەعات دوور دەبوو. سەیرمان کرد لە بەرامبەر ماڵی بەگ لەسەر بەرزترین جێگا، ساباتیان بۆ دروستکردووین. ژیانیش لە دەرەوەی گوند چاکتر و لەبارترە، بەڵام تازە ساباتەکان دروستکرابوون و منیش حەزناکەم لەوە زیاتر خەڵکمان پێوە ماندووبێت. لەڕاستیشدا ئەو ساباتانە بۆ بەگ خۆی دروستکرابوون، کە تیایاندا بژی، بەڵام وازی لێ هێنا و بە ئێمەی دابوو.

ئێوارە لەگەڵ بەگدا سەبارەت بە کوردستان دواین. پێمی وت ڕاژەی نێوان ژمارەی کوردی خێڵەکی و گوندنشین، زۆرە و راژەیان چواریەك، بەڵکو پێنج یەکیشە، ژمارەی خێڵاتی کۆچەریشی بە (١٠٠٠٠)دە هەزار دانا، کە تێکڕای هەر خێزانێك بۆ یەك چادر، حەوت سەرکەس بن. پێیشی وایە ئەم خەملاندنە، تا رادەیەك راستە و بڕواش ناکات ژمارەی خێڵە نیشتەجێیەکانی وەك (کرمانج) و (نوورەددین) و (شینکی)، بگەنە سێیەکی ئەم ژمارەیە، واتە نزیکەی سێ هەزار خێزانن(١٤٤)

## ٢ی ئاب

ئەم بەیانییە هەر زوو، بۆ دیتنی ئەو کەلاوانەی پێیان وتین لەسەرەوە هەن. سەرکەوتینە سەر گاشەبەردەکە. ئاسەواری دیوار و شوورەیەکمان بینی بەدەوریدا کرابوو، هەندێ خشتیشمان بینی، کە وەك دیاربوو ساسانی بوون. لەسەر تەپۆڵکەکەیشی، کە هەر چەند یاردەیەك دوور دەبوو، ماقۆڕ (حەوز)ێکمان دی، لەچینە گەچۆڕەکانی بەردەکە هەڵکەندرابوو، لەگەڵ درەختێکی پەیکوڵ (Tr Orn Tree)ی(١٤٥)دێرینەدا، کە هێشتا هەر سەوز بوو. کێش دەزانێ تەمەنی چەندە!، ڕەنگە قەڵاکەی، لە ڕۆژانی ئەوپەڕی گەشەیدا دیبێ!. دیمەنی دۆڵی (تاتان) یەکجار

١٤٤- ئەمە، ئەوەندەی پێوەندی هەبێ بە ناوچەی سلێمانییەوە و کۆیسنجاق ناگرێتەوە.

١٤٥- (پەیکۆڵ، دڕکی سێکوچکە، پڕ، داسك)یشی پێ دەڵێن، القاموس العلمی، عربی انگلیزی، کـردی، ص ١٧٥، کمال جلال غریب، من مگبوعات المجمع العلمی الکردی الجـزو الپـانی، الگبعـە الۆلی، مگبعـە المجمع العلمی الکردی، بغداد - ١٩٧٩- م.

دڵگیربوو، چەمەکەش بەناو پێچ و لوولەکانیدا تێپەڕ دەبوو. چەندان گوندمان بەبەری لاپاڵەکانی بەرامبەرمانەوە بینی، کە ڕوویان کردبووە باکووری خۆرهەڵات و سەرووی ئێمەوە. کەمێك لەولای لاپاڵی ئەم بەردەوە، گردێکی توورەکەڕێژمان بینی، سەرەوەی وەك ئەوانەی (چەمچەماڵ) و (دەرگەزێن) و هی تر پان بوو، ناوی گردی (ڕۆستەم) بوو،

گردێکی تری لە سەرەوە بوو، هەڵکەوتیشی وەك ئەم وابوو، ناوی گردی (شاە) بوو. پێشتر لە هەندێ لە گردەکانی دەوروبەردا گۆزەڵە دۆزرابوونەوە، قەوارەیەکی نائاساییان هەبوو.

## ٨ی ئاب

هەموومان تووشی (زەردەتا) ببووین، وا دیاربوو گوندەکە ئەم پەتایەی تێدابوو. دەرمانم بە زۆریان دا، کۆمەڵەکەمان بیست و شەشیان پێکەوە تووشی ببوون. دوێنێ شەویش لەکاتێکدا (جەعفەر عەلی)ی کلۆڵ، کە نۆکەرێکی هیندی بوو، خەڵکی (لوکناو) بوو، سەرەڕای ئەوەی خۆی بەدەم ئازاری تاوە نالاندبووی، هەندێ کوردیش زارەترەکیان کردبوو، تەرمی مردوویەکیان بردبووە ئەو ژوورەی ئەوی لێ خەوتووە، ئیتر دەردەسەرییەکی زۆری بەدەستەوە چەشتبوون تا رازی کردبوون لە ژوورەکەی بەرنە دەرەوە.

ئێوارەیەك، لەو ئێوارانەی تەندروستیم تیایدا چاك بوو، بۆ پیاسە و گەڕان چووین بۆ دۆڵێکی بچووك و دڵگیر، کە ڕێك لەخوار (بیبستان)ەوە بوو، بەناو ئەو کێوانەدا تێپەڕ دەبوو، چەند کانیاوێکی دەڕژایە سەر و ئەمبەروئەوبەریشی داری هەنجیرەکێویلە (تەوسکە) و بەهێ و هەرمێ دایان پۆشیبوو، چەند دارگوێزێکی پیر و زەبەللاحیش رازاندبوویانەوە. کاتێ گەرما پێوەرەکەم لە کانییەکدا نقوم کرد (٦٠ پلە) بوو، کانییەکی تریش لەسەر گردێکی بەرامبەر گوندەکە هەیە، (٥٧ پلە) گەرمە. گردەکانی نزیك ئەم جێگایە لە تەلەبەرد و گەچۆڕ GYPSUN پێکهاتبوون.

شاخی (ئاردبەبا)ی بەرز و قوت، راستەوخۆ دەکەوێتە تەنیشتمانەوە لەپاڵ (بانە)دا، بە (١٠ پلە) بەلای باکووری خۆرهەڵاتدا، کەمێکیش لای راستی ئەوەوە، بەشێك لەهەمان ئەو زنجیرەیە دەبینین، کە لە سێ لووتکەی شێوە سەیر، پێکهاتووە، ڕێك چوونەتە پاڵ یەکتر و ناویان (سورەنا)یە١٤٦.

---

١٤٦- ناوە راستییەکەی (سوورێن Surain)ە - م.

## ١١ی ئاب

ئێستا (نۆبەتیێ) زۆری بۆ هێناوم و زۆر بەتوندی ڕۆژی سێ جار دەمگرێ. هەموو ئەندامانی دەستەکەشم تووشی ببوون، بەڵام سوپاس بۆ خوا هاوسەرەکەم تووشی نەبووە، هەروەها میستەر (بەل)یش. هەردووکیشیان هەر تاو ناتاوێك دەهاتن و هەواڵی نەخۆش کەوتنی یەکێکی تری کۆمەڵەکەمانیان دەدامێ، ئەمەش شتێکی دڵگیربوو، مایەی نیگەرانی بوو، بەڵام تاوتووی نەخۆشیەکەی من، لە هەموویان توندتربوو، چونکە پێشتریش نەخۆش کەوتبووم. دوێنێ شەو، خوێن ئەوەندە هوروژمی بۆ ناو سەرم هێنا، میستەر (بەل) ناچار بوو شووشەیەك خوێنم لێ بگرێ، بەمە زۆر حەسامەوە.

هاتمە سەر ئەو بڕیارەی تا دەتوانرێ پەلە بکرێ ئەم جێگایە بەجێبهێڵین. لەبەرئەوە بڕیارم دا سەرباز و نەخۆشەکان، لەگەڵ کەلوپەلە زیادەکاندا بۆ سلێمانی بنێرمەوە، پاش ئەوە کەمترین باری سووك هەڵگرین و بۆ گوندێکی نزیکی کەشوهەوا لەبارتر بگوێزینەوە ، لەوێ دەتوانین چەند ڕۆژێکی تر بمێنینەوە، تا تەندروستیمان دێتەوە سەرخۆی و سەرلەنوێ گەشتەکەمان لە ناوچەی کوردستاندا دەست پێدەکاتەوە، کە ڕەنگە بگاتە (سنە). سەرباری ئەوەش کە تووشی ئەم تایە ببووم، چاوی ڕاستیشم هەوی کردووە و یەکجار ژان دەکات، لەبەرئەوە نووسینیش بۆتە کارێکی گران، یان هەر بە یەکجاریی ڕێی دیتنی لێگرتم، بەڵام بۆ بەختەوەریم، ئەم هەوکردنەی چاوم ڕێکەوتی گیرانی یەکەمین ئەستێرەی (مشتەری یەکەم)ە، لەبەرئەوە توانیم هێڵی درێژایی (بیبستان) ڕاست بکەمەوە.

## ١٣ی ئاب

سەرلەبەیانی ئەمڕۆ لە سەعات پێنجدا- بیبستان - مان جێهێشت و دوای ئەوەی بەسەر ئەسپەکانمانەوە دەشتی (تاتان) و (بیبستان)مان بڕی و لەو شاخانەمان دا، کە دەوریان دابوو، چووینە ئەو پێدەشتەی دەکەوێتە پێش (ئەحمەد کولوان)، یان دەشتی چەمی (قزڵجە)وە(١٤٧)، پاش ئەوەی ئەمیشمان بڕی و دوای ئەوەی لە ڕێگادا دواکەوتین، لە نۆدا گەیشتینە گوندی (پێنجوێن)ی جوان. ڕۆیشتنەکەشمان هێواش بوو، نەخۆشیی و هەوکردنەکەی چاوم بەڕادەیەك زۆریان بۆ هێنابووم، نەك هەر نەیان هێشت ئەو هەموو شتانە ببینم، بەڵکو ئەگەر چاویشم ببینایە، نەم دەتوانی هیچ بنووسم.

---

١٤٧- جیا لە ناوچەکانی تر، چەقەڵ لە دەشتی (قزڵجە) و (شەهرەزوور) هەیە.

ئەمڕۆمان بەتێپەڕبوون بەناو کاروانی خێڵاتی کۆچەر، یان بەناو هەواری بچووکی خێڵی جافی کورددا بەسەر برد، کە پێش ئەوەی بچنە شارەزوور، ئێستا لێرە هەڵیان داوە، یەکجار زۆریشم خەم خوارد کە نەم توانی ئەو دیمەنەیان ببینم، کە بەڕاستی دڵگیر و گەش و خۆش بوو، چونکە رەشماڵ و کەلوپەل و باروبنەیان زۆر بەرێکوپێکی پێچابووەوە و زۆر رێکیش لەسەر پشتی گا و مانگا، باریان کردبوون، دیارە بەکارهێنانی ئەمجۆرە وڵاخانە، بە مەبەستی باربردن، تایبەتە بە گەلی کورد. لەیادمە ئەمجۆرە نەریتەم لەناو کوردانی (رەشوان) دا، لە ئاسیای ناوەڕاست دیوە. ئەوا ئێستا ئەم جافانەش بەیادیان هێنامەوە. ژنان و پیاوانیان بەپێ رێیان دەکرد. ئای کە خەڵکێکی لەش تۆکمەن! پڕن لە جوانیی و شیرینیی. ئافرەتیشیان کراس و شەرواڵی شین لەبەردەکەن، (سەربەست)ی بچووکیش دەبەستن و ئەگریجەی لوولیان بەملاولای روویاندا دەخەن. چارۆکەش بەکۆڵدا دەدەن، کە بەڕەنگی شین و سپی دەچنرێ، بەشێوە لەو دەسماڵانە دەچێ، کە چیانشینەکانی (ئۆسکۆتلاند) بەکاری دێنن. چارۆکەش بەشێکە لە جلوبەرگ. هەموو ئافرەتێکیش هەیەتی، بەڵام چارۆکەی ئافرەتی دەوڵەمەند، لە ئاوریشمی زەرد و سوور دەچنرێ.

پیاوانی جافیش کراسێك لەبەردەکەن، لەناوقەدا توندی دەکەن، شەرواڵی تەنکیش لەبەر دەکەن، پێڵاوەکانیشیان لەخوری چنراوە*، کە بۆ لەپێکردن لە پێڵاوە زۆرخۆشەکانە، تەپلەیەکی خڕیش لەسەر دەکەن، لە لباد دروستکراوە، هەمووشیان چەکدارن و شمشێر و زرێی بچووکیان پێیە، هەندێ لە جافەکان دەمانچەش دەبەستن، بەڵام سوارەکانیان هەمیشە نێزەیان پێیە. چاومان بە ئافرەتێکیان کەوت، لەوە دەچوو پلەیەکی گەورەی لەناویاندا هەبێ، بەسەر ئەسپێکەوە بوو، سەروکەللە و سەرپشتی زۆر جوان بە گلۆنکەی خووری و مووروو ڕازێنرابووەوە، لبادێکیان بەسەر زینەکەیدا دابوو، گلۆنکە بە پەراوێزەکانیەوە بوون. لەدواوەش دوو وڵاخ کەلوپەلەکانیان بۆ هەڵگرتبوو، نۆکەرێك بەسەر یەکێکیانەوە بوو، سوارێکی چەکداریش لە تەنیشتەوە لە خزمەتیدا بوو. هیچ ئافرەتێکیشمان نەدی خۆی داپۆشیبێ. نەخێر. تەنانەت ئەو (سەرپۆش)ەش کە ئافرەتی عەرەب لەخۆیەوە دەپێچێ.

پێنجوێنیش کە کردبوومانە قۆناغی چەند ڕۆژەمان، گوندێکی گەورەیە و لەجێیەکی جواندایە، کەوتۆتە دامێنی نێوان شاخەکانی نزیك باشووری دەشتی (قزلجە)وە. هەوارەکەی (ئەحمەد کولوان) یشمان لەم جێیەوە (٥٥ پلە) بەلای باشووری خۆرئاواوە و بۆ سواری چاکیش

---

*ئەو جۆرە پێڵاوە، (کلاش)ی کوردەوارییە(م).

ماوەی سەعاتێك دەبێ. سەمتی قەڵا دێرینەکەش لە قزڵجەوە (٤٥ پلە)، بەلای باکووری خۆرهەڵاتەوەیە.

بەرۆژ لە باخچەیەکدا، لەژێر سێبەری دارگوێزێکی جواندا دادەنیشتین، لقوپۆپی بەسەر کانییەکدا شۆڕکردبووەوە، گەرماکەی (٥٦) پلەبوو.

گوندەکەش ئەگەرچی لەناوچەی قزڵجەدا بوو، بەڵام لەگەڵ گوندێکی تەنیشتیدا، هی ئەو (فەتحوڵڵائاغا)یە بوو، کە لە سلێمانی، لە خانووەکەیدا بووین. ساڵانەیشی (١٥) هەزار قرۆشە، چونکە داهاتی کشتوکاڵی یەکجار کەمە. هەندێ (هەرزن)مان دی، هێشتا سەوز و تەڕبوون. ئەو دامێنەی پێنجوێنی تێدایە، هەمووی باخ و بیستان و ڕەزە، میوەش هەندێکی نەبێ هێشتا نەگەییون. زۆربەی خەڵکەکەی کاروانچی و قەتارچین، هێسترەکانیان تا (سنە) و (هەمەدان) دەبەن.

## ١٨ی ئاب

لە پەیداکردنی هێستردا بۆ سەربازەکان، دواکەوتنێکی چاوەڕوان نەکراو دواکەوتین. حەزم دەکرد ئەوەندەی دەتوانم لەمڕۆوەوە هەوڵ بدەم هەرچی پێویستیانە بۆ دەست پێکردن بەسەفەریان بەرەو سلێمانی، بۆیان جێبەجێ بکەم. لەم حاڵەشدا سەفەرەکەمان پێدەچێ بکەوێتە دووسبەی. پێشم خۆشە بڵێم تەندروستی زۆربەی ئەندامانی کۆمەڵەکەمان، لەچاو جاراندا باشتربووە. ئومێد دەکەم (تا)یەکەشم بەریدابم، چونکە دوێنێ نەیگرتمەوە، کە دەبوایە بمگرێ، سوپاسیش بۆ خوا کە هاوسەرەکەم نەیگرتبوو، هەرچەندە لە (ئەحمەد کولوان) نەخۆش کەوتبوو، بەڵام نیشانەکانی ئەم (تا)یە، تاوتێی خێرا و ژانەسەرە، کە دەگاتە ئەوپەڕی، لێی دیاری نەدابوو. عومەر ئاغا دەڵێت: ئەم پەتایە لەم وەرزانەدا هەموو کوردستان دەگرێتەوە. هۆیەکەشی بە ئاڵوگۆڕی ئەو کەشوهەوایەی کە لەشەودا زۆر سارد دەبێ و ڕۆژیش گەرم دەبێ. جگە لەمە، دەشبێ هەندێ هۆی تری ناوخۆیی هەبێ، چونکە زەبری پەتاکە، لە جێیەکەوە، بۆ جێیەکی تر، جیاوازیی هەیە، بەوەی لە دۆڵە تەنگەبەر و شوێنە چاڵاییەکاندا دەگاتە ئەوپەڕی(١٤٨)

---

١٤٨- بەو ناونیشانانەدا کە نووسەر باسیکردوون، وا دیارە هەر (مەلاریا)یە، کە تائێستا زۆربەی ناوچەکانی کورد، پێوەی دەناڵێنێ - ع.

دەرکەوتنی (گەلاوێژ) - زۆر ئەستێرەش لە بنەچەدا ناوی کوردییان هەیە- دەبێ لە دووی مانگی ئاب دابێ. لە کوردستاندا بۆ شکاندنی تینی گەرما ناودەبرێ. ئیتر لەو کاتانەدا شەوانی فێنك دەبێ و ڕۆژیش لەوپەڕی گەرمیدا دەبێ.

## ١٩ی ئاب

### ((پێنجوێن))

دوێنی شەو، دوو دز هاتبوونە سەر کۆمەڵەکەمان، دوو جووت پێڵاوی ناو چادرەکانیان دزیبوو، ئەوەی سەیربوو، جگە لەم جارە، تووشی شتی لەمجۆرە نەببووین، ئەگەر بەگوێرەی ئەوە لەبەرچاوی بگرین کە لە هەوار و خێڵە کۆچەرەکانیش نزیك ببووینەوە. بەم بۆنەیەوە عومەر ئاغا ئاگاداری کردم کە ئەو چادرانەی لە دەشتاییەکەی تەنیشتمانەوە چاومان لێیانە، هی خێڵاتی گەلاڵی و کەڵهوڕ و هەندێ تیرەی خێڵاتی ترن، کە ئێستا لەو کێوانەوە داگەڕاون و لە ڕەسەنیشدا جاف نین. ئەم خێڵانە هەموویان بە لەوەڕاندنی مەڕومالاتیان لە ناوچەیەکدا بە هاوینان، باج بە والی (سنە) دەدەن. جافەکان سالانە، جگە لە دیاری ئەسپ و مەڕ، چوارسەد تمەنیش دەدەن.

پێم وایە لەیادیشم چووە بڵێم بۆ هەر گوندێك بچووینایە، شەوان کۆمەڵێك لادێیی دەهاتن بۆ ئێشکگرتنی هەوارەکەمان. ئەم پاسەوانانە پێیان دەوترێ (قیشاقچی)، لەوەش دەچێ وشەکە تورکی بێت، هەرچەندە هەر لە ئێران و کوردستاندا بەکاردێت(١٤٩).

پێم وایە گوندنشینەکانی (پێنجوێن) لەوپەڕی لەش ساغی و حەسانەوەدابن، ئەمەش لەم ناوچانەدا لە شتە دەگمەنەکانە. خانووەکانیان لە یەکتر جیایە و بەپەرژینیش دەوریان داون. بەلای منەوە لەتێکڕایی هەموو ئەو خانووانە چاکترن کە لە بەشەکانی تری کوردستاندا دیومن.

لە پێنجوێندا هەندێ بنەماڵەی جوولەکە هەن، بازرگانێتی پێستە و مازوو و شتی تر دەکەن. پێستەیەکی زۆر بۆ (هەمەدان) دەبرێ. جوولەکە لە کوردستاندا کاری زەڕنگەریی دەکەن.

---

١٤٩- بەلای زۆرەوە (قوشاقچی)یە، کە لەکاری (قوشاتمق)ەوە دێت مەبەست لە ئابلۆقەدانە لە دەوری شتێك - کە لێرەدا بە سەربازگە، یان چادرگە - دێت. بەڵام ئەم وشەیە ئێستا (ئێشقچی) دەوترێ، کە لەبنەچەدا تورکییە و مەبەست لە رووناکیی هەڵگرە، بەگوێرەی ئەوەی پاسەوانەکان لەکاتی گەڕانیاندا ڕووناکییان هەڵدەگرت -ع.

پێنجوێن، مەڵبەند، یان بازاڕێکی خێڵاتی کۆچەرە. کاروان بە هەشت ڕۆژ لە (هەمەدان)ەوە و لە (سنە)شەوە بە چوار ڕۆژ دەگات.

دیارە بەختەوەرنیم کە مێژووی سروشتیی نازانم، چونکە بواری کەڵك لێ وەرگرتنی لە کوردستاندا زۆری بەبەرەوەیە. ئەوا ئێستا (نووسەنەك)(١٥٠)و تریێ کێویلە و تۆڵەکە جیا دەکەمەوە، کە هێشتا گوڵیان پێوەیە. هەروەها ترش.

لە باڵندەدا جگە لە (بووکە سوورە)(١٥١)، کە پێشتر باسم کرد، جۆرێکی جوانی (دار کونکەرە)ش هەیە، ڕەنگیان سوور و خۆڵەمێشییە. قومریش جۆرێك هەیە، پێشتر نەمدیبوو، کە خاڵخاڵاوییەکی جوانە. ژمارەیەکی زۆریش لە (شێلاقە)١٥٢ و ژمارەیەکی زۆریش لە کەوی قاچ سوور.

---

١٥٠- نووسەنەك: کە بە عەرەبی پێی دەڵێن (حشیشه القراص)، ڕووەکێکی کێوییە، لە بەهاراندا لەناو گژوگیای دەشت و هەردا دەڕوێ، کە بەر شتێك بکەوێ، پێوەی دەنووسێ، گەڵاکانی زۆر وردن-م.

١٥١- بووکە سوورە: کە بە عەرەبی پێی دەڵێن (أبو الحناو)، باڵندەیەکی بچووکە، سنگەکەی سووری مەیلەو زەردە، بەرسنگ زەردە-م. (القاموس العلمی، الجزو الاول، کمال جلال غریب، الگبعه الاولی ١٩٧٣، مگبعه کامەرانی، السلیمانیه، ص ٣٣).

١٥٢- شێلاقە: لە قاموسەکانی (شێخ مارفی نۆدێ - ئەحمەدی) و (مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس- دوو ڕشتە)دا، هەردووکیان لە بەرامبەر وشەی (سمن)ی عەرەبیدا (شێلاقە)یان بەکار هێناوە. شێلاقەش باڵدارێکی کێوییە، لە خانەوادەی (ترونتە) و (واشە) - م.

# بەشی حەوتەم

چوونە ناو ئێرانەوە ـ زەریاچەی زرێبار ـ کەیخوسرەو بەگ ـ هەواری جاف ـ یاری جریدبازی ـ بڕینی کێوی زاگرۆس ـ گوندنشینەکانی (تەران) ـ زستانێکی سەخت ـ ناکۆکی نێوان جاف ـ سنە ـ شێوخواردنێکی نایاب ـ کۆشکەکە ـ ستەمی والی سنە ـ پرسەی گشتی ـ شۆڕش ـ کۆچی دوایی کوڕەکەی والی - پەژارە و توندوتیژی والی ـ ترسی دەست و پێوەندەکەی ـ ئاڵوگۆڕ لە بەرنامەکەماندا ـ ترسی وەزیرەکانی والی ـ بەزەیی ئەنجوومەن ـ سەرکەوتنی ئەنجوومەن ـ گەشکە و سوپاسیان ـ دەرچوون لە سنەوە بەرەو هەواری والی.

## ٢٠ی ئاب

هەرکە وڵاخەکان بۆ گواستنەوەی  سەرباز و نەخۆش و کەلوپەلەکان گەیشتن، بڕیارمدا گەشتەکەم بۆ (سنە) تەواو بکەم، مەبەستیشم لەوە چاکبوونەوەی تەندروستیم و دیتنی (زاگرۆس) و لەگەڵیشیدا تەنگەی (گاڕان)ی هێشتا نەزانراو و دیاریکردنی جێگەی پایتەختی کوردستانی ئێران بوو.

لە پێنجدا دەستمان بەڕۆیشتن کرد، هەرچەندە لە (پێنجوێن) ڕێیەکی تریش هەبوو، کە ڕاستەوخۆ بەسەر چیاکاندا سەردەکەوت و نزیکەی سەعاتێکیش ڕێگاکەی نزیك دەکردەوە، بەڵام لەبەرئەوەی حەزم دەکرد لە سروشتی دەشتە درێژەکە دڵنیابم، کە تا لاپاڵەکانی (زاگرۆس) و بەری دووەمین ڕیزە شاخەکانیش درێژ دەبووەوە، ڕێی دەشتەکەمان هەڵبژارد. ڕێی دەشتەکەش بەلاپاڵەکانی ئەو شاخانەدا درێژ دەبووەوە، کە لە باشوورەوە ببوونە سنووری چەمی (قزلْجە)، لەگەڵ لاکردنەوەی ئەویشدا، لە خۆرهەڵاتەوە بۆ باشوور، لای دەکردەوە. ئەم شاخانە لە تەپڵە سەریانەوە تا دامێنیان، لێڕەوار داپۆشیبوون، لاپاڵەکانیشیان دابڕ دابڕ و جوان بوون، وەکو شێوەی نیمچە بازنەیی. بەشی زۆری ئەم گۆڕەپانانەی لەم دابڕ دابڕانە دروستبوون، هۆبە و هەواری ئەو خێڵە بچووکانەیان تێدابوو، کە بەدەم ڕێوە بە ژمارەیەکی زۆریان گەیشتین. ڕووەو تیشکی هەتاوەکە ڕێمان دەکرد، ئەمەش وای کرد هەوکردنەکەی چاوم، ئازاری زۆرتر بێت و چێژی سەفەرەکەشی لێ زەوتکردم، خۆ ئەگەر وا نەبوایە زۆر خۆشتر دەبوو.

لە شەشی  بەیانیدا چووینە ناو ئێرانەوە. سنوورەکەشی بەپردێکی دارینەی بچووك دەستی پێدەکرد، لەسەر جۆگەیەکی بچووك دروستکرابوو، کە دەڕژایە (قزلْجە)ەوە، ئاوی ئەم جۆگەیە زۆرجار وشك دەکات. ئەوەندەی نەبرد چەمی قزلْجە لەپشت ئەو شاخانەوە، ڕووە و لای ڕاست گوم بوو، کە لێرە دەشتەکەی دوولەت دەکرد. بەپیاوێکی پیر گەیشتین، لەسەر شتێك هەڵیان گرتبوو، لە تابووت دەچوو، دەتوت دەیبەن بینێژن، سەریشی لەپێشەوە بوو، لەو دەستەبەرەیەدا قیت دانیشتبوو، سەیری ئەملاولای دەکرد. کاتێ عومەر ئاغا لەبارەیەوە پرسی، پێیان وت شەوی پێشووتر ویستوویەتی دزی بکات، بەردێك لاقی شکاندووە.

لە حەوت و نیودا، کاتێ بەسەر لێژاییەکی بچووکدا شۆڕدەبووینەوە، زەریاچەی (زرێبار)ی بچکۆلەی ساف و شینمان بینی، لەپشتیشەوە ڕووەو باشوور، کێوە بەردین و سەختەکانی (ئاورامان ـــ هەورامان) بوو، کە لە توولەڕێ زیاتر، هیچ شتێکی تر نەیدەبڕی. بەری لای

چەپی زەریاچەکە شاخاویی و دارستان بوو، بەڵام بەری لای ڕاستی دەشتێك بوو، دەتوت تا سەردەمانێکی درەنگیش هەر بەشێك بووە لە زەریاچەکە . ئێستا نزیکەی سێ میل درێژیی و دوومیلێك پانایی کشابۆوەوە. لای بەری شاخەکەوە نەبێ کە هێشتا زەریاچەکە لەجێی خۆیدایەتی، ئیتر لایەکی تری زونگێکی پڕ لە قامیشەڵانە، پانایی نزیکەی میلێك دەبێ و پڕە لە باڵندەی کێوی و سەگلاو. دەڵێن قووڵترین جێگای زەریاچەکە، نزیك ناوەڕاستێتی، کە لە زستاندا دەیبەستێ. عومەر ئاغا دەڵێ: زۆرجار کە بەستوویەتی، ڕاوم بەسەریەوە کردووە(١٥٣).

خەڵکەکە هەموویان پێیان وایە ئەم زەریاچەیە کاتی خۆی شارێك بووە، بەڵام خوا، لەبەر بەدکاریی فەرمانڕەواکانیان، بە بوومەلەرزەیەك نقومی کردووە. عومەر ئاغا دەڵێت وەك بیری بێت، زەریاچەکە لەچاو جارانیدا، زۆری کەم کردووە.

سەمتی ئێستای ڕۆیشتنەکەمان (٧٠ پلە) بەلای باشووری خۆرهەڵاتدا بوو، بەڵام لای هەوارەکانی (کەیخوسرەو بەگ)ی جاف، رووەمان لە باشوور کرد. بەدەم ڕۆیشتنیشمانەوە، دوومیلێك لە دووریی دۆڵەکان و زەریاچەکەوە، دوور دەبووین، کە لای چەپمانەوە بوون. ڕێگاکەشمان نیوە بازنەیەك پێچی دەکردەوە.

ئەوەندەی نەبرد، تووشی چوار لە سەرکردەکانی بەگ بووین، هەموویان قۆز و سوارچاك بوون، پەڕی (شینە شاهۆ)یان بەسەر و پێچەکانیانەوە کردبوو. فەرشیشیان بەژێر سکی ئەسپەکانیانەوە دادووریبوو، گوڵنکەی زەردی پێدا شۆر ببوونەوە.

لە نۆ و نیودا گەیشتینە هەوارەکەی کەیخوسرەو بەگ، کە دوومیلێك لەخوار زەریاچەکەوە بوو. پێش ئەوەش بگەینە هەوارەکەی، بەگ خۆی، بەسواری ئەسپە جوانەکەیەوە بەپیرمانەوە هاتبوو. بەڕاستی جوانترین ئەسپێك بوو، کە چەند ساڵێکی زۆر دەبوو ئەسپی وام نەدیبوو، هەرسێ کوڕەکەی و محەمەد بەگی برازای و قادربەگی سەرۆکی پێشووی جافیشی لەگەڵ بوون. کەیخوسرەو بەگ دڵی لەوکاتە خۆشتر بوو کە لە سلێمانی دیبووم. جلوبەرگێکی پۆشتەیشی لەبەردابوو، پاڵتۆیەکی ئەستەمووڵی بەسەردا کردبوو، قۆپچەکانی زێڕبوون، ئەوەندەی تر شەنگ و شۆخی کردبوو. کوڕە گەورەکەیشی، کە لاوێکی یەکجار جوان و شۆخ بوو، جلێکی

١٥٣- نیلۆفەڕ: بەزۆری لە زەریاچەی (زەرەبیار-زرێبار) دەڕوێ ــ پەراوێزەکە دوایی هات ــ نووسەر وشەی (نیلوفەڕ)ی بەهاوواتای (حندوق) داناوە، لەکاتێکدا (حندوق) ئاویی نییە و (لوتس)ە، وەك لە دەقی پەراوێزەکەدا هاتووە. ڕەنگیشە مەبەستی لە (نیلۆفەڕ) زەنبەقی ئاویی بێت ــ ع.

وەك ئەوەی باوکی بەسەر کراسێکی نایابدا لەبەر کردبوو، ئاوریشمی ئەوروپایی ڕێ ڕێ بوو، بەزیو چنرا بوو، دەستەیەك سوارەی جافیش بەسەروسیمای جوانیانەوە، لەتەك بەگدا بوون. ئیتر تا گەیشتنە هەوارەکە، لاوەکان جریدبازیان دەکرد و بەهرەی خۆیان دەنواند.

چادرگاکەی بەگ، لە ڕەشماڵە ئاساییەکان بوون(١٥٤)،کە فراوان و بەرز و بە چەپەر و چیخ دەوریان گیرابوو. چادرێکیشیان لە گونیّ- جانفاز بۆ من دروستکردبوو، تا بیکەمە دیوەخان و پێشوازی میوانەکانمی تێدا بکەم. ساباتێکی خۆشیش تایبەت بوو بە دیوی حەرەمی بەگ و بۆ من و هاوسەرەکەمیان تەرخانکردبوو، کە تیایدا ئافرەتەکانیان چاوەڕوانی هاوسەرەکەمیان دەکرد، بۆ پێشوازی لێکردنی. پێشوازییەکەش لەوپەڕی نەزاکەت و نەریتی جوانی میواندرێتی کردندا بوو.

ئێستا ئیتر دەبێ ئەم یادداشتانەم کۆتایی پێ بهێنم و گەلێکیان لە بیرەوەریمدا بپێچمەوە، چونکە هەوکردنی چاوەکانم و ژانەسەری ئەملاولای ناوچەوانم، وایان لێکردووم توانای نووسینم نەماوە.

لە دامێنمانەوە کێوێك(١٥٥) بەسەرماندا دەڕوانێ، قەڵای (مەریوان)ە(١٥٦)، کە ئێستا کەلاوەیە و من پێم وایە ساسانی بێت. لەسەر لووتکەی کێوێکی تریش، کە بەری خوارووی پێکدێنێ و نزیکەی سێ میلێك ڕووەو خۆرهەڵات تا لاپاڵەکانی زاگرۆس دەکشێ، ئاسەواری دووقەڵای ساسانی هەن، کە بەرودوا (٥٥ پلە) بەلای باشووری خۆرئاوا و (٦٠ پلە) بەلای باشووری خۆرهەڵاتەوەن و نزیکەی دوو سێ میلێکیش لە هەوارەکەمانەوە دوورن.

---

١٥٤- چینێکە لە مووی بزن، کە هۆزە ڕەوەندەکان دەیکەن بەچادر و خەڵکی ئەو هۆزانە لە باکوور و باشووردا تیایدا تایبەتمەندن و ئەم وەستاکارانە لە مەڵبەندەکانی نزیك ناوچەی خێڵەکان بڵاون، وەك مووسڵ و سلێمانی و بەغدا و دلێم (رومادی) و کەربەلا و دیوانییە. ئێستاش لە بەغدا. لەبەری (کەرخ) دوو کارگەی دەستیی بۆ ئەم چنینە هەن و بەدوو سەرچاوەی سەرەکیی دەژمێردرێن، کە لە نزیك گەرماوی (ئەیوب) لە تەنیشت شەقامی (سوید)ن. بەڵام بازاڕەکەیان لە (الجصە)ی ــــ کەرخە/ع. پەراوێزەکە دوایی هات ــــ هەرچەندە ئەم پەراوێزەی ئێرە، ئێستا وا نەماوە، بەڵام هەر بۆ ئاگاداری خوێنەر لەسەردەمی نووسینی پەراوێزەکەوە تا ئەمڕۆ، وەك خۆی هێشتمەوە ــــ م.

١٥٥- شاخی (سورانە) کە ئێستا (سورێن)ی پێ دەڵێن ــــ م ــــ دەکەوێتە سەمتی لای باکوور و (ئاردبابا)ش ــــ لووتکە قووچەکەی ــــ کە بەسەر (بانە)وەیە (١٠ پلە) بەلای خۆرئاوادا، دەکەوێتە سەمتی باکوورەوە.

١٥٦- (مەریوان) ناوی ئەو ناوچەیەیە، کە ئێستا ئێمەی تێداین و سەر بە (سنە)یە.

کێوە سەخت و رووتەنەکانی (ئاورامان ــ هەورامان)یش بەرەو خوار درێژدەبنەوە و بەسەر شارەزووردا دەڕوانن و بەتەواویش دەکەونە دامێنی ئێمەوە. دۆڵەکانیش لەو کێوانە جیامان دەکەنەوە، کە لە (ئەحمەد کولوان)ەوە، تا (پێنجوێن) و پاشان تا لای زەریاچەکە دەکشێن. لەنێوان ئەم کێوانەی (زاگرۆس و هەورامان)دا دۆڵێکی تەنگ هەیە، رێگایەکی راستەوخۆی لە سلێمانییەوە بۆ (کرماشان) پێدا دەڕوات، پێی دەڵێن رێگای (شامیان)، هەر بەو دۆڵەشدا چەمێك هەیە، لە (گاڕان)ەوە دێتە خوارەوە و دەڕژێتە (دیالە)وە. ئەم زنجیرەیەی (زاگرۆس) رووتەن و بەرزن(١٥٧)، جارجار لە (سوورانە) و (ئاردبابا)ەوە دەبینرێن. وەك بۆمیش سەلماوە هەر سەر بە (زاگرۆس)ن. بەڵام کێوی (حاجی ئەحمەد)، ئەوبەشەی (زاگرۆس)ە، کە خێڵەکانی جاف دەیکەنە هاوینەهەوار و لەم شوێنەی منەوە (٦٠) پلە بەلای باکووری خۆرهەڵاتدایە. لەوەش دەچێ (زاگرۆس) لە (ئاردبابا)ی ناوچەی (بانە)وە ڕووەو خۆرهەڵات وەرسووڕێتەوە بۆ (گاڕان) و پاشان تیژتر ڕووەو خۆرئاوا ڕوودەکاتەوە ئەو ڕێیەی کە سبەینێ لەبەری دەیگرین. دەربەندی گاڕانیش دەکەوێتە (٨٥) پلە بەلای باکووری خۆرهەڵاتدا.

دوای نیوەڕۆ بەگزادە لاوەکان، بۆ دەرخستنی توانا و بەهرەی خۆیان، یاری (جریدبازیی)یان دەست پێکرد. هاوسەرەکەشم ئامادەی دیتنەکە بوو. شەوێ تاوێك لەگەڵ (کەیخوسرەو بەگ) پێکەوە بووین، گوێمان لە هەندێ گۆرانی فارسی گرت، دوو مەلا بۆیان دەوتین، هەندێ هەژاری هیندی و پیرێژنێکی تەواو ڕووت و قووتیشی لێبوو، بەڵام بەسزمان و بێدەنگ بوو، دیمەنیشی زۆر خەماویی بوو، تووشی (پەرکەم) ببوو، کاتی خۆی جنۆکە دەستیان لێ وەشاندبوو، ئیتر کراسی لەبەرخۆی داماڵیوە و سەری خۆی هەڵگرتووە و چەند ساڵێك بەتاقی تەنیا رووی لە شاخ و کێو کردووە، پاشان لەو کێوانە هێناویانەتەوە و هێمن بۆتەوە، بەڵام کەس نەیتوانیوە رازی بکات جلەکانی پێ لەبەر بکاتەوە. هەندێ جار روودەکاتە سلێمانی و بەڕووتوقووتی بە کۆڵان و شەقامەکانیدا دەسووڕێتەوە.

لەبەرئەوەی ناچاربووم بەتەنگ تەندروستی و حەسانەوەمەوە بم و بۆ ئەوەش ئەوەندەی کە دەتوانم یادداشتەکانم کورت بکەمەوە و هەر رووداوە سەرەکییەکانی تیا تۆمار بکەم، تا ئێرە سەبارەت بە سەردانەکەم لە هەواری جافەکان، کۆتایی بەنووسین دێنم، چونکە سەرباری هەوکردنی چاوم، ئەوەتەی تووشی ئەو تایەش بووم، ئەملاولای پێشەوەی سەرم، ژانێکی زۆری هەیە، نووسینی زۆر و بەردەوامیش، ئەوەندەی تر ئاڵۆزیی و ئازارم زۆرتر دەکات.

---

١٥٧- سەمتەکەی (١٠ پلە) بەلای خۆرئاوادا، ڕوو لە باکوورە و (٣٠ پلە)ش بەلای باشووردا، رووەو لە باشوورە.

## ٢١ی ئاب

له سه‌عات پێنج و نیودا ماڵاواییم له خانه‌خوێ به‌خشنده‌كه‌م خواست ــ كه هه‌رگیز به‌خشنده‌ییه پاكه‌كه‌یم له‌یاد ناچێ ــ و به دۆڵه‌كه‌دا هاتین، كه له خواره‌وه له درێژبوونه‌وه‌ی چیای (مه‌ریوان) و له باكووریشه‌وه له چیاكانی (زرێبار) پێك ده‌هات، به سه‌متێكی گشتی، كه له یادداشتی دوێنێدا باسی هاتووه (٨٥) پله به‌لای باكووری خۆرهه‌ڵاتدایه. رێگاكه‌شمان ڕاست نه‌بوو، به‌ڵكو كه‌مێك لای ده‌كرده‌وه و له‌دواییدا زنجیره زوورگێكی بچووكمان بڕی و له حه‌وت و نیودا گه‌یشتینه (كۆزه‌خوره)١٥٨، كه به‌مانای گوێزی په‌ككه‌وتوو دێت و بریتییه له گوندێكی بچووك له شیوێكی ته‌نگدا. ئه‌و دۆڵه‌ی پیایدا تێپه‌ڕبووین، جه‌نگه‌كه‌ی تیادا ببوو، ئه‌گه‌ر بشێ وای ناوبنێین، ئه‌و جه‌نگه‌ی كه پاشای به‌غدا، هێرشێكی كوێرانه‌ی تێدا هێنایه سه‌ر ئێرانییه‌كان و ئه‌وڕه‌حمان پاشای سه‌ركرده‌ی كورد، له ماوه‌ی (١٠) ده ده‌قیقه‌دا، سلێمان پاشای كه‌هیای ئه‌وكاته‌ی به‌غدا و زۆربه‌ی سوپاكه‌ی تیایدا به‌دیل گرت...)(

---

١٥٨- له‌ده‌قه‌كه‌دا هه‌ر (كۆزه‌خۆره) نووسرابوو، به‌ڵام ڕاستییه‌كه‌ی ( گوێزه‌كوێره)یه ــ م.

)- ئه‌و جه‌نگه‌ی (ریچ) لێره‌دا ئاماژه‌ی پێده‌كات، مه‌به‌ستی له جه‌نگێكی سه‌ركه‌وتووی (١٤) ساڵ پێشتری ئه‌وره‌حمان پاشا (؟-١٨١٣)ی بابانه، كه كورته‌ی ڕووداوه‌كه ئاوایه: ساڵی (١٨٠٣ز) له‌سه‌ر داوای گه‌وره پیاوانی بابان، له(عه‌لی پاشای والی به‌غداد)، جارێكی تر ئه‌وره‌حمان پاشا به فه‌رمانڕه‌وای بابان دانرایه‌وه. به‌ڵام ئه‌م پله‌وپایه‌یه زۆری نه‌خایاندووه‌و دوای زنجیره‌یه‌ك ڕووداوی خێرا، والی م به‌غدا به‌نیازی بیانووگرتن به ئه‌وره‌حمان پاشا، هێرشی بۆسه‌ر كردووه. ئه‌وره‌حمان پاشاش كه زانوێتی (والی) له كۆڵی نابێته‌وه، ده‌ست پێشخه‌ریی كردووه و له سه‌ره‌تای مانگی حوزه‌یرانی (١٨٠٥)دا به له‌شكرێكه‌وه ڕووه‌و هێزه‌كانی (والی) چووه‌و له نزیك (پردێ) شه‌ڕێكی سه‌ركه‌وتووانه‌ی له‌گه‌ڵدا كردوون و زۆر خراپ شكاندوونی و زیانی كوژران و به‌دیل گرتنی زۆری لێداون و پاشان به‌ره‌و (ده‌ربه‌ندی بازیان) گه‌ڕاوه‌ته‌وه. به‌ڵام (والی) له دووی ئه‌وره‌حمان پاشا نه‌بۆته‌وه و به هاوكاریی خالید پاشای ئامۆزای ئه‌وره‌حمان پاشا توانیوێتی ئه‌وره‌حمان پاشا له ده‌ربه‌ندی بازیان بشكێنێ و ئه‌وره‌حمان پاشاش ناچار ڕووی له ئێران كردووه و عه‌لی پاشاش شاری (سلێمانی) داگیركردووه. ده‌وڵه‌تی ئێرانیش بۆ گێڕنه‌وه‌ی ئه‌وره‌حمان پاشا بۆ (سلێمانی)، هێزی زۆریان بۆ ته‌یار كردووه، هاوكات كه عه‌لی پاشاش ئاگاداری ئه‌م به‌رنامه‌یه بووه، هێزێكی گه‌وره‌ی له چه‌ند قۆڵێكه‌وه ڕووه‌و ئێران كشاون، كه هێزێكییان به(٣-٤) هه‌زار كه‌سه وه به‌سه‌ركردایه‌تی (سلێمان كه‌هیا)ی به‌غداد و خالید پاشای ناوبراو، ڕووه‌و (مه‌ریوان) چوون، ئه‌وره‌حمان پاشاش هه‌لی قۆستۆته‌وه‌و ده‌رفه‌تی حه‌سانه‌وه‌ی نه‌داون و هێرشێكی كتوپڕی كردوونه‌ته سه‌ر و له‌و هه‌ڵقۆستنه‌وه‌یه‌دا زیاتر له هه‌زار كه‌سی لێ كوشتوون و زۆریشیانی به‌دیل گرتوون. كه (سلێمان كه‌هیا) له‌ناو دیله‌كاندابووه. (جه‌مادی دووه‌می ١٢٢١هـ — مانگی ١ی ساڵی (١٨٠٦ز). ئه‌م نه‌به‌رده بووه

سەفەری ئەمڕۆم بەهۆی تێکچوونی چاومەوە زۆر سەخت بوو، چونکە ڕۆیشتنەکەمان ڕاستەوخۆ، ڕووەو هەتاو بوو. خانووەکان، یان بە واتەیەکی تر کۆڵێتەکانی (کۆزەخۆرە)، بە قامیشێکی درێژ دارەڕایەکی نارێك کرابوون، کە بەسەر کاریتەکەیدا ڕایەڵ کرابوون و لەمسەر و ئەوسەری خانووەکەوە دەرچووبوون، بنمیچەکەش هەمووی بەرز و تەنگە. لە کۆڵێتێکدا دایاننناین، لە چاکترینی ئەو کولێتانە بوو، کە باسمانکردن، پێشم وایە مزگەوت بوو. خانووەکانیش بە چەپەری چنراو، لەیەکتر جیاکرابوونەوە، گوندێکی پیس بوو، هەرچەند شێخ (کەریم)یش تیایدا نیشتەجێ بوو، کە یەکێك بوو لەدوو نوێنەرەکەی ناوچەکە و پیاوێکی ڕەوشت بەرزبوو، جلێکی ئاودامانی لەسەر شێوەی (بابان)ی، نەك ئێرانی لەبەر کردبوو. دووان لە پیاوەکانی لای خۆم، کە نەخۆش بوون و توانای درێژەپێدانی سەفەرەکەیان نەبوو، لەژێر چاودێری ئەودا بەجێم هێشتن، کە یەکێکیان ماوەیەك دوای ئەوە مرد و ئەوی تریشیان لە (بانە) پێمان گەیشتەوە.

## ٢٢ی ئاب

لە پێنجدا دەستمان بەڕۆیشتن کرد، تا شەش بەسەر زەوییەکی گردەڵانی زەقدا ڕێمان دەکرد، ئیتر بەدۆڵێکی تەنگەبەر گەیشتین، لەناو دوو خەرەندی زۆر نزمدابوو، کە خەرەندەکان لەسەرەوە بەرزبوون و لەناو داربەڕووەکانی دەوروپشتیاندا سەریان بەرز، دیاربوون. چەمی (عەسر ئاوا)، یان (گاڕان)، بەم خەرەندەدا تێپەڕ دەبوو، پردێکی رێکوپێکی سێ پایەیی بەسەرەوە بوو، (ئەمانوڵلاخان)ی والی ئێستای (سنە) دروستی کردبوو.

لەوکاتەوە لە گوندەکە دەرچووین، وردە وردە هەورازتر دەبوو، کە ئێستا ئیتر هەورازەکە زیاتری کرد و چەمی (عەسرئاوا)یش لە دووریی میلێکەوە دەکەوێتە لای چەپمانەوە، کە ئەمیش هەر دەڕژێتە (دیالە)وە، ڕێڕەویشمان ڕووەو پردەکە (٧٠) پلە، بەلای باکووری خۆرئاوا و (٧٠

---

مایەی ئەوەی دەوڵەتی ئێران و میرانی ئەردەڵانیش، شانازیی بەم سەرکەوتنەوە بکەن و ئەمانـدڵلا خـانی گـەورەی ئەردەڵان (١٧٧٥- ١٨٢٤ز) بۆ بەیادگارهێشتنەوەی ئەم نەبەردە، ڕووداوەکانی ئەم شەڕەی لەسەر دیواری کۆشکەکەی خۆیدا لە (سنە)، وێنە بکێشێ. (بۆ زیاتر زانیاری لەم بارەیەوە ، بڕوانە: حەمە باقی، محەمەد، میرنشـینی: ئـەردەڵان، بابان، سۆران لە بەڵگەنامەی قاجاریدا، چاپەمەنی ئاراس، ساڵی ٢٠٠٢، ل ٤٥-٥٢ (م).

پلە)ش بەلای باشووری خۆرهەڵاتدا بوو، ڕێگاکەشمان لەوپەڕی جوانیدا بوو، چونکە بەناو نزارێکی داربەڕوو، نارەوەن و هەرمێ کێویلە (کرۆسك) و رەز و چناردا تێپەڕ دەبوو، کە چیاکانی تا لووتکەکانیشی داپۆشیبوون و لە نێوانیاندا دارگوێز و گوڵی گەورەی کێوی هەبوون، ئەوەیش کە دیمەنەکەی ئەوەندەی تر جوانتر کردبوو، تێپەڕبوونی کۆمەڵێکی زۆر بوو لە خێڵی جاف، رووەو دەشتی (زرێبار)، بەخۆیان و مێگەلیانەوە، کە باروبنە و کەلوپەلەکانیان، لەسەر پشتی گا بار کردبوو، کۆرپەکانیشیان هەر لە بێشکەدا بەکۆڵی ئافرەتەوە بوون، بەڵام مندالّەکانیان هەر دووان و سیانیان، لەسەر پشتی ئەسپ، یان گایەك بوون، ژمارەیەکی زۆریش لە ئافرەتەکانیان کە جلوبەرگی پیاوانەیان لەبەر کردبوو ــ لە گەشکەو شادی دا بوون ــ لەناو ئافرەتانی تریاندا ڕێیان دەکرد و وا خۆیان نیشان دەدا کە لە بەڕێوەبردنی کۆمەڵدا دەسەڵاتێکی گەورەیان هەیە. بەڵام پیاوەکانیان قورس و لەسەرخۆ رێیان دەکرد و کوتەکیشیان بەبەر پشتێنەکانیاندا کردبوو، کە دەرزی سەرخڕی گەورە گەورەیان پێدا داکوتابوو، شمشێریشیان بەناو قەدیاندا هەڵواسیبوو، قەڵغانیشیان بەناوشاندا کردبوو. هەندێکیشیان ماڵاتیان لێ دەخوڕی و دەستەی پیاوماقوڵانیشیان سواری ئەسپ ببوون، کاروباری منالّ و کەلوپەلە قورسەکانیان بە ئافرەت سپاردبوو. جاف خێڵێکی سەروسیما توند و کەللەڕەقن.

ڕێگاکە زۆر زۆرباش بوو، ئەو گەرووەش کە پیایدا سەردەکەوتین یەکجار تەنگ بوو. لە حەوت و پەنجا دەقیقەدا خۆمان لەبەردەم سەرەو ژوورکەیەکی درێژدا دییەوە، کە هەمان سەمتی هەبوو، بەڵام پێچی زۆر تێنەدەکەوت. رۆیشتنەکەمان کە لەسەرخۆ بوو، چل و پێنج دەقیقەی خایاند. چیاکانیش گڵەسپی و تەلەبەرد بوون. لە هەشت و نیودا سەرکەوتینە سەر گەردەنەی گەرووەکە. لەوێوە لە هەردوولاوە لووتکەی بەرزتر و رووتەنمان دیتن. پاشان بە تەولەڕێیەکی زۆر لێژدا شۆڕبووینەوە. درەختیش کەمی کردبوو، وای لێ هاتبوو لە دەوەنە بەڕوو زیاتر، هیچی تر نەبوو. شاخەکانیش وایان دەنواند کە تا چاو بڕ دەکات ڕووتەن و ڕەقەنن. مرۆڤـ لەنێوانیاندا دەڵێی لە ناوەڕاستی زەریایەك شاخی بۆردایە. . دیمەنەکە پاش ئەوەی کە دڵگیر و شادی بەخش بوو مات و خەمگین دەینواند.

لە نۆ و پێنج دەقیقەدا گەیشتینە دامێنی گەرووەکە. ئیتر بۆ نانی نیوەڕۆژە دانیشتین، کەلای جۆگەیەکی بچووك، لەژێر سێبەری بییەکدا، بۆمان ئامادە کرابوو.

ئەم گەرووەی (زاگرۆس) پێی دەوترێ (گاڕان)، کە وەك پێیان وتم ناوی شێخێك، یان وەلییەکە. بێگومان ئەم ناوەش، ناوی ئیسلامی نییە. دەربەندی (ئاردبابا)ش کە دەچێتە سەر (بانە)، ئاسانترین

گەرووە، بەڵام ئەم ڕێبازگەیە هەرگیز دڵگیر نەبوو، چونکە هەموو شتێکی لەبەر چاومان وای دەنواند، دەتوت ئاگری تێچووە. دەشڵێن ڕووە و خۆرهەڵات، تا سنووری هیند، درەخت نییە.

لە دوو و نیودا، لەم جێگایەوە دەستمان بەڕۆیشتن کردەوە، ڕێگاکەشمان بەدەم پێداسەرکەوتنی کێوە بەرز و ڕووتەنەکانەوە، هەر گەوە و پێچاوپێچ و بێ دیمەن دەبوو، لە تەڵاشەبەردی شکاو پێکهاتبوو، کە خاکێکی کەمێ سوور داپۆشیبوو. هیچ شوێنەوارێکی کار و کشتوکاڵیشمان تێدا نەدی، ڕێڕەویشمان (٧٠ پلە) ڕووەو باشووری خۆرهەڵات بوو. لە یازدە و چل و پێنج دەقیقەدا گەیینە چەمێکی بچووك (کە دیاربوو هەندێ جار دەبێتە سێلاوێکی توند)، ناوی (کاکو زەکەریا)بوو(١٥٩)، دەکەوتە لای چەپمانەوە. پێش ئەوەی لێی دووربکەوینەوە، دووجارمان لێدا. لە دوازدە و پەنجاوپێنج دەقیقەدا، لە ڕێگا گشتییەکەوە بۆ دۆڵێکی زۆر تەسك لاماندا. لە یەك و پێنج دەقیقەدا گەیشتینە گوندی (جانەوەرە)١٦٠ی پیس. ئێمە ئێستا لە ناوچەی (مەریوان) داین، کە گەورەترین بەشی (سنە)یە... سەروسیمای (گۆران)ە گوندنشینەکان وەك سەروسیمای ئەوانەی تورکیا، جوان نەبوون.

## ٢٣ی ئاب

ئەم بەیانییە لە پێنج و چارەکدا دەرچووینەوە. سەمتی ڕۆیشتنەکەشمان تا نیو سەعات ڕێکردن، کە تیایدا گەیشتینەوە سەر ڕێگا گشتییەکە، (٥٠ پلە) بەلای باشووری خۆرهەڵاتدا بوو، پاشان بەدرێژایی ڕۆیشتنی ئەمڕۆ (٨٠) پلە بەلای باشووری خۆرهەڵاتدا بوو، ڕێگاکە بەناو پێچ و توونکەی دۆڵە تەسکەکاندا پێچی دەکردەوە و هەندێ جاریش بەسەر شاخەکاندا تێپەڕ دەبوو، کە لە یەکتر جیا دەبوونەوە و بەشێوەیەکی گشتیش بەرەو ژوورکەکەی لە لێژاییەکەی زیاتر دەبوو، دیمەنی زەویش وەك دوێنێ قاقڕ و مات بوو. سەرنجماندا لە هەندێ شوێندا بە لوولەی دەستکردی گڵێن، ئاویان بۆ ئاوێژەی کشتوکاڵ ڕاکێشابوو. عومەر ئاغا ئاگاداری کردم کە خاکی ئێرە، لەوە بێ هێزترە ، بۆ بەروبوومی کشتوکاڵ، کەڵکی لێ وەربگیرێ، ئەگەر ئاوێژە نەکرێ، چونکە زستانەکەی زۆر ساردە و بەفرێکی ئەستووریش تا درەنگانێ لەسەری دەمێنێتەوە.

---

١٥٩- (کاکو زەکەریا) سەمتی لە خۆرئاوایە بۆ (شامیان)، پاشان لادەکاتەوە بۆ سەمتی (گاوەڕۆ)، دەڕژێتە (دیالە)وە.

١٦٠- لە دەقە عەرەبییەکەدا بە (جەناویرە) نووسرابوو، ئێمەش لە چاپی یەکەمدا بە (چە ناویرە)مان نووسیبوو، بەڵام وەك لە پێشەکی چاپەکانی دواتر دا ئاماژەم پێکردبوو، هاوڕێم کاکە ئەرسەلانی عەزیزی لە مەریوان ، بەوجۆرەی بۆ ڕاست کردمەوە (م).

لە شەش و پەنجا دەقیقەدا بەلای گردێکی توورەکەرێژدا تێپەڕبووین، سەرەوەی تەخت بوو لەوەی (چەمچەماڵ) دەچوو، دەکەوتە لای چەپمانەوە و لە دۆڵێکدا بوو لە نزیك بناری کێوێکدا، خەڵکەکە پێیان دەوت: (قالآ)، واتە: قەلآ. ئەگەرچیش هەرگیز نەدەگونجا قەلآ لە جێگایەکی وادا بێت، کە تەنانەت دەتوانرا لە چیاکانی دەوروپشتیەوە، بە بەردە دەستیش، هێرشی بکرێتەسەر.

پاش ئەوەی نزیکەی هەموو ڕێگاکە، کە لە (جانەوەرە)وە بە ڕێکەوتبووین، هەر سەردەکەوتین، نزیکەی چارەکە سەعاتێك داگەڕاین و لە سەعات هەشتدا گەیشتینە دوا بەرەوخوارکە، بەڵام یەکسەر بەسەر بەرەو ژوورکەیەکی درێژدا دەستمان بەسەرکەوتن کردەوە و لە هەشت و نیودا گەیشتینە ترۆپکەکەی. ئیتر لەوێوە دیمەنی کێوی (زاگرۆس)ی جوانمان لێدەرکەوت و هاتنە خوارەوەشی شتێکی وا نەبوو، باسکرێ.

لە نۆ و دە دەقیقەدا لە دۆڵێکی تەسکدا گەیشتینە لای ڕەشماڵی گوندنشینەکانی (بەڕووەر). گوندەکە بەسەر کێوەکانی لای چەپمانەوە بوو، کە نزیکەی میلێك دووردەبوو. گوندنشینەکانی (بەڕووەر) هەمیشە بە هاوینان لەم شوێنە هەوار دەکەن. ئێستا لە دروێنە بوونەتەوە و بە گا و هێستریان گێرە دەکەن(١٦١).

گەرما پێوەرەکەم لە کانییەکی سازگاری نزیك چادرەکاندا نقووم کرد، سەرم لە پلەکەی سوڕما، چونکە (٦١) پلە بوو.

لەناو (کا)یەکەدا پەلەوەرێکی گەورەم چاوپێکەوت، لە کوللە دەچوو درێژایی نزیکەی چوار گرێ دەبوو، باڵیشی نەبوو، شتێکی وەك شمشێر لە کلکییەوە بەرزببووەوە، گازێکی توند دەگرێ و زیانیشی بۆ کشتوکاڵ نییە. کوردەکان دەڵێن (شێرە کوللە)یە(١٦٢).

گیانلەبەرێکی تریشمان بینی، کوردەکان پێی دەڵێن (مشکە کوێرە)١٦٣

---

١٦١- گێرەکردنی دانەوێڵە تا ئێستاش لە سەرتاسەری عێراقدا بەم شێوەیە پەیڕەو دەکرێ ـــ ع.

لێرەدا تووشی یەکێك بووم لە سلێمانییەوە نێردرابوو. لەگەڵ ئەوەشدا کە بە پێ هاتبوو، بەڵام لەوێوە تا ئێرە، هەرسێ ڕۆژی پێچووبوو.

١٦٢- لە بەرامبەریدا وشەی (حەرکول) لە (تلمود)دا هەیە" یان (کازام)، کە جۆرێکە لە کوللە و لـە (رأس الرجاو الصالح) هەیە. بڕوانە ل١٣ و ١٤ی کتێبی (لەبارەی کوللەوە) لە نووسینی (لوود ولف) ـــ پەراوێزەکە دوایی هات ـــ بەڵام لە پەراوێزەکەدا وشەی (کازام)ی عیبری بە هەڵە (کارام) نووسرابوو ـــ ع.

١٦٣ وا دیارە هەواڵدەر و ڕێنیوێنەکەی ریچن وشەی (مشکەکوێرە)ی بە فارسی لە ریچ گەیاندووە، چونکە لە دەقەکەدا بە (مووشەکوێرە)یاداشت کراوە- م .

## ٢٤ی ئاب

نزیکەی پازدە ڕۆژێك لەمەوبەر هەندێ لە جافەکان، لەگەڵ هەندێ لە دراوسێکانیاندا بەشەڕ هاتبوون، یەکێکیان زامێکی کاریگەری بەشمشێر تێکرابوو، شەوی رابووردووش لەکاتێکدا سێ جاف بە مێگەلیانەوە تێپەڕبوون، پێنج شەش سوارەی خەڵکی ئەو ناوە، هەڵدەکوتنە سەریان و رووتیان دەکەنەوە و مێگەلەکانیشیان لێ زەوت دەکەن. عومەر ئاغا کە هەواڵەکەی بیست، دەستبەجێ چوار سوارەی خۆی نارد و دوای نیو سەعات گەڕانەوە هەوارەکە و دوو دیل و مێگەلەکەیان لەگەڵ خۆیاندا هێنابووەوە. شەوێ دوو هاوڕێی دیلەکان هاتن و کێشەکەیان براندەوە. ئەویش دیلەکانی بۆ بەردان و مێگەلەکەش بە خاوەنەکانیان درایەوە.

لە پێنج و نیودا دەستمان بەڕۆیشتن کردەوە، بەیانییەکی ساردبوو. تاوێ دوای ئەوەی گوندەکەمان جێهێشت، لە شاخێکی بەرزی کوورمان دا. ئیتر ڕێکردنی ئەمڕۆمان بەردەوام پێچاوپێچ و بەناو دۆڵی زوورگە کەلاوەکاندا بوو، کە لە خۆرهەڵاتەوە چەمێکی بچووکی تێدەڕژا و رووەو (گاوەڕۆ) دەڕۆیشت و دەڕژایە (دیالە)وە. ڕێڕەوی ئاوەکەش پڕبوو لە قامیشەڵان و بیی و سەوزاییە دڵگیرەکەی، پێچەوانەی ڕوخساری ماتیی ئەو شاخە کەلاوانە بوو. گوڵە کێویلەیەکی زۆریشمان بینی، لەگەڵ درەختێکدا، کە بە فارسی پێیان دەوت: (سنجد) و بە کوردی (سنجوێ، سنجوو، یان: سرینچك) و بە تورکیش (ئایدە)، کە بەرێکی وردی دەگرت، لە (عەنناب) دەچوو(١٦٤).

لە هەشتدا، بۆ سەیران لەگوێ چەمەکە دابەزین. پاش حەسانەوەیەکی کورت، دووبارە لە هەشت و چل دەقیقەدا دەستمان بەڕۆیشتن کردەوە. لە نۆ و نیودا گەیشتینە (دووەیسە)، کە گوندێکی گەورەی پیس بوو، بریتی بوو لە کۆڵیتی پیس پیسی بنمیچ نزم، کە لەمبەروبەری گردێکی کەوەلەی ڕووتەن دروستکرابوو. بەڵام لە دۆڵەکەدا و لە لاپاڵی هەندێ گردۆڵکەی نزمی دەوروبەریدا، باخ و ڕەزێکی زۆرمان بینی، کە دیمەنی ناوچەکەی لەچاو ئەو دیمەنەدا جوانتر کردبوو، کە لە (گاڕان)ەوە دیبوومانن.

پیاوماقووڵانی ئەم گوندە، جلوبەرگی ئێرانییانەیان لەبەرکردبوو، ئافرەتەکانیشیان وەك ئەوانیان کردبوو.

ڕێکردنی ئەمڕۆمان سێ سەعات و بیست دەقیقەی خایاند و ڕووەو باکووری خۆرهەڵات بوو، بەڵام زۆرم چێژ لێ وەرنەگرت، چونکە بەردەوام بە قیبلەنما، هەر سەرنجی سەمت و ڕووەکانم دەدا.

---

١٦٤- بە عیبری (غبیراو)ی پێ دەڵێن و لە عیراقیشدا بە (نبق العجم) ناسراوە ـــ ع.

گوندی (دووەیسە)ش کە ئەمڕۆ کردمانە قۆناغ، دەکەوێتە ناوچەی (حەسەن ئاوا)وە. هەروەها شاری (سنە)ی پایتەختی ناوچەکەش، کە بەلای خۆرهەڵاتی باشوورەوەیە، سێ فرسەخ لەم گوندەوە لێمان دوورە(١٦٥).

## ٢٥ی ئاب

دوێنێ شەو میرزا (فەتحوڵلا) گەیشتە گوندەکە، کە یەکێك بوو لە رازگر= نهێنی پۆشانی (والی سنە)، وا دیارە والی، کە ئێستا لە گەشتی ناوچەکانی باکووری میرنشینەکەیەتی، بە هاتنمانی زانیوە بۆ ناوچەکەی و فەرمانی بۆ (سنە) ناردووە، تا لە کۆشکەکەیدا دامان بنێن و بەو جۆرەش پێشوازیمان بکەن، کە وەك لە خۆی بکرێ. هەر لەبەرئەمەش کوڕی دووەمینی، کە ئێستا فەرمانڕەوای فەخریی شارە، بەخۆی و هەموو بەشەکانی لەشکرەکەیەوە، خۆی بۆ پێشوازی لێکردنم ئامادە دەکات. ئەمەش شتێك بوو، خۆمم لێ دەپاراست، لەبەرئەوە سەرومڕ ئەمجۆرە خۆ ئامادەکردنانە ڕەت دەکەمەوە. فەرمانی (خان)یش مشتومڕیان لەسەر نەدەکرا، چونکە لەوجۆرە پیاوانە نەبوو فەرمانەکانی جێبەجێ نەکرێن، ئەگەر بچووکیش بن، بۆیە بەگران خۆم لەمجۆرە ئاهەنگە پێ دەرباز دەکرا. داواکەشم سەری نەدەگرت ئەگەر بەتوندی ئەوەم بۆ ڕوون نەکردایەتەوە، کە ئەگەر هەر سووربن لەسەر مەبەستی خۆیان، یەکسەر دەگەڕێمەوە بۆ ئەو شوێنەی لێوەی هاتووم و هۆیەکانیش بۆ (خان) ڕوون دەکەمەوە. پاشان لەسەر ئەوە ڕێکەوتین کە دووان، یان سیان، لە پیاوماقوڵان، لە باخچەکەی (والی)دا پێشوازیم لێ بکەن، کە خۆمیش هەر لەوێ دەبم.

میرزا، نامەیەکی (محەمەد خان)ی میری گچکەی بۆ هێنابووم، لەگەڵ دیاری شەش باری هێستر میوە و بارێکیش بەفردا. وتووێژ، تا شەش و نیو نەیهێشت بزووم.

ڕووی زەوی وەك خۆی وابوو، شتێکی وای نەگۆڕابوو.لەوە پتر کە زیاتر لەبەرچاو بوو، لە هەندێ دۆڵدا باخ و ڕەز و گوندی بچووکمان دیتن. تا زیاتریش لەشار نزیك دەبووینەوە، زەوی لێژتر دەبوو، پاشان لەپشت شارەوە دووبارە بەرزدەبووەوە و پاش چەند هەردە و هەڵەت و

---

١٦٥- بەگوێرەی قسەی مێجەر (ڕەنل)، فرسەخ لە سێ میل و نیوی بەریتانی کەمترە. بڕوانە ل (٤)ی کتێبی (گەڕانەوەی دە هەزارەکە). بەڵام میستەر (فریزەر) لە لاپەڕە (٣٦٧)ی کتێبی (گەشتێك لە خوراساندا، دەڵێت فرسەخی خۆراسانی، کەمێك لە فرسەخی عێراقی زیاترە و لە چوار میلی بەریتانیش کەمترە.

زوورگێکی تر، زنجیرە کێوی بەرزی (بازرخانی)(١٦٦) دەست پێدەکات، کە ڕووەو باکوور و باشوور درێژبۆتەوە. ڕێگاکانی هەمەدان و (تاران)یش بەسەر ئەم زنجیرە کورتەدا تێپەڕ دەبن.

لەسەرخۆ ڕێمان دەکرد، بەتایبەتی لە بەشی کۆتایی ڕێگاکە، چونکە هەستم بەئازارێکی زۆردەکرد و ژانەسەریش، کە پێشتر تووشم ببوو، زۆری بۆ هێنابووم.

(سنە) بەو کۆشکە جوانەیەوە، کە لەسەر بەرزاییەك دروستکراوە و قولیپ دەوری داوە و بەو هەندە خانووسازییە جوانەیەوە کە بەلاپاڵەکانەوە دروستکراون، دیمەنێکی زۆر لەوە جوانتریشی هەیە، کە پێشتر وام هەست دەکرد...

بەنزیکبوونەوەمان لە شار، بەلای ڕاستدا بۆ (باخی خوسرەو ئاوا) وەرسووڕاینەوە، کە چارەکە میلێك کەمتر بەلای باشووری خۆرئاوادا لێی دووردەبوو، بەلاپاڵێکەوە بوو، لە بناری شاخێکەوە هەڵدەکشا و لەسەر لووتکەکەی کۆتایی دەهات. باخەکە لە دوورەوە وای دەنواند کە دارستانێکی دارچنارە، چونکە جگە لەو، هەر تەنیا ئەو درەختە ڕاست هەڵچووە چڕانە نەبێت، ئیتر وارش و دیواری بۆ نەکرابوو. لە نۆ و پەنجا دەقیقەدا گەیشتینە دەروازەکەی. ئیتر یەکسەر دیمەنە جوانەکەی سەرسامی کردین و بەو تەلاّنەدا خۆمان بە ژووردا کرد، کە درەختی چناری بالاّ ڕێکوجوان، لە هەردوولایەوە داپۆشیبوو، کۆشکێکی گەورەی قەشەنگ و بەرز، باخات تێی ئالاّبوو، لەبەردەمی کۆشکەکە و لەپشتیشەوە حەوزی چوارگۆشەی جوان، فوارەیان بەسەرەوە بوو، فوارەکان ئاویان هەڵدەدا، سەبەتەی پڕ لە میوەی ڕەنگاوڕەنگیش بەدەوری حەوزەکەوە بوون. تەلارەکە، واتە کۆشکەکە زۆر قەشەنگ بوو، بەنیگاری زێڕینە، لەسەر شێوەی ئێرانییانە نەخشێنرابوو، لە باخچەکەدا داری میوەی دانسقە، بە کۆمەڵ، بە زەوقێکی ناسك، بەڕیز نێژرابوون. لە تەلارەکەوە بەسەر ڕێگا گشتییەکەی باخچەکەدا دەمانڕوانی، کە درەخت داپۆشیبوو. بەڕاستی دڵفڕێن بوو. ئەم کۆشکە چواردە ساڵ لەمەوبەر (ئەمانوڵڵاخان)ی والی ئێستا، بەیادی باوکیەوە: (خوسرەوخان)ی والی پێشوو، دروستی کردبوو، ناویشی نابوو (خوسرەو ئاغا). لەسەر پارچە زەوییەك دروستکراوە، شەش سەد گەزی

---

١٦٦- زوورگەکانی (بازرخانی) لە بانوویەکدا دواییان دێت، کە بەرزایی (هەمەدان)ە دوای گەیشتنە سەر بەرزاییەکانی ئەم زوورگانەش، پێدا شۆڕبوونەوەیان زۆر گرانە ـــ خاریچ.

سەرنج: دانیشتووانی (سنە) و دەوروبەری، جگە لە ناوی (بازرخانی)، هەندێ جاریش پێی دەڵێن (بازرجانی)، یان (بازرگانی)، یان: باجەرخانی ـــ م.

چوارگۆشەی شاهییە(١٦٧)بەسەر چەند گۆشەیەکدا دابەشکراوە، کە تەلاّنی پڕ لە چنار جیایان دەکاتەوە و تەلاّن، یان راڕەوێکی سەرەکیش لە ناوەڕاستیاندایە. ناو چوارگۆشەکانیش ئەو درەختی میوە جۆراوجۆرانەیان تێدا نێژراوە، کە لەم ناوچانەدا دەڕوێن. لە نزیك تەلارەکە و تەلاّنە گشتییەکەش ئەو گولاّنە نێژرابوون، کە بەدیوار و درەختدا هەلّدەگەڕێن.

لەبەردەم دەروازەی کۆشکەکەدا، میرزا فەرەجوللّای مامی میری گچکە، کە بەڕێکەوت لە (سنە) بوو، لەگەلّ (عینایەتوللّا بەگ)ی گەورە پیاوی ناوداری شار و پیاوانی تری بەڕێز، کە ناویانم لە یاد نییە، پێشوازییان کردم.

دوای نیوەڕۆ، تەتەرێکی پەلە، لای والی خۆیەوە بۆ لام هات ، تکام لێدەکات دوای مانەوەم و ڕابواردنم لە (سنە)، بەو ڕێگایەدا بۆ سلێمانی بگەڕێمەوە، کە ئێستا ئەو خۆی لەسەرێتی. لەبەرئەوەش کە ئەم ڕێگایە کۆسپی زۆرم ناهێنێتە بەر و دەرفەتی دیتنی هەندێ شوێنی تازە و گرنگیشم بۆ دەڕەخسێنێ، بۆیە بۆ وەلاّمی خواستەکەی خۆم گورج کردەوە (١٦٨).

---

١٦٧- یان گەزی شاهی، کە نزیکەی دە یاردەی ئینگلیزییە ــ پەراوێزەکە دوایی هات. ئەمەش ناچێتە عەقلّەوە و دەبێ هەلّەیەکی چاپ بێت. ڕاستییەکەیشی نزیکەی یاردە و دەیەکی یاردەیەکە. درێژایی گەزی شاهی ئێستا، لە بەغدا یەك مەترە. لە قاموسی (F, STEINGASS)ی فارسی ــ ئینگلیزییشدا درێژایی گەزێك، ئەوەندەی پانایی ٢٤ پەنجە، یان شەش جار چوار پەنجەیە. بەلاّم گەزی شاهی وەك لە کتێبەکەی (نادر شاە)دا هاتووە، کە لە (ل. لوکهارت ــ ١٩٣٨ز ــ لوزان ــ لەندەن) نووسیویێتی و ناوی ناوە (گەزی شایگان)، پێوانەی نیو بالاّپیاوی مام ناوەندییە و ئاسایی لە (خۆراسان) بەکار دێت.

پێش ئەوەی یاردە لە بازاڕەکانی بەغدا پەیدابێ و پێوانەکانی دەیەی مەتریش بلاّوببنەوە، پێوانە سەرەکییە بەکارهێنراوەکانی بەغدا بەجۆرە بوون:

گەزی بەغدایی ٥.١٧ گرێیە و گرێی بەغدایش دەکاتە ١٦.٤ سانتیم، گەزی (حەلّەب)یش ١٦ گرێی بەغدابییە.

گەزی شاهی (کە باسەکەمان لەسەر ئەمەیە) دەکاتە گەز و نیوێکی حەلّەب. خۆ ئەگەر بۆ گرێی بەغدایی و سەنتیمەتریشی بگێڕینەوە، نزیکەی مەترێك دەکات.

پاشان گەزی ئاسایی، کە زۆرجار گەزی بەنای پێ دەلّێن و درێژاییەکەی ئانیشکی پیاوێکی ئاساییە. لە سەرەتای ئانیشکەوە بۆ کۆتایی نینۆکی پەنجەی ناوەڕاست. ئەمەش دەکاتە نزیکەی نیومەتر، یان دوازدەگرێی بەغدایی ــ ع.

١٦٨- والی لە نامەیەکدا باسی ئەوەی کردبوو کە لە دەمێکەوە دەنگوباسی میستەر (ریچ)ی بیستووە و ئارەزووی دیتنی دەکات ــ خاریچ.

یەکجار سەرسامی باخچە و تەلارەکە بووم، کە تا ئێستا وێنەیانم لە خۆرهەڵاتدا نەدیبوو. تەلارەکەش وەك خانووسازییەکانی تری هاوشێوەکانی، چاولێکەری شێوەی (جوسق = چارباغ)ی ئەسفەهان و شوێنەکانی تری وەك ئەوە، کە سەردەمیان بۆ ڕۆژگاری دەوڵەتی سەفەوی دەگەڕێتەوە.

پاش چاوەنوارییەکی درێژ، کە لە برساندا هێزمان لەبەر بڕابوو، بۆ شێوکردن، یان بە واتەیەکی تر بۆ نانێکی دەوڵەمەندانەی ئێوارە، بانگکراین، کە بۆ بەردەمی هەریەکەمان سینییەك تەرخان کرابوو. دووبارەش لە دەی شەودا، بۆ نانێکی وەك ئەمە بانگکراینەوە.

ئەو پیاوانەی لێرە چاوم پێیان کەوت (کە هەموویان گۆران بوون) ئاخاوتنیان بە کوردی گۆرانی بوو ـــ بەڵام لەگەڵ مندا بەفارسی دەدوان. هەمووشیان جلوبەرگی ئێرانییانەیان لەبەر کردبوو، کە دڵی پێ نەدەکرایەوە و بە هیچ جۆرێ ئەو راستگۆیی و پیاوەتییەشیان تێدا نەبوو، کە لە هاوڕێیانی بابانیمدا هەبوون. بێگومان جلوبەرگی ئێرانی و نەریتی ئێرانییانەیان لێ نەدەهات و لەم بوارەدا من پێم وایە، ئەمانە لەچاو کورددا نزمترن ١٦٩، چونکە سەروسیمایان داتەپیویی و ژێردەستەیی دەنواند. عومەر ئاغاش لەبارەیانەوە وتی: (ئەمانە خێڵەکیی نین). منیش دان بەوەدا دەنێم کە سەروسیمای عومەر ئاغا، تەواو پێچەوانەی ئەوان بوو، چونکە ئەو، بەسەروسیمای سەربازییانە و بەو جلوبەرگە بریسکەدار و سەروپێچە بەڵەکە هەڵگەڕاوەیەوە بۆ دواوە، کە هەنیەی جوانی دەرخستبوو، بە هەموو مانای وشەوە، پیاوەتیی لێ دەباری و لەناویاندا دەتوت شازادەیە، وەك سەرنجیشم دا ناوبانگێکی بڵاو و ڕێزێکی گەورەی لەم دەوروبەرەدا هەیە.

## ٢٦ی ئاب

ئێرانییەکان لە یەك لایەنەوە وەك تورکەکان بەوێل نین، کە دەستبەردارت بن و وازت لێ بهێنن. بەڵام کە سەرکردەیەکی تورك لە ماڵەکەی خۆیدا پێشوازیت دەکات، ئیتر دەڕوات و جێت دەهێڵێ، مەگەر خۆت ئارەزووی دیتنی بکەیتەوە، بە تایبەتیش کە خانمێکت لەگەڵدا بێت. کەچی ئێرانییەکان شەو و ڕۆژ تێت دەئاڵێن و ڕێگای دەربازبوونت لە دەستیان نییە، ئەگەر لە دەرەوەی شار بیت. هاوسەرەکەشم نەیتوانیبوو بێتە دەرێ و چاوێك بە کۆشکەکەدا

---

١٦٩- رەنگە ریچ لێرەدا مەبەستی لە (کورد)، پیاوگەلی خێڵی (جاف)بێت، کە لەو سەردەمەدا بە (جاف) وتراوە: کورد وبە دانیشتوانی قەڵەمڕەوی ئەردەڵانیش وتراوە: گۆران (م).

بگێڕێ. بەڵام بۆم دەرکەوت ئەگەر لە شار نیشتەجێ بین، دەتوانین بڵاوەیان پێبکەین. لەبەرئەوەش کە خانەخوێیەکانمان دەیانویست بمانبەنە ئەو بەشەی لە کۆشکەکەدا بۆمانیان ئامادە کردبوو. منیش لەوانە بووم کە ئارەزووی دیتنی هەندێ لە شارەکەم دەکرد. ئەم بەیانییە پێشنیارەکەیانم پەسەند کرد و باخچەکەمان جێهێشت و پاش ئەوەی بەسوارییی، بەو لاپاڵەدا شۆڕبووینەوە، کە کۆشکەکەی لەسەر دروستکراوە، دوای چەند دەقیقەیەك گەیشتینە لێواری دەرەوەی دیواری شارەکە، کە لە قوڕ دروستکرابوو. لێرەوە ئیتر بە شەقامێکی سەختی پیسدا سەرکەوتین، تا دەروازەی قەڵاکە، یان کۆشکەکە، لەوێ ئەو پاسەوانانەمان دین، کە چاوەڕێی سڵاوی پێشوازی لێکردنمان بوون. ئەم پاسەوانانە نزیکەی دووسەد هەورامی چەکدار دەبوون کە تفەنگیان پێبوو و شەرەفی پاسەوانێتی کۆشکەکەیان پێ سپێرابوو. پیاوگەلێکی سەروسیما سەیربوون (سیمای خێڵایەتیان تێدا نەدەبینرا)، لەسەر شێوەی ئێرانی جلوبەرگی خوری سپی و ئەستووریان لەبەردابوو، کڵاوبورگی



**دوو سەربازی کورد- لە هەورامان**

سەیریان لەسەر کردبوو، کە لە لبادی ڕەش و تەپڵە سەرەکەیشی قووچ بوو، لە دامێنیشیەوە پەلکی درێژ و باریکیان پێوەبوو، لە شتێکی وەکو هی جاڵجاڵۆکە دەچوو١٧٠. کە بەلایاندا تێپەڕبووین، خۆیان بەسەر تفەنگە درێژەکانیاندا دابوو، لێمان ورد دەبوونەوە.

لە هەیوانێکەوە کردیانین بە ژوورێکی گەورەدا، بەسەر شاردا دەیڕوانی. پاش چەند دەقیقەیەك (خانی گچکە) هات، کە مێرد منداڵێکی جوانی نۆ و دە ساڵان دەبوو، بەڵام ویقار و قورسیی و سەر و ڕوخساری لەوە زیاتر بوون، کە منداڵێك لەو تەمەنەدا هەیبێ، لەوەش دەچوو بۆ ئەم بۆنەیە خۆی وا نیشان بدات. عینایەتوڵڵا بەگ کە لەسەر دەستووری ئەوانەی لەناو کۆشکدان، شاڵێکی لەسەروپێچەکەیەوە ئاڵاندبوو، وەك سەرۆکی تەشریفات و زمانحاڵی (خان) خۆی دەنواند. بەڵام میرزا فەرەجوڵڵا، لەپاڵ خوشکەزاکەیدا ڕاوەستا بوو. هەر نۆکەر و کەسێکی تریش بهاتنایەتە ژوورەوە، لای (خانی گچکە)، چەمینەوەیەکی خاو و سستانە دەچەمینەوە، بەڵام ئەو، گوێی بە کەسیان نەدەدا.

قاوە و شەربەت و سینییە حەڵوا سازکرا و میری گچکە بەدەستی خۆی قاوە و شەربەتی دامێ. سەرنجمدا تێکڕای ئێرانییەکان، زۆر بێ سەروبەر حەڵوایان دەخوارد. قسە و باسێکی وا گرنگیشمان نەگۆڕییەوە، لە خۆشهاتن و چاك و چۆنی و ئەمجۆرە شتانە زیاتر. پاش ئەوەی خانی گچکە مۆڵەتی لێ خواستین و جێی هێشتین، گەشتێکمان بەسەرلەبەری کۆشکەکەدا کرد.

تەلار (pavilion)ێکی تازە، لەپشت بێڵای سەر دەروازەکەوە هەیە، ناوی (خوسرەوی)یە، بەناوی گەورەترین کوڕی زیندووی (خان)ەوەیە، ناوبراو، کە ناوی (خوسرەوخان)ە، بەڵام لەم دواییەدا لەبەر خۆشەویستیی (محەمەد عەلی)، ناوی نراوە (محەمەد عەلی).

لە نزیك ئەو ژوورەشەوە کە بۆ منیان سازکردبوو، هۆڵێکی کۆنی پێشوازیی هەبوو، چل و حەوت ساڵ لەمەوبەر خوسرەوخانی باوکی ئەمانوڵڵاخان، دوای هاتنە دنیای (والی)ی ئێستای کوڕی، دروستی کردبوو. ئەو نەخش و زەخرەفە زێڕینەی کە ڕۆژێك لە ڕۆژان جوان بووە، ئێستا وایان لێ هاتووە چاك ناکرێنەوە. دیوارەکانی هۆڵەکە تا بەرزایی نزیکەی چوارپێ،

---

١٧٠- بڕوانە وێنەکە ــ پەراوێزەکە دوایی هات ــ ئەم کڵاوانە بەلای ئەوسای لەشکرەکانی خۆرهەڵاتەوە نامۆ نەبوو. یەنی چەرییەکانی ناو سوپای عوسمانی، بۆ ڕازاندنەوەی کڵاوبەرگ، هونەرێکی زۆر سەیریان بەکار دەهێنا و بۆ هەر پلەوپایەیەکی ڕیزەکانی سوپا، کڵاوێکی تایبەتین هەبوو، کە بۆ سەربازە یەنی چەرییە تۆپچییەکان، ئەوانەی پێیان دەوتن (خومپارەچی)، کڵاویان هەبوو، لەم جۆرە کڵاوەی ئەم وێنەیە دەچوو ــع.

تەختەیان تێگیرابوو. وێنەی گوڵیان لەسەر کرابوو. لە بەشی سەرەوەی دیوارەکانیشیدا وێنەی هەمەجۆرەیان تێدابوو، کە شەڕی (چالدێران) و ئەو شەڕەی دەنواند، کە لەنێوان (تەیموری لەنگ) و (بایەزید)دا ڕوویاندا بوو لەگەڵ وێنەی هەندێ لە پاشایانی سەفەوی ئێران و وێنەی شای ئێستا(١٧١)، بەڕیشە سەیرەکەیەوە و وێنەی (ئەسکەندەری گەورە)ش، لەکاتێکدا خەریکی لەبەرکردنی جلی ئێرانیانەیە، کە دەموچاوی ئافرەتێکی ڕووتیان لەجێی سەری داناوە، کاتژمێرێکیش لە تەنیشتیەوەیەتی. ئەوەشی سەیرە ئێرانییەکان، ئەسکەندەر وا نیشان دەدەن کە لاوێکی کۆستەی لووسکە و ڕوخسار جوان بووە.

پێشەوەی هۆڵەکە ئاوەڵابوو، بە دیرەگ ڕاگیرا بوو، لە سەریشەوە پێش هەیوان، یان (بێلا)یەك هەبوو، ئێرانییەکان پێیان دەوت (شانشین)، کە نەخش و نیگارێکی زۆر دانسقەی تێدا کرابوو. ئەمجۆرە پێش هەیوانانە، پێیان دەوترێ (تەلار ــ هەیوان)، کە هەموویان چاولێکەری خانووسازیی سەفەوییەکانن لە ئەسفەهان. رووبەری ئەمجۆرە هۆڵە، جگە لە بێلاکە، پەنجا پێ درێژ و بیست پێ پانایی بوو.

ئەگەر کەمێکیش بەلای سووچی ئەم هۆڵەدا لابکەینەوە، کە بە ئەستێرە و گوڵ ڕازاوەتەوە، ئەو هۆڵە تازەیەی پێشوازیی دەبینین، کە چوار ساڵ لەمەوبەر (ئەمانوڵلاخان) دروستی کردبوو.

---

١٧١- فەتح عەلی شاە: دووەمین شای بنەماڵەی قاجارەکانە. دوای مردنی (ئاغا محەمەد خان)ی مامی جێگەی گرتەوە. دوای پشێوییەکی ناوخۆی سوپا، چووە سەر تەخت. ئەوکاتە حاکمی ئەیالەتی (فارس) و جێنشین بوو. ئیتر لە (شیراز)ەوە بەرەو پایتەخت کشا و بە پشتیوانی (حاجی ئیبراهیم)ی سەرۆك وەزیرانەوە سەرکەوت. ئەمەش لەساڵی (١٢١٢ك ــ ١٧٩٨ز)دا بوو. ساڵێکیش دوای ئەم ڕووداوە، تاجی نایە سەری. ماوەی (٣٧ ساڵ ) فەرمانڕەوایی کرد و ساڵی (١٢٥٠ك ــ ١٨٣٤ز) مرد.
ئەو ڕووداوانەی لەسەردەمی ئەودا روویاندا، ملکەچ پێکردنی سەرانی خۆراسان و دەست بەسەرداگرتنی گەورەترین بەشی ئەو ئەیالەتە و شەڕکردنی لەگەڵ ئەفغان و پاشان لەگەڵ ڕووسدا، کە بووە هۆی لەدەستدانی گەرەج. بەوە ناسرا کە توانی لەبەر تەماعی ناپلیۆن، لە ئێراندا ڕابوەستێ. ئەمەش وای کرد هەر یەکسەر دوای چوونە سەرتەختی، ئینگلیز لەگەڵیدا پەیمانی بەست. هەر بە هۆی ئەمەشەوە بوو ئیتر ئەفغانەکان ئەوەندە شەڕیان بە هیند نەفرۆشت و بازرگانیش لەنێوان هیند و ئێراندا گەشەی کرد. سەردانی (سیر جون ماڵکولم)یش، وەك وەزیرێکی سەر ئاسایی لای دەرباری ئێرانیی، لەسەردەمی ئەمدا بووە. ــ ع.

ئەم ژووره له هۆڵەکه گەورەتره و ڕووی پێشەوەی به پەنجەرەی پڕ له وێنەی ڕەنگین گیراوە. ژوورێکی یەکجار قەشەنگە. به مەڕمەڕێکی کەمێك تەنك، یان له (خارا)یەکی دەماراوی، دیوارەکانی داپۆشراوە. به هەمەڕەنگ و زەوقێکی جوانیش نەخشێنرا بوو، پلەکانی پلیکانەکەش هەر له خارای دەماراوی، که له شاخێکی لای ڕێگای (هەمەدان)ەوە بۆی هێنرابوو، زۆر به پەرۆشیش لەسەرخۆ، له زەوی دەرهێنرابوون. بەڵام ئەوەی که زیانی به جوانیی هۆڵەکه گەیاندبوو، ئەو وێنانه بوون که له بەشی سەرووی دیوارەکان یەکجار ناشیرین دروستکرا بوون، له وێنەی سەر دروشم دەچوون، که مەلیك (سلێمان و سەبەو)ی شاژنیان دەنواند، لەگەڵ وێنەی (جەنگی دەهلی) و (نادر شاە)دا، که تاجەکه بۆ مەغۆل دەنێرێتەوە و چەندان وێنەی تری لەم بابەتە ڕووداوانە. لەمانەش ناخۆشتر قوتکردنەوەی ئەو وێنانه بوون، که دەیانوت گوایه وێنەی ئیمپراتۆری ڕووسیا و میری ئێستای بەنغال و فەرمانڕەوای گشتی هیند و پاشای ئیسپان و ئیمپراتۆری ئەڵەمانیا و بوناپارتە، که تفەنگ و نێزەی بەدەستەوە گرتبوو، هەمووشیان بێ سەر و بەربوون و به هیچ جۆرێك نەسیما و نەباڵایان لەو کەسانه نەدەچوون. وێنەکەی ئیمپراتۆری ڕووسیا نەبێ، هەر یەکەمین جار سەیرت بکردایه، دەتناسییەوە. هەروەها وێنەی خاوەن شکۆ (شای ئێران)یان کردبوو بەڕیشە ترسناکەکەیەوە، که مجەوهەرات قورسیان کردبوو. تەنیشتەکانی هۆڵەکه و دوو بیلای بچووکی بەرزبوون، که پێیان دەوت: (باڵاخانە) و زۆرجوان ڕازاندبوویاننەوە. من وای دەبینم که وشەی (باڵکۆن)ی ئینگلیزی، هەر وشەی (باڵاخانە)یە و شێوێنراوە. هەموویشی بەڕەنگی ئاویی زێڕین، ڕەنگکرابوون، له ڕاستیشدا سواخی دیوارەکه بەو خارا دەماراوییە، زۆرجوان و قەشەنگ بوو. خۆ ئەگەر لەجیاتی ئەم وێنه بێ سەروبەرانە، وێنەی دەستکردی (ڕۆبین)یان تیدا بکردایه، که ڕەنگه هونەرییەکانی لەگەڵ بەشەکانی تری هۆڵەکەدا دەگونجا. یان ئەگەر ئەویش پەیدا نەبوایه (که هەرواش دەبوو)، له بری ئەو، پارچە فەرشی (گوبلین)یان پێدا هەڵبواسیایە، دەبووە ژوورێك، ئەوەی دەهێنا لەهەموو شوێنێکی ئەوروپاوە سەفەرت بۆ بکردایه.

کەمێك لەولای ئەم هۆڵەوە، ژوورێکی بچووك هەیە، هەموو دیوارەکانی ئاوێنه بەندن و یەکجار سەیر به مەسینه و پەرداخ و شووشە و چینی و فەخفوری و شتی تر ڕازێنراوەتەوە.

ئێرانیگەل چێژێکی زۆر لەمە وەردەگرن، بۆیە که بەم ژووره عەنتیکانەدا دەیانگێڕام، دانیان کیبڕ دەکردەوە و له دەم و چاوم ورد دەبوونەوە، بزانن نیشانەی سەرسوڕمانم لێ دیار دەدات!. کەمێکی تر لەولای ئەم هۆڵەوە میحرابێکی بچکۆلەی جوان و هەندێ خانووبەرەی

تر هەبوون، هێشتا تەواو نەببوون، یەکێکیان پەنجەرەیەکی ئینگلیزی تێدابوو، بەسەر هۆڵ و سەکۆکەدا دەیڕوانی، ئەم کۆشکە دەبێ دوای تەواوبوونی، کۆشکێکی زۆرجوان دەربچێ، بەڵام هێشتا هەر گەلێ شوێنەواری دزێوی خۆرهەڵاتییانەی تیا دەمێنێتەوە، وەك ڕاڕەوی تەنگ و تاریك و پیس و پلیکانەی ترسناك و شتی تریش. لە یادیشم چوو، لە باسی هۆڵەکەدا ئاماژە بۆ ئەو وێنە تازەیە بکەم، کە جەنگی (مەریوان)ی دەنواند. تیایدا ئەمانوڵڵاخان و ئەو گۆرانانەی لای ئەوی بەزەقی دەنواند، کە (سلێمان کەهیا) بە دیلی دەبەنە بەردەم، پێشتر باسی ئەم جەنگەمان کرد، کە (دە) دەقیقەی خایاندووە و تیایدا (کەهیا) خۆی بەدەست (ئەوڕەحمان پاشا)وە داوە، بەبێئەوەی ئێرانییەکان، یان گۆرانەکان بچنە شەڕەوە(١٧٢).

ئەمانوڵڵاخانیش وەك هەر ئێرانییەکی تر، خولیایەکی سەیری لە خانوو دروستکردندا هەیە. خولیایەکە بەئاسانی دەتوانێ تیایدا نقوم بێت. چونکە بەئاسانی بۆی دەلوێ کرێکاران و پیشەسازان بەبێگار بگرێ، کاری بۆ بکەن، بەرامبەر بەوەی هەندێ دەسەڵاتی وەك ئەوەیان بداتێ بتوانن وڵاخی دێهاتی بەبێگار بگرن، یان لەوەیان خۆش بێت، کە میوانی دەوڵەت و فەرمانبەرانی رانەگرن. یان لە خاوەن قەرزەکان بپارێزرێن، یان لە هەندێ شتدا چاوپۆشییان لێ بکات، کە لەو بابەتەن و خولیا و ئارەزووەکانیان دەپارێزێ.

بۆیە دروستکردنی مزگەوتێکی جوان و دەستکاری کردنەوەیەك لە کۆشکەکەدا و هەندێ گەرماو و خان (کاروانسەرا) و بازاڕێکی گەورە لە دەوری مەیدان، شتێکی وایان تێنەچووە و هەمووشیان لەو شتانەن کە لەگەڵ زەوق و ستەمی ئەمانوڵڵاخاندا دەگونجێن. ئەمانە وا دەکەن گەشتوەر سەرسامی قەبەییەکەی بن. بەڵام هاوواڵاتیانی هەژار و دێهاتیی کلۆڵ لە باسی پرۆژە و خانووبەرەکانیدا، دەناڵێنن.

کۆشکەکە بەسەر بەرزاییەکەوە دروستکرابوو، لە هەموو لایەکییەوە بەسەر شاردا دەیڕوانی، دیوار و وارشێکیشی لە قوڕ بۆ کرابوو، حاڵی باش نەبوو. بەشێکی شارەکە کەوتبووە دامێنی شاخەکەوە، پاشان دیوار و وارشێکی تری قولیپدار، لەپشت ئەویشەوە بەشێکی تری شار، کە ئەویش هەر وارشێکی تری بۆ کرابوو.

ئەمانوڵڵاخان لەم چەند ساڵەی دواییدا شارەکەی زۆر گەورە کردبوو، ئەگەر لە بێللای کۆشکەکەوە بتڕوانیایە، هەندێ خانووی تازەت دەبینی، بەخشتی سوور دروستکرابوون. بەڵام

---

١٧٢- بڕوانە ئەو باسەی لەم بارەیەوە لە یادنامەی ڕۆژی ٢١ی ئابدا و پەراوێزەکەیدا هەیە.

خانووی ئاسایی، وەك ئەوانەی سلێمانی، لە خشتی کاڵ دروستکرابوون، لە هەموو لایەکیشیەوە ئەو زەوییەی دەوری شاری دابوو، لە ئاستی شار بەرزتر بوو، کە بە لاپاڵێکەوە بوو، دەچووەوە سەر دۆڵێکی پڕ لە ڕەزوباخ، ئەمەش وای لە کۆڵانەکانی شار کردبوو، هەردە و هەڵەت بێ و دووبارە دوای دۆڵەکە، زەوی بەرزتر ببێتەوە و وەك پێشتر باسکرا ببێتە زوورگی دابڕدابڕ، کە لە زنجیرەی (بازرخانی)دا کۆتایی بێت.

لێرەدا لە وەرزی بەهار و هاویندا (تای گەڕاوە) نامۆ نەبوو، بەتایبەتی ئەمساڵ زۆر بەخەستی هەموولایەکی گرتبووەوە. ئاویش بەشێوەیەکی دیار لەسەرتاسەری ئێران و کوردستانی تورکیادا، کەمی کردبوو. هەڵکەوتی شوێنی قەڵاکە و زەوییە بەرزەکەی دەوری (سنە)ش، لەو شوێنانە بوون، کە لەباری تەندروستییەوە پاکژ بوون.

دوای دیدەنی کۆشکەکە، بە ماندوویی گەڕامەوە ژوورەکەم ــ حەزیش لەوە ناکەم بۆ دیتنی ماڵان بسووڕێمەوە ــ بەڵام کە شێوێکی نایاب، یان بە واتای تر، نان و خواردنێکی ئامادەکراوم بینی، پەشیمان نەبووم.

دوای نانخواردن بۆ حەسانەوە، لە هۆڵەکەدا لێی ڕاکشام. کە خەبەرم بووەوە، هەندێ لە دەم سپیانی شار، سەردانیان کردم. کە شەویش درەنگ بوو، هاوسەرەکەم لە کۆشکەکە گەڕایەوە، بەڵام تا بوو بە سەعات (١٠)، نانی ئێوارەیان نەهێنا، بۆیە وەك بۆم دەرکەوت ئێرانیگەل، تا نەگاتە ئەو وەختانە، نانی ئێوارەیان ناخۆن.

## ٢٧ی ئاب

بەهۆی میرزا فەیزوڵلاوە زانیم کە کورد ناوێکی گشتییان بەسەر (زاگرۆس)دا بڕیوە، ئەویش ناوی (شاهۆ)(١٧٣)یە ئەم ناوە بۆ ناوی شاخی (جوانرۆ)ش هەر بڵاوە، بەڵام ئەو کوردانەی شارەزای ئەم ناوچانە بن، ئەم ناوە گشتییە بەسەر ئەو شاخانەدا دادەبڕن کە لە (شیراز)ەوە بۆ (بوشەهر) درێژ دەبنەوە و لەوێشەوە بۆ (بەندەر عەباس).

---

١٧٣- (ئینکەتیل دوبیرون) دەڵێ کتێبەکانی زەردەشتی، بە کێوی (ئەلوەند)ی نزیك (هەمەدان) دەڵێن (شاهۆ).

شاری (سنه)(١٧٤)، که پێشتر لەسەر گردێکی تەخت لە خوار ئێستای شارەوە بووە، سەد و حەفتا ساڵ لەمەوبەر یەکێك لە باپیرانی ئەمانوڵلاخان دروستی کردووە. ئێستا چوار، یان پێنج هەزار خێزانی تێدایە، لەمانە دووسەد خێزانیان جوولەکەن، پەنجاماڵیان کلدان و کاپولیکن و سەر بە بەتریارکی دیاربەکرن لە ئەبریشیەی مووسڵ، کەنیسە و قەشەشیان هەیە، هەمووشیان خاوەن پیشە، یان لە بوارێکی تەسکدا بازرگانن(١٧٥).

هاووڵاتیانی موسڵمانی شار، هەموویان سوننی شافیعی مەزهەبن. بەڵام والی و بنەماڵەکەی، لەبەر دڵنەوایی کردنی شای ئێران، خۆیان بەشیعە نیشان دەدەن.

لەکاتێکدا گەیشتینە (سنە)، لە پرسەدا بوون، چونکە شارەکە بەهۆی ئەم ڕووداوەوە لە ماتەمینی گشتیدا بوون:

محەمەد حوسێن خانی کوڕە گەورەی والی، کە دایکی لە خەڵکی رەشۆکیی و کچی پیاوێکی سەڕافی شارە، لە جێنشینیی میرنشینەکە، بێ بەری کرابوو، درابوو بە (محەمەد عەلی)، یان (خوسرەوخان)ی برای دووەمی، کە دایکی ئەمیان لەدوای بنەماڵەی (والی) خۆی، لە ڕەسەنترین بنەماڵەکانی (سنە)یە، جگەلەوەی کە خۆشەویسترین کوڕی باوکێتی. لەسەر ئەمە لەنێوان ئەم دوو برایەدا ناکۆکی پەیدابوو. باوکیان پشتگیری ئەمی دواییانی کردووە. محەمەد حسێن خانیش لەمە تووڕە بووە و هەندێ لە هەلپەرستانیش ئەمەیان بۆ مەبەستی گەورەکردنی ناکۆکییەکە قۆستۆتەوە و پەیمانیان داوەتێ پشتگیری بکەن و تەفرەیان داوە لە (سنە) هەڵبێت. ئەویش چەند مانگێ لەمەوبەر، ژمارەیەکی زۆری لەوانە، کە هاوپەیمانی بوون و لەناویاندا خۆشەویست بووە، لەگەڵ خۆی بردووە و ڕێی نێوان بەغدا و کرماشانی گرتۆتەبەر و بەدەم ڕێوە هەندێ لەو خێڵانەی داگیر کردووە کە سەر بە حکومەتی باوکی بوون و لەو دەشتی نێوان (بەغدا و خانەقین)ەدا خەریکی مێگەل لەوەڕاندن بوون.

بەڵام (والی) دوای وەرگرتنی ڕەزامەندی شای ئێران، بە لەشکرێکەوە شوێن کوڕەکەی دەکەوێ. (مانگی مارتی ڕابووردوو، کە من گەیشتمە خانەقین و قەسری شیرین، دوو ڕۆژ

---

١٧٤- ناوی ڕاستەقینەی (سنە)، (سنندج)ە، کە خەڵکەکە کورتیان کردۆتـەوە و کردوویانـە بـە (سـنە) ـــ پەراوێزەکە دوایی هات ـــ ڕاسترەکەی: (سانان دژ)، یان (سناندج)ە، کە لە دەقـی پەراوێزەکـەدا بەهەڵـەی چاپ (سناندرج) نووسرابوو ـــ م.

١٧٥- لە (سنە) فەرش دروست دەکرێ، لەوانەی (کرماشان) چاکترە.

پێش من(١٧٦)، والی جێی هێشتبوون و گەڕابووەوە)، ئیتر باوك و کوڕ، لە ناوچەی کرماشان بەیەك دەگەن و لەنێوان هەردوولادا شەڕێکی گەرم دەقەومێ. والیش فەرمانی توند دەردەکات کە کەس کوڕەکەی نەکوژێت و برینداری نەکات. بەڵام لەم پیاهەڵپژانەدا کوڕەکە بریندار دەبێ و دوای شەڕەکە بۆ (سنە)ی دەیهێننەوە و بەدەم ڕێگاوە لەبەر سەختیی زامەکەی دەمرێ. ئیتر والی هۆشی لەسەردا نامێنێ و هەر لە شوێن شەڕەکە، سەری ژمارەیەك لە هاوپەیمانانی کوڕەکەی دەپەڕێنێ و کە دەگاتەوە (سنە)ش، زیاتر لەسەد کەس لە پیاوماقوڵانی سنە، لە سێدارە دەدات و چوار سەد کەسی تریان، ڕووەو کرماشان لە دەستی هەڵدێن... ئەویش خانووەکانیان تێك دەدات و سامان و موڵکیشیان زەوت دەکات. ئافرەتەکانیشیان ناچار دەبن بە خاوخێزانەوە هاواری بۆ دێنن.

بەڵام (محەمەد عەلی)، یان (خوسرەوخان)ی کوڕی دووەمی، کە جێنشینی باوکێتی، لاوێکە، تەمەنی پازدە ساڵ دەبێ و پێشتر لەلایەن (شا)وە فەرمانی لە جێ دانیشتنی باوکی پێدراوە و کچێکی (شا)شیان بۆ دیاری کردووە، کە لە نەورۆزی داهاتوودا بۆی دەگوێزنەوە و بەو بۆنەیەوە لە (تاران)یشدا ئاهەنگی گەورەی بۆ دەکەن. والیش ئێستا خۆی خەریکی گەشت و سەردانی ناوچەکانە و زۆری بۆ هاوولاتیانی هێناوە، پارەی پێویست بۆ ئەم ژنهێنانە کۆبکەنەوە، کە ئەگەر نرخی ئەو دیارییانەشی بچێتەسەر، کە پێویستە بۆ (شا) بنێردرێ، ئەوا پارەکە زیاتریش دەکات. ئەو کوڕە بچووکەیشی کە لە (سنە) جێی هێشتبوو، ناوی (محەمەد خان)ە و تەمەنی نزیکەی دە ساڵێك دەبێ. والی هەشت کوڕیشی هەیە.

ئەمانوڵلاخانی١٧٧ سنە خۆی تەمەنی چل و حەوت ساڵ دەبێ و دەڵێن خۆی سەرداری وەخت و خاوەنی بڕیار و سیاسەتی ئێرانە. ئێرانیگەل خۆیشیان دەدان بەوەدا دەنێن کە لە هەموویان زیرەکترە و لەسەر ئەوە یەکن کە هەرچی ڕێگایەکی خۆ دەربازکردن لە فرتوفێڵ و

---

١٧٦- لە بەرگی دووەمی ئەم گەشتنامەیەدا باسێك لەبارەی ئەو گەشتەوە دەبینن کە میستەر ڕیچ بۆ کرماشان کردوویەتی.

١٧٧- کاتی خۆی لە ئێراندا چوار والی هەبوون، کە سەر بە پایتەخت بوون و ئەمانە بوون: میری ناوچەی گەرەج، میری سنە، میری لوڕستان، میری هوێزە، ئێستا هەر والی (سنە)یان لێ ماوە. میری (هوێزە) پێی دەوترا (مولی) و سەییدیش بوو، لە نەوەی پێغەمبەر، یان وەك خۆی دەیوت سەییدم. (کەلب عەلی خان)یش، کە لە نەوەی میرەکانی (لوڕستان)ە و ئەمانە لە خێڵەکانی فەیلین لەگەڵ میستەر (گرانت) و میستەر (فوژرنگهام)دا جەنگاوە.

چاو و ڕاوەکانی لەبەربگیرێ، بێ کەڵکە. هەروەها لەبارەیەوە دەڵێن گوایە یەکجار وریایە لە ڕاهێنان و ڕاکێشانی هەر کەسێکدا کە بیەوێ، بەچەندان جۆر ڕێگای لە خشتەبردن و بە کاری وا، کە خۆی لا خۆشەویست بکات. بەڵام هەرچی بکات و بنوێنێ، هەمیشە مەبەستی بەرژەوەندی تایبەتی خۆیەتی و پشتی پێ نابەسترێ. بەڕادەکیش خولیای سامان پێکەوەنان و ستەمکارییە، لە زۆربەی فەرمانڕەوایانی ئێرانی تێپەڕاندووە، بۆیە هەرکە ناوی دێت، میرنشینەکەی لە ترساندا لەرزی لێ دێت. لە کاروباریشیدا زۆر سەر دەرچووە و دەڵێن سامانێکی یەکجار زۆری هەیە، کە زۆربەی بە بازرگانێتی کۆی کردۆتەوە و سەرمایەی زۆریشی لای ژمارەیەك بازرگان داناوە، کە بۆ حسابی ئەم، بەکاری دێنن. نزیکەی پەنجا هەزار سەرمەڕیشی هەیە، لای خەڵکێکی زۆر دایناون، کە بۆی بەخێو بکەن و هەرکاتێکیش داوای کردنەوە، ئەگەر ڕۆژگارێکی زۆریشی بەسەردا چووبێ، دەبێ دەستبەجێ بۆی بهێننەوە. ئەمەش مانای ئەوەیە ئەم مێگەلەی، نەدەبێ نەخۆش بکەون و نەدەبێ بمرن و نەدەبێ گورگیش بیانخوات! بەکورتی شەریکی هەموو بازرگان و کاسبکارێکە لە میرنشینەکەیدا، یان بە واتەیەکی تر، یەکەمین قۆرخکارە تیایدا...

پێویستیم بە قوتویەکی تازەبوو بۆ قیبلەنماکەم، لەبەرئەوەش کە دار و تەختە هەمووی، بەڵکو دارتاشەکانیش هەموویان موڵکی والی بوون، بۆیە ناچار بووم لای میرزا فەرەجوڵلاوە فەرمانێك بۆ دروستکردنی وەربگرم. ئەم ڕووداوە جارێکی تریش دووبارە بووەوە، کاتێ داوای قەیتانێکی ئاوریشمینم بۆ دەمانچەکەم کرد و جارێکیشیان داوام لە (ئۆفانس)(١٧٨)کرد هەوڵ بدات هەندێ (مەی) پەیدا بکات، ئەویش داوای لە (دیان)ێك کردبوو، لە وەڵامدا وتبووی: ئەگەر فەرمانی پێ نەکرێ، ناوێرێ بیداتێ، چونکە والی ئاگای لەوە هەیە چەند شووشە مەی لە ماڵەکەیدا هەیە. هەموو شەریکەکانی والیش بەشەکانی خۆیان لە کاسبیەکانیاندا هەرچەند بێت، دەبێت زۆر چاك ئاگاداری ئەوەبن داهاتەکەی، داهاتێکی ڕێکوپێك بێت.

---

١٧٨- کوفا ئۆفانس: یەکێك بوو لەو دوو سکرتێرە (سیڤیل) ئەهلییەی لە پاشکۆیەتی بنکەو بارەگای نیشینگەیی بەغدادا بوون. بە ئەرمەنیی لە دایك بووە و سەر بە ڕێبازگەی کاپولیکی رۆمانی بوو. بەهۆی ڕاستگۆییەکەیەوە، لە وڵاتانێکدا کە ڕاستگۆیی تێدا نییە و لەبەر وەفادارییی و ڕەوشتی بەرزی و هەڵسوکەوتی سەرنج ڕاکێشەرانەی، لای میستەر ریچ جێگایەکی تایبەتی هەبووە ـــ خاریچ.

(کورگەچی باشی ــ کارگەچی باشی)یەکەی والی، یان کارگەچییەکەی، کابرایەکی دیانە و کاتی خۆی والی، دووسەد تمەنی بۆ حسابی خۆی داوەتێ تا بازرگانی پێوە بکات، بەو مەرجەی سالآنە بەرێکوپێکی بیست تمەن بە والی بدات. بەلآم کابرای بەستەزمان سەیر دەکات لەم ئیشەدا زیان دەکات، لەدڵیشەوە حەزدەکات پارەکەی بۆ بگێڕێتەوە، بەلآم ناوێرێ تەنانەت ڕازی دڵیشی لا بدرکێنێت. والیش ئێستا خەریکی گەشتی ناوچەکانی میرنشینەکەیەتی و خەڵکی (سەقز) ڕاسپێرییان کردووە، کە شەش سەد تمەنی بۆ دەنێرن و سەردانیان نەکات، ئەویش وەلآمی دابوونەوە، کە سەردانیشیان دەکات و هەزار تمەنیشیان لێ دەسێنێ و گەلێ شتی تری عەنتیکەم لەم بارەیەوە بیستووە... هەر پێش ماوەیەك چوار پیاوماقوڵی (سنە)، بۆلای (شا) چووبوون و بەسەر خاك و پێیدا کەوتبوون و دادیان لەلا دەربڕیبوو، کە (والی) زوڵمیان لێ دەکات و لە خاوەن شکۆی دەپاڕێنەوە تا لە (والی) بیان پارێزێ. ئەویش ناردبوونی بۆلای (محەمەد عەلی میرزا)ی کوڕی. والیش داوای کڕینەوەی کردبوون و بەمجۆرە مامەڵەیان دەست پێکردبوو، پاشان ڕێککەوتبوون، لەسەروو ئەمەشەوە والی ئەوەی لای میر (محەمەد عەلە میرزا) باسکردبوو، کە لەسەر ئەو پارەیەشەوە لەسەری ڕێکەوتووین، ئەگەر هەر لە کرماشان چاویان هەڵبکۆڵێت، دووهەزار تمەنی تریشت دەدەمێ. (میر)یش رازی دەبێ و چاوی ئەو کلۆلآنەی دەرهێناوە و بەچاو بەستراوی بۆ (سنە)ی ناردن.

سەرلەبەیانی سەردانی (خانی گچکە)م کرد، کە لەسەر (شانشین)ی هۆڵەکە دانیشتبوو، عینایەتوڵلا بەگ و خانەدانێکی تری لابوون، هەردووکیان جلی فەرمیی ــ رەسمییان لەبەردا بوو. ئاساییانە ساردەمەنی پێشکەش کرا و قسە و باسێکی وا خۆش نەکرا، هەندێك نەبێت. پرسیاری زۆریان لەبارەی فەرەنگستان لێکردین، لەجیاتی من، عومەرئاغا وەلآمی زۆریانی دایەوە، چونکە ئەو، لەمجۆرە بابەتانەدا زۆر شارەزابوو. هەمووشیان بەگرنگییەوە پرسیاریان لەبارەی (ماڵکۆڵم)ەوە (١٧٩) دەکرد.

١٧٩- سیرجۆن ماڵکۆڵم ــ ١٧٦٩ ز ــ ١٨٣٣ز) لە ولآتانی هیند و ئێراندا لە پلەوپایەی هەمەجۆری سەربازی و بەڕێوەبردندا کاری کردووە و لە دواییدا لە پەرلەماندا بۆتە نوێنەر. بۆ یەکەمین جار لەساڵی ١٧٩٩زــ دا بۆ لای دەرباری ئێرانی نێردرا، بۆ بەستنی پەیمانێك لەگەڵ بەریتانیادا، دوای سەرکەوتنی، بەرێگەی بەغدادا لە ساڵی (١٨٠١ز ــ دا، گەڕایەوە هیند. دووبارە وەك وەزیرێکی سەر ئاسایی بۆ دەرباری ئێران نێردرایەوە. دوای گەڕانەوەی بۆ بەریتانیا، مێژووی ئێرانی لە دوو بەرگدا نووسی و ساڵی (١٨١٥ز) ــ جون مەری ــ لە لەندەن لە چاپدرا ــ ع.

دوای نیوەڕۆ هەندێ لە ئەندامانی بنەماڵەی (خان) سەردانیان کردم، منیش لە (شانشین ـــ تەرار)ی ئەو هۆڵەدا پێشوازیم لێکردن، کە سەرلەبەیانیان (خانی گچکە) و عەسرانیش من تیادا دادەنیشتین.

ئەو خانانەی سەردانمیان کرد، بریتی بوون لە: (شێر محەمەد خان)، کە یەکێك بوو لە براکانی والی و (سوبحان ویردی خان)، کە یەکێك بوو لە مامەکانی و (ئەحمەد خان)ی کوڕە مامی، هەمووشیان گەورە و سەروەر و لە تەمەنیشدا بە ساڵاچوو بوون و جلی رەسمیشیان لەبەر دابوو. لەبارەی مێژووی بنەماڵە رەسەنەکەیانەوە ئاخاوتن و وتیان حەوت سەد ساڵێك دەبێ فەرمانڕەوای (سنە)ن و بنەماڵەکەشیان ناوی (مامولی)یە، کە لەڕاستیدا زۆرکۆنن، بەڵام لەبەرئەوەی (گۆران)ن، یان لە چینی جووتیارن ، بۆیە لای خێڵەکییەکان بەڕێز نین. هەروەها ئاگاداریان کردم کە ناوی (ئاردەڵان)، لە بنەچەدا بە کەسێکی بەناوبانگی بنەماڵەکەوە ناونراوە(١٨٠).

ئیتر لەوساوە بە فەرمانڕەواکانی ئەم ناوچانە دەوترێت میرانی (سنەیی ئەردەڵان)، وەك چۆن بەفەرمانڕەواکانی (سلێمانی) دەڵێن (میرانی بابان). پێشتر هەندێ کەس پێی وابوو هەر تەنیا بە ناوچەکە دەوترێ (ئاردەڵان)، بەڵام دوایی سەلماندیان کە وانییە. کاتێکیش ستایشی هەندێ خانووبەرەم کرد، یەکێك لە خانەکان وتی: بەڵێ وایە، چونکە هەرچی سامان و داراییمانە لە خانووەکانماندا سەرفی دەکەین، بەپێچەوانەی بابانەکانەوە، کە هەرچی سەرمایەیانە دەیخەنە سەریەك و شتی واش پاشەکەوت دەکەن کە بگوێزرێتەوە، تا لە هەموو ساتێکدا، کە پشێوییەك رووبدات، یان سەرۆکێکیان لەکارخرا، ئامادەی کۆچ و باربن. عومەرئاغا لەم قسەیەدا دەمودەست هەڵیدایە و وتی: بەڵێ ئێوە پارە و سامان لە خانووبەرەدا سەرف دەکەن، چونکە ئێوە دەربەستی ئەوەنین کێ دەبێتە سەرۆکتان و هەرچۆنێکیش بژین، پێی قایلن، بەڵام ئێمە سەرۆکەکەمان لەهەر کوێ بێت، خۆشمان لەوێین، لەبەرئەوەی لە تەنگانە و لێقەومان و ترس و بیمدا لەگەڵیانداین و هەرچییەکیشمان هەیە، دەستی پێوە دەگرین و هەڵی دەگرین بۆ ئەوکاتانەی ئەو لە ژیانی ناخۆشیدا پێویستی پێی دەبێت... ئەم قسەیەش هەر قسەی ڕووت و سەرزاریی نەبوو، بەڵکو هەر بەڕاستی وابوو، چونکە خۆم لەنزیکەوە زۆرشتی لەو بابەتانەم لێ دیون، بەڵکو ئەگەر (ئەمانوڵلاخان) لاببرێ،

---

١٨٠- وەك چۆن (بەبە) ناوی کەسێك بووە لە بنەماڵەی (کرمانج)دا ـــ خاریج.

یەك كەس لەو هەندە گزیر و نۆكەرانەی زیاتر، كە دەتوانیّ مووچەیان بۆ ببڕێتەوە لەگەڵیدا نامێنێتەوە. بەڵام ئەگەر (مەحموود پاشا)ی سلێمانی لەكار بخرێت، هەرچی خزمێتی لە وڵاتەكەدا دەستبەجیّ شوێنی دەكەون و هەرچیشیان لە پارە و موڵك لەدەستدا بێت، پێشكەشی دەكەن، بەڵكو ڕۆژانەش بە پارەیەكی كەم كاردەكەن، بۆئەوەی هاوبەشی لە یارمەتیدانی سەرۆكەكەیاندا بكەن، تا گوزەران و حەسانەوەی دەستەبەر بكەن. زەقترین جیاوازیی لەنێوان خێڵەكییەكان و گۆرانەكاندا ئەو جیاوازییە ئاشكرایەیە، كە لەنێوانی ڕۆحی هەردوولایاندا هەیە، چونكە گۆرانەكان خەڵكێكی ترسنۆك و كینە لە دڵن و دەڵێن زۆر پیسكە و فێڵاوین و ئارەزووی دزی كردنیشیان لە ئێرانییەكان زۆرترە.

شتێكم لە هەڵسوكەوتی ئێرانییەكاندا بەدی كرد، جێی دڵخۆشیی بوو، ئەویش ئەوەبوو وەك توركەكان فرتوفێڵ ناكەن، كە بۆ دانیشتن نەچنە جێیەك لەخوار جێی ئەوروپاییەوە بێت، بەڵكو ئەمان هەوڵ دەدەن وەك هەڵسوكەوت لەگەڵ گەورەیەكی خۆیاندا بكەن، لەسەرووی خۆیانەوە جێگات بكەنەوە و دابنیشیت.

ئەم ئێوارەیە میستەر (بەل لی نۆ) بۆ گەشتی ئاسەوار دیتنەوە، بۆ (هەمەدان) و (كرماشان) چوو.

## ٢٨ی ئاب

ئەمڕۆ سەربازەكان لەبەرچاومدا خۆپیشاندانیان كرد. والی سێ سەد سەربازی هەیە، كە ساڵی پار كردبوونی بە سەرباز و چاوی لە (عەباس میرزا) كرد، كە ئەفسەرێكی رووسی و هەندیّ سەربازی رووسی بۆ مەشق پێكردنیان بۆ نارد و تەپڵ و كەڕەناشی پێشكەش كردبوو. مەشق پێكردنەكەشیان لەسەر شێوەی ئینگلیزییە. بۆیە سەیربوو تەپڵ و كەڕەنای ئێرانی، پارچە مۆزیكی (كرینادی بەریتانی) بژەنیّ، چونكە ئەفسەران و سەربازە هەرە چاكەكانیان ئێستا لەگەڵ (والی)ن و هەرتەنیا سەدیان لێرە ماون، وەك پێشیان وتم، هەموویان تازە سەربازن ، هەموویشیان لە (فوڵستاف)ی(١٨١) خانەخۆی دەچوون، بەخۆیان و شەپقەی ئاسایی ئێرانییانەیان و كراسی درێژی ئێرانیانەیانەوە، كە كردبوویانن بە شەرواڵە كەتانە سپییەكانیانەوە، كە هەر دەرپیّ بوو، لەبەری

١٨١- میستەر ریچ، بەوە ئاماژە بۆ پیاوێكی قۆشمە دەكات. بیّ بەهرەبووە و ناوی (جەستس شالو) بووە، لە بەشی دووەمی بەرهەمەكەی (شكسپیر)دا، كە بەناوی (شا هەنری چوارەم)نووسیوێتی، ناوی هاتووە ــ خاریچ.

ئەوجۆرە کەسانە نەدەهات، کە خەمگینانە خۆی بە سەرباز نیشان بدات. وەك بۆم دەرکەوت لەو ماوە کورتەدا شتێکی ئەوتۆ فێر نەبوون، شایانی باسکردن بێت. تفەنگی چاکی ئینگلیزییان پێبوو، والی لە (شا)ی بۆ کڕیبوون، کە ئەویش بازرگانێتیان پێوە دەکات و لە هیندستانەوە دەیانهێنێ و بەنرخێکی گران بە کوڕەکانی خۆی و هاوولاتییەکانی دەفرۆشێتەوە. رووسێك فەرمانی بۆ سەربازەکان دەردەکرد و فەرماندەی هێزەکەش لەپاڵیدا راوەستابوو، گالۆکێکی بەدەستەوە گرتبوو، زرم و کوت بەسەروقاچی سەربازەکانیدا دەکێشا، جلوبەرگیشی فەرمی ــ رەسمی نەبوو، بەڵکو جل وبەرگی ئاساییانەی ئێرانی لەبەردابوو. والی، گەلێ خێڵی کوردی کۆچەری لەژێر فەرماندەدایە، ئەمانەش هەموویان بریتین لە تیرەکانی (شێخ ئیسماعیلی و مەردمە و کەڵهوڕ و جاف). خێڵی جافیش لەکاتی خۆیدا لەژێر دەسەڵاتی (سنە)دا بوون و لە ناوچەی (جوانرۆ) نیشتەجێ بوون.

## ٢٩ی ئاب

میرنشینی (سنە)(١٨٢) دەکرێت بە حەوت نلوچە، یان بەشەوە، کە بریتین لە (جوانرۆ) لەوسەری باشووری خۆرئاوا، (ئاورامان ــ هەورامان)، (مەریوان)، (بانە)، (سەقز) لەسەر رێی (تەورێز)، (حەسەن ئاوا)، کە بریتییە لە ناوچەکانی (سنە) و (ئەسفەند ئاوا)، کە لەسەر رێی (هەمەدان)ە. هەر ناوچەیەکیش لەمانە، کراوە بەچوار، یان پێنج ناوچەی بچووکترەوە. ناوچەی (هەورامان و بانە) لەو ناوچە باسکراوانەن، کە لەدەمێکەوە لەژێر دەسەڵاتی بنەماڵەیەکدان، لەوانە: (والی)، کە فەرمانڕەوای هەردووکیان دەبێ. لەمەوە من وام بۆ دەردەکەوێ کە ئەم دوو ناوچەیە لەسەرەتادا سەربەخۆ بوون، پاشان بەپێی پەیماننامەیەك چوونەتە ژێر دەسەڵاتی (والی)یەوە. بەڵام ناوچەکانی تر، هەر فەرمانڕەوایەك، والی دیاری بکات، بەڕێوەی دەبات. جوانڕۆش(١٨٣) یەکێك لە کوڕەکانی والی فەرماندارێتی.

١٨٢- ماوەی نێوان (سنە) و (جوانرۆ) هەژدە فرسەخە. لە (سنە)شەوە بۆ (سەقز) بیست و چوار فرسەخە. لە (سنە)شەوە بۆ (ئاورامان ـ- هەورامان) لە نزیکترین بەشی لە ناوچەکەوە دوازدە فرسەخە.

١٨٣- رووباری (کارو) دوو فرسەخ و نیو لە باشووری (سنە)ەوە دوورە و رووباری (دیالە) پێك دێنێ، یان بەواتەیەکی تر، لقە سەرەکییەکەیەتی، کە لە چەند سەرچاوەیەکی جیاجیا پێك دێ و ئاوەکەی لە جێگەیەکدا، لای (حەسەن ئاوا) کۆدەبێتەوە.

ئەمڕۆ بردیانینە ژوورەکەی (والی)یەوە بۆ سەیرکردنی، بریتی بوو لە هۆڵێکی ڕێکوپێك، دیوارەکانی وێنەی ئافرەتی پێداهەڵواسرابوو، وتیان یەکێکیان کە نیزەیەك بووە، کاتی خۆی (شا عەباسی گەورە) بە دیاری داوێتی بە یەکێك لە باپیرانی والی. پێش ئەوەی ژوورەکەمان بۆ ساز بکەن، چووینە ژوورەوە، هەرکە دەرگاکانیان بۆ کردینەوە، بۆنێکی خەستی مەی لێ بڵاوبووەوە. لەسەر ڕەفەکانیش هەندێ شووشە و لێوان ــ پەرداخمان بینین، کە بەڵگەیەکی زۆر ئاشکرا بوون تا بزانین (خان) لەو موسڵمانە توندانە نەبوو، کە پابەندی ئایینیان بن. ئەم جێگایەشی بەتایبەتی بۆ رابواردنە نهێنییەکانی خۆی تەرخان کردووە.

لەبەرئەوەی هەرچەند سەرنجم لەدەستوپێوەندەکانی والی سنە دەدا، هەستم دەکرد ئێرانییەکان نیشانەی چاوبرسێتیان پێوە دیاربوو، بۆیە وام بەچاك زانی سەردانی جێگەکەی نەکەم، وەك پێشتر بەڵێنم دابوو، بۆئەمەش ئەم ئێوارەیە خانەخۆییەکەم لەوە ئاگادار کردەوە، کە بەرێگای ڕاستەوخۆدا نیازی گەڕانەوەم بۆ سلێمانی هەیە، ئیتر وەك چاوەڕێشم دەکرد، بەرهەڵستییەکی بێهودەی ورووژان. سەیرم کرد بەسەرسوڕمانەوە بۆ یەکتر دەڕوانن و پاش ئەوەی بێ کەڵکانە تەقەللایان دا، بڕیارەکەم بگۆڕم، هەموویان چوونە ژوورەکەی عومەر ئاغا و کۆبوونەوەیەکیان کرد و چەند کەسێکیان ناردە لام، تا تکام لێ بکەن کە بچم بۆ لای والی، بەڵام هەر سووربووم لەسەر بڕیاری خۆم، ترسی ئەوەشم لێ نیشتبوو، (خان= ئەمانوڵلاخان) ئەوەندەم بلاوێنێ ، ناچارم بکات بەبێ ئارەزووی خۆم، پێویست بکات بیبینم. ئەمەش زیاتر وای لێکردم لە بڕیارەکەمدا گیربم. عومەرئاغاش چەندجارێك هاتە لام و پاش ئەو (سەیید)١٨٤ و پاش ئەویش (ئۆفانس)، کە هەردووکیان سکرتێری ئەهلیی بنکەی نشینگەیی بوون، تا بڕیارەکەم بگۆڕم، بەڵام بێهودە بوو. لەدواییدا ئەندامانی ئەنجوومەنەکە هەموو هاتنە بەردەرگاکەم و تکام لێ بکەن، تا بەڵکو بەزەییم پیایاندا بێتەوەو داخوازییەکەیان جێبەجێ بکەم و وتیان گوایە من لەبارەی رقی (خان)ەوە کەمم بیستووە و لای ئەو، پۆزش هێنانەوە ناخوات، تا تەنانەت ئەگەر خۆمیش پێی بڵێم، وای بۆ دەچێت کە دیارە ڕێزێکی وام لێ نەگیراوە، بۆیە بێزاربووم و وام لێ هاتووە بەو شێوە کوتوپڕە، بەرنامەکەم بگۆڕم. پاشان باسی ئەوەیان بۆکردم کە چۆن (خان) لەسەر شتێکی لەمەش کەمتر بنەماڵەکەی (ڕەشید بەگ)ی بنبڕکردووە. خۆ ئەگەر هەر سووریش بم لەسەر قسەی خۆم، ئەوا

١٨٤- بڕوانە (رحلە المنشی البغدادی)، کە مامۆستا (عەباس عەزاوی) لە فارسییەوە کردوویەتی بە عەرەبی ــ شرکە التجارە والگباعە المحدودە ــ بغداد ١٩٤٨ز ــ ع.

عینایەتوڵلا بەگ و میرزا فەرەجوڵلا، ناچار دەبن بۆ سلێمانی هەڵبێن و پێش گەیشتنی من بگەنە ئەوێ، چونکە چوونیان بۆلای (خان) بەبێ من، لەو شتانەیە کە هەرگیز ناکرێ.

لە سەرەتادا وای بۆ دەچووم ئەو باسی مەترسییەی تووشی دەبن، دەست هەڵبەست بێ، لەبەرئەوە هەر سووربووم لەسەر بڕیارەکەم، بەڵام دوای ئەوە نەرمتربووم و یەکێکم ناردە لایان، تا چارەیەکی مام ناوەندی بدۆزێتەوە، ئەویش بەوەی سکرتێرە ئێرانییەکەم بنێرمە لای خان و لەبری من پۆزشی لێ بخوازێت، کە خۆم نەمتوانیوە سەردانی بکەم و ڕەزامەندی خۆمی سەبارەت بە خزمەتگوزاری دەستوپێوەندەکەی پێ ڕابگەیەنێ... وەك بیستمەوە دەستیان بەگریان کردووە و پێشنیارە تازەکەشم هەرتەنیا خۆشییەکی کەمی پێ بەخشیون وەك دوایی بیستمەوە پەنایان بۆ فاڵنامەی دیوانی (حافز)ش(١٨٥) بردووە. فاڵنامەکەش پێی وتوون داواکەیان لێم دووبارە بکەنەوە. لەکاتێکدا من خەریك بووم بیرم لەوە دەکردەوە، کە ڕێی تێناچێ گرنگی پێدانەکەیان دەست هەڵبەست بێت و ئەو چیرۆکانەشم هاتنەوە یاد، کە لەبارەی رق و ستەمی (والی) یەوە بیستبووم، بەتایبەتیش ڕووداوی (محەمەد ڕەشید بەگ). ئیتر هەر بەڕاستی ترسی ئەوەم لێ نیشت ئەم بەسزمانانە، بەهۆی منەوە شتێکیان بەسەر بێت. بۆیە بڕیارمدا داواکەیان جێبەجێ بکەم و گوێ نەدەم بەهەر شتێك کە دێتە ڕێم. کاتێکیش دووبارە هاتنەوە بەردەرگاکەم و لێم پاڕانەوە، تا چاکەیەکی تریان لەگەڵ بکەم و ڕۆژێکی تریش سەفەرەکەم دوابخەم، بۆئەوەی دەرفەتیان هەبێ، پێشەکی سەردارەکەیان لەوە ئاگادار بکەنەوە، کە نیازی گۆڕینی بەرنامەکەمم هەیە، سەیریان کرد لەوە ئامادەترم کە ئەوان چاوەڕێیان دەکرد، چونکە وەڵامم دانەوە، کە لەبەر خاتری ئەوان، خۆم بۆلای (خان) دەچم. ئیتر ئەو شادیی و خۆشییەی لەم ساتە کوتوپڕەدا بەسەریاندا هات، بە ئاشکرا نیشانی دام، کە ترس و لەرزیان هەرگیز دەستکرد نەبووە. ئەم مشتومڕە تا سەعات یازدەی خایاند و تووشی ژانەسەرێکی کردم، کە تا بەیانی بەتەواوی خەوی لێ زڕاندم.

---

١٨٥- زۆربەی خەڵك، بەڵکو هەندێ لە ئەدیبانی خۆ بە فەیلەسوف زانیش، تائێستاش پێیان وایە کە پەندەکانی شیعری (حافز) پڕن لە ئامۆژگاری و ئەوەیشی بیەوێ خۆی سەرپشك بکات، دەبێ گوێڕایەڵیی ئامۆژگارییەکانی بکات. ئەمەش دەبێت بە هاندەرێك بۆ مرۆڤ تا هەموو پەندەکانی لەبەر بێت، کە هەموو لاپەڕەکانی دیوانەکەی پڕن لەو پەندانە. بەڵام شێوێنراون و ئەوەندەیان باڵ پێگیراوە، کراون بە ئیلهامیی، یان سەرپشك بۆ پشکنین و پێشبینی کردن ـــ ع.

# بەشی هەشتەم

دەرچوون لە سنە - دیمەنی زەوی - چادرەکانی کولانە - سیاسەتمەدارانی مەزنی کورد - ڕووباری (قیزیل ئوزون) - هەوارەکان - سەرنجەکانی لادێیەك - ڕەوشتی نائاسایی جاف - ڕێگایەکی کووڕ - شیرینی و ساردەمەنی لە هەنگوین و کەرە - گەیشتنە گوندی (میك) - ریچ خانم بۆ گوندێکی تر دەبرێ - پوورە هەنگ - گەیشتنەوەی ریچ خانم پێمان - دیاریی میوە لای (والی)یەوە - گەیشتنە (بانە) - کوڕەکەی والی - میوەی تازە پێگەیشتوو -.

## ٣٠ی ئاب

بەیانی زوو لەخەو هەستام، گیانم تێکچووبوو، بەڵام هەر سووربووم لەسەر سەفەر. کاتێکیش گەیشتمە دەرەوەی کۆشکەکە، تووشی میرزا فەرەجوڵڵا بووم، بەپەلە بۆ لام دەهات، توند دەستی گوشیم و سوپاسی کردم کە بە تەنگ تکاکەیانەوە بووم و وام کردووە ئیتر بەتەواوی دڵنیابن و تا دەرەوەی شار بەڕێی کردم، بەڵام عەبدوڵڵا بەگی کوڕی عینایەتوڵڵا بەگ، بۆ بارەگاکەی والی یاوەریی دەکردم، کە والی خۆی بە تایبەتی بۆ ئەو کارەی ناردبوو، لەپێشدا بە دەروازەی قەڵاکەدا تێپەڕین و پاشان بە دەروازەی وارشی شارەکەدا، کە وارشەکەی (بەسرە)ی بیر دەخستمەوە، چونکە ئەویش هەر لە قوڕ دروستکرابوو. لەوێدا بۆم دەرکەوت کە شار، جگە لە وارشە قایمەکەی قەڵاکە، هەر یەك وارشی هەیە و لەوە بەدواوە دەوروبەرێکی بەرفراوان دەست پێدەکات.

لە شەش چارەکێك کەمدا بەتەواوی شارمان جێهێشت. عەبدوڵڵا بەگ ڕاست و دروست هۆی خەمباربوونی دوێنێ شەویانی بۆ باسکردم و وتی تۆ هەر تەنیا شتێکی کەم لەبارەی شتە تایبەتییەکانی (والی) و گومان و ڕقی دەزانیت، چونکە ئەگەر بیستبای تۆ، وازت لە سەردانەکەی هێناوە، ئەو بەمجۆرەی لێك دەدایەوە:

(منیش وەك دراوسێکانم چەند جارێك بێهودە ئەم کابرایەم بانگهێشتن کردووە، کەچی ئەوا بەپێی خۆی و بەوپەڕی ئارەزووی خۆی، ڕێی گرتۆتەبەر و ڕەنگە هەندێ کاروباریشی ببوایە، کە دەیویست پێمی بڵێ و پیاوەکانیشم لە (سنە) ئەمە دەزانن، بەڵام هەر بە ئەنقەست بێزاریان کردووە و نەیدیوم. لەبەرئەوە چاکەی منیان ناوێت، یان ڕەنگە پیلانگێڕیش بن لە دژم).

پاشان کوڕە لاوەکە وتی: (ئیتر خۆت لێکی بدەرەوە و بزانە ئەم بیرکردنەوانە چ ئاکامێکی تاریکی بەسەر دەهێنایـن).

عەبدوڵڵا بەگ پێمی وت زستانی (سنە)، لە هی سلێمانی ساردترە و هاوینەکەیشی فێنکترە.

هەرکە لە شاریش دەرچووین ڕێگاکە وردە وردە دەبووە بەرەو ژوورکە و بەدرێژایی سەفەرەکەمان هەر وا بوو، زەوی جوان دەبینرا و کشتوکاڵیش تیایدا مام ناوەندی بوو، لووتکەی کێوەکانیش هەڵوەریو و شەقار شەقاربوون، هەندێکیان ئەوەندە زۆر شەقار ببوون، وەك شوێن ئاسەواریان دەنواند، بۆیە تەلەبەرد و گڵەسپیمان لەم دیو و ئەودیوی شاخەکانەوە

دەبینی. بەشێکی زۆری ئەم شەقاربووانەش لەوە دەچوون ئاسنیان زۆر تێدابێ، ڕەنگی هەندێکیشیان مەیلە و سەوزبوون.

ماوەیەك بەشیوێکدا ڕۆیشتین و لەنزیك هەشتدا لای چەپمانەوە گوندی (ساری قامیش)ی١٨٦ گەورە و ڕەزەکانیمان بینی، پاش ئەوە بەبانەکانی (ئەڵلا خودا)دا هەڵگەڕاین، کە هەڵگەڕانێکی زۆر کووڕ نەبوو. لە نۆ و چل و پێنج دەقیقەدا گەیشتینە تەپڵەسەرەکەی. ئەم شاخش بە ریزە شاخەکانی (بازرخانی)یەوە دەلکێتەوە و درێژدەبێتەوە و بەتروپکە بەرزەکەیەوە، لە هەموو زنجیرە هاوتەریبەکانی لای چەپمان دووردەکەوێتەوە. شاخی تریش لە پشتمانەوە و بەلای خۆرهەڵاتی باشووری خۆرهەڵاتەوە هەبوون. لە باشووری خۆرهەڵاتیشمانەوە، لە دوورەوە دەشتەکانی (بان لێلاق)١٨٧ دەکشان، کە لە پشتیەوە لووتکەی شاخی بەرزمان لێ دەرکەوتن، لە هەموو لایەکیشمانەوە لووتکەی شەقار شەقارمان لێ دیاربوون. وەرسووڕانەوەمان بە دەوری کێوەکەدا ماوەیەکی خایاند.

لە دە و بیست دەقیقەدا نشێو ببووینەوە و زۆر لێژ نەبوو. ئەم کێوەش ڕووی کردبۆوە باکووری خۆرهەڵات. لە دەوروبەری یازدە و نیودا گەیشتینە گوندی (باینچۆ)ی گەورە و پیس، کە لەدامێنی نشێوییەکەدا، لە دۆڵێکدا بوو، دەکەوتە سەر ناوچەی (حەسەن ئاوا). لێرەدا بەڕێگاکەی (تەورێز) گەیشتین. سەمتی ڕۆیشتنەکەشمان بەگشتی ڕووەو باکوور بوو، خێرایی ڕێکردنیشمان زۆر زۆر باش بوو، جگە لە سەعات و نیوێك نەبێ، کە بەسەر توولەڕێیەکی بەردەڵانی سەختەوە تووشی دەردەسەری بووین، تا ڕێگاکەمان کردەوە، ڕێگایەکی گەوە گەوە بوو، بەردەکانی ورد ببوون و بە دەوری لاپاڵێکی کێوە لێژەکانەوە بوو.

هاوسەرەکەم هەر بەرەبەیان بەسواری ئەسپەکەی، شاری جێهێشتبوو، تەنیا سەعاتێکیش لە پێشمانەوە بوو، ئەو بە ڕێگایەکدا هاتبوو، لەوەی ئێمە پێچاوپێچتر بوو. ئەوەی لە قۆناغی ئەمڕۆماندا بڕیبوومان، چوار فرسەخ بوو.

---

١٨٦- ئێستا پێی دەڵێن: سەراو قامیش، یان: سارووقامیش ــ م.

١٨٧- بان لێلاخ ، یان: بان ئێلاخ ــ یشی پێدەڵێن ــ م.

## ٣١ی ئاب

له سه‌عات پێنج و چل ده‌قیقه‌دا سواری ئه‌سپه‌کانمان بووینه‌وه. پاش ئه‌وه‌ش ماوه‌یه‌ك به‌شیوێکدا ڕێمان کرد و چووینه پێشتره‌وه، زه‌وی جوانتر خۆی ده‌نواند و لووتکه‌ی کێوه‌کانیش چاکتر دیار ده‌بوون. به‌ده‌م ڕێوه هه‌ندێ ته‌له‌به‌رد و گڵه‌سپی و که‌مێکیش نتراتی پۆتاس، یان خوێی بارووده‌مان بینی، به‌ڵام له‌باره‌ی به‌پیتی و بێ پیتیی خاکه‌که‌ی، نه‌مانده‌توانی هیچ بڕیارێکی له‌سه‌ر بده‌ین، کشتوکاڵیشی تێدا که‌م بوو.

له سه‌ره‌تای ڕێکردنماندا کانیاوێکی زۆرمان دی. (بان لێلاق)، که ده‌که‌وته لای خۆرهه‌ڵاتمانه‌وه، به‌شێك بوو له (سنه) و دیمه‌نیشی له ده‌شتێك ده‌چوو، ڕیزه شاخێك بیبڕێت، له وه‌رزی هاوینیشدا له ناوچه زۆرسارده‌کان بوو. ڕێگاکه‌مان هه‌رده و هه‌ڵه‌ت و سه‌متی ڕۆیشتنه‌که‌شمان زۆر ڕووه و باکوور بوو، هه‌واکه‌شی سازگاربوو، هه‌وای مانگی کانوونی یه‌که‌می به‌غدای به یادم ده‌هێنایه‌وه.

له نۆدا لای چه‌پمانه‌وه به‌لای گردێکی تووره‌که‌ڕێژی ته‌ختدا تێپه‌ڕ بووین، نادر شا ـــ له‌کاتی جه‌نگ کردنیدا له‌گه‌ڵ (تۆپال عوسمان)ی پاشای به‌غدادا، دروستی کردووه و چادره‌که‌ی له‌سه‌ر هه‌ڵداوه و له‌به‌ر سازگاریی هه‌واکه‌ی، ماوه‌ی چل ڕۆژ ماوه‌ته‌وه. له نۆ و چل ده‌قیقه‌دا گه‌یشتینه لای ڕه‌شماڵه‌کانی گوندی (کولانه) له هه‌واری هاوینه‌یاندا، وه‌ك چۆن گوندنشینه‌کانی (به‌ڕوده) ده‌چنه هه‌وار. ڕه‌شماڵه‌کان له نزیك ڕێگاکه هه‌ڵدرابوون و له گردی (تاوشان ته‌په)شه‌وه١٨٨ زۆر دوور نه‌بوون. بۆیه به‌م ناوه‌شه‌وه ناونراوه، چونکه ڕۆژانی زستان، زستان، که‌روێشکی زۆر تێدا ده‌بینرێ. ئێرانییه‌کانیش وه‌ك تورکه‌کان، بۆ ڕاوه که‌روێشك، هه‌ڵۆ به‌کار ناهێنن، به‌ڵکو بۆ ڕاوکردنی تانجی به‌کاردێنن.

چادرێکی دوو ئه‌ستونده‌گیمان بینی، والی بۆ ئێمه‌ی هه‌ڵدابوو، فه‌رشێکی جوانی ده‌ستکاری (سنه) و هه‌ندێ (لباد)یش به ده‌وریدا ڕاخرابوون، به‌ڵام ئه‌و چادره‌ی له‌گه‌ڵ خۆم هه‌ڵم گرتبوو، عومه‌رئاغا بۆ خۆی هه‌ڵدا، عه‌بدوڵڵا به‌گیش چادری تایبه‌تی خۆی پێبوو.

کورد، وه‌ك ئینگلیز وان، زۆر سه‌رقاڵی سیاسه‌تن، که‌چی به‌درێژیی ڕێی ئه‌مڕۆ، عومه‌رئاغا و عه‌بدوڵڵا به‌گ پێکه‌وه گفتوگۆیان له‌باره‌ی سیاسه‌ته‌وه نه‌کرد.

---

١٨٨- ئێستا (دووشان ته‌په)ی پێده‌ڵێن ،که ده‌بێ له بنه‌ڕه‌تدا (ده‌وشان ته‌په)، واته (گردی که‌روێشك) بێ-م

لەبەرئەوەی گوندی (کورانە) دەکەوتە سەرسنووری نێوان ناوچەی (حەسەن ئاوا و قەرەتورئاوا)، بۆیە هەمیشە لەدەست سەردارێکەوە دەکەوتە دەست سەردارێکی تر و زۆرتریش دەکەوتە دەست ئەو فەرمانڕەوایەی بەرژەوەندی زۆرترە تیایدا.

بەلای زۆرەوە لەوە دەچێ بۆ گەیشتن بە (والی)، پێویست بکات هەر سەر لە (بانە) بدەین. کەسیش پێشتر ئەمەی پێ نەوتم، نەك لەبەر دووریی ڕێگاکە پەشیمان ببمەوە و نەچم. ڕێگاکەی (بانە) هەرماوەی یەك دوو ڕۆژ ڕێکردن لە ڕێگاکەمان لادەدا و چوونیشم بۆ ئەوێ دەرفەتی دیتنی بەشێکی تازەی کوردستانم بۆ دەڕەخسێنێ. لە دەستدانی سەردان کردنیشی دەبووە جێی داخ، لەبەرئەوەی سەردانی ئەشکەوتەکانی (کەرەفتو)ش، یەك دوو ڕۆژی تریش دوای دەخستین، بۆیە پێم چاك نەبوو، چونکە کۆمەڵەکەم هەموویان (نۆبەتی)یان هەبوو، لە نەخۆشخانەیەکی گەڕۆك دەچووین.

## ١ی ئەیلول

ئەم بەیانییە لە پێنج و نیودا ڕووەو باکووری خۆرئاوا دەستمان بەڕۆیشتن کرد. ناوچە شاخاوییەکە دەکەوتە لای چەپمانەوە. لە یەکەمین سەعاتدا زۆربەی هەوراز و نشیوییەکانمان بڕی. ئیتر خێرایی ڕۆیشتنەکەمان هێواش بووەوە و پاشان ئاسایی بووەوە. لە حەوت و پێنج دەقیقە کەمدا لە شێوێکی چاڵ نزیك بووینەوە، دەچووەوە سەر (قیزیل ئوزان)، کە ڕووبارێك بوو هەندێ ناوبانگی جوگرافیایی هەبوو(١٨٩)، سەرچاوەکەی ماوەی دوو فرسەخێك، بەلای

١٨٩- میجەر ڕەنل پێی وایە کە (قیزیل ئوزان)، ئەو (گوزان)ەیە کە لە (العهد القدیم)دا باسکراوە. بڕوانە (سفر الملوك الپانی الإصحاح ١٧ــ ٦). ئەمەش باسێکە لە کتێبەکەیدا هاتووە، کە ناوی ئاوایە (لێکۆڵینەوە لە چارەنووسی ئەو ئیسپارتە جوولەکەیەی لە ــ نەینەوا ــ بەدیل گیراون):ــ

ئەم ڕووبارە لە ناوچەیەك هەڵدەقوڵێ، کاتی خۆی پێیان دەوت (ماتیان) و لەنێوان (تەورێز) و (هەمەدان)دا بوو، لە خۆرهەڵاتەوە دێت و دەڕژێتە بەشی باشووری خۆرئاوای زەریای (خەزەر)ەوە. لە ڕێکردنیدا بە زنجیرە کێوێکی زۆر گەورەدا تێپەڕ دەبێ، کە (میدیا) لە ناوچەکانی قەفقاس جیادەکاتەوە. لە بڵندترین ئاستی (میدیا)وە زۆر خوڕ و خێرا و ترسناك بۆ ناو دەربەندێکی هەزار بەهەزارەوە شۆڕ دەبێتەوە، کە ئاوی ئەم ڕووبارە لەبن چیاکاندا هەڵیکۆڵیوە و پانتاییەکەی چەند میلێك دەبێ. پاش ئەوەی دەگاتە نزمایییەکانی (گەیلان)، ئیتر تا دەڕژێتە زەریاوە بەکەڵکی کەشتیرانی دێت. پێش ئەوەش بەو شێوەیە شۆڕبێتەوە، هەردوو ڕووباری (ئەبهەر) و (قەزوین) و ڕووباری تریشی تێدەڕژێ و پێی دەوترێ (شا ڕود). بەتێکرای هەموو ئەو تێڕژانەش دەوترێ (سفید ڕود)، یان ڕووباری سپی. ڕەنگە ئەم ناونانەیشی لەوەوە هاتبێ کە لەکاتی

خۆرئاوادا، یان چەپی کێوەکانی (عەباس بەگ)ەوە بوو، کە لە خۆرهەڵاتەوە دەهات و پاشان ڕوو لە (میان دووئاو) کات

وەك یەکێك بۆ یەکەمین جار لە ڕووبارێکی مەزن ورد بێتەوە، منیش ئاوا لە ڕووبارەکە ڕامام، کە لە دۆخی پێکهاتنیابوو، ئەوەندەشی ئاو تێدانەبوو، بەڵام ئەمە شتێکی دەگمەنە، چونکە لەم وەرزەدا ئاو لەچاو جاراندا لەپڕدا کەمی کرد، لەبەرئەوەی بەرزایی ئاوی ئەم ڕووبارە لەکاتی ئاساییدا دەگاتە ئەژنۆ. زۆرجاریش تا چەند ڕۆژێك هەر بوار نادات. والی بەهیوایە پردێکی لەسەر دروست بکات.

هەرکە لە (قیزیل ئوزان)ماندا، دووبارە بە بەرزاییدا هەڵگەڕاینەوە و بەسەر ڕێگایەکی سەخت و ڕووتەندا ڕێمان کرد، لەو ناوچەیە دەچوو کە پێشتر باسمان کرد. لەملاولاشمانەوە لووتکەی ڕێك دیاربوون. بەشی زۆری زەویش بەیار بوو. ئەم ناوچەیەش لەوەرگەی ئاسایی و هاوینە خێڵاتی سلێمانی بوو. بەدەم سەرنجمەوە لە شوێنەواری هەندێ هەوار، لە شێوەی پەیڕەویان گەیشتم، کە بریتی بوو لەوەی ماڵەکانیان لە شێوەی بازنەدا دروست بکەن و مێگەلەکانیان لە ناوەڕاستیدا دابنێن(١٩٠).

لە ڕاستیشدا ئەمجۆرە دەستورە بۆ پارێزگاری پێویستە، چونکە هەمیشە لە دوژمنایەتی دانیشتوانی ئەو ناوچانەدان، کە تیایاندا دەژین و ئەم کۆچکردنانەشیان وایان لێ دەکات هەمیشە میوانێکی ئێسك گران بن.

---

هەستانیدا بەدەم ڕەوتییەوە بەناو چیاکاندا، کەفێکی سپی دەکات، چونکە (دی لافالە)ی گەشتوەر دەڵێ (... ئاوەکەی خۆی ڕەنگێکی مەیلە و سووری هەیە...). گەشتوەرەکان باسێکی ترسناکی ئەو ڕێگایەی دەکەن، کە بەلێواری دۆڵەکەوەیەتی و تاقە ڕێگاشە، کە دەبێ وڵاخ بەبارەوە بەرەو (ئەسفەهان) بچێت. بەشێوەیەکی گشتیش پڕە لە خەرەندی هەزار بەهەزاری ترسناك. ڕێبوار، کە بەم ڕێیەدا دەڕوات. جڵەوی ئەسپەکەی شل دەگرێ و بەسڵەوە بەدوای خۆیدا کێشی دەکات، نەوەکو وڵاخەکە لە هەنگاوێکیدا ساتمە بکات و هەڵیدێرێ. بڕوانە (ئۆلیاریۆس و هانۆی) و هی تریش ــ ئەم هەزار بەهەزارە دەکەوێتە نزیکەی سەد و هەشتا میلێك لە خۆرئاوای زەریای (خەزەر ــ قەزوین)ەوە. بڕوانە پەراوێزی لاپەڕە (٣٩٥)ی گەشتی جوگرافیایی هیرۆدۆتس ــ لە نووسینی (ڕەنل).

١٩٠- مەڕی (قالاچوالان ــ قەلاچوالان) خورییەکەی پڕترە، بەڵام خوری مێگەلی ئەم ناوچەیە تەنك و نەرمە.

لەوە دەچیٚ ئیٚستا لەسەر بەرزاییەك بین، زۆر لەسەروو ئاستی زەریاوە بیٚت. پیٚشم وایە ئەو زەوییەی ئیٚستا ئیٚمەی لەسەرین، هەردەیەکە زۆر چەم و شیوی پیٚدا تیٚپەڕدەبن و لەبەرهەمی (ڕیٚواس ــ Rhubarb)یشدا زۆر دەوڵەمەندە، کە جۆریٚکی نایابە، بەتایبەتی ئەوجۆرەیان کە لەبەردەڵانیدا دەڕویٚن. ئەم ڕووەکە کیٚوییەش لە کوردستان و لە زۆربەی بەشەکانی ئیٚران دەڕویٚ و بەزۆری بۆ دروستکردنی شەربەت بەکار دیٚت، هەر ئەو ڕیٚواسەیە کە لە باخچەکاندا دەڕویٚ و گاڵگاڵیٚشی هەر بەناوی خۆیەوە لیٚ دروست دەکریٚ.

بە دۆڵیٚکدا تیٚپەڕبووین، تا دەهات هەر تەنگتر دەبووەوە، تا وای لیٚهات بووە شیویٚکی بەردەڵانی، بارانیٚکی زۆری تیٚدا کۆببووەوە. ئەمەش نیشانەی ئەوەبوو کە دویٚنیٚ شەو بارانیٚکی زۆر لەم ناوچانە باریوە. لە نۆ و نیودا بە بەرزاییەکانی شیوەکەدا سەرکەوتین و پاشان دووبارە هاتینەوە ناو دۆڵەکە، لەویٚدا ئیتر گەیشتینە (کەڵەك ئاوا)ی گەورە، لە ناوچەی (هۆبەتوو ــ Hobetoo)١٩١، لیٚرە قۆریە پووشیٚکی زۆر و کەڵەکەکراومان دی، بۆ زستانیان دانابوو بەکاری بهیٚنن. خەڵکەکەش خەریکی درویٚنەی دانەویٚڵە بوون، بەڵام کزن هیٚشتا سەوز و تەڕ بوو، گەنمەشامی هیندیش پیٚگەیشتبوو. دەڵیٚن زستان لە هەموو ئەم ناوچانەدا یەکجار ساردە، هەواش سارد و سازگار بوو١٩٢ ، بۆیە هەتاو بیٚزاری نەکردین. هیٚشتا بەسەر ئەسپەکانمانەوە بووین و بە بەریشمانەوە بوو زیاتر ڕیٚ بکەین.

ڕوومان لە چادرەکانی گوندەکە کرد، لەوسەری دۆڵەکە هەڵدرابوون، لە دە و دە دەقیقەدا گەیشتینیٚ(١٩٣).

خەریك بوو وەرزی هەوارنشینی دوایی دەهات و خەڵکەکەش خۆیان بۆ گەڕانەوەی ناو دیٚ ئامادە دەکرد. سەیرمان کرد گەرمای کانییەکی سازگار لە نزیك چادرەکەمانەوە (٥٠ پلە) بوو.

زەعفەرانیٚکی زۆری سپی و سوورمان دی، هیٚشتا گوڵیان پیٚوە مابوو، لە هەموو لایەکدا ڕوابوون. تەنانەت لە ناوەڕاستی ڕیٚگاکەشدا. داوام لە گوندنشینەکان کرد هەندیٚکم بەڕەگەوە بۆ بهیٚنن، تا بۆ بەغدا بیبەم. هەندیٚکیان لەهەموو جۆریٚکی بۆ هیٚنام، وتیان لە بەهاراندا ئەم ناوچانە هەمووی ئەم گوڵە دایدەپۆشیٚت.

---

١٩١- هەوەتوو ــ شی پیٚدەڵیٚن، کە دەبیٚ لە بنەڕەتدا (ئۆبەتوو) بوو بیٚ ــ م.

١٩٢- ناوچەیەی هۆبەتوو، سارد ترین ناوچەی ئیٚرانە (م).

١٩٣- هیٚشتا ئەم ڕیٚگایەمان، ڕیٚگەی (تەبریٚز)ە، کە سبەینیٚ دوایی پیٚ دیٚنین.

## ٢ی ئەیلول

سەرەڕای ئەوەش کە شەوێکی ساردبوو، کەچی مێشوولە هێرشیان هەر بۆ هێنام و نەیانهێشت ساتێکیش بسرەوم. ئەمڕۆ هەوا ئەوەندە ساردبوو، بەجۆرێك حەزم دەکرد کەوڵە بچکۆلە کۆنەکەم، کە لە کەوڵی مەڕبوو، لەبەری بکەم. لە شەشدا سواربووینەوە . دۆڵەکە هێشتا ڕووی کردبووە باکوور. ڕێگای (سەقز) و (تەورێز) دەیان بڕی. بەڵام ڕێگاکەی ئێمە ڕووەو باکووری خۆرهەڵات و بەسەر بەرزایی ئەو شاخانەوە بوو، کە بەسەر دۆڵەکەدا دەیانڕوانی. بەدرێژایی ڕێکردنی ئەمڕۆ، ئەم ڕێیەمان گرتەبەر، هەرچەندە هەندێ قەدبڕیشمان کرد.

لادێییەکمان لەگەڵدا بوو، پاش ئەوەی سەیرێکی ئەملاوئەولای خۆی کرد، تا دڵنیابێت بزانێ ئێرانی لە دەوروپشت دیارنین، نەك گوێیان لێی بێت، ئەوسا بە (عومەرئاغا)ی وت: بارەکەڵلا لە (کرمانج)(١٩٤) عومەرئاغاش لێی پرسی:

(ئەی سنەییەکانت چۆن بینی؟). لادێییەکە وەڵامی دایەوە: (ئەی نەفرەتی خوا لە هەموویان بێت). عومەرئاغاش بێدەنگی کرد و وتی: کوڕە بێدەنگ بە نازانیت ئەگەر گوێیان لێت بێت، چیت لێدەکەن؟. لادێییە کلۆڵەکەش وتی: (لەمەی ئێستا خراپترم لێ ناکەن).

لەو کاتەوە کە لە هەوارەکانی گوندەکە دەرچووبووین، تا دەهات زەوی بەرزتر دەبووەوە، بەڵام زۆر نا، ئەوەندەی پێ نەچوو، خۆمان لەسەر هەردەیەك دییەوە، دەوروبەریشمان لووتکەی بەرز و زوورگ بوون، کە سنووریان لەسەری ئەوسەری هەردەکە کۆتایی دەهات. یەکێك لە شاخەکانی لای چەپمانەوە، کێوی (حاجی ئەحمەد)ی لێ شاردبووینەوە، کە چوار فرسەخێك لێمانەوە دوور دەبوو، بەڵام خۆی ڕووەو باکووری خۆرهەڵات و باشووری خۆرئاوا بۆ (زاگرۆس) درێژ دەبۆوە. زستان لێرە زۆر سارد دەبێ و توولە ڕێگاش بەهۆی کەڵەکەبوونی بەفری زۆرەوە لەسەری، دەگیرێ. شوێنەواری زریان و تۆفی بارانی زۆری ئەم دواییەشمان بینی. ئەم زریان و تۆفانە لەم وەرزەدا، لە دیاردە سروشتییە ئاسایییەکانە، چونکە باران لەسەرەتای تشرینی یەکەمدا دەست پێدەکات و ئەوەندەی پێناچێ بەدوایدا بەفر دەبارێ. زەوی هەمووی بەیار بوون و کشتوکاڵیان تێدا نەکرابوو، کرابووە لەوەڕگەی هاوینەی خێڵاتی (سلێمانی).

لە هەشتدا بەملەیەکی لێژدا هاتینە خوارەوە، کە شۆڕبوونەوەمان چارەکە سەعاتێکی خایاند. دوای ئەوە گەیشتینە دۆڵێك بەو ناو شاخە بەرزانە پێچاوپێچ تێپەڕ دەبوو. ئیتر هەر

---

١٩٤- ئەوە ناوی خێڵەکەی پاشای سلێمانی یە، عومەرئاغاش هەر لەو خێڵەیە ــ خاریچ.

بەوێدا ڕێمانکرد، تا لە دواییدا بەلای یەك دوو گوندی دیمەن پیس و هەندێ شارای خەلە و خەرماندا تێپەڕبووین، کە لەم ڕۆژانەی دواییدا لە کۆکردنەوەی ببوونەوە. هەندێ (لۆکە)شمان بینی، لە گەشەکردنی سروشتی خۆی ڕاوەستابوو. چەند دارگەرچەکیشمان دین، ئەوانیش هەر هەمان حاڵیان هەبوو، زۆر گەشەیان نەکردبوو.

هاوسەرەکەم، ئاساییانە بەیانیان پێش ئێمە دەکەوتە ڕێ، بەڵام ئەم بەیانییە درەنگ کەوتە ڕێ. لەبەرئەوەش کە خەریك بووین پێی دەگەیشتینەوە، بۆیە لە نۆ و نیودا لای کانییەکی بچووك دابەزین، بۆئەوەی دەرفەتی هەبێت زیاتر پێشمان بکەوێت(١٩٥).

پاشان لە دە دا، لە هەمان ئەو دۆڵە تەنگەوە کە تیایدا بووین، دەستمان بەڕۆیشتن کردەوە. لە یازدەدا گەیشتینە گوندی (سوور مووسێ - Soormoosi)، کە دەکەوتە ناوچەی (خوڕخوڕە)وە، کە تێی چووین. وا دەهاتە بەرچاو لەوسەری لێژاییە کووڕەکەدا بێت، یان بەسەر دۆڵەکەوە بێت. لەوبەرمانەوە بەسەر بەرزایی چیاکانەوە قەلایەکی چوارگۆشەمان بینی، گوندنشینەکان لەکاتی هێرشی (بلباس)ەکاندا خۆیانی تێدا قایم دەکەن، هەرچەندە ئەم هێرشانە کەمیش ببوونەوە، یان هەر نەمابوون، چونکە ئێرانییەکان و تورکەکان، هێز و گوڕی بلباسیان تێکدابوو.

لە دۆڵەکەدا، لەکاتی وەستانی (با)دا، گەرمایەکی زۆر ناخۆش هەبوو. بەدەم ڕێکردنی ئەمڕۆمانەوە گلەسپی و تەلەبەردێکی زۆر و هەندێ نیترات و تەباشیرم بینی. پێم وایە لەسەر هەندێ بەرزاییش(بەردی گرانتی)م بینی، بەڵام زۆر لێی دڵنیا نەبووم.

---

١٩٥- لەبەر نەریتی خۆرهەڵاتییانە، ڕیچ خانم لەگەڵ دەستەیەکی جیاواز لە دەستەکەی میستەر ڕیچدا ڕێی دەکرد. باسی ئەمەش کرا. لە دوو کاتی جیاوازیشدا دەکەوتنە ڕێ و پابەندی ئەوەش بوون کە مەوداو ماوەیەك لە نێوانیاندا هەبێ، بەتایبەتی کاتێ میستەر ڕیچ پیاوگەلێکی وای لەگەڵدابێ، خاوەنی پلەوپایەیەك بن لە وڵاتدا. کۆمەڵەکەی ئەم بریتی بوون لە یاوەرەکەی و میواننەوازەکەی و دەستوپێوەندەکەی خۆی و پیاوانی بارەگای نشینگەیی و ئەفسەرەکانی و کارگوزارەکانی. ڕیچ خانمیش کارەکەرەکانی و هەندێ پاسەوان و میناس ئاغا و دکتور (بەل)ی لەگەڵدابوون. هەرچەندە ئەمە لەگەڵ نەریتیشدا نەدەگونجا و دەتوانین ڕوونی بکەینەوە و بڵێین موسڵمانەکان ڕێگا بە ئافرەتی ئەوروپایی دەدەن، کە پیاوانی وڵاتەکەی خۆی و سەر بە ئایینەکەی خۆی، یاوەریی بکەن. بەڵام ئەو تاوانەی چاوی لێ ناپۆشرێ، ئەوەیە کە موسڵمان ئەو ئافرەتە بەبێ سەرپۆش ببینن، یان لەهەر شێوە کۆڕ و کۆبوونەوەیەکی کۆمەڵایەتیدا ببینن، کە جێگایەکی بەرچاوی هەبێت. ئیتر سەرپۆشی پێوەبێت، یان پێوە نەبێت گرنگ نییە ــ خاریچ.

ژمارەی ئەو خەڵکەی لەم ناوچانەدا جلوبەرگی تێکەڵی تورکی و کوردی لەبەردەکەن، لەوانە زۆرترن کە جلوبەرگی ئێرانییانە لەبەردەکەن. بەڵام ئافرەتیان هەموویان جلوبەرگی شێوە ئێرانییانە لەبەردەکەن.

## ٣ی ئەیلول

لە شەشدا دەستمان بەڕۆیشتن کردەوە، ڕۆیشتنەکەمان لە دۆڵەکەدا بە ئاشکرا بەردەوام بەپێچاوپێچ بوو، تا گەیشتینە ئەو شاخانەی دەبوونە سنوور بۆ دامێنی. پاشان ئەو ماوەیەی لە ڕێگاکە مابوومان بەخۆشی بڕیمان، هەرچەندە پێچیشی زۆر تێدەکەوت. کاتێ سەرکەوتینە سەر شاخەکە، هەندێ داری گەورەی هەرمێ کێویلەمان بینی، کە دیمەنیان دڵی دەکردەوە، بەتایبەتی دوای سەفەرێکی درێژی وشك و ڕووتەن، کە لەوکاتەوەی لە (سنە) دەرچووین، جگە لە هەندێ بێستان، هەر داری گەورەی توودڕکی گەییومان بینی، یان دەوەنە بیی کە بە زۆری لەهەموو جێگایەکدا ڕوابوون.

بەدەوری کێوەکاندا سووڕاینەوە، لە هەندێ لووتکەی بەرزیاندا هێشتا گیا سەوزبوون، ناو بەناویش گوڵی تێدابوو. لە حەوت و نیودا بۆ شیوێکی تەنگەبەر شۆڕبووینەوە، لەوێوە یەکسەر سەرکەوتینەوە. لە هەشت و بیست دەقیقەدا بەلای خۆرئاوادا سووڕاینەوە. ئیتر بەدرێژایی ڕێگا هەر بەم سەمتە ڕێمانکرد. ڕێگاکە پێچی زۆر تێدەکەوت. دوای تاوێ گەیشتینە لای چەمێکی بچکۆڵە، پێی دەوترا ڕووباری (خوڕ خوڕە)(١٩٦)، کە ئاوەکەی بەهۆی بارانی زۆری ئەم دواییەوە، زۆر زیادی کردبوو، بەڵام کە ئاوەکەی نیشتبووەوە، لەپاش خۆیەوە ژمارەیەك ماسیی جێهێشتبوون، کە لەسەر قوڕەکەی ڕۆخی مردبوون.

پاشان سەرلەنوێ بە لێواری شیوێکی بەردەڵانیدا سەرکەوتینەوە. لە دە دا گەیشتینە گوندی (قەرە بوکرا)ی١٩٧ نزیك بەرزایی شیوەکە، کە لەژێر لووتکەی شاخێکدا بوو.

---

١٩٦- ئەم چەمە دەڕژێتە (قیزیل ئوزان)ەوە. لە لاپاڵی شاخێکی بەرزی لای چەمانەوە هەڵدەقوڵێ، پێی دەوترێ (چل چەمە Tchat chama)، کە سەر بە زنجیرە شاخەکانی (خوسرەوخان)ە. لەپاڵیشیدا لەژێر لووتکەیەکدا، گوندی (قەرەبوکرا Kara - bokra)یە کە سبەینێ دەیچینێ، سەختیی شاخەکانیش بە تەواوی لە باشووری خۆرهەڵاتەوە بۆ باکووری خۆرهەڵات بوو، کە زۆربەیان لەو بانووەدا نامێنن، کە دوێنێ بڕیمان.

١٩٧-(قەرە بوقرە) و (قەرەبوغرە)شی پێدەڵێن ــ م.

ئەگەرچی هەندێ دارچنار و میوە، لە پیسیی گوندەکەیان کەم کردبووەوە، بەڵام دیمەنی گوندەکەیان جوان کردبوو. لەوبەری شیوەکەشەوە ئاسەواری قەڵایەکمان بینی، بۆئەوە کرابوو لەکاتی هێرشی بڵباسەکاندا پەنای بۆ ببرێت.

ئەمڕۆ، یەك دوو گوند لەو گوندە پیسانەمان بینی، ئەو ناوچانەش کە پیایاندا تێپەڕ دەبووین قاقڕ و چۆڵ بوون. گەلێ چیرۆکی دڵتەزێنمان لەمەڕ ئەو جافانە بیست، کە لە هەموو ئەم ناوچانەدا مێگەل دەلەوەڕێنن و ئاکارێکی ئەوەندە بێ سنووریان هەیە، هیچ یاسایەك نایانگرێتەوە، کە بێگومان ئەو بەڕێوەبردنە خراپەی (والی)ش هۆی گەورەیە بۆئەوەی دانیشتوانی ئەم ناوچانە چۆڵی بکەن، سەرباری هێرشی خێڵە ڕەمەکییەکانیش کە ئەویش هەر زەبری خۆی هەیە.

ئەمڕۆ لە جاران زیاتر (تەلە بەرد - SCHISTUS)م بینی کە چین چین لەسەریەك بوون و ناو بەناویش دەمارە گەچۆڕیان تێکەڵ بوو، کە ڕەنگی هەندێکیان مەیلەو سوورێکی جوان بوو. هەروەها وردە مەعدەنێکی زۆرم بینی، بەتایبەتیش لە کۆتایی قۆناغی ئەمڕۆماندا.

بۆئەوەی ڕۆژی دواتر بگەینە (بانە)، حەزمان دەکرد ڕۆیشتنی ئەمڕۆمان زیاتر بێت، بەڵام ئەو کوردانەی دەیانویست هەر ڕێ بکەین، ماوەکەیان نەدەزانی، ڕێگاکەشمان چونکە شاخاویی و سەخت بوو، بڕیارمدا خۆم نەخەمە گێژاوی ڕێکردنێکی درێژەوە، بەتایبەتیش کە نەخۆشێکی زۆری کۆمەڵەکەمانم لەگەڵدایە. لەبەرئەوە بڕیار لەسەر ئەوە درا ئەمڕۆ لە (قەرە بوقرە) لا بدەین. ئەمڕۆش لەو دۆڵە تەنگەبەرەدا گەرما بەتین بوو.

سەقز، شارستانی ناوچەکە، ڕاستەوخۆ دەکەوتە سەروومانەوە، ماوەی گەیشتنە ئەوێش بەڕێگایەکی  زۆر خراپدا شەش سەعات دەخایەنێ. بەڕێیەکی کەمێك لەو باشتریشدا حەوت سەعاتی دەخایاند. دەکەوتیشە لای شانی دووەمی کێوەکانی (خوسرەوخان)ەوە١٩٨.

## ٤ی ئەیلول

لە شەش و چارەکدا لە گوندی (قەرە بوقرە) دەرچووین، دوای ئەوەی لە شیوەکە دەرچووین و بەو شاخەدا هەڵگەڕاین، کە لای باکوورەوە دەبووە سنوور بۆی. ڕوومان کردە قەڵاکە و بە ڕێگایەکی کووڕ و ناخۆشدا بە دە دەقیقە گەیشتینێ. پاشان بەڕێگەیەکی پێچ و گەوەدا کەوتینە پێچاوپێچ کردنەوە بەدەوری ترۆپکی کێوەکاندا. لەم شاخانەدا ورچێکی زۆر هەیە، هەموویشی لە بۆرە ئاساییەکانە.

---

١٩٨- ماوەی نێوان (قەرە بوکرا) بۆ (سەرخوانی شەلاڵ)ی نزیك (تەراتوول) چوار سەعاتە. لەوێشەوە بۆ (بییستان) چوار سەعاتی ترە.

لە نۆ و پێنج دەقیقەدا چووینە سەر ڕێگایەکی چاك، خۆمان لە گەروو، یان دۆڵێکی بەردینی تەنگەبەردا، یان شیوێکدا دییەوە، کە شاخ دەوریان دابوو، ئیتر تا ئێوارە زۆر بەگران دەستمان کرد بە پیایدا ڕۆیشتنی. ڕێگاکەش بەلێواری ستوون ئاسایی چەوەلە هەڵوەریوەکاندا، بەردەوام کەندولەند بوو. تەنگەکەش تەسك و لار بوو، لە ڕاستیدا لە توولە ڕێیەك زیاتر هیچی تر نەبوو، کە لای چەپییەوە هەزار بەهەزار بوو.

کوردەکان خۆیان دانیان بەوەدانا، کە ئەم ڕێگایە ناخۆشترین ڕێگایە،کە تا ئێستا پیایدا ڕۆیشتووین. سەرنجیشم دان بۆ یەکەمین جاربوو لە ئەسپەکانیان دابەزین و بەپێ، بەو دەربەند و تەنگەبەرە سەختانەدا ڕێ بکەن. ئەسپەکەی (عومەرئاغا) لای چاڵێکی هەزار بەهەزار، هەڵئەنگوت، بەڵام زۆر چابووکانە یەکسەر لەسەر ئەسپەکەوە خۆی فڕێدا، بەبێئەوەی جڵەوەکەی لەدەست بەربێت. خۆ ئەگەر وای نەکردایە، خۆی و ئەسپەکەی پێکەوە سەر ئەنگرێ دەبوون و دەمردن. تووشی ژانەسەرێکی قورس بووم، ناچاریش بووم بەلێواری هەزار بەهەزاری شاخەکەدا، تا کۆتایی ڕێکردنەکە، ڕێ بکەم. ئەمەش کارێکی سەخت بوو، تەنانەت بۆ پیاوێکیش کە تەندروستی زۆرباش بێت و فێری ڕۆیشتنیش بێت. ڕۆژەکەیشی گەرم و ناخۆش بوو، چاویش بە هیچ دیمەنێکی جوان، یان شتێکی سەرنج ڕاکێش، زاخاوی نەدەدرایەوە.

لەسەر شاخەکەوە، کێوی (کەلی خان) و کێوی (زاگرۆس)، یان بەشێکیمان بینی. لە حەوت و سیی و پێنج دەقیقەدا گەیشتینە دامێنەکەی و تاوێ دواتر گەیشتینە گوندێکی بچووکی پیس، ناوی (حاجی ئەحمەد) بوو. پاش ئەوەی کەمێك هەڵگەڕاین، یەکسەر شۆڕبووینەوە سەر گوندی (سووتە) لە چاڵاییەکی لێژ و ترسناکدا بوو. لای چەپییەوە خۆمان بە فنجانێك قاوە ژیاندەوە. خۆمان وا دانابوو کە ئیتر ناخۆشیمان نەماوە، کەچی دوایی بۆمان دەرکەوت هێشتا ناخۆشییەکەی هەرماوە.

لە نۆ و چارەکدا دەستمان بەڕۆیشتن کردەوە. دوای تاوێ شۆڕبووینەوە و لە دۆڵێکی نزمدا لە چەمێکی بچووکماندا. پاشان چووینە گوندی (سێفە تاڵە)ی بچووکەوە، کە بە مانای سێوی تاڵ دێت. لێرەش دووبارە بۆ حەسانەوە ڕاوەستاینەوە. پیاوێکی ئاییینی (کە وەك دەردەکەوت خاوەنی گوندەکە بوو)، سفرەیەکی دەوڵەمەندی پڕ لە هەنگوین و کەرەی تازە(١٩٩) و ماست و ئارووی بۆ دانایین.

---

١٩٩- خەڵکی ئەم وڵاتانەی خۆرهەڵات، هەنگوین و کەرە، پێکەوە دەخۆن، کە دەشێ ئەمە لە بەشەکانی تریشدا خوویەکی بڵاوبێ، بەگوێرەی ئەوەی لە (تەورات)یشدا وا هاتووە: (هەرکاتێ زانرا کە شەڕ پەسەند نەکرێ و چاکە هەڵبژێردرێ، کەرە و هەنگوین پێکەوە، دەخورێن). سفر ــ أشعيا ــ الاصحاح ــ ١٥٧.

عومەرئاغا و بەگ، بە هەڵپە بەربوونە ئەم خۆراکە بەتامە لادێییانەیە، بەڵام (نۆبەتیێ)ی توند نەیهێشت لە یەك دوو کەوچك زیاتر لە ماستەکە بخۆم.

لە یازدە و نیودا بەهەمان ڕێگا ناخۆشەکەدا دەستمان بەڕۆیشتن کردەوە. دارەبیی، ڕۆخەکانی (خورڕخوڕە)یان ڕازاندبووەوە. خورڕخوڕەش بەهێواشی بە دۆڵەکەدا تێپەڕ دەبوو. بەناو ڕێگایەکی جوانی پڕ لە درەختدا ڕێمان دەکرد، بریتی بوو لە نارەوەن(٢٠٠) و سوورەچنار و گوڵە کێوییەکی زۆر.

لە یەك و نیودا ماندووبوون پەکی خستم، لەبەرئەوە ناچاربووم لەژێر سێبەری داربییدا تاویێ ڕابکشێم، کە لەگویێ چەمێك بوون، ماسیی گەورە و دەستەمۆی تێدابوو. خەڵکەکەی ئێرە زۆر تامەزرۆی ماسی خوادرن نەبوون. لە دوودا دووبارە سواری ئەسپەکانمان بووینەوە، یان بە واتەیەکی تر بەپیێ ڕۆیشتینەوە، چونکە بەو بیێ هێزیی و ژانەسەرەوە، نەمدەتوانی ئەسپەکەم بە لێواری ئەو هەزار بەهەزارەدا بئاژووم.

لە دوو و چل دەقیقەدا گەیشتینە گوندی (مییك ــ MEEK)، بەڵام من پەکم کەوتبوو، سەرباری ئەوەش تووشی نائومێدییەك بووم، پەژارەی کردم، چونکە بیستم هاوسەرەکەم بەخۆی و کەلوپەلەکانیانەوە، لەجیاتی ئەوەی لابداتەوە و لە (مییك) رابوەستیێ، کەچی بۆ گوندی (بایەندەرە) براوە، لە بڵندایی دۆڵەکە.

پاش ئەوەی دڵنیابووم لەو جێگایەی بۆی براوە، بۆم دەرکەوت نە من دەتوانم ببزووم و بیگەمیێ، نە ئەویش دەتوانیێ لە سەفەرێکی وەك هی ئەمڕۆدا بگەڕێتەوە و بەمن بگاتەوە، چاوەڕێکردنی درێژیشی تاکاتی شێوکردن، بەئومێدی ئەوەی پێمان بگاتەوە، ئارەزووی نانخواردنی نەهێشتم و (نۆبەتیێ)یەکی کەمیشم تووش هات و هەموو جلەکانمی خستە سەر

---

٢٠٠- نارەوەن: چەند ناوێکی تریشی هەیە، هەندیێ جار بەپێی ناوچە، ناوی جیاجیای لێنراوە، وەك: ڕەشەدار، دارە ڕەش، وزم، بناو، دار تۆفانە، دار مێشوولە. بە عەرەبیش پێی دەوتریێ (دردار) و بە ئینگلیزیش ASH & ELM ــ. درەختێکە گەڵاکەی دەوەریێ و لە ناوچە ساردەکاندا دەڕوێ. گوڵەکەی بچووك و سەوز و بە شێوەی هێشوو شۆڕ دەبێتەوە. هەندێکی گوڵەکەی سپییە و تۆوەکەی باڵدارە، بەهەوادا بڵاودەبێتەوە. بەرەکەی لە هەنار دەچێت، ناوەکەی شێدارە و کە دەتەقێت مێشوولەی لیێ دێتە دەرەوە. (نالی) شاعیر، بە (نارەوەن ) ناوی هێناوە:

دەس بەندیانە دێن و دەچن سەرو و نارەوەن،

یا حەلقەیانە صوفیی مل خوار و مەندەبوور(م)

ئارەق و ئاو، جلی زیادەی ژێرەوەشم پێ نەبوو تا بیانگۆڕم. لەم کاتە ناهەموارەدا عومەرئاغا ئەوپەڕی سۆزی نیشاندام و (حاجی قاسم)یش(٢٠١) زۆر بەتەنگمەوە هات و بە درێژایی شەو، ئێشکی گرتم. ئەمە یەکەمین جار بوو لەم چەند ساڵەدا، نۆکەرێك، یان بیانەیەك ئەوەندە خزمەتم بکات، بڕوام نەدەکرد و زۆریش ئاسوودە نەبووم.

گوندی (میبیك) دەکەوێتە ناوچەی (سەقز)ەوە، کە لای چەمە بچووکەکەوە دەست پێدەکات و کەمێکیش پێش ئەوەی بگەیتە (سێفە تاڵە).

هەنگوینی ئەم ناوچانە ناوبانگێکی زۆری هەیە، چونکە ڕووەکێکی زۆر و بۆنداری تێدا دەڕوێت. سەرباری ئەو ماندووبوونەشم، چووم بۆ سەیری پووره هەنگێك لە باخێکی نزیکدا، کە زۆر جوان و ڕێك، گوڵ و گیای بۆنخۆشی تێدا نێژرابوو. کەپرێکیشیان لە لقوپۆپی درەخت تێدا کردبوو. لە تەنیشتیشیەوە لوولەی گڵێن، یا ڕاستتر، لوولە گڵینی وشك کراوە دانرابوو، کە سەرێکیان کرابوەوە و سەرەکەی تریان کونێکی بچکۆلەیان تێداهێشتبووەوە. خۆ ئەگەر بیانەوێ هەنگوینەکەی کۆبکەنەوە، ئەوسەرەی لادەبەن کە کەوتۆتە دیوی لای کەپرەکەوە و شانە هەنگوینەکانی تێدایە و هەندێ پووشی لە نزیك دەسووتێنن، ئیتر هەنگەکانی لە کونە بچووکەکانەوە هەڵدێن و هەنگوینی ناو لوولەکان بۆ خاوەنەکەی جێ دەهێڵن.

گوندنشینەکان شانەیەکیان لێ دەرهێنا و هەنگەکانیان نیشاندام کە لە شانەکانیدا کاردەکەن. بەجۆرێ سەرگەرمی کارکردن بوون، گوێیان نەدەدا بەوانەی دەستکاریان دەکردن و هێرشیشیان بۆ نەدەهێنان.

ئەمڕۆ گوێمان لە دەنگێکی بێ شوماری (کەو) بوو، دەیانوت لە (هەورامان) زیاتریش هەیە و ڕاوکاران بەسەدانیان لێ ڕاو دەکەن، ئەویش بەوەی لەسەر دوو شاخی بەرامبەر ڕادەوەستن و ئەو پۆلانەیان دەترسێنن کە بەرەو ڕوویان دەچێت و دەست بە هاوار هاوار دەکەن و ئەو پۆلانەیان دەترسێنن کە خەریکن لێیان نزیك دەبنەوە، ئیتر ئەوانیش ترسیان لێ دەنیشێ و دەشڵەژێن و دەپسێن و دەکەون، ئەوسا گرتنیان ئاسان دەبێت... عەبدوڵڵا بەگ بۆی گێڕامەوە، گوایە جارێکیان لە هەورامان لەگەڵ (والی)دا بووە و ئەمجۆرە ڕاوەیان کردووە. دەیوت نزیکەی هەزار کەویان ڕاو کردووە.

---

٢٠١- یەکێکە لە نۆکەرەکانی میستەر ڕیچ.

ئاسکیش بەهەموو جۆرەکانییەوە و بزنەکێوی و کەڵەکێوی، کە وەك من پێی بزانم پێی دەڵێن شوور. هەروەها جۆرە ئاسکێکی تریش لەم ناوچانەدا زۆرە، کە پێی دەڵێن مەڕەکێوی و لە وەرزی زستاندا راوی دەکەن، بەڵام (ریم)(٢٠٢) لە ناوچەی (ئەسفەندئاوا) هەیە.

## ٥ی ئەیلول

بەدرێژایی شەو زۆر نەخۆش بووم. ئەم بەیانییەش کێشەم ئەوەبوو کە ئاخۆ دەتوانم سەفەر بکەم یان نا؟ بەڵام بڕیارمدا تەقەللای بۆ بدەم. ئیتر لە حەوتدا لە (مییك) دەرچووین و پاش ئەوەی بە ملەیەکی زۆر کووڕدا هەڵگەڕاین. بە گەردەنەکەیدا سووڕاینەوە بۆ ئەو شوێنەی کە لێوەی بۆ گوندی (بایەن دەرە) دادەبەزین. لێرە ئیتر هەستم کرد گیانم دادەهێزرێ، بە ڕادەیەك نەمتوانی لەوە زیاتر ڕێ بکەم و کاتێ ویستم دابنیشم، لەهۆش خۆم چووم و کەوتم. بەڵام بەوەی باش بوو (کورد ئۆغڵی)(٢٠٣) لەپشتمەوە بوو، باوەشی پێداکردم و گرتمییەوە. لێرە ئیتر بۆم دەرکەوت، یان بە واتەیەکی تر ماندووبوونم وای لێکردم بزانم کە ناتوانم لە (بایەن دەرە) زیاتر ڕێ بکەم، کە دوێنێ شەو هاوسەرەکەم تیایدا مابووەوە. بەڵام کڵۆڵیم هەر دەستبەردارم نەببوو، چونکە زانیم هاوسەرەکەم (لەبەر هەڵەیەك) قۆناغێکی تر پێشکەوتبوو. کاتێ عومەرئاغا، بەمەی زانی، خۆی بۆ (بایەن دەرە) چوو، سوارێکی بەدوای کۆمەڵەکەدا نارد، پێیان بڵێ لە نزیکترین گوندی ئاقاری (بایەن دەرە) بەریان لێ بگرێ و پاشان خۆی گەڕایەوە و ئەوەی کردبووی بۆی گێڕامەوە. لەبەرئەوە دەستمان بەڕۆیشتن کردەوە ، یان بەواتایەکی تر (کورد ئۆغڵی) و ناڵبەندەکەمان تا دامێنی لێژاییەکە هەڵیانگرتم. لەوێ دووبارە لەژێر سێبەری بییەکدا لەگوێ چەمێکی جوان بۆ حەسانەوە ڕاکشام. لەم جێگایەدا فنجانێ قاوەم خواردەوە، ژیاندمییەوە. عومەرئاغای جگەرسۆزیش سووربوو لەسەر ئەوەی دوو کەوچك لە دەرمانە گشتییەکەی کورد بخۆمەوە، کە (دۆ) بوو، لە (بایەن دەرە)شەوە بۆمی هێنابوو. پیاو هەق بڵێ زۆری ژیاندمەوە. لە دە و نیودا هەستم کرد توانای ئەوەم هەیە، ئەوەی لە ڕێگاکە ماوە، بیبڕم، بۆ بەختەوەریشم ئاسان بوو.

بەسوارییی، لەسەرخۆ لە دەربەند و دۆڵێکی پێچاوپێچدا ڕێمان دەکرد، بەڵام تا دەهات تەختتر دەبوو، ئاوێکی پێدا دەڕۆیشت، لەمبەروبەریەوە داری بیی بەشێوەیەکی جوان روابوون. لە دوازدە

---

٢٠٢- نەمزانی بە کوردی بەوجۆرە ئاسکە دەڵێن چی، کە بە عەرەبی پێی دەڵێن (ریم) ـــ م.

٢٠٣- میر ئاخوڕەکەی لای میستەر ڕیچ ـــ ه. خەڵکی (بایەزید) بوو، لە ئەرمینیا ـــ خاریچ.

چارەکێك کەمدا، بەبێئەوەی هەڵگەڕێین، گەیشتینە سەر بەرزاییەك، لەوێوە یەکسەر لێژ دەبووەوە، پێم وابوو لەهەموو ئەو لێژاییانە، لێژتر بوو کە تائێستا پیایاندا هاتبووین. هاتنە خوارەوەشمان پیایدا نزیکەی نیو سەعاتی خایاند، ناویشی (کەللەباڵین-Kelleh Balin) بوو. عومەرئاغا و عەبدوڵلا بەگ لەسەر ئەوە یەکبوون کە ئەمە یەکێکە لە دەربەندەکانی (زاگرۆس). هەردوو کێوەکەش لێرەدا دۆڵێکیان دروست دەکرد، دەچووەوە سەر (بانە). هەردووکیشیان داربەڕوو داپۆشیبوون.

لەدامێنی لێژاییەکەدا بەناو ڕێگایەکی پڕ لە داری بەڕوو و نارەوەن و چنار و بییدا ڕێمان دەکرد. لەیەك و نیودا گەیشتینە گوندی (سوورەنە)، کە لەنێوان دووبانی کێوەکانی (زاگرۆس)(٢٠٤)دابوو. گوندەکە پیس بوو، بۆ ئەوە نەدەشیا بەو ناوەوە ناوبری، بەڵام تیایدا بە هاوسەرەکەم گەیشتمەوە. ژەمی نانی ئێوارەم تێدا نۆشکرد، کە بۆی ئامادە کردبووم، چونکە لە پێرێ ئێوارەوە هیچم نەخواردبوو.

لێرە، پیاوێك هاتەلام، والی لە (بانە)ەوە بۆلامی ناردبوو ، هەندێ بارە میوە و نامەیەکی ناسکیشی هێنابوو.

## ٦ی ئەیلول

لە شەشدا لە (سوورەنە) دەرچووین و بە دۆڵە جوانەکەدا دەستمان بەڕۆیشتن کردەوە. لە حەوتدا بەگوندی (بجەئی ــ Bjae یان بزەئی Bzae)دا تێپەڕبووین، کە دەکەوێتە لای ڕاستمانەوە. دوای تاوێ دۆڵەکەش و هەردوو کێوەکەش بەلای باشووردا زۆر وەردەسووڕانەوە. لێرەدا ئەو سێ خاڵە، یان ئەو سێ لووتکەیەمان دین کە پێشتر باسکران. تاوێ دواتر کێوەکان لە دەربەندەکەدا، کە دەچووەوە سەر (قزڵجە)، وەك خۆیان لێدەهاتەوە.

لە نۆ و نیودا گەیشتینە خانووەکەمان لە (ئەحمەد ئاباد)، یان (ئەحمەد ئاوا) وەکو کوردەکان دەیڵێن، کە گوندێك بوو لە تەنیشت (بانە)وە. خانووەکەشمان بەسەر جێگایەکی جوانەوە بوو، لەسەر کێوەکانی (ئاردبابا) کە بەشێك بوو لە خۆرئاوا، یان باشووری زنجیرەی

---

٢٠٤- وا دیارە ئەو بانەی خۆرهەڵات، هەر ئەو گردە بێت، کە بەرەو دۆڵی (باین دەرە) بە تەنیشتیدا تێپەڕبووین، سەمتی گەروەکەش بۆ گوندەکە (٧٠ پلە) لە باکوورەوە بۆلای خۆرهەڵاتدا بوو، پاشان بەلای باشووردا زۆر لادەکاتەوە و دووبارە ڕوودەکاتەوە (بانە). ئەو سێ لووتکانەش کە لە (ئەحمەد کولوان) و (زریبار)ەوە دیمانن، لە (سوورەنە)وە دەکەونە سەمتی (٥٠ پلە) بەلای باکووری خۆرئاوادا. بەڵام (بانە) دەکەوتە (٨٣ پلە) بەلای باکووری خۆرئاوادا.

(زاگرۆس)(٢٠٥)ماوەی دە دەقیقەیەك بەسواریی لە (بانە)وە دووردەبوو. هەندێ ڕەز و پێش هەیوانێکی جوانیشی لێ بوو، کە زۆرجار سوڵتانی (بانە)، بەنیازی سەیران، چادرەکەی تێدا هەڵدەدات. بییەکی زۆرجوانیش لە نزیك کانییەکی ساردبوو، گەرمابییەکەی (٥٣ پلە) بوو. بەڕاستی ئەم بییە، جوانترین بیی بوو کە تا ئێستا دیبووم.

والی هەندێ چادری بۆ پێشوازیمان هەڵدابوو. بان نۆکەرەکەیشیمان بینی، لەگەڵ هەندێ چێشتکاردا، چاوەڕوانیان دەکردین.

دوای نیوەڕۆ (حوسین قولی خان) کە یەکێك بوو لە کوڕەکانی والی - بۆ بەخێرهاتنم هاتەلام و وەزیرێك و سێ ئەندامی ئەنجوومەنی لەگەڵدا بوو، یەکێکیان پیرێك بوو، وەك بزانم ناوی (میرزا عەبدولکەریم) بوو، هەمیشە وێژەر، یان لەناویاندا سەرۆکی قسەکەر بوو، بەڵام (خانی گچکە) مێردمنداڵێك بوو، تەمەنی نزیکەی دوازدە ساڵێك دەبوو، سیمای لە میری گچکەی (سنە) دەچوو، بەڵام لەو بزێوتر و زرنگتربوو. هەڵسوکەوتی لێزانانە و بە ڕەوشت بوو. بە نەزاکەتێکی زۆرەوە بە فارسی بەخێرهاتنی کردم و ئاخاوتنیشی بەپرسیاری ماوەی نێوان وڵاتەکەی و ئینگلتەرە دەست پێکرد و کوردستانت چۆن هاتە بەرچاو و ئاخۆ ئێمە لە وڵاتی خۆمان قەننە دەکێشین و گەلێ پرسیاری تریش. پاشان پیاوە پیرەکە سەری قسەکانی لێ وەرگرت. وتووێژەکانیش چونکە هەمووی لەبارەی خووخدەی ڕێزگرتنی ئێرانییانەوەبوو، بۆیە تۆمارکردنی زۆر شایستە نییە.

ئێوارە لای (خان)ەوە دیاری زۆری میوە و هەندێ هەڵووژەی (میاندووئاو)م بۆ هات. هەرچەندە زۆر چاکیش نەبوو، بەڵام خراپ نەبوو، چونکە نۆبەرەی وەرزەکە بوو. لەکاتی پێشکەشکردنی دیارییەکانیشدا وێنە هەڵکۆڵراوەکانی (پەرسەپولس)م وەك چاکترین نموونە دەهاتە بەرچاو، کە سەرۆکی کۆمەڵەکە بە گۆچانێکی درێژەوە پێشدەکەوێ و کۆمەڵێکیش نۆکەر لە دوایەوە، هەریەکەیان شتێکی هەڵگرتووە. بەمجۆرە بەنیازی گەورەکردن، دیارییەکە بەسەر زۆرترین ژمارەدا دابەش دەکەن. خان پێی لەوە داگرت کە دەبێ نانی ئێوارەمان لە چێشتخانە تایبەتییەکەی خۆیدا بۆ ساز بکەن و دیارە بەپێی زەوقی ئێرانییانە دەبێ و وەك بزانم لە نانی (سنە) چاکتر و خۆشتر دەبێ و بەتەنگ کاتی حەسانەوەشمانەوە بوون.

---

٢٠٥- وادیارە ئەو شاخەی دەکەوێتە تەنیشتی باکووری دۆڵی (بانە)وە، کێوی (زاگرۆس)ی سەرەکی بێت. بەڵام کێوەکەی تەنیشتی لای باشووری و کێوەکانی تریش، هەر بریتین لە لقی تری ئەو کێوە، کە (٢٥ پلە ) بەلای باکووری خۆرئاوادا لادەکاتەوە و لەوێدا لووتکەیەکی قووچ پێك دێنێ و پاشان ئەم لووتکەیە دیارنامێنێ. ئەم لووتکەیەش (بیتوێن)ە، کە نزیکەی ١٣ سەعات دووردەبێ.

# بەشی نۆیەم

سەردانمان بۆ لای والی سنە ـ قەڵای بانە ـ وتووێژی والی سنە ـ ژنهێنانی کوڕەکەی ـ والی سەردانم دەکاتەوە ـ دڵڕەقیی والی لە بانە ـ خۆ تەیارکردن بۆ ڕۆیشتن ـ گیروگرفتی چاوەنوارِ نەکراو ـ بەگران دەستکەوتنی وڵاخی باریی ـ پۆزشی والی ـ سوڵتانی بانە ـ دەست پێکردنی ڕێکردنمان ـ سەرۆکی گوندەکە ـ ڕێگە پێنەدانمان لەسەر ڕێکردنمان ـ هەڵوێستێکی خراپ ـ بڕیاری بەشەڕ ڕێگاکردنەوە ـ ترسی سەرۆکی گوندەکە ـ ڕێگەپێدانمان بۆ ڕۆیشتن ـ چیا ـ چوونە ناو ناوچەی بابانەکانەوە ـ دەستوپێوەندەکانی عومەرئاغا ـ کەلاوەکانی قەڵاچوالان ـ میوەی تازە ـ شاخی نزم ـ گەیشتنە سلێمانی.

## ٧ی ئەیلول

خان،٢٠٦ ئەم بەیانییەی دیاریکردبوو، تیایدا سەردانی بکەم. پەیمانیشی دابوو بەفێنکیی، پێش ئەوەی گەرما دابێت، (کە دەترسام تینەکەیم بەرکەوێ)، پێشوازیم بکات، بەڵام تاپێش دە و نیو ئاگاداریان نەکردم، کە ئامادەی دیدەنیمە. ئەوسا ئیتر سواری ئەسپەکانمان بووین و بۆ شار چووین. لەوێ لەبەر شاردا (میرزا عینایەتوڵلا) و دەستەیەك سوارە پێشوازیان کردین. ئاپوورەکردنەکەشیان لەو گەرما و ناو تەپوتۆزەدا زیاتری دەنواند. کاتێ ئێمە بەناویاندا تێپەڕبووین، بەدەم سەرکەوتنمانەوە بۆ سەر شاخی قەڵاکە، کۆمەڵێك تفەنگ بەشانی (سەقز)ی و گەلێ ناوچەی تری کوێستانیمان بینی، کە لەهەردوو بەری ڕێگاکەوە ڕیزیان بەستبوو. هەروەها سەربازان، یان سەربازانی نیزامیی، کە سلاوی سەربازانەیان بۆ کردم، بەڵام لەو هاوڕێیانەیان چاکتر نەبوون، کە لە (سنە) دیبوومن. ژمارەشیان نزیکەی سەدوپەنجا سەربازێك دەبوون. قەڵاکە، یان کۆشکەکەش، یان هەر ناوێکی تری لێ بنرێ، شوێنێکی دیمەن ناشیرین بوو. چاوم بە(خان) کەوت، لە هۆڵێکدا دانیشتبوو، دیوارەکانی گەچکاری نەکرابوون، کۆمەڵێك کاڵەکی لە دەوربوون. بۆ پێشوازی کردنم هەستا، دەستی بۆ من و میستەر (بەل) درێژ کرد. لەوە نائومێد بووم کە هەڵسوکەوت و ڕوخساری بەوجۆرە نەبوو پێشتر لە دیدی مندا بوو. وام چاوەڕێ دەکرد قیت و قۆزیی (داوود پاشا)ی تێدا ببینم، بەڵام هەر ئێرانییەکی ئاسایی ڕوخساری توند، یان بە واتەیەکی تر، دوو ڕەگ بوو، یا لەو شێوانە بوو کە پێیان دەڵێن پیاوێکی چاك و سنگ فراوان. لەوانە نەبوو ترش و خوێ بەقسەکانییەوە بکات و هەربەوە دەست پێدەکا کە هەندێ پرسیاری کورت بکات و سەرنجی کورتیش دەربڕێ. باڵای لە مام ناوەندی کەڵەگەتتربوو. دەموچاوێکی خڕوپڕ و ریشێکی سپی و دووبرۆی رەش و پڕی پێوەبوو، کە شێوەی ڕاست وەستان و لەیەکەوە نزیکیان وایانکردبوو سەرەوەی دەموچاوی دڵی پێنەکرێتەوە.

لێرەدا دەبێ ئاماژە بۆ ئەوە بکەم، کە هەرگیز ئێرانییەکم نەدیوە لە هەموو ڕوویەکی جوانییەوە، جوان بێت. ڕەنگە هۆی ئەمەش هی ئەو جلوبەرگانەیان بێت کە لە جوانیی بێبەشیان دەکات، ئاکاری توند و قەبەیان و ئاخاوتنیان بە دەنگێکی گڕ، لایان بووە بەخوویەکی باو، کە لاسایی پیاوانی خێڵەکی و ناو کۆشکەکان دەکەنەوە. بەڵام بەلای منەوە لە (ئەوباش)ێکی پۆشتە زیاتر، هیچی تر نین.

---

٢٠٦- خان: مەبەست لە ئەمەنوڵلا خانی گەورەو والی ئەردەڵانە(م).

لەگەڵ (خان)دا، مووساخانی حاکمی (سەردەشت)یش دانیشتبوو، کە بۆ سەردانی (والی) هاتبوو، لەگەڵ سوڵتانی (سەقز)دا، ئەمیان خزمی خۆی بوو، هەروەها سوڵتانی (بانە)ش لە تەنیشتیانەوە دانیشتبوو، دانیشتنەکەیشی بێ زۆر لەخۆکردن و ئاسایی بوو، لە هەمووشیان زیاتر بەئازادیی ڕەهاییەوە دانیشتبوو. ئەوە وای لێکردبوو دەتوت شازادەیە لەناویاندا. هەردوو کوڕەکەی خان لەپشت پەنجەرەکەوە ڕاوەستابوون، کە سەرەوکاری کۆمەڵێك نۆکەر و چەکداریان دەکرد. ئەو کوڕەیانی کە زۆری لێ نزیك بوو (**محەمەد عەلی خان**) ئەوەیان بوو کە لە جەژنی نەورۆزی داهاتوودا، کچەکەی (شاه) دەخوازێ. کوڕێکی داڕێژراوی ڕەشتاڵە بوو، شێوەی لە باوکی دەچوو[٢٠٧]، بەڵام ئەو کوڕانەی تری، کە دیبوومن، لەو ناچن.

جلوبەرگی دەرەوەی والی بریتی بوو لە شاڵێکی ڕەشی کشمیری. جلەکانی تریشی ئاسایی بوون. چەکی جوان و خەنجەری گرانبەهای هەڵنەگرتبوو. پێشەوەی دەربارەکەیشی بەم شت و بەو شت نەڕازانبووەوە، لە دووربینێکی پاپۆڕ و باستونێکی بە (لەك) بۆیەکراو، زیاتر نەبێ، کە شوێن دەسکەکەی زیوین بوو، لەگەڵ قاپێکدا کاتژمێرێکی تێدابوو دووسێ مۆر و قووتوویەکی تریاك، لە

---

٢٠٧- **محەمەد** عەلی خان: مەبەست لە: (خوسرەوخان ــ١٨٠٠- ١٨٣٤ز)ە، کە لەم کاتەدا سەرقاڵی ئامەدەکارییە، (حوسن جیهان خانم)ی کچی فەتح عەلی شای بۆ بخوازێ و دواتریش: ماهشەرەفخانم - مەستوورە خانم (١٨٠٥-١٨٤٧ز)ی مێژوونووس و نووسەری ناسراوی خواست-م.



**ئەمانوڵڵاخان (گەورە)ی ئەردەڵان**

**(١٧٧٥ – ١٨٢٤ ز)**

**ئەم وێنەیەم لەم سەرچاوەیە وەرگرتووە:**

**خاندان کرد اردلان در تلاقی امبراتوری های ایران و عپمانی**

شیرین اردلان مترجم: مرتچی اردلان
چاپ ستارەی سنجر، اول، تهران ۱۳۸۷ش. ص ۲۲۵
دەستکاری (برمنگهام).

بەتورکی دواندمی، کە ئێستا لە ئێراندا بۆتە زمانی باوی چینی خانەدان. منیش ئێستا لەبەرئەوەی قسەکانی شایانی تۆمارکردن نەبوون، کەمێکیم لەبیرە، چونکە هەر کورتە پرسیاری کرد، قسەکانیشی وا دەکرد، کە لەبارەی شتی بێ بایەخ و بەئەنقەست دووبارەکردنەوەی تێدا دەبوو، بۆ ئەوەی وات لێ بکات تۆش دووبارەی بکەیتەوە.

پرسیاری لەبارەی تەمەنمەوە کرد، وەڵامم دایەوە، وتم سی و سێ ساڵم، کەچی سەرنجێکی بە کوردی دەربڕی، وتی وەك چل ساڵێك دەنوێنێت. پاشان سەبارەت بە نەخۆشییەکەم پرسیاری بەتۆپەڵێك زاراوەی پزیشکانەی خۆرهەڵاتییانە دەست پێکرد، کە وەك بۆم دەرکەوت شارەزاییەکی تێدا هەبێ. لەمەڕ (مالکۆڵم) دوا و ستایشێکی زۆری کرد، ئاگاداریشی کردم کە (مالکۆڵم) گەلێ دیاری جوانی داوەتێ. دوایی سەبارەت بەکار و ئەرکی نیشنگەیەیی بەریتانی لە بەغداد، پرسیاری کرد و پێی لێ ڕاکێشا بۆ بڕی مووچەکەم! ئینجا نزیکەی پەنجا کاڵەکێکیان بۆ هێنایە بەردەمی، ئەویش قەڵەمبڕێکی بچووکی برمنگهامی لە گیرفانی دەرهێنا و یەکەیەکە لێی چەشتن. سینییە حەڵواشیان هێنا. ئەو لێی خوارد و منیش هەر لێم خوارد. ئیتر هەر خەریکی ئەوەبوو پارچەی بچووك بچووکیان لێ بکاتەوە و بەدەستی خۆی پێشکەشمیان بکات. پەیتا پەیتاش قەننە دەهێنرا. پرسیارێکی زۆری لەبارەی (بۆناپارت)ەوە کرد و ئەوەشی کرد کە ئاخۆ (میرنشینگەل) پێکدێنێ! وتیشی بۆتە ناوداران. نزیکەی دوو سەعاتێك لەگەڵیدا دانیشتم...

کە بەجێم هێشت، هەڵسا و دووبارە خۆشهاتنی کردم. پێشی وتم لەم نزیکانەدا سەردانم دەکاتەوە. پرسیاری تایبەتی لەبارەی دەستوپێوەندەکانی (سنە)ی لێ پرسیم، کە ئاخۆ لە هەڵسوکەوتیان ڕازی بووم، یان کەسێکیان شتێکی نابەجێیان بەرامبەرم نەکردووە!... ئەو تووڕەییەی لە سەروسیمایدا دەردەکەوت و ئەو ترس و لەرزەی لە نۆکەرەکانی دەنیشت، کاتێ کە ئەو تووڕەییەی دەردەکەوێ، وایان لێکردم ئەگەر هیچیشم لەبارەیەوە نەبیستبێ، بڕوا بکەم کە سەرکردەیەکی ترسناکە. لەڕاستیشدا هەرچیم لەسەری بیستووە، ئەوە دەسەلمێنن کە پیاوێکی فێڵاویی و قیناویی و زاڵمە.

قامچی لێدان لە (بانە)، ئەوە هەر پیشەی ڕۆژانەبوو. سامانێکی زۆری تێدا زەوت دەکرا. پار زستان، لێرە شۆڕشێك هەڵایسابوو، وتیان هۆیەکەی ئەم کارە توندوتیژانە بوون.

(بانە) شارێکی پیس و قێزەونە. لەو ئاستەدایە شایاڵی ئەوە نەبێ ناوی بنێی (شار)(٢٠٨)حاڵیشی لەو گوندانە چاکتر نییە، کە پیایاندا تێپەڕبووین، ئەوەندە نەبێ کە لەوان بڵاوترە. (خانوو)ەکەش، یان قەڵاکەش لەسەر گردێکی تووڕەکەڕێژ دروستکرابوو. هەر بەڕاستیش ناوی (بانە) هی ناوچەکەیە، ئەگینا شارەکە ناوی (بەڕۆژە ــ Berozeh)یە، بەڵام بڵاو نییە. جوولەکەیەکی زۆریش تیایدا نیشتەجێن.

## ٨ی ئەیلول

ئەم بەیانییە مووساخانی حاکمی (سەردەشت) سەردانی کردم. بەدرێژیی باسی ئینگلیزەکانی (تەورێز)ی کرد. ئەوەشی جێی دڵخۆشی و شادیی بوو، ئەوەبوو کە هەموولایەك بەباشی باسی هەڵسوکەوتی ڕۆڵەکانی وڵاتەکەمیان دەکرد.

سەر لە ئێوارە (والی) سەردانی کردم، کە لەپێشیەوە سەربازەکانی و لەدوایشیەوە ژمارەیەکی زۆری سوارە دەڕۆیشتن. بەڵام ڕێکردنەکەیان ئەو سام و شکۆیەی نەبوو، کە تورك هەیەتی، بەڵکو تویژاڵێکی ماتیی و داتەپیویی ئێرانییانەی بەسەرەوە بوو، بەتایبەتیش ئەگەر ژمارەکەیان زۆربێ. جلوبەرگەکانی (خان) لەوانەی دوێنێی ساکارتر بوون، چونکە جلێکی جۆری ئەستووری لەوانەی لەبەردا بوو، کە دەروێشەکان لەبەری دەکەن. سەرباز لەبەر چادرەکەدا سڵاوی سەربازانەیان بەچەك بۆ کرد و تیپی مۆزیکەکەش بەتەپڵ و مۆزیك، سروودی شاهانەیان بۆ لێدا. خانی سەردەشت و هەردوو سوڵتانی (بانە) و (سەقز)یشی لەگەڵدا بوون. هەندێ چەکی نیشاندام و پرسی کە ئاخۆ ئینگلیزیی، یان فەرەنساین و نرخیان چەندە و لەم بابەتە پرسیارانە. وتیشی گوایە (شا)ی ئێران بەڵێنی داوەتێ سێ تۆپی بیابان و دەستەیەك تۆپچیشی، بۆ فێرکردنی کۆمەڵێك لەوانەی لای خۆی بداتێ. هەروەها وتی: منیش وا دەکەم خۆم فێربکەم و دەمبینیت وەك تۆپچییەکانی ئینگلیز بوومەتە تۆپچییەکی زۆرباش، ئەی لە (سنە) قولیپەکانی کۆشکەکەت نەبینی؟ تۆپێك هۆ... لەوێ دادەنێم و هەندێ گامێش و مەڕیش لەو شاخانەی ئەوبەرەوە دادەنێم، ئەوسا دەبینیت ڕۆژانە چەندیان لێدەکوژم.

---

٢٠٨- دەڵێن (سەقز) لەو بەرینتر و پێشکەوتووترە.

ئێستا ئیتر هەڵوێستی دۆستانەتر بوو. قسەکردنیش لەگەڵیدا، هەرچەندە لە رووی زانیارییشەوە زۆر بەکەڵك نەبوو، بەڵام بێ زۆر لەخۆکردن و ئاسایی بوو. پاشان لای بۆلای مووساخان کردەوە و بە کوردی پێی وت: (بەوخوایە ئەم پیاوە وای کردووە خۆشم بوێ). دوایی پێمی وت: (حەز لە برایەتیم دەکەیت؟ شتێکی باشە، پیاو هاورێی دەوڵەمەندی وەك منی هەبێت). ئیتر باسی کتێبخانەکەم هاتەپێشەوە و عومەرئاغا زرنگانە هەلەکەی قۆستەوە و ئاگاداری کرد کە دەمەوێت دانەیەك لە کتێبی بەناوبانگی مێژووی کوردستانم چنگ بکەوێ، کە ناوی (مێژووی کورد)ە. لێرەدا گەیشتە ئەوپەڕی گەشکە و وتی: (مێژووی کوردانت دەوێ؟ سا بەخوا چنگت دەکەوێ)، چەند ساڵێك بوو، بەردەوام لە هەوڵی پەیداکردنی ئەم کتێبەدا بووم.

ئەم کتێبەش ئەوەی دەهێنا پیاو هەر لەبەر خاتری چنگ کەوتنی، (سنە)ی بۆ بگرێتەبەر(٢٠٩) لەوەش دەچوو بەم دواییە حاڵێکی ئایینی بۆ هاتبێ، بۆیە دەستی بەزیکر و وێرد خوێندن و تەسبیحات کرد. وتیشی نیازی حەجی (مەککە)ی هەیە. پاشان پرسیاری (کات)ی لە ئامادەبووان کرد، کە وەڵامیان دایەوە، پارچەیەك تریاکی بچکۆلەی دەرهێنا و کلۆیەك شەکریشی بەدوادا هەڵدا و دەستکرا بە قەننەکێشانێکی زۆر.

باسی ئەوەم بۆ کرد کە سبەینێ نیازی سەفەرم هەیە. ئەویش تکای لێکردم بیخەمە دووسبەی، تا دووبارە دیدەنیم بکاتەوە.

لە سەعات چواردا هاتەلام و تا نزیك بانگی شێوان لام مایەوە. پاشان مۆڵەتی خواست و بەنەزاکەت و ڕەوشتێکی زۆرەوە ڕۆیشت. سواری ئەسپێك، یان بارگیرێکی گەورە ببوو، سەرتاپای بە مەخمەل داپۆشرابوو. هەر کە لایشی بەلای دەستوپێوەندەکانیدا دەکردەوە، یان یەکێکی دەدواند، ئەوان دادەچڵەکین و ئەبڵەق دەبوون.

---

٢٠٩- میستەر ڕیچ توانی دانەیەك لە مێژووی کوردی چنگ بکەوێ، بەلام لەیادم نییە لای کێ دەستی کەوت. ئەو دانەیەش ئێستا لەگەڵ سەرجەمی کتێبخانە تایبەتییەکەی کە تایبەتە بە کتێبخانەی خۆرهەڵات، لە مۆزەخانەی بەریتانیایە ـــ خاریچ.

تێبینی: مەبەست لەو مێژووە، شەرەفنامەی **میر شەرەفخانی بەدلیسی** یە. بڕوانە پەراوێزی (١) لاپەڕە دوازدەی پێشەکییەکەی (مّحمد عَلی عَونی) لەو چاپەیدا، کە (فَرج اللّه زکی الکُردی) بلاوی کردۆتەوە، چاپی قاهیرە، ع.

## ٩ی ئەیلول

ئەمڕۆ دەبوایە سەردانی والی بکەم و مۆڵەتی لێ بخوازم. پێشتر داوام لێکردبوو خۆی کاتێکم بۆ دیاری بکات، چونکە ئەوەندەی پێوەندی بەمنەوە هەبێت، هەموو کاتێك بۆ من وەك یەکە. ئەویش وەڵامی دامەوە کە ئاگادارم دەکاتەوە.

بەدرێژایی ڕۆژی ئەمڕۆ، هەر لە بەیانییەوە، بۆ یەکلاکردنەوەی حسابی (بانە)ی بەسەربرد. چاوی سێ پیاوماقوڵی ئەم بەشەی میرنشینەکەی دەرهێنا و ئافرەت و کچەکانیانیشی لەگەڵ کۆمەڵێك خەڵکی تردا ئاوارەی (سنە) کردن. کاروانێکی درێژی ئەو ئافرەت و کچانەمان دیتن، کە میر ئاوارەی کردن، بەسەر وڵاخەوە ئەو دەشتەیان دەبڕی و هەندێ یاساوڵی سەر بە (خان)یش بەسوارییی، لەنێوان ئافرەتەکاندا ڕێیان دەکرد. ڕۆژی ئەمڕۆ ئەمە کردەوەی (خان) بووە. بەڵام بۆ بەختەوەری تا نەگەیشتایەتە سەعات یازدەش دەستی پێنەدەکرد. تا زیاتریش دەنگوباسەکانیمان ببیستایە، زیاتر ڕقمان لە دڕندایەتی و ملهوڕییەکەی دەبووەوە.

دوای نیوەڕۆ بۆ سەردانی گوندێك چووبوو، کە پێشتر ڕووتی کردبوونەوە، کەچی پێش ڕۆیشتنی هەواڵێکی بۆ ناردبووم، دەڵێ ئەمڕۆی بەهەندێ کاروبارەوە بەسەر بردووە، کە نەیتوانیوە دەستبەرداریان بێت و تکاش دەکات کە سبەینێ سەردانی بکەم و لەوێوە ماڵاوایی لە یەکتر دەخوازین و ئیتر ئەو بە ڕێیەکدا دەڕوات و منیش بەڕێیەکی تردا. ئەم دواکەوتنەش زۆر بێزاری کردم، بۆیە نوێنەرێکم نارده لای تا داوای لێبووردنی لێ بکەم کە ناتوانم سبەینێ دوابکەوم. بەڵام ئەو جێگایەی جێهێشتبوو، تا درەنگانێکی شەویش نەدەگەڕایەوە.

لە یازدەدا چوومە سەر جێگەکەم، بەڵام هەر تاوێك ئارامم گرت، تا بان نۆکەر هات، کە لە هەمان کاتدا بان هۆبەش بوو، ئاگاداری کردم، فەرمانی پێکراوە بەپەلە چادرەکان بپێچێتەوە. سەرم لەم توندوتیژییە لەپڕە زۆر سوڕما. بۆیە من و عومەرئاغا کە هەواڵەکەی گەیاندبوو، هەرچەندمان دەکرد نەماندەزانی چۆن هەواڵەکە لێك بدەینەوە! بەڵام بڕیارمدا چادرەکان کۆنەکەنەوە، مەگەر هێزێکی لەوەی خۆمان گەورەتر، بەزۆر پێمان کۆبکاتەوە. لەبەرئەوە ئەگەرچی شەویش درەنگ بوو، بەڵام داوام لە عومەرئاغا کرد سواربێت و بچێتە شار، تا سۆراخی ئەم هەواڵە سەیرە بکات، بزانێ چییە. عومەرئاغاش داواکەمی لەئەستۆ گرت و دوای نیو سەعات مەلاکەی (میرزاکەی) ــ فەقێ قادر ــ گەڕایەوە (بەینی خۆمان بێت پیاوێکی یەکجار چاکە) بۆئەوەی ئاگادارم بکاتەوە، کە شتەکە هەڵەیەك بووە و

میرزاکانیش لێی پاڕاونەتەوە، کە بە (خان)ی نەیگەیەنێ. بان نۆکەرەکەش لەرزی لێ نیشتبوو دەیوت ئەگەر (خان) شتەکە بزانێ، هەردوو چاوی هەڵدەکۆڵێ.

عومەرئاغاش ئاگاداری کردم کە نەیتوانیوە والی ببینێ. لەبەرئەوە ، وای بەچاك دەزانێ لە شار بێت، بۆئەوەی وڵاخەکان بهێنێ (کە دەبوایە والی بۆمانی پەیدا بکات، چونکە بەبێ فەرمانی ئەو پەیدا نەدەکران) تابتوانین سبەینێ بەیانی بەزوویی ڕێ بکەوین. چاکیشم کرد کە لە مەسەلەکە بێدەنگ بووم، چونکە سەیرم کرد هیچ سووکایەتی پێکردنێکی دەست هەڵبەستی تێدا نییە. بۆشم دەرکەوت کە ببێ و نەبێ، فەرمانەکە بەسەرخۆشیی و لەکاتی مەست بوونێکی زۆردا دەرکراوە، چونکە والی، جگە لە بەنگ کێشان، (مەی)یەکی زۆریش دەخواتەوە، لەبەرئەوە زۆر ئاسانە لەم کاتەدا بیهێنیتە بەرچاوت، کە دەبێتە چ دڕندەیەکی زیانبەخش. ئەم ڕووداوە ناخۆشە، تا دوای نیوەشەو خەوی لێ زڕاندم(٢١٠).

## ٠١ی ئەیلول

لەگەڵ دەرکەوتنی شەفەقدا هەڵساین، بەڵام وڵاخەکانمان نەبینی. عومەرئاغاش لەشار گەڕابووەوە، ئاگاداری کردم کە وڵاخەکان بەڕێوەن، بەڵام نۆیان لەو کاروانە گل دراونەتەوە کە لە بەغداوە هاتووە و لێرەوە بەرەو وڵاتی (کەرەج) تێدەپەڕێ، ئەو کاروانەی کە دوێنێ خۆم لەو باجە زیادەیە رزگارم کرد، کە دەیانویست دووئەوەندەی لێ وەربگرن، لەگەڵ هەندێ داخوازی تری گراندا، کە دەستوپێوەندەکانی (خان) لێیان داوا دەکرد.

نانی بەیانیمان ئاسایی بۆ ئامادە دەکرا، دوای نانخواردن کیسەدار ــ بان نۆکەرەکەی خان و عەبدوڵلا بەگ ئاگاداریان کردم کە (خان) دەیەوێ سەردانم بکات و ماڵاواییم لێ بخوازێ. تووڕەبووم و پێم وتن وڵاخەکانی کاروانەکەم ناوێ (ئەو وڵاخانەی ناردبوومنەوە بۆ خاوەنەکانیان و دواییش دڵنیابووم لە جێبەجێکردنی فەرمانەکە) و بەتەنیا دەڕۆم و کەلوپەلەکانیش لەجێی خۆیان جێدەهێڵم و نامەوێ دیدەنی (خان)یش بکەم. لەسەرئەمە

---

٢١٠- دوێنێ شەو، مەیتەرەکەی لام (حوسێن)ی بەسزمان مرد. لەو کاتەوە کە یەکسەر لە (سنە) دەرچووبووین و نەخۆشیی زۆری بۆ بردبوو، خۆی دابووە دەست نائومێدی. لاوێکی چاك بوو. حەسەنیش کە یەکێك بوو لە چادر هەڵدەرەکان، ئەویش لە گوندێکدا مرد. ناچاریش بووم هەر لەو گوندە بینێژم. مەیتەرێکی تریش لە سلێمانی مرد.

عەبدوڵلا بەگ و هەندێ دەستوپێوەندی (خان) دەستبەجێ سواربوون و بەغار بۆ شار چوونەوە، بەڵام خاوەنی ولآخەکان، لەگەڵ ولآخەکانیدا، کە لەوکاتەدا بۆ هەوارەکەمان هێنابوویانن، لام مایەوە. کیسەدار (بان نۆکەریش) بۆ رازیکردنم بەپەلە نانەکەی داینێ، هەرچەندە لەو تووڕە نەبووم، چونکە ئەو پیاوێکی چاك و خزمەتگوزاربوو. عومەرئاغاش سێ، یان چوار ولآخی ئامادەکرد، کە لەملاولەولا کۆی کردبوونەوە. باری کردن و لەگەڵیان ڕۆیشت، بەڵام پێش هەموو شتێك هەگبەکانی من و قیبلەنماکەی بارکرد. کۆمەڵەکەشمان هەر جرتوفرتیان بوو. پاش ئەوەی کاروانی باروبنە قورسەکە ڕۆیشت، کە توانیمان باریان بکەین.

ریچ خانم و میستەر (بەل)یش سواربوون و یەك دوو نەخۆشیان لە دەستەکەی من لەگەڵدا چوون، لەگەڵ پیاوێکی خێڵەکی لە دەستەکەی عومەرئاغا، کە متمانەی پێدەکرا و ئامۆزاشی بوو، تفەنگەکەی منیشی درایە و شمشێرە پانەکەی منیشی بەشێوەیەکی پێکەنیناوی بەقایش و کێلانە بریقەدارەکەیەوە خستە سەرشان، کە پێی بووە سەرکردەی کاروانەکە و بەم قیافەیەوە بۆ ئەوە دەشیا سەرکردایەتی کۆمەڵێك ڕێگر و چەتە بکات.

نیو سەعات دوای ڕۆیشتنی کاروانەکە، عەبدوڵلا بەگ بەپەلە گەڕایەوە، تا ئاگادارم بکاتەوە، کە ئێستا (والی) لەخەو هەستاوە و هەواڵی ئەوەی بیستووە کە لەبەر دەست نەکەوتنی ولآخ، سەفەرەکەم دواکەوتووە، فەرمانی کردووە ئەسپەکەی خۆیم بۆ بێنن. زۆریش مەبەستێتی کە شتێکی وا ڕووی نەدابێ، نیگەرانی کردبم. تکاشم لێدەکات بەدەم ڕێوە، کە بەشاردا تێپەڕ دەبم، لای لابدەم و قاوەیەکی لەگەڵدا بخۆمەوە و بەلایشیەوە دەبێتە مایەی شەرەف، ئەگەر وەك بەڵگەی لێ ڕازی بوونی، بارگیرێکی یەرغەی لێ قبوول بکەم. لەبەرئەوە پاش ئەوەی هەندێ پارەم بەسەر ئەو چاو برسیانەدا بەشیەوە، کە تەنگیان پێ هەڵچنیبووم و بەوە ڕازی نەدەبوون کە دابوومنێ، سواربووم و بۆ ماڵآوایی لێکردنی (خان) ڕووم لە شار کرد. سەیرم کرد سەرقاڵی ئەوەیە نامەیەك بەمیرزایەکی دەنووسێ، ئەویش لەبەردەم (خان)دا خۆی بەدەمدا دابوو، ئەوەی دەنووسی، کە (خان) چی پێ بڵێ، کوتومت وای بنووسێ.کە من دڵنیابووم ئەگەر بیانهێشتایە میرزا خۆی ئەو شتانەی بنووسیایە، کە خان پێی دەوت، بەشێوەیەکی تر دەینووسی(٢١١).

---

٢١١- لە خۆرهەلآتدا شێوەی نووسین، لەگەڵ شێوەی قسەکردندا زۆر جیاوازە. وا دیـارە مەبەسـتی (ریـچ) لێرەدا ئەوەبێ کە ئەگەر (خان) پوختەی ئەوەی پێویستە بنووسرێت، بۆ میرزای بگێڕێتەوە، میرزا دەیتوانی بەشێوەیەکی جیاواز، لەشێوەکەی (خان) دەری ببڕێ-خاریچ.

خان، زۆر بەجوانی و نەزاکەتەوە، بەپێی شێوە سەیرەکەی خۆی، پێشوازی کردم. دووربینێکی بچکۆلە و کیفەکەی دەرهێنا بوو، لەبەردەمیدا بوو وتی ئەوە دیاری سەرۆك وەزیرانی شایە، بۆی ناردووە و داوای لێکردم سەیری پێبکەم و پرسیاری نرخەکەیشی کرد. سەری لەوە سوڕمابوو، کە بۆچی ئەم دووربینەش وەك دووربینە گەورەکان، تارمایی بەرجەستە ناکات. پاشان وتی مادام ئەو تەقەللایەیان لە دروستکردنیدا داوە، دەبوایە بە ئەندازەی ئەو هێزی نزیك کردنەوەیەی، بەرجەستەیشی بکردایە. سولتانی بانە (نورئەللا) هاتە ژوورەوە و لە دوورەوە دانیشت. خانیش پێمی ناساند و وتی: یاخشی ئۆغلان (واتە کوڕێکی باشە). ئەم کوڕە باشەش ڕیشێکی ڕەش و پڕی پێوەبوو، درێژاییەکەی پێیەك دەبوو، بە ئاشکراش ترس و لەرزی لە ستایش کارەکەی پێوە دیاربوو ــ و گوندێکی پێبەخشیوە. واتە بە (خان)ی بەخشیوە ــ. ئەم گوندەی کە لەم دواییەدا، خان زەوتی کردبوو و دەیەوێ کۆشکێکی تیدا دروست بکات، لەوەی (خوسرەوئاوا) چاکتر بێ و خەڵك لە مووسڵ و حەڵەب و قاهیرەوە بۆ دیتنی بانگ بکات ــ. ئیتر سینییە شیرینیان هێنا و والی پرسیاری ئەوەی لێکردم، حەز لە چ دیارییەك دەکەم، تا بۆمی بنێرێت. وەڵامم دایەوە کە ئەو کتێبەی بەڵێنی دامێ بمداتێ، دەبێتە بەنرخترینی هەموو دیارییەکان. ئەویش دڵنیای کردم کە دەیمە خاوەنی و وتی لەبەرئەوەش کە هەرگیز لە ژیانیدا درۆی نەکردووە، دانی پێدادەنێت کە دوو دانەی هەیە، بەڵام دەیەوێ بەراوردیان بکات و بەهەموو دڵنیاییەوە دانەیەکیانم لەگەڵ تەتەرێکدا لە (سنە)وە بۆ دەنێرێ، بەمەرجێ لە بریتی ئەوە، چەند پاکەتێکی بارووتی بدەمێ. پرسیارەکەی دووبارە کردەوە، کە حەز لە چ جۆرە دیارییەك دەکەم و هەر دووپاتی دەکردەوە. کە ڕوانیم هەر پێ دادەگرێ، پێم وت زۆر زۆر سوپاسگۆ دەبم، ئەگەر هەر کتێبێ، پێی وابێ بەلامەوە چاك دەبێ، ئەوا بۆمی بنێرێت. وەڵامەکەم ڕازی نەکرد و پێی داگرت، کە دەبێ هەر کتێبێك دەستنیشان بکەم، منیش پێم وت کە گەڕامەوە بۆ وڵاتی خۆم لەوێ چاو دەگێڕم، بزانم چیم پێویستە، ئەوسا ئاگاداری دەکەمەوە. وەڵامی دامەوە کە ئەوکاتە ئەویش ئاڵوگۆڕێکم لەگەڵدا دروست دەکات. واتە: ئەو هەرچی بوێت، بۆمی بنووسێت و بۆی بنێرم و منیش هەروا بکەم.

دوای ئەوەی سەعاتێك لای مامەوە، ماڵاواییم لێکرد. ئیتر هەستا و دەستمی گوشی، گەلێ وشەی خۆشهاتن و میواننەوازیی دەربڕی و بەتکاوە داوای لێکردم پێی بڵێم کە ئاخۆ لێی ڕازیم. هەر ئەمڕۆ (خان) بەڕێی گەڕانەوەی خۆیدا بۆ (سنە) گەڕایەوە. ئەمەش دەبێتە مایەی خۆشیی دانیشتوانی ئەم ناوچانە.

سەعات دوازدە و نیو لە (بانە) دەرچووین. پاش ئەوەی ڕووەو باکووری خۆرئاوا دەشتەکەمان بڕی، چووینە ناو دۆڵێکی تەنگەبەرەوە، کە شاخی بە بەڕوو داپۆشراو دەوریان دابوو. بەمجۆرە تا یەك و چل و پێنج دەقیقە ڕێمان کرد. پاشان سەرکەوتینە سەر زنجیرە زوورگێك، کە دەبوونە سنوور بۆ ڕێگاکە. لە دوودا گەیشتینە گوندی (سووێرەوە ـــ Swearwea)ی(٢١٢) بچووك و پیس، کە بەسەر دۆڵەکەمانەوە بوو. ئیتر لێرە هەستمان کرد بەشێکی تەواومان لە قۆناغی ئەمڕۆمان بڕیوە، چونکە درەنگ بەڕێکەوتبووین.

ئەمڕۆ (نۆبەتیێ)یەکە سەردانی زۆربەی کۆمەڵەکەمانی کردەوە. عەبدوڵڵا بەگ دەبوایە تا ئێرە یاوەریم بکات، بەڵام بۆئەوەی پاشماوەی شتەکانی ترمان بۆ بنێرێ و ئەو وڵاخدارە بەسزمانەش بە سەلامەتی ئازاد بکات، کە من پاراستم، بەچاکمان زانی هەر لە (بانە) ماڵاوایی لێ بکەم، کە بەڕاستی تاقە پیاوێك بوو نیگەران بم بۆ جێهێشتنی، کوڕێکی چاك و خزمەتگوزار و ڕۆح سووك بوو.

کوڕێکی لاو، لە (بانە)وە تا ئەم گوندە، بە تەنیشت ئەسپەکەمەوە ڕێی دەکرد، هەواڵی ئیشەکەیم لێ پرسی، وتی پێڵاودرووە. حەزم کرد بزانم ساڵانە چەند بەدەوڵەت دەدات، وەڵامی دامەوە کە هەر پازدە ڕۆژ جارێك (تمەنێك) دەدات، بەڵام ئەوەتەی (خان) هاتۆتە (بانە)وە، بنەماڵەکەیان (پێنج) تمەنی داوە. لەبەرئەوە خەریکن لە برسا بمرن، چونکە ئیشەکەی داهاتێکی ئەوتۆی نییە، تا باجێکی ئەوەندە بدات.

## ١١ی ئەیلول

دوێنێ شەو، هەندێ دز هاتنە سەرمان و لە شتەکانی من: دوو زینی زیوچن و هەندێ چەکی زیوکاریان دزیبوو. هەرکە ئاگاداریان کردم، عەلی ئاغا (کە لە دەستەکەی خۆم بوو ـــ لەگەڵ فەقێ قادر، کە لە دەستەکەی عومەرئاغا بوو) ناردمن بۆلای (ئەمانوڵڵاخان)، تا ئاگاداری بکەنەوە و دزەکان بدۆزنەوە و شتە دزراوەکانیشمان بۆ بنێرنەوە٢١٣.

---

٢١٢- ڕاستییەکەی (سوێرئاوە ـــ یان ـــ ئاوا SOR AWA)یە. واتە ئەو گوندەی ئاوەکەی سوێرە ـــ ع.

٢١٣- وادیارە ئەم دزیکردنە لە (ریچ) زۆر ئازاری دابێت. چونکە بەدەم ئەو پشکنینە وردەوە کە لەم چەند ساڵەی دواییدا، لەناو ئەرشیفی بەڵگەنامەی قاجاریدا لەگەڕاندام، چەند بەڵگەنامەیەکی دەوڵەتی بەریتانیام دیینەوە، تایبەتن بە گازندەی ئینگلستان، لە دەوڵەتی ئێران کە وەك دەردەکەوێت (ریچ) لەبارەی ئەم دزی لێکردنەیەوە ، گازندەی لای کاربەدەستانی باڵای ئینگلستان لە (ئەمانوڵڵاخانی والی سنە)، کردبێ تا لە

لە حەوت و نیودا لە (سوێرئاوا) دەرچووین و پاش ئەوەی چووینە سەر ڕێگاکەی دوێنێمان، تا نۆ، لە دۆڵەکەوە ڕووەو باکووری خۆرهەڵات ڕێمان کرد. ئیتر لە دۆڵەکەدا گەیشتینە کوێرە شیوێك، پاشان لە ڕێگاکە لاماندا و لە نۆ و نیودا گەیشتینە گوندی (نوێژگە)، کە بە لاپاڵی شاخێکەوە بوو، لە باکوورەوە دەبووەوە سنوور بۆ شیوەکە. ڕێگاکەی ئەمڕۆمان بەلای زۆرەوە تەختەڵانی و پڕ لە دارودرەخت بوو،کە زۆربەیان داری بەڕوو و هەرمێ کێویلە (کرۆسك) بوون. زەویش کەوەلە و گەچۆڕاوی بوو. هێشتاش هەر لە ناوچەی (بانە)دا بووین، بۆیە ئەگەر شتێك بە شتێکی ترەوە بەیاد بێتەوە، ئەوا ئەم ناوچەیە بە (دز) بەناوبانگە. هەرچەندە ئەو ولاخانەی لە (بانە) پەیدامان کردبوون، ماندووش نەبوون (کە زۆربەیان بارگیربوون)، بەڵام چونکە لەنێوان (نوێژگە) و (مەروێ)دا گوندێکی تر نەبوو، کە نێوانیان چوار سەعاتە، بۆیە نەمانتوانی لە (نوێژگە)٢١٤ زیاتر بڕۆین.

## ١٢ی ئەیلول

سەروسیمای ئەحمەد بەگی کوێخای گوندەکە، هیچ سەرنجی ڕانەدەکێشا و شەڕانیش دیاربوو. ئەم بەیانییەش پێیان وتین کە نایەوێ ولاخمان بۆ پەیدا بکات و ڕێگاشمان نادات ئەوانەش کە پێمانە، بەکاریان بهێنین، وتبووشی ئەم فەرمانەی لە سوڵتانی (بانە)وە وەرگرتووە.

ئەمەش وا پێدەچوو زۆر دوور نەبێ، چونکە لەو نامەیەدا کە لای سوڵتانەوە بۆم هاتبوو (ئەو سوڵتانەی هەقم بوو لە ڕووداوی تریشدا لە هەڵسوکەوتی ڕازی نەبم) وادیار بوو بەلای ئەو پیاوەدا دایشکێنێ، کە گومانی زۆرمان هەبوو لەسەرئەوەی پێوەندی بە دزەکانەوە هەبێ.

تێدا مابووین و نەماندەزانی چی بکەین، چونکە (ئەمانوڵلاخان) سەفەری کردووە و واش پێدەچوو تاقە دەسەڵاتێك کە دەتوانین پشتی پێ ببەستین بۆ هاوکاری کردنمان دژی خراپەی ئەم کوێخایە، پشتی ئەوی زیاتر دەگرت وەك هی ئێمە. گوندەکەش لە جێگەیەکی قایمدا بوو، سی چل

---

ڕێگەی ئەوانەوە تەقەللا بدەن بۆ دۆزینەوە و گێڕانەوەی کەرەسە دزراوەکانی (ریچ)... لەم بارەیەوە بۆ زیاتر زانیاریی بنواڕە: (میرزا صالح، غلامحسین ــ أسناد رسمی در روابگ سیاسی أیران با انگلیس و روس و عپمانی ــ جلد یکم ــ ص ١١٤ ــ نشر تاریخ أیران، مرکز پخش: إنتشارات خوارزمی ــ چاپ اول ١٣٦٥ ش)ــ م.

٢١٤- نوێژگە: بە مانای ئەو جێگەیەی نوێژی لێدەکرێ و بە فارسیش (نمازگاه)ە. لە کوردیدا نوێژیش هەر بەمانای (نوێژ)ە و وا دیارە لە وشەی (نماز)ی فارسییەوە وەرگیرا بێ.

تێبینی: بۆچی دەبێ ناوی (نوێژگە) لە (نماز)ی فارسی وەرگیرابێ! وەك دیارە ئەمجۆرە زانیارییانە (وەك پێشتریش وتمان) هەر چاوساغ و وەرگێڕە تورك و فارسەکانی لای (ریچ) ئەمانەیان لە (ریچ) گەیاندبێ(م).

تفەنگ بەدەستیش خڕببوونەوە، کۆمەڵەکەی ئێمەش خۆیان لەخۆیاندا کەم بوون و هەمووشیان سوارەبوون و نەخۆشیی پەکی خستبوون. لەبەرئەوە نەماندەتوانی بەرەنگاری تەنگانە ببینەوە... لێرەدا لەوە پەشیمان بوومەوە کە نەدەبوو سەربازەکان (سوپاییەکان) بۆ سلێمانی بنێرمەوە، چونکە هەربوونیان لەگەڵماندا مایەی ئەوەبوو هەموو شتێك بێتەوە دۆخی جارانی خۆی...

دوای ڕاوێژکردن لەگەڵ عومەرئاغادا، کە بۆ ئەم داروبارە کتوپڕە چی بکەین، بڕیارماندا هەرچۆنێ بێت ڕێ بکەین و خۆمان بگەیەنینە بابانەکان و کەلوپەل و چادرەکان لە دوای خۆمانەوە بەجێ بهێڵین و کۆمەڵێك چەکداری (شینکی ــ خێڵێکی ئازای شاخاوی بوو، لە نزیکمانەوە بوون لە سنووری ناوچەی بابان)دا بۆ ڕزگارکردنی کەلوپەلەکان بنێرین. ئیتر هاوسەرەکەم بە پارێزگاری میستەر (بەل) و محەمەد ڕەزا چاوەش و هەندێ نۆکەر، کە هەموویان سوارەی چەکداربوون، ناوچەکەی بەجێهێشت. من و عومەرئاغاش خۆمان دواخست، بۆئەوەی ئاگادارییی نەخۆشەکان بکەین و بەرهەڵستی هەر هێرشێك بکەین کە بکرێتە سەرمان.

وا دیاربوو ئەو هەڵوێستەی ئێمە و ڕاوێژەکەمان، بەدڵی ئەحمەد بەگ نەبوو، بۆیە بەپەلە هات و وتی ئامادەیە چەند گوێدرێژمان بوێت، بماندات و ڕێککەوتین و دوای دەردەسەرییەکی زۆر و دواکەوتنێکی درێژ و سوێندخواردنی ئەوان و هەڕەشەی ئێمە لێیان، وڵاخەکان ئامادەکران. ئێمەش باروبنەمان بارکرد و نەخۆشەکانمان سوارکرد و پێش ئەوەی خۆمان ببزوین. دەستمان بەهەموویانەوە نا و تا ماوەیەکی ڕێگاش بەڕێمان کردن، بەڵام بە لەبەرچاو گرتنی هەڵسوکەوتی ئەمان و بەو شتانەشدا کە لەکاتی ڕۆیشتنماندا، لێیان ڕوویدا، عومەرئاغا سڵی ئەوەی هەبوو لە ڕێگادا هەڵکوتنە سەرمان. بێگومان ئێمەش ئامادەی بەرهەڵستیی بووین و منیش هەستم دەکرد متمانەی تەواو بەتوانای خۆمان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەیان هەیە، چونکە سوارەی چاك و چەکداربوون و خۆشمان بە چاکترین شێوە ڕێکخستبوو، بۆئەوەی بەوپەڕی تواناوە پارێزگاری باروبنە و نەخۆش و پەککەوتەکانمان بکەین. ئەو خۆ ڕێکخستنەی خۆشمان هەر پاراست، تا بە سەلامەتی سنوورمان بڕی.

وا دیاربوو کوێخاکەی (نوێژگە) وای بەچاك زانیبوو دەست نەهێنێتە ڕێمان و لە ناوچەکەی دەرچین و زیانمان پێنەگەیەنێ، چونکە ئیتر دوای ئەوە هیچ شوێنەوارێکی خۆی و دەستە و کۆمەڵەکەیمان نەدی(٢١٥).

---

٢١٥- سوڵتانی (بانە)، ئەحمەد بەگی سەرۆکی گوندی (نوێژگە)ی بە گیراویی بۆ سلێمانی بۆ ناردم، تا چ سزایەکم بەلاوە چاك بێت، بەرامبەری بیکەم، کە بێگومان لێی خۆش بووم و ناردمەوە.

لە حەوت و نیودا ڕۆیشتین و لەسەرخۆ ڕوومانکردەوە ئەو ڕێگایەی دوێنێ دەستبەرداری بووین و لە هەشتدا گەیشتینەوە سەری. دوای تاوێ سەیرمان کرد بە زەوییەکی چاکتردا هەڵدەگەڕێین. نزارە داربەڕوویەکی گەورە و دارهەرمێ کێویلە و داری تری تێدابوو، لە شێوەی گۆیژدا بوو. بەدەم ڕێوە دووجار لەسەر ئەو شاخە هەڵوێستەمان کرد، کە پیایدا سەردەکەوتین و ناوی (بێ لوو) بوو، کەمێکیش ڕووی دەکردە باکووری باشوور، بەڵام بەرزبوونەوەی شاخەکە، لە دەشتی (بانە)وە لەسەرخۆ بوو، بەڕادەیەك کە لەملایەوە هیچ نیشانەیەکی ئەوەی پێوە نەبوو شاخ بێت. کەمێکیش لای چەپمانەوە کێوی (سوورکە ئوو ــ Soorkeoo)(٢١٦) بەخۆی و لاپاڵە لێژەکانییەوە بەرزببووەوە و ڕووی دەکردە باشووری خۆرهەڵات و ئەمسەری نزیکیشی لێمانەوە ئاوی (بانە) و چەمی تر، دابڕدابڕی کردبوو، ئاشکراشە کە بەشێکە لەو زنجیرەیەی پێشتر بەسەریدا تێپەڕین و وەك پێشم وابێ هەر ئەو کێوەیە کە بۆ (ئەحمەد کولوان) دەبووە سنوور و لە کاتی تێپەڕینماندا لە سلێمانی یەوە بۆ ئەحمەد کولوان، بەو ڕێیەدا کە ناوی (تاریلەر)(٢١٧) بوو، بڕیمان.

دوای ئەوەی لەسەر کێوی (بێ لوو) حەساینەوە و وڵاخەکانیشمان تاقەت کردن، لە دە و نیودا دەستمان بەڕۆیشتن کردەوە. کە دەڕۆیشتین وەك ئەوە وابوو لەناو یەك زەریای شاخدابین، کە لە ڕاست و چەپمانەوە دەوریان دابووین، هەندێکیان بەهێڵێکی ڕاست کشابوون و هەندێکی تریان دابڕدابڕ و تێکچڕژاو بوون و پیاو سەری لە دروستکردنی هێڵکارییاندا دەرنەدەکرد. لەوەش دەچوو زەوی بە تەلەبەرد و گەچۆڕ و بەردەئەستێ داپۆشرابێ.

دوای تاوێ گەیشتینە سەر ترۆپکەکەی، بەشۆڕبوونەوەشمان پیایدا، چووینە سنووری ناوچەی بابانەوە. دیمەنەکەی تا بڵێی دڵگیربوو. شۆڕبوونەوەی ڕێگاکە یەکسەر دەچووە سەر دۆڵێکی تەنگەبەر، کە بنی دیار نەبوو. پاشان زەوییەکە لەوبەرەوە دووبارە بۆ ئاستێك بەرزدەبووەوە، لەوەی لای ئێمە بەرزتربوو، دوو ترۆپکی لەو بڵندتریش بەسەرییەوە بوون(٢١٨) زینۆیەکیان لەنێواندا بوو، ئەوەی لای باکووریان، کە لە (سوێر ئاوا)وە دیبوومان شێوەی زۆر سەیر دروست ببوو، دیمەنی وڵاتەکەش ڕەنگین بوو. زنجیرە چیاکان و هەڵکەوتیشیان زۆر جوان دابڕدابڕ ببوون، ڕەنگی زاڵی خاکیش، سوورێکی

---

٢١٦- ڕاستییەکەی (سوورکێو SOR - KEW)ە، واتە کێوەسوور ــ ع.

٢١٧- ڕاستییەکەی (تاریەر)ە، کە ئێستا وای پێدەڵێن ــ ع.

٢١٨- ئەم دوو لووتکەیە دەکەونە ناوچەی (سیوەیل)ەوە.

تێربوو، کە ڕەنگی مسین و سەوزی تێری تێکەڵ ببوون. هاتنەخوارەوەمان بەلاپاڵی ئەو کێوانەی چەم و شیو دایدڕیبوون و خەرەندەی تێدا دروستکردبوون، دوو سەعاتی خایاند، کە هەر بەناو دارستانی جواندابوو، مەگەر لە هەندێ ماوەی زۆر کورتدا نەبێ، شۆڕبوونەوەشمان زۆر لێژبوو، ڕێگاکەش وەك پیاو چاوەڕوانی دەکرد، کە بەناو زەوییەکی شاخاوی ئاوەها دابێ، یەکجار وا خۆش نەبوو.

بێگومان ئەو جیاوازییەش کە لە نێوان ئێران و (کوردستانماندا) لێرە بەدی دەکرێ، ئەگەر پیاو بەوردی سەرنج بدات لە هیچ شوێنێکی تر ئاوا بەئاشکرا نابینرێن. ئەوەی لێرە دەیبینین تەنانەت خاکەکەش لە سرووشت و لە ڕەنگیشدا گۆڕاوە. ڕواڵەتی هەموو شتێك بریتی بوو لە ڕواڵەتی مەزنیی و جوانیی.

دوای نیو سەعاتی تر گەیشتینە پێدەشتەکە و لە چەمی (بەڕۆژە ، یان: بانە)مان دا، کە چەند چەمێکی تر لەو کێوانەوە دەهاتنەخوارێ و تێکەڵی دەبوون. ئەم چەمە کە لە باکوورەوە کەمێك ڕووەو خۆرئاوا دەهات و لە ژوور ئاوی (قەڵاچوالان)(٢١٩)ەوە دەڕژایە (ئاڵتوون سو)وە، دەبووە سنوور بۆ ئێران و تورکیا.

کە هەستم کرد لە خاکی دەردەسەریی و دەرۆزەکاران ڕزگارم بووە و گەیشتوومەتەوە وڵاتی میواندرێتیی راستەقینە، دڵخۆشییەکی مەزن دایگرتم. هەروەها هەستم کرد گەڕابێتمەوە ماڵی خۆم... ٢٢٠

سەرکەوتینە سەر بەرزاییەکەی بەرامبەرمان و بەلاپاڵەکانیدا هەڵگەڕاین. چەند چینە بەردێکمان بینین، ئەستوورایییان دوو گرێ، یان سێ گرێ دەبوون و لەو گوێ خەرەندانە بوون، کە ئاوەڕۆ دروستی کردبوون، بەڵام ئەوەندە سەیر لوول و بەیەکدا ئاڵابوون، دەتوت پارچە خشڵی زاخاودراوی دابڕدابڕە و لەسەر شێوەی کۆن دروستکراوە.

لەیەك و چل و پێنج دەقیقەدا گەیشتینە گوندی (مەروێ) لە ناوچەی (ئالان). ئیتر لێرە کوردی ڕاستەقینە پێشوازییان لێکردین. بۆم هەیە لێرە بڵێم ئێستا چاوەڕێ دەکەم بحەسێمەوە...

گوندەکە لە جێگەیەکی جواندا بەلاپاڵی شاخێکەوەیە و بە جێگایەکەوەیە، زۆر لە چەمەکەوە بەرز نییە، لەوبەریشییەوە کێوی (بێ لوو)مان دەدی، کە ڕووەو باکوور و کەمێکیش بەلای

---

٢١٩- ئاوی (قەڵاچوالان) لە نزیك (شینك) دەڕژێتە (ئاڵتون سو)وە.

٢٢٠- ئێمە پێشتر ئاماژەمان بەم هەست و هەڵوێستە جیاوازەی (ریچ) کرد، کە لە نێوان کوردانی قەڵەمڕەوی هەردوو میرنشینی بابان و ئەردەڵان دا دەبینێ (م).

خۆرئاوادا کشابوو. لەوێوە چاڵێك (خەرەندێکی لێژ)ی بەردەڵانی ڕووتەن هەبوو، پێی دەوترا (بری) و پیاو لەو دەلاقە و کەلێنی ئەو خەرەندەوە سەرووی گوندەکەی دەبینی، کە دیمەنێکی بەردەڵانی زۆر جوانتر بوو، کێوەکە لەپشت کەلێنەکەوە بەرزتریش دەبووەوە. شاری (بێ تووش)یش لەژێر کێوەکەدا دەبینرا ٢٢١، کە دەکەوتە باکووری خۆرهەڵات و سێ سەعاتە ڕێیەك دەبوو، نەك لەبەر دووریی ماوەکە، بەڵکو لەبەر ناخۆشیی ڕێگەکە. ڕووبەڕووی شاخەکە و بەرامبەر (بێ تووش)یش ناوچەی (پشدەر) هەبوو. لای خۆرئاوای ئێمەشەوە زنجیرە چیایەك هەیە، پێی دەوترێ (کوڕکوڕ)، کە لەوە دەچێ بلکێتەوە بەو شاخەی ئێستا باسم کرد. لەو تەنیشتەیشییەوە کە لە ئێمەوە نزیکە، گوندی (شینك) هەیە، کە پێنج سەعاتە ڕێیەك دەبێ. (گەڵاڵە)ش لە نزیك (شینك)ە، کە لای ڕاست، واتە لای باکوورەوەیە. هەروەها (مەرگە)ش دەکەوێتە شانی ئەودیوی زنجیرەکەوە، کە ڕووبارێك لە (بیتوێن) جیای دەکاتەوە و دە سەعاتە ڕێیەك دوور دەبێ.

لە ئاقاری (مەروێ)وە تووتنێکی زۆر دەکرێ، کە ئێستا گوندنشینەکان بە بەنییەوە دەکەن بۆ وشککردن. هەر بۆ تاقیکردنەوە تووتنەکەم کێشا، هەستم کرد مام ناوەندییە. لەم ناوچانە ماشێکی زۆر دەکرێ و مەزرا سەوزەکانیشی دیمەنێکی جوانیان هەیە. لە نێوان ئەم کێوانەدا گژوگیای کێوییش، بەتایبەتی لەم ناوچانەدا زۆرن، کە وەك نەخش بەسەر ڕووی زەوییەوەن.

## ١٣ ی ئەیلول

لە حەوتدا دەستمان بەڕۆیشتن کردەوە و یەکسەر بە کێوەکەدا هەڵگەڕاین، ڕووەو ترۆپکە شێوە سەیرەکە، کە باسمان کرد و ناوی (گمۆ Gmo)یە. لەم کێوانەدا کانیاوێکی زۆر هەیە، جوتیاران زۆربەیان بۆ جۆگە لێهەڵگرتن بەکاری دێنن، کە گەوەو پێچاوپێچ بە دەوری کێوەکەدا دەیان هێنن، بۆئەوەی لەهەر شوێنێ پێویستیان پێی هەبێ، ئاوێژەی پێبکەن.

لە هەشت و چارەکدا گەیشتینە گوندی (دێرێ)ی جوان، کە دارستانێك لە جوانترین سپیدار، کە تا ئێستا دیبیم، داپۆشیبوو، لقوپۆپی درێژ و سێبەری زۆریان هەبوو، باخ و ڕەز لە هەموولایەکی کێوەکەوە دەوری گوندەکەیان دابوو. ڕەزیش بەسەر زۆر جێگە و درەختدا هەڵزنابوو، کە پیایدا شۆڕببوونەوە، یان لە درەختێکەوە بۆ درەختێکی تر پەلی هاویشتبوو، وەك پرچی گوڵ و ئەگریجەی لق و پۆپ. لە لاپاڵەکانی کێوەکەشەوە کانیاوێکی زۆر هەڵدەقوڵێن و بەسەر ڕەگی درەختدا تێپەڕ دەبوون و دەبوونە تاڤگەی بچووك بچووك، ئیتر جیا لە خوڕەی ئاو، گوێمان لە هیچی تر نەبوو.

---

٢٢١- وەك دیارە لەو سەردەمەدا (بێ تووش) گەورەو ئاوەدان بووبێ، بۆیە (ریچ) بە (شار) ناوی دەبات. (م)

هەر وا ئاسان نییە، مرۆ بە ناوچەیەکی ئاوەها دڵگیردا تێپەڕبێ و نەوەستێ و تێر لە دیتنی نەخوات. بۆیە من و عومەر ئاغا دابەزین و لە نزیك جۆگەیەکی بچووك چووینە ژێر سێبەری دارگوێزەکەوە. ئیتر گوندنشینەکانیش دەستبەجێ خۆراکێکیان لە هەنگوینی شانە و کەرەی تازە و دۆ و هەڵووژە و ترێ هێنایە بەردەممان. تا نۆ و دە دەقیقە لێرە ماینەوە، پاشان بە نابەدڵی جێگا جوانەکەمان جێهێشت و لە نزیکەی نیو سەعاتێکدا، کە هێشتا هەر سەردەکەوتین، گەیشتینە بڵندترین بەرزایی، کە دیمەنێکی بەشان و شکۆی هەبوو، چونکە کانیاوێکی زۆر، لە زەوییەوە هەڵدەقوڵی و بەشێکی ئاوەکەی بەلای باکووردا، ڕووەو ئاوی (بروز) دەچوو. ئاوی بەشەکەی تریش دەڕۆیشت و کەمێك لەولاترەوە دەڕژایە ئاوی (شینك)ەوە، هەرچەندە درەختمان نەدی، بەڵام لەبەرئەوەی ئاوی زۆر بوو، زەوی سەوزی دەکردەوە. ئەم شوێنەش بە (هەزار کانیان) دەناسرا.
لێرەدا گەیشتینە بەرزترین شوێنی ڕێگاکەمان، بەڵام (گمۆ - Gmo) و هەردوو لووتکەکەی، کە ڕووتەن و بەردەڵانی بوون، ئاستیان لەوەی ئێمە بەرزتربوو. ماوەیەك ڕۆیشتین و هێشتا دوو لووتکەکە هەر بەسەرماندا دەیانڕوانی.

نەدەکرا ڕێگایەکی لەمە چاکتر بگرینەبەر، کە بەهۆیەوە بتوانم بیرێکی ڕاستەقینە لەبارەی زنجیرە چیاکان و لەیەکتردانەوەیان گەڵاڵە بکەم.

(سوورکێو) کەوتبووە هاوتەریبی ڕێگاکەمان و وەك پێشتریش بڕوام وابوو، کێوی (قزڵجە)، یان (تاریەر)ی پێکدەهێنا، کە ئێمەی پێدا تێپەڕ دەبین و لەگەڵێدا لێك دەداتەوە و کێوی (کوڕە کاژاو)یش دەکەوێتە پشتەوە، یان باشووری ئەم کێوەوە، کە کەمێك ڕووەو باشووری خۆرهەڵات بەرەو تاریەر دەکشێ. لەو زەوییەشدا کە ناوبەناو شاخی شەقار شەقاری تێدایە، هەردوو زنجیرەکە، بەبەرزیی لێمەوە دیارن. ئیتر گوند و شوێنە سەوزەکان، یان بە تەختایی لاپاڵی کێوەکانەوەن، یان هەندێ جاری تر لە لێژاییەکانیدان، کە بەهەموویان جیاوازییەکی دیمەن جوان پێك دێنن. هەر سەد یاردەیەك دەڕۆیشتین و تووشی کانییەکی سارد دەبووین، ئەگەر لێت بخواردایەتەوە، ددانەکانتی دەتەزاند. زەویش ڕەنگێکی مسینی ڕەنگ گۆگردی هەبوو. ڕێگاکەش وەك ئاسایی، درەخت داپۆشیبوو، هەرچەندە فشەڵ و بەردەڵانیش بوو، بەڵام وەك تووڵەڕێی ناو شاخ، خراپ نەبوو.

دوای تاوێ ناڵی ئەسپەکەم کەوت و ئیتر تا ئەسپەکەم ناڵ نەکەمەوە. نەدەکرا بەو ڕێگا بەردەڵانییەدا، بەو سەر وڵاخە قورسەوەی وەك ئەسپەکەمەوە ڕێ بکەم. ئەوەندەش نەدەبوو کە مۆڵەتی ناڵبەندەکەمان دابوو، سەردانی دەسگیرانەکەی بکات، کە لە گوندێکی نزیکی ئەم ناوە بوو، سوارمان کرد و کۆمەڵێك دیاریمان بۆ ئەم دیدەنییە خۆشە نارد. ئیتر عومەرئاغا

کەرەسەی پێویستی ناڵکردنەوەی پەیداکرد و خۆی بەدەستی خۆی ئەسپەکەی ناڵکردەوە و وتی ئەو سەربازەم بەپوولێك ناوێت، ئەگەر نەتوانێ ئەسپەکەی خۆی ناڵ بکاتەوە. ئەم ناڵکردنەوەیە ماوەیەك دوای خستین و تا نەبووە سەعات دوو، نەمانتوانی بگەینە گوندی (کەناروێ)، لە ناوچەی (سیوەیل)(٢٢٢).

## ١٤ی ئەیلول

دوێنێ شەو، لە سلێمانی یەوە ژمارەیەکی زۆر لە گزیر و پیاوەکانی عومەرئاغا، گەیشتنە لای. ئاگاداری کردم کە نزیکەی تا چل نۆکەری دەبێت و سێ و چوارێکیان نەبێت، ئیتر هەموویان خزمی خۆین. وتیشی پێی باش نییە نۆکەرێکی شاریی و لادێیی بیانە، بگرێتە خۆی. هەروەها وتی: (ئەوانە زۆر پێتەوە نانووسێن، لە تەنگانەشدا لەگەڵتدا نامێننەوە. بەڵام خێڵەکی بەپێچەوانەی ئەمانەوەن و ئەگەر خێڵ و هۆزەکەی خۆیشی نەبن، زۆر پابەندت دەبن و برسێتی و تێنوێتی و هەژاریی و ماندووبوون و مەترسیی، لێیانت جیا ناکاتەوە. زۆریشم پێ خۆشبوو، کە لە پیاوەکانی عومەرئاغام بیست، نەخۆشەکانی کۆمەڵەکەمان، لە سلێمانی چاك بوونەتەوە.

لە شەش و نیودا سواری ئەسپەکانمان بووینەوە و ڕۆیشتین. سەمتی ڕێکردنەکەشمان ڕووەو باشوور بوو. بە شیوێکدا شۆڕبووینەوە، تا بن دامێنی (سەرسیر). پاشان لە شیوەکە لاماندا و پاشماوەی ئەو زنجیرەیەمان بڕی، کە دەلکایەوە بە شاخی (سەرسیر) و دوێنێ لێماندابوو. دوایی بۆ سەر چەمی (سیوەیل)(٢٢٣)دا گەڕاین، کە لە لاپاڵەکانی (سەرسیر)ەوە دەهاتە خوارەوە و پاشان کەمێك بەلای باکووردا بۆ خۆرئاوا لای دەکردەوە و لای (ماوەت)دا دەیدایەوە لە چەمی (قەڵاچوالان) و ئەوسا هەردوو چەمەکە ڕوویان دەکردە (ئاڵتوون ــ کۆپری). ئاوەکەی لەو شوێنەی ئێمەی لێ پەڕینەوە، تا چەند هەنگاوێ دەگەیشتە ئەژنۆی وڵاخ و دواتر تەنك دەبووەوە. پانتاییەکەی نزیکەی دوازدە، یان پازدە یاردە دەبوو، بەڵام شوێن دەراوەکەی زۆر لەوە پانتربوو. زۆرجاریش لە زستاندا بوار نادات، مەگەر بە کەڵەك.

لێرە زەوی هەمووی گڵەسپی بوو. بەرەو دەشتی (شارباژێڕ) شۆڕبووینەوە و دوای تاوێ توانیمان کێوی (گودرون)ی دۆستی دێرینەمان، لە شاخی (گۆیژە)، جیابکەینەوە، کە ڕووتەن و بەپاڵ یەکەوە، تا چاوبڕی دەکرد، وەك شورە و وارشێکی قولیپدار، هەڵدەکشا.

---

٢٢٢- شاخی (سەرسیر) بەتەواوی کەوتبووە لای خوارووی ئێمەوە، کە نزیك میلێك لێمان دووردەبوو. ڕێگای ئەمرۆشمان بەلاپاڵەکانی زنجیرەی کێوی (سیوەیل) دابوو.

٢٢٣- رووباری (سیوەیل) لە چەمی (قزلجە و بییستان) پێکدێ و بەدامێنی لاپاڵەکانی (سەرسیر)ی سەروودا دێت.

ئێستا لە خاکێکدا بووین، تەمۆخ و گاشەبەردی زۆر تێدابوو، درەختیش کەم ببووەوە، یان هەر نەمابوو، لە هەندێ جێگادا نەبێ. لە نۆ چارەکێك کەمدا شۆڕبووینەوە ناو دۆڵێکی تەنگەبەر، کە چەمی (قەڵاچوالان)(٢٢٤) دروستی کردبوو، ئیتر تا (قەڵاچوالان) ڕێمان کرد، کە پایتەختی کۆنی ئەم بەشەی کوردستان بوو. شارەکە لەم تەنگەبەرییەدا دروستکرابوو. وا دیارە کورد حەز لەم جێگە چاڵ و نەدیوانە دەکات، تا شار و گوندی تێدا دروست بکەن ــ شارەکە هیچ شوێنەوارێکی نەمابوو، لە هەندێ کۆڵێتی پیسی ئەو گوندنشیانە زیاتر، کە لەم جێگایە نیشتەجێن.

(لە سلێمان ئاوا، یان سلێمان ئاباد) دابەزین کە شوێنەواری باخچەیەکی دەستنیێژی (سلێمان بەبە)ی باپیری بەناوبانگی بابانەکان بوو. ئەم دۆڵە بەمیوەی چاك و بەتایبەتیش بەترێ و شووتی بەناوبانگە، کە هەمووی بۆ سلێمانی دەچێ.

لەشەش و دە دەقیقەدا دەستمان بەڕۆیشتن کردەوە. پیاوەکانیشمان گەشکە و شادی دایگرتبوون، کە دەیانزانی دوای سەعاتێکی تر، دەگەینە سلێمانی. منیش خۆم هەستم بە گەشکەیەك دەکرد، وەك چۆن مرۆ هەست دەکات دەچێتەوە ماڵی خۆی. هەر بەڕاستیش ئەو نەزاکەت و میواننەوازییە جوانەی کە لە سلێمانی لەگەڵماندا کرابوو، لەو هۆ گەورانە بوون، کە وا هەست دەکەم نیشتمانی دووەمینمە.

ڕێگاکەشمان دوای دۆڵەکە، یان دوای چاڵاییی دەراوی ڕووباری (قەڵاچوالان)، وردە وردە هەر سەردەکەوت و تەنگەبەرێکی دەهاتەبەر. کە سێڵاو دڕیبووی و ئێستا وشك ببووەوە. خاکەکەی هەڵوەریو و تەمۆخەکەیشی بەجۆرێ بەسەریەکدا لوول دابوو، وەك ئاسەوارێکی کۆنینە، بەملاولادا بڵاوی کردبوونەوە(٢٢٥).

---

٢٢٤- ڕووباری (قاڵاچوالان)، هەر ڕووباری (تان کوزی)یە. بڕوانە پەراوێزەکانی ژمارە ٤ و ٥ و ٦ ـــ ی بەشی شەشەم ــ کە بە سەمتی (دۆڵەدرێژ) کۆدەبێتەوە و بەنێوان کێوەکانی (کوڕە کاژاو)دا تێپەڕ دەبێ و پانایی دەراوی (قاڵاچوالان) نزیکەی نیو میل دەبێ. ئاوەکەیشی لەم بەشەدا نزمە، چونکە بۆ مەزرای شووتی و کێڵگەی تر بەکاردەهێنرێ. لە بەرامبەر شاری (قاڵاچوالان)یشدا ئاوی (جون کورە)ی تێدەڕژێ، کە لە (سروچك)ەوە شۆڕدەبێتەوە. ڕووباری (قاڵاچوالان) لە زستان و بەهاردا زۆر دەبێ و زۆرجاریش هەموو ڕێڕەوەکەی پڕ دەبێ. کەمێکیش لەولاترەوە، بەلای ڕێڕەوەکەیەوە، پردێکی لە لقوپۆپی بیی، لەسەر دروستکراوە، کە لەسەر ستوونی بەردین دانراوە. پار زستان ئاو بردبووی.

٢٢٥- ئەمڕۆ بەدەم ڕێکردنەوە (گڵەسپی)م بینی.

لە حەوت و نیودا گەیشتینە نزمایی و چاڵاییەکانی بەردەمی شاخی (ئەزمڕ). دوای تاوێ بە کورتترین بەشیدا، بە ڕێگایەکی زۆر باریکدا بەپێچ و گەوە و بەلاپاڵی شاخەکەدا سەرکەوتین، بێئەوەی بەرەو خوارەیەکمان بێتەڕێ. لە هەشتدا گەیشتینە سەر ترۆپکەکەی، پاش ئەوەی پێنج دەقیقە ڕووەو باشوور هەر بە ترۆپکەکەیدا ڕێمان کرد، دەستمان بەهاتنەخوارەوە کرد. لە سەرەتادا هاتنەخوارەوەکەمان ناخۆش نەبوو، بەڵام دوای ئەوە ئیتر ڕێگاکە بەلێواری هەزار بەهەزارێکەوەبوو، بەتایبەتی لە جێگایەکدا، کە چاك نەکرابوو، لە ناوەڕاستیدا نووکی بەردێکی گەورە دەرچووبوو. ئیتر ناچاربووین هەموومان لە ئەسپەکانمان دابەزین و خۆمان لەسەردەست بەسەریدا تێپەڕین و ئەسپەکانیشمان لەسەرخۆ و هێمن، ڕێی خۆیان کردەوە و هاتن. لێرەش بەسەلامەتی ڕزگارمان بوو.

لە هەشت و نیودا گەیشتینە دامێنە سەرەکییەکەی خوارەوە. هێشتاش سەمتی ڕۆیشتنەکەمان هەر ڕووەو باشوور بوو، دیوەکەی تریشی لە بانێکی بەشبەش پێکهاتبوو، کە بە هاوتەریبی یەکتر درێژ بوونەوە...

لە هەشت و پەنجا دەقیقەدا لە چاڵێکی ئەو بانەوە، چووینە ناو شیوی سلێمانییەوە، کە لە نۆدا گەیشتینێ، سەمتی شارەکەش وا دەکەوتەوە کە (٢٠پلە) ڕوو لە باشووری خۆرئاوا بکات. لە دەدا گەیشتینەوە بەر چادرگەکەمان لە باخچەکەی (پاشا)دا، لە (چوارباخ)(٢٢٦).

بەجۆرە گەشتەکەم تەواوکرد، کە ئەگەرچیش بەلای نەخۆشەکانی لای منەوە زۆر خۆش نەبوو، بەڵام سوپاس بۆ خوا، کە لەوە کەمتر ماندوو بووین، لەوەی چاوەڕێ دەکرا، ئەگەر ئەوانە لەبەرچاو بگیرێ، کە (نۆبەتێ)مان تووش هات و هەڵکەوتی لەش و لاری بەغدادییەکانیش بەرگەی ئەو سەختییەیان نەدەگرت و دەترسان و هەمووشیان ئەوانە بوون کە کارگوزار و کاربەدەستانی کۆمەڵەکەمیان پێکدەهێنا...

گەشتەکەش کەڵکێکی زۆری هەبوو، چونکە سەردانی گرنگترین و سەیرترین پارچەی کوردستانم کرد و دانسقەترین ئەو جێگایانەم بینین، کە پێش من نەناسرابوون، ئەو شوێنانەی ڕێی تێناچێ گەشتوەرێکی تر، بەم نزیکانە سەردانیان بکات. ئەو ڕێگایانەش کە زۆربەیان بەڕێکەوت، یان لە ئەنجامی بڕیاردانی ئەو ساتوکاتەدا لەبەرم گرتن. بۆ بەختەوەریش هەموویان لەو ڕێگایانە بوون کە بەهۆیانەوە توانیم بیرێکی گشتی، لەسەر وڵاتەکە گەڵاڵە بکەم و هەر هەمان ئەو ڕێگایانەش بوون کە ئەگەر پێشتر زانیاریم لەبارەی بەرنامەیەکی گشتیی تێکڕاییان هەبوایە، دەمویست ڕووپێوییان بکەم.

---

٢٢٦- ئێستا بۆتە گەڕەکێك، لە گەڕەکەکانی سلێمانی ــ ع.

# بەشی دەیەم

سەرنەگرتنی کوتاندن دژی ئاوڵە ـ مردنی کوڕەکەی عوسمان بەگ ـ ماتەمینی میر ـ شوێنەوارە مێژینەکانی شارەزوور ـ ئەسکەندەری گەورە و کچە شازادەی هیندی ـ ناوی ناوچەکان ـ عومەرئاغا ـ چەوساندنەوەی و زیندانی کردنی ـ پابەندیی و هۆگریی دەستە و دایەرەکەی ـ نەزاکەتی ـ قینی لە عوسمان بەگ ـ ڕەحمەتوڵلای تاتار ـ گەشتەکەی بەو کێوە سەختانەی دیانە کلدانەکانی تێدا دەژین ـ ئامێدی ـ ئامۆژگاریی میر بۆ تاتارەکان ـ تەنگوچەڵەمە و داهاتووی تووشی ـ هەوارگەی کلدانییان ـ نانی برنج ـ ڕامانی کلدانییان کە ڕەحمەتوڵلایان لەناو خۆیاندا دیوە ـ قێزکردنەوەیان لە محەمەد ـ ئیزەدیەیان ـ شاری وان ـ ناوی هۆزەکانی کورد ـ جلوبەرگی پیاوان ـ سەمای خانمان ـ پلەوپایەی ئافرەتی کورد ـ چیرۆکی دارشمانە ـ پیرێکی بەڕێزی بابانی.

## ٢٢ی ئەیلول

هەرکە گەیشتمە سلێمانی و زانیم ئەو بەرنامەیەی هاوسەرەکەم بۆ کوتاندن دژی ئاوڵە دایناببوو، سەری نەگرتووە، تووشی نائومێدییەکی تاڵ بووم. سەرنەگرتنەکەش بەهۆی نەزانین و هەڵەشەی ئەو پیاوەوە بووە کە کارەکەی لە ئەستۆ گرتووە و پێکوتراو (لقاح)ەکەش خراپ بووە و بڵقەکانیش ناتەواو بوون. لەبەرئەوە ئەو مندالآنەی کوترابوون، یەك دووانێکیان نەبێ ئیتر هەموویان تووشی ببوون ــ کوڕی دووەمی عوسمان بەگیش کە منداڵێکی جوانکەلە و تەمەنی ساڵ و نیوێك دەبوو، لەناو ئەوانەدا بوو، کە تووش ببوون و دوێنێ مرد ــ.

سەرلەبەیانی ئەمڕۆ چووم بۆ سەرەخۆشیی لێکردنی میر و عوسمان بەگ. میر یەکجار دڵگران بوو، چونکە بەزۆر فرمێسکەکانی ڕاگرتبوو. بەدەنگێکی کز و لەرزۆکیشەوە وەڵامی سەرەخۆشیی کردنی دامەوە و یەك دوو جاریش بە خەم و پەژارەوە ناوی برازاکەی هێنا، تا وردە وردە باسەکەمان بۆ باسی تر گۆڕی و بۆ سەر باسە کۆنەکەی خۆمان گەڕاینەوە، کە پێوەندی بەنەریتی ئەم وڵاتانەوە هەبوو. گەڕان و پشکنینم بە شوێن شاری شارەزووردا گەلێ لە کوردەکانیشی هاندا، بیر لەم کارە بکەنەوە. ئەمڕۆ میر وتی: لای وابێ شارە کۆنەکە دەکەوێتە لای (قیزقەلعەسی)یەوە، لە نزیك (بییستان سوور)ی ناوچەی شارەزوور، کە تا ئێستا پاشماوەیەکی زۆری کەلاوەی، یان بەواتەیەکی تر شوێنەواری کەلاوە، لای (قیزقەلعەسی) هەن، کە دوو سەعات لە (ئارباد) و پێنج سەعات لە سلێمانی یەوە دوورە. تا ئێستاش خەڵکی لەو شوێن و کەلاوانە قسڵ دێنن. خەڵکەکە دەڵێن گوایە (قیزقەلعەسی) لەکاتی خۆیدا ئەسکەندەری گەورە، بۆ ئەو کچە شازادە هیندییەی دروستکردووە، کە دوای گەڕانەوەی لە هێرشی بۆ سەر هیندستان، لەگەڵ خۆی هێناویەتی، لە ئەنجامی ئەوەشدا کە تووشی نەخۆشییەك بووە، پزیشکەکانی ئامۆژگارییان کردووە، کە دەبێ لە کەشوهەوایەکدا بژی، نزیك بێ بە کەشوهەوای وڵاتەکەی خۆی. بۆیە بۆ ئەم مەبەستە دەشتی شارەزووریان بۆ هەڵبژاردووە. (یاسین تەپە) و (گەورە قەڵا)ش دوو کەلاوەی ترن لەو ناوچەیەدا. جێگایەکی تریش هەیە هەر بەناوی (دزکەرە)وە.

بەکورتی و بەڕاستی ناوچەی شارەزوور، یان ئەم بەشەی کوردستان، سەرلەبەری پڕە لە شوێنەواری کۆنینە، ئەگەرچی هەریەکەیان بەتەنیا بەکەلاوە دانانرێ.

سەعاتێ، یان سەعات و نیوێك لەولای سلێمانی و لەخوار هێڵی زوورگەکانی ئەوبەرەوە (هەزار مێرد)یش هەیە، جێگایەکە، گەلێ ئەفسانەی لەبارەوە دەگێڕنەوە. ئاگرپەرستەکان، یان وەك کورد پێیان دەڵێن مەجوسەکان، بەرگرییەکی درێژخایانیان لە بەرامبەر داگیرکردنی سەرەتای ئیسلامدا

لێکردووە و مەیدانی بەیەکدا هەڵپژانێکی سەخت بووە. وەك دەڵێن پاشماوەی سەنگەرەکانیان، کە ناوبەناو لەسەر لێواری گردەکان دروستیان کردبوون، تا ئێستاش بەرچاو دەکەون.

بەهیوام کە هەوا خۆشبوو، سەردانی شارەزوور بکەم. ئەمڕۆ هەر بەتەواویی گەیشتمە ئەو باوەڕەی کە نابێ پشت بەزانیاری ڕۆژهەڵاتییان ببەسترێ، تەنانەت بەوانەشیان کە یەکجار بە زیرەك و ڕاستگۆ ناوبانگیان دەرکردووە، چونکە بەڵگەیەکی ترم دەستکەوت، کە چۆن گەشتوەرەکان بەبێئەوەی خۆیان پێبزانن، کەوتوونەتە گەورەترین و نابەجێترین هەڵەوە. بۆ وێنە جارێکیان میر، خۆی ئەوەی بەدڵنیاییەوە پێ وتم کە گوایە خێڵەکەی خۆی ناوی (کرمانج)ە، کەچی ئەمڕۆ هەر خۆی پێمی وتەوە کە ئەمە وا نییە و بەهەموو کوردەکانی قەڵەمڕەوی بابانی دەوترێ: کرمانج. بەڵام خێڵەکەی میر، ئەوە هەر بابانی یە و نەخۆی و نەکەسیش لە دانیشتووان نەیانتوانی پێم بڵێن کرمانج چییە و ئەم وشەیە لەچییەوە هاتووە. یەکێك لە دانیشتووان کە پێم وایە ئەویش لە هەمان بنەماڵە بێت، پێمی وت: گوایە بنەماڵەی بابان لقێکە لە هۆزی (سەککیر)٢٢٧ و هەردوو هۆزی (شینکی (گەلاڵی)یش بەخزمایەتی بەمان دەگەنەوە و بنەماڵەی بابان، لە دوای پووکانەوەی بنەماڵەی (سۆران) دەرکەوتووە و ناوی دەرکردووە. ئەمەش وەك پێشتر باسم کردبوو، گوایە سەد ساڵ دەبێ، وا نییە و بنەماڵەی بابان لە سەرەتادا لە کێوەکانی پشدەرەوە هاتوون دەستیان بەسەر (مەرگە و ماوەت)دا گرتووە و قزڵجەشیان لە ئێرانییەکان داگیرکردووە، کە تا ئێستاش بەشێکی ئەم بنەماڵەیە لە کرماشان دەژین، ئەگەرچیش بەکوردی دەدوێن، بەڵام بەکوردی ڕەسەن دانانرێن. ڕەنگە ئەمەش هەر لەبەرئەوە بووبێ گوندنشین، یان جووتیار بوون.

دوای ئەوەی لای میرم جێهێشت، چووم بۆ سەردانی عوسمان بەگ و بەم چەند ڕستە کورت و ئاساییە وەڵامی سەرەخۆشییەکەمی دایەوە: دەسەڵات نییە، ئیشی خوایە، ئیشی خواش ڕەت ناکرێتەوە، تەمەنی درێژی بۆ ئێوە جێهێشتبێ. ئیتر دوای تاوێکی کەم، گەڕایەوە سەر دۆخی جارانی و دەستی بەقسەی ئاسایی و پێکەنین کردەوە و پاشان سەیری هەندێ ئەسپی کرد و چەند پارچە مەڕمەڕێکیان بۆ هێنا، تا بۆ ڕازاندنەوەی کۆشکە تازەکەی لێیان پەسەند بکات و سەرنجیشی بۆ ئەوە ڕاکێشام کە ئەم بەردانە، هی قەرەداخن.

ئەمساڵ هەموو دانیشتووانی سلێمانی لە دەست ڕەشەبا هاواریانە، کە هەوای ئەمساڵی ئەوەندە گەرم کردووە، بۆتە مایەی سستی و تەمەڵیی و لەسەرەتای هاوینەوە ئەوەتەی دەستی پێکردووە، سێ ڕۆژی لەسەریەك، بێ ڕەشەبا نەبووە. ئێمەش لە وەتەی لەو کوێستانانە گەڕاوینەتەوە، ئەگەرچی ڕەشەباکە لەچاو جاراندا کەمێك خاوی کردۆتەوە، بەڵام لەشمان لەبەر قرچەدا داهێزراوە. هەر لەم چەند

---

٢٢٧- ئێستا پێیان دەڵێن سەکر-م.

ڕۆژە کەمەشدا سەرنجی هەڵکەوتی ئەم ڕەشەبا سەرسەختەم داوە، هەستم کردووە کە دێت، دەیکات بە گەردەلوول و لە شێوەی تەوژمێکی ڕاستدا بەسەر شارەزووردا تێپەڕ دەبێ. ئەمەش لە کاتێکدا لەناو شاردا وا دەکات کە چەند سەد یاردەیەك لە چادرەکانی ئێمەوە دوورە، کەچی لای چادرەکانی ئێمە، شنەیەکی کەم نەبێ، هیچی تر نەبوو، ئەویش بەئاستەم چادرەکانی دەلەراندەوە. چەند شەوێ لەمەوبەر کاتێ ئەم ڕەشەبایە لەوپەڕی توندییەکەیدا بوو، (میناس ئاغا)ی لامان توانی دەشتەکە ببڕێ و بگاتە شاخەکانی ئەوبەرمانەوە، بەڵام هەرکە لە (تانجەرۆ) پەڕیبۆوەوە، شوێنەواری ئەم ڕەشەبایەی هەست پێ نەکردبوو، کەچی لە گەڕانەوەیدا لە هەمان شوێن، ڕەشەباکە گرتبوویەوە.

## ٢٨ی ئەیلول

بەهۆی عومەرئاغاوە، لیستەی ناوی هەموو ناوچەکانی کوردستانم چنگ کەوت، کە لە سنووری بەغداوە دەست پێدەکات(٢٢٨).

---

٢٢٨- داوودە: لە دووریی چوار سەعاتە ڕێ لە کفری یەوە دەست پێدەکات و (دەلۆ)، (زەنگەنە)، (گوم)، (زەن) یان زەند، کە بەهۆی ناوی دانیشتووانییەوە وا ناونراوە و (شێخان)، (نورە)، (چەمچەماڵ)، (چیا سەوز) و (کێوەچماڵە)، (شوان)، (چوبوق قەلعە)، (عەسکەر)، (قەڵاسێوکە)، (کیرخەبەر) و (بازیان) لێرەوە سنووری دەرەوەی سلێمانی دوایی دێت... ئێستاش بابگەڕێینەوە سەر قەرەداغ، کە دەلۆ و زەنگەنە لە خۆرئاوا و باکوورەوە بوون بەسنوور بۆی، بەڵام لە باشوورەوە، تا (دیالە) دەچێت. دەربەندی (بانی خێڵان)یش کە لەسەر دیالەیە، سەربە قەرەداخە. قەرەداخیش مەڵبەند (أیالە)یەکی گەورەیە و دەبێت بەچەند بەشێکی ترەوە، ئەوبەشەی بانی خێڵانی تێدایە پێی دەوترێ (دیزیائییش DIZZIAIEESH) و (گەورە قەڵا)ش هەر دەکەوێتە ئێرەوە. (وارماوە) و (سەرچنار)، کە سلێمانی دەکەوێتە نێوانیانەوە. (سورداش)یش کە کێوی (پیرەمەگرون)ی تێدەکەوێ. (مەرگە) و (پشدەر)یش، کە زێی ئاڵتوون کۆپری بەنێوانیاندا تێدەپەڕێ و ئەم زێیە پێنج، شەش سەعاتە ڕێ لەولای (ساوق بولاق ـــ سابلاخ)ەوە لە (لاجان) هەڵدەقوڵێ و (گەلاڵە) و (شینك) و (ماوەت) و (ئالان)یش. هەروەها (سیوەیل) و (سەراومیراوا)، کە ماوەت و سیوەیل و ئالان سنووریان بۆ دروست دەکەن و (باڵخ) و (گابیرون) و (شارباژێڕ) و (بەرگە ئوو) و (سرۆچك) و (گوڵ عەنبەر) و (هەڵەبجە )، کە گوڵ عەنبەر و وارماوە و زەهاو سنووری بۆ دروست دەکەن. (شەمیران)یش کە ناوچەیەکی شاخاوییە، دەکەوێتە ئەوپەڕی دیالەوە. (جەوتان)یش کە دەنووسرێ (جفتان)، بۆ قزلجە دەبێتە سنوور. هەروەها هەڵەبجە و تەراتوولیش. بەڵام (قەرەحەسەن ) ناوچەیەکە جاری وا هەیە دەخرێتە سەر بەغدا و جاری واش هەیە دەخرێتە سەر کوردستان و سنوورەکەی کەرکووکە. هەروەها (لەیلان) و چەمچەماڵ و شوان. سەرنج: ١ـــ ڕاستییەکەی (شینکایەتی)یە. ٢ـــ باڵخ، گاپیلۆن.٣ـــ بەرگەلۆو.٤ـــ تەرەتوولو ـ ع.

## ٢٩ی ئەیلول

هاوڕێی جگەرسۆزم عومەرئاغا، بەدەم قسەوە مێژووی ژیانی خۆی و ئەو چەوساندنەوەیەی لەم دواییەدا بەسەری هاتبوو، بۆ گێڕامەوە و وتی: چوار، پێنجێ لە دڵسۆزترین لە دەستەکەی خۆم لەگەڵدا زیندانی بوون، زیندانەکەش شێدار و بێ کەرەسەی گەرمکەرەوە بوو، زستانیش لەوپەڕی ساردیدا بوو، هەر ڕۆژەش جارێ، یان دووجار، یەك دووانێکیان لەو پیاوانەی لای من دەبردە دەرێ و دارکارییەکی سەختیان دەکردن، هەر لەسەر ئەوەی شوێنی شاردنەوەی سامان و دراوی سەرکردەکەیان نەدەدرکاند. کەچی سەرباری ئەوەش کەسیان ورەیان بەرنەدا و ددانیان پێدا نەنا، تا ڕۆژێکیان هەموو پیاوەکان کۆبوونەوە و گەیشتنە ئەوەی ئاگاداری ئاغاکەیان بکەن کە پیلانێکیان سازکردووە، لەو شەوەدا زیندان بشکێنن و نۆبەدارەکان سەرببڕن و سەرکردەکەیان بۆ کەرکوك بفڕێنن. بەڵام ئەم، هەرگیز ڕێی ئەم تەقەللایەی نەداون. لەکاتێکدا پیاوەکان لە ماوەی ئەو زیندانی کردنەدا خەریکبوون لە برساندا بمرن، بەڵام کەسیان ئەوەیان تێدا هەست پێنەکراوە کە ئارەزووی دڵ گۆڕینێك بکات، یان خزمەتێکی تر بەچاکتر بزانێ لەوەی بەرامبەر سەرکردەی دەیکات. لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆربەی پیاوانی عومەرئاغا، خێڵەکین. بەڵام جۆرە خەڵکێکن هەر لە مێژەوە لە خزمەتی باوکیشیدا بوون، چونکە (فەقێ قادر)ی باوکی و میرزاکەی و ژنەکەی و خوشکەکانی و برا بچووکەکانیشی هەموویان لە حەرەمی عومەربەگدا دەژین و بەشێکن لە هەمان خێزان. پیاوەکانیشی هاوبەشیی بوون و نەبوونیی دەکەن و هەرچی بکات ئەوە دەکەن و کە ڕۆژگاریش پشتی تێدەکات، بەرگی شڕ لەبەردەکەن و کە دەستیشی دەگاتەوە پلەوپایە، دەستگیرۆییان دەکات. ئەم هەموو شتانەش دەکەن بێئەوەی ورتەیان لێوەبێت، یان ئاخ و ئۆفێك بکەن، بەڵکو بەپێچەوانەوە، هەموو ئەم شتانە لە ئەستۆ دەگرن، هەروەك شتێکی ئاسایی و پێویست بێت لەسەریان. عومەرئاغاش خۆی ئەم نیشانە و ڕەوشتانەی تێدایە و شتێکە وەك ئەوان. میریش ئەگەرچی بەدڵنیایی و لەناخەوە خاتری ئەمی دەوێت، بەڵام بەدنەدان و بۆ تێچاندنی عوسمان بەگ، کە ڕقی لە عومەرئاغایە، لێی هەڵگەڕایەوە و ڕەفتارێکی توندوتیژی لەگەڵ کردووە. عومەرئاغاش چونکە پێی وابوو کە میر ڕێزی دەگرێ و ئەمیش ڕێزێکی زۆری بۆ (ئەوەڕەحمان پاشا)ی باوکی هەیە، بۆیە هەرگیز بیری لەوە نەدەکردەوە ڕۆژێك لەڕۆژان، پشتی تێبکات و دەستبەرداری بێت و بێزاریی و سکاڵاشی لە میر، دەرنەدەبڕی، مەگەر بۆ کەسێکی وا نەبێت کە زۆر متمانەی پێدەکات. لەبەرئەوە لەو کاتانەدا کە قسەیشی بکردایە، قسەکەی شتێکی وانەبوو... کە باسی بێدەسەڵاتیی و دەستە پارچەیی میریشم بۆ کرد، عومەرئاغا دەستبەجێ

بەڕاستگۆییەکی ئاشکراوە وتی: قوربان دڵنیات دەکەم هەر بەتەنیا لە عاستی تۆدا وایە، ئەگینا خۆی وا نییە. ئەم قسەیەشی سەرزاری نەبوو، بەڵکو لەناخەوە بوو. قسەکەیشی واکرد، تا وریام بکاتەوە، نەوەك گومان لە سەرۆکەکەی بکەم. عومەرئاغا بەهۆی ئەوەوە کە پێشتریش وتم عوسمان بەگ ڕقی لێیەتی و ڕقەکەی خۆی لێ ناشارێتەوە، باری ئابووری و دەرامەتیشی بەتەواوی داهێزراوە و تووکی دەرکردووە، کەچی ناکوڕووزێتەوە، بەڵکو ئەوپەڕی توانای خۆی بەکاردەهێنێ تا هەست بەدەست کورتێتی و نەبوونییەکەی نەکرێ. لەگەڵ ئەوەشدا کە چەند مانگێك دەبوو لەگەڵ مندا بوو، بەڵام ئەوەندەی تۆسقاڵێك سووکە ئاماژەیەك، یان ئارەزوویەکی وای دەرنەخستووە، تا شتێکم لێ وەربگرێ. خۆ ئەگەر لەجیاتی ئەم، دەوڵەمەندترین تورکم لەگەڵدا بوایە، نەدەگەیشتە نیوەی ئەم ماوەیەش، کە بێ سێ و دوو کردن، دەستی لێ پان دەکردمەوە.

چەند ڕۆژێك لەمەوبەر، لە کاتێکدا تەتەرێکم بۆ ئەستەمووڵ دەنارد، ئەو پایتەختەی ئێستا وای لێ هاتووە هەرچی دڵ دەیەوێ لەو فەنتازیی و شتە پێویستیانەی کە ڕەنگە خەڵکی خۆرهەڵاتی بۆی سەراسیمە ببێ، کەچی کە لە عومەرئاغام پرسی حەز لەچی دەکات، تا بۆی بهێنێت، پێمی وت ئێستا هیچی بیر نییە، کە پێویستی پێی هەبێ و گورجیش باسەکەی گۆڕی. بەڵام (مەسرەف) لەناو ئامادەبووەکاندا بوو، داوای لێکردم پارچەیەك کەهرەمان(٢٢٩) بۆ دەمی قەننەکەی بۆ ڕابسپێرم.

لەگەڵ ئەوەشدا کە عوسمان بەگ ئەگەر مەبەستی بوایە، عومەرئاغای پێ لەناودەبرا، کەچی عومەرئاغا ڕووی هەر نەدەدایە و لێی بێباك و سەرکەش خۆی دەنواند. وەك بڵێ لێی ناترسم و سڵی لێ ناکەمەوە. کە لێشم پرسی: بۆچی خۆی لە بەگ ناگەیەنێ، یان لەگەڵ منیشدا نەبێ سەردانی ناکات!. وتی: چونکە خراپەی لەگەڵ کردووم و خۆشم ناوێ. بەکورتی تا ئێستا دوای ئەو تاقیکردنەوە دوور و درێژەم لەگەڵ عەرەب و ئێراندا، عومەرئاغا تاقە خۆرهەڵاتییەکە، کە بەهەموو مانایەکی وشەوە، بتوانم پێی بڵێم: (جەنتڵمان).

---

٢٢٩- کەهرەمان SUCCIN: کارەبا، عەمبەر، موورووی کارەبا، زەردوویی: ماددەیەکی ڕیسینی زەردی بەنرخە، لە درەختی کاژ (سنەوبەر)، بەکاری پاڵەپەستۆ دەبێت بە کارەبا لەژێر زەویدا. (القاموس العلمی المصور ــ ص ٧٨ ــ بەرگی سێیەم ــ کمال جلال غریب) ــ م.

## ۳۰ی ئەیلول

ئێستا بەستەکێکی ترم لە (بۆمبای)یەوە بۆ هات و دەبێ بینێرم بۆ ئەستەموولْ. ئەو ڕەحمەتوڵڵا ئاغایە لە بەغداوە بۆی هێنابووم، کە لەکاتی شۆڕشی (سەعید پاشا)دا تەقەللای دابوو بەڕێی (ئامێدی و وان)دا بۆ ئەستەموولْ بچێت. ئەمڕۆش هەر سەبارەت بەو ڕێیە قسەم لەگەڵ کرد، کە ڕێیەکی زۆر سەیرە و هیچ تورکێکی تر تەقەللای نەداوە بیگرێتەبەر(۲۳۰).

لەسەر ڕاسپێریی حاکمی هەولێریش زمانزانێکی کلدانی لە (عەین کاوە)وە۲۳۱ لەگەڵ خۆی بردبوو، کە لە خێڵە کلدانییەکانی جۆلەمێرگ بوو. لە هەولێریشەوە چووبوو بۆ (ئاکرێ ــ یان ــ نائوکور ــ NAOUKOR)، کە دوو ڕۆژە ڕێ بوو، ئەگەر هەر ڕۆژەی دوازدە

---

۲۳۰- بۆ گەیشتنە ئاسیای بچووك بەم ڕێیەدا، مرۆ دەبێ بەو وڵاتە سەخت و لێك دابڕاوانەدا تێپەڕبێ کە دیانە کلدانییەکانی تێدان و وەك من بزانم ئەمانیش ئەم تاقە دیانانەن کە ئازادیی خۆیان لە موسڵمانەکان پاراستووە، چونکە زۆر ئازایانە لە ڕوویاندا وەستاون. وا لە خواریشەوە ئەو سەرنجانە دەنووسین کە لە یادداشتەکانی میستەر ڕیچدا لەبارەی ئەم گەلە ڕەفتار سەیرەوە هاتووە:

(هارترین خێڵەکانی (چۆڵەمێرگ) و (هەکاری) لێك دابڕاو، خێڵەکانی کلدانن، کە چوارن و ئەمانە مل بۆ میری هەکاری نادەن و ژیانێکی تەواو کێوییانە دەژین. ئەمانە سەر بە ئایینی دیانن و لە دارودەستەی نەستورن و پیاوەکانیشیان لە قەڵافەت زلیی و ئازایەتیدا بەناوبانگن. دەڵێن تێپەڕینیش بە ناوچەکەیاندا، لە تێپەڕین بەناو خێڵە موسڵمانەکاندا ترسناکترە. ئەمانە لە ناوچە شاخاوییەکانی نێوان چۆڵەمێرگ و ئامێدی دا دەژین، کە تەنیا هەر خێڵێکی موسڵمانی تێدایە. هەندێ جاریش باج بەمیری هەکاری دەدەن، ئەگەر بەدڵی ئەمانی کرد و بەتەنگیانەوە هات. بەڵام بەزۆر نایدەن. ناوچەی هەکاریش دوو سەعاتە ڕێیەك لە (ورمێ)وە دووردەبێ. میری ئێستاش (مستەخان): (پێشکەشی)، یان: دیاری ــ بە (عەباس میرزا )ی فەرمانداری تەورێز دەدات).

کێبون ــ سەبارەت بەم گەلە کێوییە، لەنێوان قسەکانیدا دەڵێ: کالیبین ــ CHALYBEANS ــ ئەم ناوەیان لە سروشتی خاکە ئاسنینەکەیانەوە وەرگرتووە، چونکە ئەمانە لەسەردەمی (سیروز)ەوە چاوگەی زنجیرە شەڕ و وێرانکارییەکی بێ پسانەوە بوون و جارجارەش بەناوی جیاجیای وەك (کلدانی CHALDEANS) و (زانین ZANIANS) و لەسەردەمی (جەستیان JASTINIAN)یشدا بڕوایان بەخوا هێناوە و دانیان بە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمان داناوە. بڕوانە لاپەڕەی ۱۳٤ بەرگی حەوتەمی (داهێزران و ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی ــ لەندەن ــ ۱۹۰۲ز ــ.

۲۳۱- عەین کاوە: گوندێکە لە نزیك هەولێر، هەروەها (دیان)ی تێدایە.(تێبینی: ئیستا گەڕەکێکی گەورەیە لە هەولێر.م)

سەعاتە ڕێ بێت. ڕێگاکەش تا بناری چیای (ئاکرێ) کەمێك تەخت ببوو. لەوێشەوە ئەگەر بەپیادە ڕێ بکات و هەر ڕۆژەی دوازدە سەعات بڕوات، ئامێدی دوو ڕۆژە ڕێ دوور دەبێ. ڕێگاکەش زۆر سەخت و شاخاوییە. (زبێر پاشا)ی حاکمی ئامێدیش زۆری لەگەڵ خەریك ببوو کە سەفەرەکەی نەکات. چونکە سەفەرەکەی ئەگەر سەریش بگرێ، هەر ترسناکە. بەڵام تەتەرەکە هەر سووربببوو لەسەر ڕای خۆی. ئیتر ئەوسا پاشا هەندێ ئامۆژگاری کردبوو، لەوانە: هەرچییەکی لێ وەرگرتن، پارەیان بداتێ و هەر خواردنێکیان بۆ هێنا، لێی ڕازی بێ و ستایشی بکات. لە پارە سەرفکردنیشدا دەست کورتیی نەکات. چونکە ئەو خەڵکانەی لەو ناوچانەدان، کە ئەمی پێدا تێپەڕ دەبێ، بەتایبەتی دیانەکانیان، هارترین و ڕقاویترین خەڵکن و حول حولی مەزهەب و دەم بە هاوار و هەڵچوونیشن و بچووکترین بەربەرچدانەوەشیان، دەبێتە مایەی لەناوچوون. پاشان چەند نامەیەکیشی دابوویە و دووسێ کەسی شارەزای ناوچەکەشی لەگەڵ ناردبوو. بەڵام سەفەرەکەی زنجیرە دەردی سەرییەکی بێ بڕانەوە بووە، چونکە ڕووتیان کردبۆوەوە و چەکیشیان کردبوو. سەرباری ئەوەش منەتی ئەوەیان بەسەرداکردبوو، کە گوایە ڕاسپاردەی زبیر پاشای پێیە. بۆیە لە دەستدرێژی تر ڕزگاری بووە. سەفەرەکەی لە (ئامێدی)یەوە بۆ (وان) ماوەی سیازدە ڕۆژی خایاندبوو. ئەم ماوەیە بەوەشەوەیە کە بیست و چوار سەعات لە جۆلەمێرگ(٢٣٢) دواکەوتبوو.

---

٢٣٢- جۆلەمێرگ: پایتەختی کوردانی ناوچەی هەکارییە، کە بارەگای (قۆچ هانەس ـــ KOTCH HANES)ی بەتریریارێکی کلدانییە و ئەمیش هەمیشە فەرمانداریتی تیپێکی سوپا دەکات، لەهەر جەنگێکدا لەنێوان میری هەکاری و ئێراندا بقەومێ، کە پایتەختەکەی دەکەوێتە قەڵەمڕەوییەکەیەوە، لەنێوان جۆلەمێرگ و سەڵماس دا. لە بەکارهێنانی تفەنگ و شمشێردا بەناوبانگە، وەك هەموو دزە قاڵبووەکانی داروەستەکەی دەیزانن. ناونیشانیشی بەکلدانی (ڤاپولیقا)، واتە: (جاپلیق)و لە ئەشکەوتێکی گەورەدا خەڵوەت دەکێشێ و دەشڵێن گوایە لە نزیك چۆڵەمێرگ کانی ئاسن و قوڕقوشم هەیە، کە ئەم هەردوو کانە، موڵکی میری هەکارین، جگە لە ڕۆژێك نەبێ لە ساڵێکدا، ئەویش ڕۆژی جەژنی گورگیسی پیرۆزە. چونکە نەستورییەکان ئەو ڕۆژە بۆ خەڵوەت گرتن بۆ ئەو (پیرۆزە) تەرخان دەکەن و تا چەند دەتوانن، بەدرێژایی ئەو ڕۆژە ئاسن و قوڕقوشم دەربهێنن. ئەم (دیر)ەش دەکەوێتە نێوان ئەو نەستوریانەی ناویان (چوالاخ)ە، کە سێ ڕۆژە ڕێ لە جۆلەمێرگەوە دووردەبێ. ئەمانە بڕوایان وایە لە ڕۆژی جەژنی (پیرۆزە)دا لەهەموو ڕۆژێ زیاتر بەرەکەتی هەردوو کانەکە زیاد دەکات ـــ لە یادداشتی میستەر ڕیچ ـــ ەوە ـــ خاریچ.

ناوچەی (هەکاری)ش لە ناوچە شاخاوییە هەرە سەخت و دژوارەکانە و سەختیی ڕێگاکەی تا (وان) هەر نالەبارە و زۆربەی شوێن و ناوچەکانیشی لێڕەواری چڕ و نزارن. خەڵکەکەش لەو کورد و عەرەبانە کێوی ترن، کە تەتەرەکە دیبوونی. کێوەکانیشی ئەوەندە بەرز و سەرکەشن، بەجۆرێ هەندێ جار گوندەکە بەجێ دەهێڵێت و پێچاوپێچ و بەکاوەخۆ، چوار پێنج سەعات بەسەریدا سەردەکەویت، کەچی دووبارە گوندەکە بەجۆرێ دەبینیتەوە، وەك ئەوەی هێشتا لەژێر پێتدا بێت. بەڵام قۆناغە ڕۆژەکان زۆر درێژن و لە مانگی تشرینی یەکەمەوە پێش خۆرکەوتن دەست پێدەکەن و دوای خۆرئاوابوون کۆتاییان دێت. تەتەرەکە دوای پەنجا سەعات ڕێکردن گوندێکی پرش و بڵاوی دیبوو، پانایی گوندەکە نزیکەی سەعاتە ڕێیەك ببوو، ئەمەش هۆبەی هۆزێکی دیانەکان بووە و کولێتەکانیان لە لقوپۆپی درەخت دروستکردووە. خەڵکەکەش کێویترین خەڵکێك بوون کە لەم ناوچە کێوییە دیبوونی. ئەم کلدانیانە بەم حاڵەشیانەوە کلێتەیەك لەسەردەکەن لە (ئاردە برنج) دروست دەکرێ، لە کلێتەی ئەوروپایی دەچێ. ئەمانە لە مەرەزەکردن بەولاوە، گەنم و جۆ نازانن و نانیش هەر لە برنجەکە دروست دەکەن. لەچاو خەڵکی تریشدا باڵایان بەرز و بەهێزیشن. لە گوێز و هەنگوین و نانی برنجیش زیاتر، هیچی تریان نەبووە، کە بە تەتەرەکەی بدەن. لە بەرامبەر ئەمەشدا پارەیەکی زۆریان لێ وەرگرتبوو. سەرباری ئەوەش کە خۆڵەمێش و کای ئەوەندەی برنجەکە تێکەڵ بووە. بەڵام بەپێی ئەو ڕاسپێرییانەی لە ئامێدی پێی وترابوون، سوپاسێکی زۆری بەرامبەر بەم خۆراکەی کردبوون و زۆر بەلەزەتیشی زانیبوو. جگە لە دووان سیانێکیشیان نەبێ، بەکوردی قسەیان نەکردبوو. کابرای زمانزانی عەین کاوەییش بەئاستەم لە زمانەکەیان گەیشتبوو. سەرسامییەکی زۆریشیان بەرامبەر سەروسیمای تەتەرەکە نیشان دابوو. کە ئەویش هەمان سەرسامی بەوان نیشان دابوو. لێشیان پرسیبوو دەبێ پیاوی کێ بێ! ئەویش پێی وتبوون عوسمانییە. کەچی لەوە نەگەیشتبوون و ئەمیش هەرچەند نەیوێرابوو ئاشکرای بکات، بەڵام ئەوەی پێ گران ببوو، کە وتبوویان سوڵتان ناناسین و ملی بۆ نادەین و هەرئەوەندە زانیبوویان کە موسڵمانە، پێیان وتبوو ئەمان زۆر لەپێش هاتنی (محەمەد)ی پێغەمبەر، لەم جێگایە بوون و لەگەڵ ئەوەشدا ڕووتیان نەکردبووەوە. کە بەجێشی هێشتبوون، لەوپەڕی تەبایيدا بوون لەگەڵیدا و پێیان وتبوو پێشتر هیچ سوارێکی تریان نەدیوە بەچیاکانی ئەواندا تێپەڕێ. هەروەها ژمارەیەکی زۆری (ئیزەدی)یە شەیتان پەرستەکانیشی دیبوو. چاویشی بە (میر)ی هەکاری نەکەوتبوو، کە وەك دیار بووە، دەسەڵاتێکی کەمی بەسەر دارودەستەکەیدا هەبووبێ. ئەوەش هەر لەبەرئەوەیە کە ئەمانە خێڵەکیین.

(ئامێدی و هەکاریی)ش خەڵکێکی وایان تێدانەبووە بەتەواویی پێیان بوترێ: لادێیی، یان شێوەیەکی تر، کە پێیان بوترێ جووتیار. پێم وابێ ئەمەش بەڵگەیەکی ترە، کە ئەم ناوچانە نیشتمانی ڕەسەنی کورد و کلدانە و ئەو ڕەگەزی (تاجیك) یان (تات)ەی لەسەرتاسەری کوردستانی باشووردا هەن، بەڵگەی ئەوەن کە ئەم ناوچانە وڵاتێك بووە، داگیرکاریان تێهاتووە.

لە ئەنجامدا تەتەرەکە گەیشتبووە (وان) و گومانیشی تێدانییە بەم گەیشتنەی زۆر دڵخۆش بووە. ڕەحمەتوڵلا وتیشی: ئەگەرچی (وان)، میرنشینێکی کوردییە، بەڵام پێشکەوتووە. (دەورێش پاشا) ی میری (وان) یش پێی وتبوو پێشتر کەسێکم نەناسیوە، لەو کێوانەوە هاتبێ.

## ١ی تشرینی یەکەم

ئەم بەیانییە نزیکەی سەعات و نیوێك باران ڕشێنەی کرد، بارینەکەی پێش وەخت بوو، لەبەرئەوە ڕەنگە زیان بە شەتڵە مەرەزە بگەیەنێ، چونکە خەریکی پێگەیشتنە.

ئەمەی خوارەوەش وەك پێم وابێ ڕوونکردنەوەیەکی تێروتەسەلە لەبارەی ئەو هۆز و تیرانەی لەو پارچەیەی کوردستاندان کە میرنشینی سلێمانی بەڕێوەیان دەبات:

**یەکەم:** ـــ ئەو هۆزانەی لە ناوچەیەکی دیاریکراودا نیشتەجێ و سەقامگیر بوون

أ- لە ناوچەی پشدەر:

هۆزی سەککیر (سەکر) و نوورەدینی. ئەم دوو هۆزە نزیکەی (١٠٠) گوندیان دەبێ و دەشتوانن نزیکەی هەزار کەسێك چەکدار بکەن.

ب- لەو ناوچانەدا کە بەناوی هۆزەکانیانەوە ناونراوە:

شینکی ٢٠٠ خێزان

گەڵاڵی ٥٠٠ خێزان، هەردوو هۆزەکەش تەواو خێڵەکیین.

ج - سیوەیل: نەژادی ئەم هۆزە گومانی لێ دەکرێ و ساغ نەبۆتەوە، بەڵام هەرچۆنێك بێت ئێستا هۆزێکن و خەڵکەکەشیان تێکەڵی لادێیی نابن، بەڵام دانیشتوانی ناوچەکانی تر گوندنشینیان تێکەڵە، یان گوندنشینن و خێڵەکییان تێکەڵە. واتە گوندێکی جیاواز نییە بۆ یەکێك لەم دوو دەستەیە.

**دووەم:** ـــ تیپرە و هۆزی کۆچەریی و ئەوانەی هەوارنشینن:

أ ــ هۆزی جاف: دوازدە تیرەن و جافی ڕەسەن شەش سەد خێزان زیاترنین، بەڵام پاشماوەیەکی زۆری هۆزەکانی لوڕستان و کوردستانی ئێران لەژێر سێبەری جافدا دەژین. لەبەرئەوە ئێستا تێکڕای هێزی خێڵەکە، چەند هەزار خێزانێك دەبێ. ئەم هۆزە لەکاتی پێویستدا بۆ بەرگری کردنی خۆی، دەتوانێ هەزار پیادە و سێ سەد سوارە بخاتە ژێر چەکەوە. بەڵام بۆ کۆکردنەوەیان بۆ پێویستیی میر، ناتوانرێ خێڵەکە قایل بکرێ و ئەم هەموو هێزە کۆبکاتەوە. خێڵەکەش سەرومڕ، ساڵانە سێ سەد توورەکە، یان جاروبار کەمتریش بەمیرنشینەکە دەدات. (توورەکەش بریتی بووە لە ــ ٥٠٠ ــ پارچە دراوی زیو، یان زێڕ و بەگوێرەی ڕێکەوتن ــع).

بەڵام خێڵەکانی تر لەچاو ئەمانەدا باجێکی زۆر زیاتر دەدەن، چونکە نەوەکو جاف بەهێزن و نەوەك جافیش خۆیانیان پێ دەپارێزرێ.

هۆزی شێخ ئیسماعیل ٥٠٠ خێزان

هۆزی کەڵهووڕ ٢٠٠ خێزان

هۆزی مەندیمی ٣٠٠ خێزان

هۆزی کەلو ــ کەوانی ٢٥٠ خێزان (ئەمانە لە هۆزی جاف نین ــ ع)

هۆزی مەرزینك ٨٠ یا ٩٠ خێزان (ئەم هۆزە پێشان بەشێك بوون لە بلباسەکان).

هۆزی تیلەکۆ ١٠٠ خێزان

هۆزی کووسا ٢٠٠ خێزان (ڕاستەکەی کۆستایە ــ ع)

هۆزی هەمەداوەند ٢٠٠ خێزان (هەر هەمەوەندە ــ ع)

هۆزی سوفیاوەند ٤٠ یا ٥٠ خێزان (ئەمانە بەشێکن لە هۆزی لەك ــ ع)

هۆزی کەچەڵی ٤٠ خێزان (لەهەمان کاتیشدا گوندە و بەشێك لە هۆزی شێخ ئیسماعیلی تیایدا نیشتەجێن ــ ع)

هۆزی چگنی ٤٠ خێزان

هۆزی زەنگەنە ٤٠ خێزان (لە چەند گوندێکدا پەرشوبڵاون ــ ع)

هۆزی زەند ٦٠خێزان (خێڵی کەریم خانی شای ئێرانن کە قاجارەکان ــ خێڵەکەی شای ئێستا ــ لەسەر تەخت لایان برد. کاتێ هاتنە ئەم ناوچانەش ڕەوەند بوون و ئێستا زۆریان لە (زەنگەباد) سەقامگیربوون و زۆریشیان لە سوپای بەغدادا بوون بە سەرباز.

هۆزی کروەئی ٠٦ خێزان (ئەمانە کورەوین و عەرەب نەژادن، پێشان لە ــ قەرەتەپە ــ بوون ــ ع).

هۆزی لوڕ ٠٦ خێزان (ئەمانە فەیلین).

هۆزی سەدەنی ٠٠١ خێزان (ڕاستەکەی سەدانییە ــ ع).

هۆزی کوورزەئی ٠٠١خێزان (بنەچەکەیان لە کۆیسنجاقە و گوندێکیش بەم ناوەوە هەیە ــ ع).

سەرەڕای ئەوەی زۆر خێزانی ئەم خێڵانە لەژێر سێبەری جافدان، بەڵام هیچ یەکێ لەم خێڵانە پشت بە جاف نابەستن.

لەم لیستەیەدا ژمارەی ئەندامانی خێزانیش باس نەکراوە. لەبەرئەوەش کە هۆزی جاف بەهێزن زۆرباشیش خۆیان پێ دەپارێزرێ، بۆیە ڕۆژانە چەندان پیاوی هۆزە چەوساوەکانی تر پێوەندییان پێوە دەکات.

لەناو ئەو خێڵانەی سەرەوەدا خێڵێك نییە تەواو بێ، چونکە پاشماوەی بەشی تریان لە ناوچەکانی سنە و کرماشان و لوڕستانە.

## ٢ی تشرینی یەکەم

کە بیستم لە ماڵێکی قەراخ شار، زەماوەند بۆ بووکێك دەکەن، منیش بۆ ئەوەی یەکێك بم لە بینەران، خۆم ئامادەکرد. بەڵام بۆئەوەی نەبینە جێی سەرنج، من و میستەر (بەل)، هەریەکەمان مشکییەکمان بەسەرمانەوە بەست و دوو عەبای ڕەشمان بەشانماندادا و جلەکانمان پێ شاردەوە.

دوای ئەم خۆگۆڕینە، شەوێ بەرەو زماوەندەکە چووین و دوای ماوەیەکی دوور گەیینە شوێن ئاهەنگەکە، کە خانوویەکی ئاسایی بوو. لەوێ لەسەربانی ماڵەکەوە، کە هەر شەش پێ بەرزدەبوو، خۆمان بەناو خەڵکە زۆرە سەیرکەرەکەدا کرد. حەوشەی خانووەکەش کە شانۆی زەماوەندەکە بوو، خەڵکێکی زۆری لە کوردی هەمەچینە و هەمە تەمەنی لێ بوو، هەر لە لادێیی مشکی بەسەری گڵونکە ڕەنگاوڕەنگەوە، تا لۆزەندەرێکی ترسناك، کە کەوڵی پێستە بزنێکی لەبەر کردبوو. زۆربەشیان دەستیان لەیەك ئاڵاندبوو، کە بە هەڵپەڕکێیەك دەستیان پێکردبوو، پێیان دەوت: (چۆپی) و لە شێوەی بازنەیەکی پچڕپچڕدا دەستیان لەیەك ئاڵاندبوو. حەوشەی ماڵەکەیان پڕکردبووەوە. هەڵپەڕکێکەش بریتی بوو لە لەش جووڵاندن و بۆ پێشەوە و

بۆ دواوە هاتن و چوون و ئەم پێ و ئەو پێیان بەزەویدا دەدا و ناوبەناویش توندتر پێیان بەزەویدا دەدا. ئەم هەڵپەڕکێیە، ئەو گۆرانییە ئێرلەندییەی دەهێنایەوە یادم کە دەڵێ:
(Ri Sing on Gad and Siking on Sugan) واتە: جارێك بەرزدەبنەوە و جارێکی تریش نزم دەبنەوە.

دڵخۆشیی خۆیشیان بەقریوەیەکی بەرز دەردەبڕی، ئەوانەی تریش کە هەڵنەدەپەڕین، بەشەکەی تری حەوشەکەیان پڕکردبووەوە. لە سەربانیش بەهەر چوار دەوری حەوشەکەدا ئاپوورەیان بەستبوو. هەندێکی تریش لەناوەڕاستی حەوشەکەدا بە چیچکانەوە دانیشتبوون، کە دەهۆڵ و زوڕناژەنەکەشیان لەناودا بوو. هەموو شوێنەکەش بە سێ چرا ڕووناك کرابووەوە. بەڵام ئاپوورەکە گوێی نەدەدایە ئەو چرە دووکەڵەی کە لە چراکانەوە بەرز دەبوونەوە. هەڵپەڕکێکارانیش سەعاتێ پێش گەیشتنی ئێمە، هەڵپەرکێیان دەست پێکردبوو. دوای ئەوەی نیو سەعاتی تریش بەدڵی خۆیان هەڵپەڕین، ئەوسا خاوەن ماڵ و هەندێ کەسوکاریان، کە هەموویان چەکداربوون، بەدار و تێلاوە، بۆیان دەرپەڕین و دەهۆڵ و زوڕناکەیان بێدەنگ کرد و سەماکارانیش بەم شێوەیە بلاوەیان پێکرا بۆ خەڵکی تر و حەوشەکە چۆڵ کرا. لەپڕێکدا کوردێکی کەتە، بازیدایە ناوەڕاستی حەوشەکەوە و



زەماوەند (هەڵپەڕکێی ئافرەتان)

تا چەند دەقیقەیەك مێكوتێكی بەدەستەوە گرتبوو، شتی گاڵتەجاڕیی و یاری دەكرد و خەڵكی دەهێنایە پێكەنین. پاشان دووبارە دەهۆڵ و زوڕنا، ئاوازی چۆپییەكەیان لێدایەوە و پۆلێ ئافرەت، كە سیی كەسێك دەبوون، هاتنە حەوشەكەوە و دەستیان گرت و لەسەرخۆ و ڕێكوپێك، هەڵپەڕین. ئەمانە بەبێ ڕووبەند و بەگێز و گوڵنكە و خشڵ و كراسی ئاوریشمی ئاڵ و والاوە، لەوپەڕی خۆگۆڕیندا بوون، لەڕاستیشدا دیمەنێكی زۆر ڕەنگین بوو. بەڵكو بەلای منەوە شتێكی تازەبوو، چونكە هێشتا لە خۆرهەلاتدا ئافرەتم نەدیوە ــ بەتایبەتی خانمەكانیان ــ بەو سەربەستییەوە، بەبێ ڕووبەند، تێكەڵ پیاوان بن، تەنانەت ئافرەتی عەرەبیش ئەوەندەی ئەمان، لەم مەیدانەدا سەربەست نین، چونكە ئەوان خۆیان زۆرتر دەپێچنەوە.

ئەم پۆلە ئافرەتە لەسەرخۆ، بەدەوری حەوشەكەدا دەستیان بە جووڵە و شەپۆڵدان كرد. هەڵپەڕكێكەیان هەنگاوێك دەهاتە چەقی حەوشەكە و بەهەنگاوێكی تر بۆ دواوە دەچوونەوە. كەمەر و سەر و لەشیان بەشێوەیەكی ڕێك و یەكجار زۆر شیرین دەجوولاند. ئاوازەكەشیان لەگەڵ جوولانەوەیاندا زۆر هێمن و گونجاوبوو. خانمەكانیش لە سەماكەیاندا شتێكی ناوێزەیان نەدەكرد و زیادەڕەوییان تێدا نەدەكرد. ئەم هەڵپەڕكێیەی نیو سەعاتی خایاند، دڵی زۆر پێدەكرایەوە. دوای نیو سەعاتەكە دەهۆڵ و زوڕناكە لە لێدان كەوتن و ئافرەتەكانیش دوای ماندووبوون كشانەوە و هەموو گیانیان داپۆشییەوە، هەر لەسەریانەوە، تا پێیان و بەرەو ماڵ چوونەوە... ئەم كارەشیان لەجێی خۆیدا نەبوو، چونكە ئەو ژمارە پیاوەی هەڵپەڕكێكەیان بینی، زۆرتربوون لەوانەی كە ڕەنگە لە شەقامەكانی سلێمانی دا تووشیان بن و زۆربەشیان جوان و شۆخ و شەنگ بوون.

ڕەنگە دوای باسكردنی ئەم دیمەنە، بێهوودە نەبێ ئەگەر بڵێین ئافرەتی كورد، لەچاو ئافرەتی تورك و بەڵكو ئافرەتی عەرەبیشدا، لە ماڵی خۆیدا كەمتر ڕووبەند دەگرێتەوە، ڕێگا بەنۆكەریش دەدرێ بچێتە ماڵەكانیان. ئەوەندەش گوێ بەخۆ داپۆشین نادەن، تەنانەت لەبەرچاوی بیانەش... كە لە ماڵیش دەچنە دەرەوە بۆ ناو شار، سەرپۆشێكی شینی سفت، (لەوانەی ئافرەتی بەغدا دەیدەن بەسەریاندا)، دەدەن بەسەرداو پەچەیەكیش دەگرنەوە، لە تووكی چارەوێ دروست دەكرێ زۆركەم و بەدەگمەنیش بەسەر دەموچاویاندا بەری دەدەنەوە، مەگەر ئافرەتی چینی سەرەوە، یان تووشی یەكێك بن كە خۆیان حەزبكەن نەیاننناسنەوە. بان نۆكەر(حەرەم ئاغاسی) میریش كە بەپێی دابونەریتی خۆرهەلاتییانە، دەبێ خەسیو بێ، لەگەڵ چەند نۆكەرێكی حەرەمدا، هەر لە كوردە ڕیشن و و بازۆڵە بادراوەكان بوون...

ئافرەتەکانی لای کەیخوسرەو بەگیش ڕووبەندیان نەدەگرتەوە، تەنانەت لە پێش چاوی پیاوەکانی دەستەکەشماندا. کاتێ هاوسەرەکەشم چووبووەوە بۆ سەردانیان لە ڕەشماڵەکانیاندا، ژمارەی پیاوی ئەوەندەی ژمارەی ژنەکان لەناویاندا دیبوو. بەڵام ئافرەتانی چینی هەژار لە سلێمانیشدا بەبێ ڕووبەند و عەبا، دەسووڕێنەوە. هەندێ جاریش بەیانیان زوو لە هاویندا لەسەربانی ئەو خانووە نزمانەیانەوە، کە هەر پێنج شەش پێ لە زەوییەوە بەرزدەبن و بەسەر کۆڵانە تەنگەبەرەکاندا دەنوارن، لەناو جێگادا، لەگەڵ مێردەکانیاندا، یان کە لەناوجێ دێنە دەرێ بۆ سەر کاروباری خۆیان، دەبینرێن. سەرباری ئەم ئازادی و دیاردەی بێ دەربەستییەشیان، بەڵام هیچ ئافرەتێ ئەوەندەی ئافرەتی کورد، ڕەوشت بەرز نین و ئەمانە، لەم شکۆ و سەربەرزییەوە، زۆر لە ئافرەتی تورك لە سەرووترەوەن.

پلەوپایەی ئافرەت لە کوردستاندا زۆر لە پلەوپایەی ئافرەتی تورکیا و ئێران بەرزترە، مەبەستم لەمەش ئەوەیە، کە مێردەکانیان بەچاوێکی یەکسانیی بۆیان دەنوارن و گاڵتە بەدەستەپارچەیی و چۆکدادانی تورك دەکەن و لەم ڕووەوە ڕقیشیان لێیان دەبێتەوە(٢٣٣).

---

٢٣٣- بەڵگەش لەسەر ئازایەتی ئافرەت کەم نییە لە ناو ئافرەتی کورددا. فەیزوڵلا فەنیی هاتەلام، کە پیاوێکی زرنگە و لە میکانیکدا دەستێکی باڵای هەیە و کاتی خۆی لای والی بەغدا (دیوان ئەفەندی) بووە، باسی ئۆرگۆنێکی بۆکردم، خۆی دروستی کردبوو، هەندێ ئاوازی تورکی و فارسیش فێرببوو، پێی لێدەدا، لەکاتی ماڵاوایی لێکردنم و هاتنی نۆکەر و هێنانی ئەسپەکەیدا و گردبوونەوەیان لێی، ئاوڕێکی لێدامەوە و پێی وتم دەمەوێ شتێکت نیشان بدەم، ڕەنگە هێشتا بەرچاوت نەکەوتبێ. ئیتر بانگی نۆکەرێکی کرد و هات و لێی پرسیم: ئاخۆ هیچ شتێکی سەیر و نامۆ، لە نۆکەرەکەیدا بەدی دەکەم؟. منیش پێم وت: نەخێر و سەرباری ئەوەش پێم وت: هەر کوڕێکی چابوك دەبینم. ئەویش پێی وتم ئەوە کوڕ نییە، بەڵکو بەکارترین نۆکەرێکیشە، کە پیاو بڕوا ناکات. ڕەوشتیشی بێگەردە و بەڵکو بۆتە مایەی شەرەفمەندیش بۆ ئافرەتان. ئازایەتییەکەشی لەسەروو ئازایەتی پیاوەوەیە. هێشتا کچیشە. ڕۆژێکیان تورکێك ویستبووی دەستی بۆ درێژبکات، بەڵام ورگی هەڵدڕیبوو، وتبووی ئەگەر گەورەکەشم بیەوێ شتی وام لەگەڵدا بکات، سێ و دووی لێ ناکەم و ورگی دەدڕم. شانازییش بەوەوە دەکات کە چەند جارێك هێرشی کردۆتە سەر تۆپێکی داگیراوە، بێئەوەی بگەڕێتەوە، یان ڕمەکەی بهاوێ، تا گەیشتۆتە سەر سەربازە تۆپچییەکە. جلوبەرگی پیاوانەی لەبەرکردبوو، شاڵێکی ئاوریشمیشی لەسەرەوە پێچابوو. باڵایەکی زراڤی پێوەبوو، تەمەنی هەر لەنێوان (٥٢ـ ٠٣) ساڵیدا دەبوو، سەروسیمایەکی کوردانەی هەبوو، هەتاو بردبووی.

لە کوردستاندا خێزان جۆرە هێمنی و ئارامییەکی هەیە، کە ئەمە شتێکە، بەتەواویی لە تورکیادا نییە، بەڵام هەندێ میر و دەسەڵاتداری بەهێز و سەرەڕۆی کورد، جۆرە توندوتیژییەك دەنوێنن، کە لە تورکیا مل بۆ ئەوجۆرە شتانە نادەن، ئەویش ئەوەیە ئەگەر پیاوێکی ئەو چینە دەسەڵاتدارە، کچێکی خۆشویست، دایك و باوکی ناچار و ڕازی دەکات بیدەنێ. چونکە ترسی پابەندییان بەئاییینەوە، نایەڵێت بەڕێگایەکی تر بیخوازێت. کە لێیشی تێر و بێزار دەبێ، تەڵاقی دەدات و لە نۆکەرێکی خۆی مارە دەکات، بەتایبەتیش لادێیە کلۆڵەکان دووچاری ئەمجۆرە چەوساندنەوەیە دێن. لەم بنەماڵەیەدا عوسمان بەگ تاقە کەسێکە خلیسکاوەتە ناو ئەمجۆرە تاوانەوە. بەڵام ئەو ئافرەتانەی لە جەنگدا بە تالان دەبرێن ــ کە زۆربەیان (ئیزەدی)ن، یان هی ناوچەکانی تری کوردستانن ــ لە ماڵەکاندا دەکرێن بە کەنیزەك.

لای ئافرەتی کورد هەڵپەڕکێ خولیایەکی گەورەیە، چونکە زۆرجار ئافرەت بەبێ پێ وتن و بانگهێشتن، خۆیان بۆ کارکردن لە زەماوەند و ئاهەنگدا ئامادە دەکەن، بۆئەوەی ڕێگایان بدەن هەڵپەڕن. لەگەڵ خۆیاندا دیاری بچکۆلەش بۆ بووکێ دەبەن. لەمجۆرە بۆنانەدا ئەگەر پیاویشی زۆر تێدابێ، بەئاشکرا و بێ ڕووبەند و خۆپێچانەوە هەڵدەپەڕن. هەڵپەڕکێی خۆرهەڵاتییانەش، سەرەڕای ئەوەی جیاوازیشیان تێدایە، بەڵام هەر لەسەر یەك شێوەن و ڕەنگە لە زۆر کۆنەوە بۆیان مابێتەوە. هەڵپەڕکێش جۆرێکە لە (سێرکوی گریك)ی، یان ڕۆمیکا ــ بەڵام ئەم، ئاڵوگۆڕی کەمتر تێدایە و کەمتریش بزوێنەرە.

جلوبەرگی ئافرەت لە کوردستاندا بریتییە: لە ئاوەڵکراسێکی گەورەی تورکییانە و کراسێکی پانوپۆڕ، لەناوەڕاستدا پشتێنێکی دووگۆی گەورەی کەمەرە و هەیاسەی زیو، یان زێڕی لەسەر دەبەسترێ، لەسەر ئەویشەوە کەوایەك لەبەردەکرێ، لەسەر شێوەی کەوای پیاوانەیە و لەبەر گەردندا بە دووگمە دادەخرێ، بەڵام دووگمەکەی داناخەن و تادامێنی دەکرێتەوە و کراس و کەمەرە و لوولەی لێوە دەردەکەوێ. ئەم کەوایە لە ئاوریشمی میل میل یان گوڵدار، یان ڕەنگاوڕەنگ، لە کوتاڵی (کوجەرات) و بەپێی جیاوازیی وەرز و دەوڵەمەندیی خاوەنەکەی دەدوورێ. لەسەروو ئەمەشەوە (سەڵتە ــ بنش)(٢٣٤)دێت و ئەمیش لە (سەتن ــ SATIN)ە و وەکو کەوا دەدوورێ، بەڵام دووقۆڵی تەسکی هەیە، درێژییان ناگاتە لای ئانیشك. لە زستانیشدا لەجیاتی ئەمە، کلۆنجە لەبەردەکەن، کە ئەویش جۆرێکە لە سوخمە،

---

٢٣٤- هەمان وشە، دواتر باس دەکرێ.

بەڵام ناوداره و لۆکەی تێدایە. لە زستاندا چارۆکەش دەگرنەوه، ئەویش لە ئاوریشمی جۆراوجۆر و چوار ڕەنگی دەدووریّ. ئەم چارۆکانە جۆرێکن لە دەسماڵ و کراسی گەرمکەرەوەی بیّ قۆڵ و لەبەر گەردندا گریّ دەدریّ و لەدواشەوە تا دەگاتە خوار هەردوو ڕەفیسکەوە بەسەر پشتدا شۆڕدەبێتەوە. چارۆکە بەتەنیا بەکراس دانانریّ، بەڵکو لە ڕۆژانی جەژن و ئاهەنگدا، لەجیاتی ئەمە، سەڵتە لەبەردەکریّ. لەبەرکردنی ئەم سەڵتەیە ــ بنش ــ ەش لە تورك و ئێرانەوە وەرگیراوە. لەبەرئەوە سەڵتەیان لا شیاوترە، وەك لە چارۆکە، چونکە چارۆکە هەر بەجلێکی تایبەت بەکوردستان دەزانن.

ئافرەتی کورد ڕۆب لەبەر ناکەن. بەڵکو لە ڕۆژانی ساردا لەجیاتی ئەمە، کەوایەك، یان دوو کەوا لەسەریەك، لەبەردەکەن. سەروپێچی ئافرەتی کورد، ناتوانریّ بەتەواوی و بەوردیی باسکریّ، کە لە قوماشی ئاوریشمین، یان بەواتەیەکی تر هەمووی لە شاڵی ڕەنگاوڕەنگی وەك پەلکەزێڕینەیە و بەشێوەیەکی ڕێکوپێك و هونەریی لای ناوچەوانەوە ڕێکی دەخەن و بەجۆریّ بە دەرزی سنجاق ڕاگیری دەکەن، کە وەك تاج، یان بەواتەیەکی تر قۆچکەیەکی لیّ بێت، کە ئەوەندەی دوو پیّ، بەسەر سەرییەوە بەرز دەبێتەوە، بەڵام ئەملاولاکانی بەدیوی پشتەوەدا بۆ بەرپیّ بەردەدەنەوە. ئافرەتی دەوڵەمەندیشیان پێشی هەنییەیان بەلاگیرە و سەر پەرچەمی پان دەڕازێننەوە، کە وردە گەڵای زێڕیان پێدا شۆڕدەبێتەوە و لەملاولای فێستەکەشەوە ڕستێك شیلانی ئاڵی پێدا بەردەبێتەوە، ئەم ڕستە شیلانەش هەر بەلاگیرەکەوە بەندە. لەژێر ئەم سەروپێچەشەوە سەرپۆشێکی گەورە، کە پێی دەڵێن دەسماڵ، بەشان و ملیاندا دەیدەن و لەسەر سنگدا گریّ دەدریّ و بەشی دواوەی بەسەر پشتدا شۆڕدەبێتەوە. وەك بیستم ئەم دەسماڵە، هەر ژنەکانیان بەسەر شانیاندا دەدەن. قژیشیان لەپشتەوە زۆر دەرناخەن، بەڵام ئەگریجەیان بەملاولای لاجانگیاندا بەردەدەنەوە. ئافرەتە هەژارەکانی شارەکانیش لە جلوبەرگدا لاسایی خانمە خانەدانەکان دەکەنەوە. بەڵام ئافرەتە گوندنشینەکان هەر تەنیا کراس و ئاوەڵکراسی شینی ئەستوور لەبەردەکەن و لە کەمەریشدا پشتێنی لەسەر دەبەستن. چارۆکەشیان لە قوماشێکی شینی تێر دروست دەکەن، کە دامێن و پەراوێزەکەی میل میلی سپی تێدایە و لەسەرەوە لەسەر سنگیان گرێی دەدەن. کڵاوی سەریشیان فێستێکی بچووکە.

سەروپێچی ژنەکانیان زۆر قورسە و تاڕادەیەکیش ئازارێکی زۆری پێوە دەکێشن، زۆرجاریش قژی تەوقەسەریان پێوە دەڕووتێتەوە. لەو شتانەش کە بەگران بڕوایان پێدەکریّ، ئەوەیە بەم سەروپێچانەشەوە دەخەون و سەرینی بچووك دەخەنە ژێر سەریان و زێڕ و

خشڵیشیان کەمە. بەلای زۆریشەوە بریتییە لە زێڕ و مەرجان. بەڵام ئافرەتی چینی ڕەشۆکی، دراوی زیو و پارچە مەعدەنی بچووك و مووروو بەسەروپێچەکانیانەوە دادەدوورن.

جلوبەرگی پیاوانەشیان، لەڕووی کوتاڵ و شێوەی دروستکردنییەوە، زۆر لەشێوەی جلوبەرگی تورکی دەچێ. جگە لە میریش بەشێکی کەمیان چۆغە، یان سەڵتە (بنش) و(٢٣٥)جبەی لە شاڵی ئەنقەرەیی دروستکراو، لەبەر دەکەن. جلی ئاسایی سەرەوەیان وەك (عەنتەری)(٢٣٦)، یان وەك کراسی ژێرەوە دەدوورێ و لەبەر گردندا دووگمەی لێدەدرێ، بەڵام هەر وا دەیهێڵنەوە و دایناخەن. ئەمە لە قوماشی ئاوریشمی گوڵدار، یان خەت خەت دروست دەکرێ و لە زستاندا لەجیاتی ئەمە، سەڵتە (لبادە) لەبەردەکەن و پشتێنیشی لەسەر دەبەستن، ئاوەزوونەکەی لە زێڕ، یان لە زیو دروست دەکرێ و بە بەردی (لاجیوەرد)(٢٣٧) دەیڕازێننەوە و لەسەروو هەموو ئەمانەشەوە ئەو عەبا ئاساییە لەبەردەکەن کە شێوەکەیمان لەبەرچاوە. ئەوەش کە بەتایبەتی کورد جیا دەکاتەوە، مێزەرەکەیەتی و بریتییە لە پارچە قوماشێکی ئاوریشمی سفتی ڕەنگاوڕەنگی سوور و زەرد و شین(٢٣٨)، کە سیمی زێڕ و زیویان تێکەڵە و ئەم مێزەرە بەجۆرێ دەبەستن، پێشی هەنییەیان بەدەرەوەبێ. هەنییەی کورد زۆرجوان و جوامێرانەیە، هەر لە قوماشی مێزەرەکەی خۆی، گوڵنکە و ڕیشووی ڕەنگینی چنراو، بەسەر شان و ملیاندا شۆڕدەبێتەوە، کە ئەمەیان دیمەنێکی نائاسایی دەهێنێتە بەرچاو، باس ناکرێ، بەتایبەتی ئەوکاتانەی بەسەر ولاخەوەن و لۆقەی پێدەکەن. ئەو هەندە کەمەشیان کە جاروبار شاڵی کشمیری لەبەردەکەن، بەشێوەیەك دەیدەن بەسەر شانیاندا، بەسەر پشت و ئەملاولای شانیاندا شۆڕدەبێتەوە. تێکڕاش هەموو وەکو ئەوروپایی پێڵاوی

---

٢٣٥- بنش: سەڵتەی سەرەوەیە و جبەش کەوای ژێرەوەیە. هەردوو وشەکەش تورکین. پەراوێزەکە دوایی هات ـــ بنش: بەرامبەرەکەی لە ئینگلیزیدا (Riding coat)ە و بەرگێکی ڕەسمییە و کاتی خۆی تورکەکان لەکاتی سواریدا لەبەریان دەکرد، هەروەها بەو جبە پانوپۆڕەش دەڵێن، کە زانایانی ئایینی لە هەندێ بۆنەدا لەبەری دەکەن-ع.

٢٣٦- عەنتەری: ئەم وشەیە، لە وشەی (ئانتاری) تورکییەوە وەرگیراوە و لە عێراقدا بەرامبەر ئەمە (دیزداشە)یە و لە میسریش (جلابیە)یە ـــ ع. لە کوردیشدا کراسی ئاودامانی پێدەڵێن. (م)

٢٣٧- لاجیوەرد: بەردێکی شینە، ئەلەمنیوم و مەگنیوسیوم و ئاسن و فوسفوری تێدایە -القاموس العلمی- ص ١٤٥ -کمال جلال غریب-م.

٢٣٨- لای ژنان و پیاوانی کورد، ڕەنگی ئاڵ و والا و زەق، پەسەندن بۆ لەبەرکردن.

قەیتاندار لە پێ دەکەن، کە یان ڕەنگی ڕەشە، یان زەردە و گوڵنکەی پێوەیە. هەندێکیشیان کڵاش لەپێ دەکەن، کە لە ئێران دیبووم، پێم وایە هەر لەو ناوچانەشەوە دەیانهێنن.

بەڵام لادێیی و خێڵەکیی هەژار، کراسی ئاودامان (عەنتەری) لەبەردەکەن و لە سەروو ئەمیشەوە کەوایەك لەبەردەکەن، لە شاڵێکی ئەستوور دروست دەکرێ و یەخەکەی کراوەیە و لە کەمەردا قایشێکی ئاوەزوون مسی لەسەر دەبەستن. ئەم کەوایە لە خوار پشتێنەکەوە بەیەکەوەی نادوورن و هەروا بەهەڵدڕاویی لە شێوەی چمك و لۆی پاڵتۆدا، دوو چمکی دواوە و ئەو دوانەکەی تری لەپێشەوە دەهێڵنەوە. ڕەنگی ئاسایی ئەم کەوایانە، سپی یان بۆر، بەڵام بەرۆك و سەرقۆڵەکانی بەدەزووی ڕەنگاوڕەنگ پەراوێزی بۆ دەچنرێ. مێزەرەکانیشیان لە قوماشێکی لۆکەی ئەستوورە و ڕەنگی سوورێکی تۆخە، چواردەوری بەڕەنگی شین دەچنرێ. ئاساییەکانیشیان عەبا بەسەر شاندا دەدەن. ئەوەشی نەتوانێ عەبا بکڕێ، یان پێی گەرم نەبێتەوە، لەجیاتی ئەوە، کەوڵە بزنێك، یان عەبایەکی خوری چنی ئەستوور و ڕەنگ تۆخ، لەبەردەکەن.

(کەپەنگ)یش(**٢٣٩**)کە لە لبادی سپی و ئاسایی، یان لە کەوڵێکی کورتی بزن دروست دەکرێ، بەرگێکی ترە و هونەری تێدا نییە و لەو جلوبەرگانەیە کە ئاسایی لەسەرەوە لەبەردەکرێن.

کورد، بەهەموو چینەکانییەوە، هەژار و دەوڵەمەندیان، گەورە و بچووکیان خەنجەر هەڵدەگرن. سەرباری جافەکان و خێڵی تر، جگە لە چەکەکەی خۆیان (مێکوت)یشیان هەیە، کە دارێکی درێژە و سەرێکی ئاسنی پێوەیە. کەوابوو خەنجەر و گورز و شمشێر و مەتاڵێکی بچووك، کە دەیخەنە سەر شانیدان، بریتین لە چەکی کوردێکی پیادەڕەو. بەڵام سوار، جگە لەم چەکانە نێزەشی پێیە و دەمانچەش بەشانیدا هەڵدەواسێ، هەر کەسێکیشیان بتوانێ لەکاتی جەنگدا بەرگێکی زرێ و کڵاوێکی ئاسنیش هەڵدەگرێ و پیادەکانیشیان وەك شتێکی ئاسایی تفەنگی درێژ و قورس هەڵدەگرن کە شتێکیان بۆ کراوە، وەك قاچ، تا لەکاتی تەقاندندا لەسەری دابنرێ.

هۆزی (شینکی) زۆربەیان سەربازی پیادەن و زۆر بە ئەنگێویش ناویان دەبرێ. جافیش بەشی خۆیان لە سەربازی پیادەدا هەیە، بەڵام زۆر پشت بەو سەربازە خێڵاتیانە نابەسترێ، کە

**٢٣٩**- کەپەنك: ئەمە پاڵتۆیەکی لبادە، شوان لەبەری دەکات، بەڵام ئەگەر لەشێوەی سەڵتەی بێ قۆڵدا بوو، پێی دەوترێ: (کوڵەباڵ). کەچی سەیرە، ئێستا لە کوردستانی خۆرهەڵاتدا پێی دەوترێ: فەرەنجی ـــ ع.

له ناوچەکانی خۆیانەوە دوورن، یان بە وتەی تر، لە جەنگدا پشت بەوانە نابەسترێ، کە بەرژەوەندی تایبەتی خۆیانی تێدا نییە.

## ٤ی تشرینی یەکەم

ئەم بەیانییە پیاوێك لە (دارشمانە)ەوە هاتبوو، عومەرئاغاش کە دەیزانی ئارەزووی بیستن و دیتنی شتی سەیرم هەیە و حەزدەکەم کۆیان بکەمەوە. بەپەلە چووبوو. کابرای دیبوو، بەڵێنی بەمنیش دا سبەینێ بۆمی بێنێ و لەو سەرگورشتە ڕۆمانتیکییە سەیرە بگەم، کە پێوەندی بە بنەچەی بنەماڵەی بابانەوە هەیە.

پێشەکی دەبێ ئەوە بزانین کە (دارشمانە) گوندێکی بچووکە لە (پشدەر) و کاتی خۆی مەڵبەندی بابانەکان بووە و دانیشتووانی ئێستای گوندەکە هەموویان لەو بنەماڵەیەن، یان بەواتەیەکی تر بنەماڵەی بابانیی لەوانن و شانازیشی پێوە دەکەن، چونکە ناوبەناو هەندێکیان سەردانی سلێمانی دەکەن و ئەوڕەحمان پاشاش پێشوازی ئەم ئامۆزایانەی خۆی دەکات و لە گەڕانەوەشیاندا ئەو دیاری و پێویستیانەیان دەداتێ کە لەگەڵ گوزەرانیاندا دەگونجێ و ئاتاجیان پێیەتی. ئەوانیش بەپێی ئەوەی لقە سەرەکییەکەی خێزانەکەن، بێ پەردە دەچنە لای و لەگەڵی دادەنیشن. لەبەرئەوە زۆرجار دەبینیت لادێییەك لە گوندەکەی خۆیەوە شۆڕدەبێتەوە و گوێدرێژێکی پێش خۆی داوە و بەرەو سلێمانی دێت و ڕوودەکاتە لای میر. میریش پێش ئەوەی  فەرمووی لێ بکات، خۆی دەچێتە تەنیشتییەوە و قەننەیەکی کورتی پیس دەردەهێنێ و دایدەگرێتەوە. پاشان خۆی قەننەکەی دادەگیرسێنێ و پاش ئەوەی مژێکی لێدەدات، دەڵێ: ئێ، ئامۆزا، پێم بڵێ حاڵت چۆنە؟ و... با بگەڕێینەوە بۆ سەرگورشتەکە:

لە دارشمانە، دووبرا هەبوون، ناویان فەقێ ئەحمەد و خدر بووە. ئەمانە دەردەسەرییەکی زۆریان بەدەست ئەو بڵباسانەوە چەشتووە، کە کاتی خۆی لە پشدەردا بەدەسەڵاتترین خێڵ بوون. فەقێ ئەحمەدیان ئازا و کارامە بووە و بەتووڕەیی گوندەکەی جێدەهێڵێ و سوێند دەخوات تا دەسەڵاتی ئەوەی نەبێ تۆڵەی خۆی بکاتەوە، نەگەڕێتەوە.

چۆتە ئەستەموولْ و لە دامودەسگای میریدا خۆی دامەزراندووە. ڕێکەوتە سەیرەکانیش وا بووە سوڵتان لەگەڵ فەرەنگەکاندا لە جەنگدا بووە. کابرای سەرگورشتە گێڕەوە وتی ئەم فەرەنگانە ئینگلیزن. لەو کاتەشدا جەنگ لە شێوەی زۆران و دەستەویەخەدا بووە، بۆیە جارێکیان پاڵەوانێکی فەرەنگیی هاتۆتە مەیدانەوە و ماوەی پێنج ڕۆژ، زۆرانی لەگەڵ

ئازاترین سوارەی تورکدا گرتووە و یەکەیەکە هەموویانی بەزاندووە و کوشتوونی. ئیتر فەقێ ئەحمەد داوا دەکات زۆران لەگەڵ ئەم پاڵەوانە بوێرەدا بگرێ. سوڵتانیش بەشوێنیدا دەنێرێ و لێی دەپرسێ خەڵکی کوێیە، دوای ئەوەی بە سەروسیمای قایل دەبێ، ڕێگای دەدا زۆرانەکە بگرێ و ئەسپێك و هەموو پێویستی دەداتێ، ئەویش دەچێتە مەیدانەوە و کابرای فەرەنگیی دەبەزێنێ و کاتێ دادەبەزێ، سوارە بەزیوەکە سەرببڕێ، دەبینێ دوژمنەکەی کچە و دەست دەکات بەتکاوپاڕانەوە لێی و پەیمانی دەداتێ ئەگەر نەیکوژێ، شووی پێ بکات. ئیتر وەك بەڵگەیەکی سەرکەوتن لەگەڵ خۆیدا دەیبات بۆ ناو هۆردووی تورك و لەوێ سوڵتان پێی دەڵێ حەز لە چ پاداشتێك دەکەیت بەرامبەر بەم کارەت بتدەمێ؟ ئەویش تکای لێدەکات نازناوی (بەگ)ی پێببەخشێ و لە گوندەکەی دایبنێ و موڵکی گوندەکەی و دارشمانەشی بۆ هەمیشە بداتێ، کە ئەمە داوایەکی بچووك و چاوتێرانەیە، یان کورت بین بووە، چونکە هەر بەڕاستی ئەگەر داوای هەموو کوردستانیشی بکردایە، بێ سێ و دوو دەیدایە. ئیتر دوای ئەوەی تەواو بەو دەستکەوتانەی قایل دەبێ بە دەوڵەمەندیی و شانازییەوە لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بۆ نیشتمانەکەی خۆی دەگەڕێتەوە . خواش دوو کوڕیان پێدەبەخشێت، کە باباسلێمان و (بوداخ کێخان)ن. لێرەدا دەبێ ئەوەش بڵێم کە کچەکە ناوی (کەیخان) بووە. دوای ئەمە فەقێ ئەحمەد دەکەوێتە بەربەرەکانییەکی بەردەوامی بڵباسەکان و دەسەڵاتیان لێ وەردەگرێتەوە و پلەوپایەشیان زۆر دادەبەزێنێ.

ڕۆژێك لە ڕۆژان فەقێ ئەحمەد لەوێ نابێ و چوارسەد، پێنج سەد بڵباسیی بەسەریاندا دەدەن و (کەیخان)یش سواری ئەسپەکەی دەبێ و هەموویان پەرشوبڵاو دەکاتەوە و ژمارەیەکی زۆریشیان لێ دەکوژێ. ئەوسا بانگی خەڵکی دارشمانە دەکات و پێیان دەڵێ: هۆ پیاوگەلی دارشمانە، کاتی خۆی فەقێ ئەحمەد ژیانی پێبەخشیمەوە و من لەدەست ئەودابووم و هەر چاوەڕێی ئەو ڕۆژە بووم چاکەکەی بدەمەوە، ئەمەش هەموو ئاوات و چاوەڕوانیم بوو. ئێستەش ئێوە هەرچیتان بەچاوی خۆتان دیوە، بۆ فەقێ ئەحمەدی بگێڕنەوە، چونکە من بۆ جێگایەك دەچم ، کە جارێکی تر چاوم پێی ناکەوێتەوە، پێیشی بڵێن تکا دەکەم بەدوامدا نەگەڕێ، چونکە دادی نادات، ئەگەر واش نەکات، ئازاری پێ دەگەیەنم، کە خوا ئاگای لێیە حەز بەوە ناکەم. ئەمەی وت و جڵەوی ئەسپەکەی وەرسووڕاند و ئاوزەنگی لێدا و دەستبەجێ لە چاوگوم بوو.

کە فەقێ ئەحمەد دەگەڕێتەوە، سەری لە ڕووداوەکە سووڕدەمێنێ، هەرچەندە چاوەڕێشی دەکرد ئەمە ڕووبدات، بەڵام بۆ ئەو لەدەست چوونەی (کەیخان) خەم دایدەگرێ. سەرەڕای

ئەوەش کە وتوویەتی شوێنم نەکەوێ، بڕیار دەدا هەر شوێنی بکەوێ. ئیتر شوێنی دەکەوێ و لە دۆڵی (خەردان)٢٤٠ تووشی دەبێ، تکای لێدەکات بگەڕێتەوە. ئەویش پێی دەڵێ شتی وا نەبووە و نابێ، چونکە تۆ موسڵمانیت و من فەرەنگیی و دەچمەوە بۆ نیشتمانی باووباپیرانم. لەبەرئەوە تکات لێدەکەم نزیکم مەبەرەوە، ئەگینا ئازارت دەدەم و ماڵاوا.

بەڵام فەقێ ئەحمەدی شەیدا، هەر سوور دەبێ لەسەر شوێنکەوتنی. ئەویش نێزەکەی بەرزدەکاتەوە و دەیدا لە شانی و دەکەوێ و ژنەش بۆی دەردەچێ. ئیتر ئەوەندە دوورناکەوێتەوە، کە هەست دەکات بەرامبەر ئەو دڵنەرمییەی ئەو، کاتێ ژیانی لەناو دەستیدابوو، ئەم دڵڕەقیی لەگەڵ نواندووە، جگەلەوە ئەگەرچی مێردەکەی موسڵمانیشە، لەهەمان کاتیشدا باوکی منداڵەکانێتی، لەبەرئەوە بەزەیی پێدادێتەوە و دەگەڕێتەوە سەری. دەبینێ هێشتا زیندووە. ئەویش هەتوانێکی بەهێز لە زامەکەی دەدا و ترسی مردنی لێ دوور دەخاتەوە و پێویستییەکانی چارەسەرەکەیشی بۆ جێدەهێڵێ و دەڕوات.

بەڵام مێردەی ئازا و ئەویندار، دوای ئەوەی زامەکەی گۆشتەوزوون دەبێتەوە و چاك دەبێتەوە، ئارامی لەبەردەبڕێ بۆ ئەوهەڵوێستە ڕەقەی هاوسەرەکەی لەگەڵیدا کردووە. بۆیە شوێنی دەکەوێ تا دەگاتە فەرەنگستان. لەوێ لە ئێوارەیەکدا ڕێی دەکەوێتە شارێکی گەورە و لە (مەهتەرخانە) گوێی لە دەنگی بەزم و گۆرانی دەبێ و مۆزیك دەژەنرێ و چراش هەڵکراوە و ئەوشتە ئاساییانەش ئامادەکراوە، کە بۆ ئاهەنگ و زەماوەند (گوی)(٢٤١) ساز دەکرێ...

ماوەیەك دادەمێنێ و مینەی شوێنێك دەکات شەوی تێدا بەسەربەرێ، تا لەدواییدا بڕیار دەدات خۆی بداتە دەست قەدەر و ئەسپەکەی لە کوێ ڕاوەستا، لەوێ دابەزێ ئیتر جڵەوی بۆ شل دەکات و بەرێکەوت لەبەر دەرگای پیرەژنێکدا ڕادەوەستێ. ئەویش میوانداریێتی دەکات و دوای ئەوەی هەندێ سێ و دووی دڵی خۆی دەکات، هەواڵی ئەو ئاهەنگەی لێ دەپرسێ کە دیوێتی، ئەویش دەڵێ: کچە شازادە، لە جەنگی موسڵمانەکان گەڕاوەتەوە و ئێستا دەیدەن بە ئامۆزای خۆی.

---

٢٤٠- خەردان: وەرگێڕ ئەم ناوەی بۆ ساغ نەکراوەتەوە - ع.

سەرنج: ڕەنگە مەبەست لە دۆڵی (خدران) بێت، کە لە گوێ (زێی بچووك)ە و بەرامبەر ناحیەی (بنگرد)ە، لە دامێنی چیای (کۆسرەت) لە قەڵەمڕەوی دێرینەی بنەماڵەی بابان دایە ـــ م.

٢٤١- گوی: وشەیەکی تورکییە و بە مانای شایی دێت.

فەقێ ئەحمەدیش تکا لە پیرەژن دەکات کارێ بکات ڕێی بدەن بۆ سەیری زەماوەندەکە بچێت. پیرەژنە ڕازی دەبێت، بە مەرجێ جلی ژنانە لەبەر بکات. بەمجۆرە توانیبووی لە یەکەم دیدەنی (کەیخان)ی شۆخ و مێردەی خۆ تەیارکردوودا، خۆی بگەیەنێتە نزیکیان.

ئا لەم کاتەدا کە کچە شازادە دەچێتە بەردەم مێردەکەی، مێردەی دڵڕەقیش کوتوپڕ شەقازلەیەك بەبنا گوێیدا دەدا و پێی دەڵێ: تۆ هەر ئەوە نەبوویت لای موسڵمانەکان دیل بوویت؟ ئەی تۆ ئابڕووت نەتکاوە؟ چۆن زات دەکەیت خۆتم نیشان دەدەیت؟ بووکیش لەتاو ئازاری شەقازلەکە و چونکە چاکیش فێری کوردی بووە، بەکوردی هاوار دەکات: (ئای فەقێ ئەحمەد، لە کوێت بهێنم؟).

لەم هەلەدا فەقێ ئەحمەد دەردەپەڕێ و زاوای دڵڕەق دەکوژێ و لەگەڵ بووکە شەنگەکەیدا دەگەڕێتەوە ئەستەموولْ و لەوێ سوڵتان لەجاری پێشوو زیاتر خەڵاتی دەکات...

ئەمجارەش فەقێ ئەحمەد و بووکە هۆگرەکەی بۆ پشدەر دەگەڕێنەوە و تامردن پێکەوە بەخۆشی و کامەرانیی بەسەری دەبەن. لەپێش مردنیشیدا دەستی بەسەر ناوچەکانی پشدەر و مەرگە و ماوەت دا گرتووە. لە دوای خۆیشی (بابا سلێمان)ی، کوڕە گەورەی (کە باپیرەگەورەی میرەکانی ئێستای سلێمانییە)، لەجێی دانیشتووە. ئەمیش پاشماوەی پارچەکانی تری کوردستانی داگیرکردووە و تا ئێستاش لەژێر دەسەڵاتیاندایە. بەڵام (بوداخ کەیخان)ی کوڕی دووەمی بە وەجاخ کوێریی سەری ناوەتەوە.

پوختەی هەندێ شتی ئەم سەرگوزشتەیەم بیست و پێشتریش میر، بەشێوەیەکی ئاڵۆز، هەر بۆی گێڕابوومەوە و شانازیشی بەوەوە دەکرد کە وەچەی (کەیخان)ی ئەورووپاییە و پێشی وتم ڕەنگە بەدووری نەزانێ، بەخزم بەمن بگاتەوە. بەڵام ڕووداوەکەی بە ـــ باپیری بابا سلێمان ـــ ەوە بەستەوە. ژنانی بنەماڵەکەش هەمان سەرگوزشتەیان بەجۆرێکی نزیك لەم گێڕانەوەیەی ئێمە، بۆ هاوسەرەکەم گێڕابووەوە.

لەم سەرگوزشتەیەدا کە لە حیکایەتخوانەکەم بیستووە، بێ زیاد و کەم، وەکو خۆی نووسیمەوە. گیانی سوارچاکیی و جوامێرییەکی زۆری تێدایە. کە ئەمە شتێکە، بەلای کەمەوە تا ئێستاش خەڵکی خۆرهەڵات کەمتر گرنگییان پێداوە. ڕووداوەکەش خۆی لەخۆیدا لە جۆری بیرکردنەوەیانەوە زۆر دوورە. دیارە سەرگوزشتەکە ڕووداوی ڕاستی تێدایە و ڕەنگە لە ڕۆژگارێکی زۆر لەوە دوورتریشدا ڕوویدابێ، کە حیکایەتخوانەکە بۆمی دەستنیشان کرد. شتێکی باشیش دەبوو، یان جێی سەرسوڕمان دەبوو، ئەگەر بتوانرایە پێوەندییەك لەنێوان ئەم

ڕووداوە و سەرگورشتەکانی جوامێریی و سوارچاکیی ڕۆژگاری خاچپەرستان، یان ڕۆژگاری سەلاحەدینی ئەیوبی دا بدۆزرایەتەوە، چونکە سەلاحەدینیش هەر میرێکی کورد بوو. ڕێیشی تێناچێ حیکایەتخوانانی کورد، ئەوانەی جگە لە سولتانی ئەستەموولْ، ناتوانن سولتانێکی تر بهێننە پێش چاوی خۆیان، حەزدەکەن ئەمجۆرە سەرگورشتانەی شایستەن و ناوبانگیان هەیە، هەر بیلکێنن بە (بابا سلێمان)ی یەکەم باپیرە و پاڵەوانە خۆشەویستەکەیانەوە، کە لای ئەوان ژیانی ئاشکرایە و ئەوەندەش ناوبانگی هەیە، ئەمجۆرە بۆ هەڵبەستنانە بگرێتەخۆ...

من ئامادەم نموونەیەکی زۆر بخەمە ڕوو لەسەر ئەو ئاڵۆزییە، لە یەکچوانەی لەو ڕۆژگار و مێژووانەدا حیکایەتخوانانی خۆرهەڵات باسیان کردووە.

لە ئەنجامی تێبینی میر دا، کە خولیایەکی زۆری گوێ پێدانە مێژووی کوردم هەیە، ئەرکی کێشا و ناردی بەشوێن ئەحمەد بەگدا، کە پیاوێکی خانەدانی بنەماڵەکەیان بوو، وتیان تەمەنی (١٠٠) ساڵ دەبێ و چونکە مێژووی بەسەرهاتی بنەماڵەکەشی لەبەربوو، جێی ڕێز و نەوازشێکی زۆرە لەلایەن کەسوکار و نەوەکانی خۆیەوە. ئەم بەسەرهاتانەش ڕۆژ لەدوای ڕۆژ خەریکن لەناودەچن. هەرچەندە لەڕاستیدا هەندێکیان شایانی ئەوەن بپارێزرێن. ئەم پیرە بابانییە هێژایە ئێستا لە ناوچەی خۆیدا لە شارەزوور دەژی.

# بەشی یازدەهەم

دڵتەنگیی و خەمباریی میر ـ کوڕە گەورەکەی بەبارمتە بۆ کرماشان دەنێردرێ ـ نەخۆش کەوتنی کوڕە بچووکەکەی ـ ئاژاوە لە نێوان ئەندامانی بنەماڵەکەدا ـ ئەحمەد بەگی دارشمانەیی ـ هۆزەکانی ڕەواندز ـ شێوەی تەرم ناشتن لای کورد ـ بنەماڵەی بابانی ـ شەجەرەی میرانی بابان ـ مردنی کوڕە بچووکەکەی میر، بە ئاوڵە ـ دڵگیریی میر ـ سلێمان بەگ ـ بازرگانیی سلێمانی ـ ئاخاوتن لەگەڵ عوسمان بەگدا ـ ئارەزووی وازهێنانی میر، لە فەرمانداریێتی ـ عومەرئاغا، زیرەکیی و وردبینییەکەی ـ بەراورد لەنێوان کورد و تورك و ئێران دا ـ لوقمان ـ سەردانێك بۆ ماڵاوایی کردن لە میر ـ وتووێژی ئایینی ـ بانگهێشتنی عوسمان بەگ بۆ چوونە سەرکاری تازەی ـ ڕەتکردنەوەی بانگێشتنەکەی ـ سیماکانی ڕەوشتی کوردان ـ هەڵهاتنی دەروێش خالیدی گەورە ـ دوا سەردانی میر، لە میستەر ریچ ـ ئاخاوتنێکی شیرین ـ دڵتەنگیی میر، بەبۆنەی مردنی کوڕەکەیەوە ـ ڕەوشتی ـ ئامادەبوون بۆ دەرچوون لە کوردستان ـ خەمباریی بەهۆی جێهێشتنی خەڵکی کوردستان.

## ٧ی تشرینی یەکەم

ئەم بەیانییە سەردانی میرم کرد، بەڵام هەتا بڵێی مات و دڵتەنگ و خەمباربوو، دڵم زۆر بەو خەمباریی و دڵتەنگییەی سووتا، چونکە پێم ناخۆش بوو ئەو کابرا جوامێرە بە خەمباریی ببینم. سێ ڕۆژ لەمەوبەر ئەوڕەحمان بەگی کوڕیشی، کە حەوت ساڵانە بوو، بەبارمتە بۆ کرماشانی ناردبوو، کوڕە بچوکەکەشی لەو دواییەدا تووشی ئاوڵە ببوو، پشێویی و ئاژاوەیەکی ناخۆشیش لەناو خێزانەکەیدا بڵاوببووەوە. عوسمان بەگیش زۆر سەری کردە سەری بۆئەوەی بیجووڵێنێ و لەگەڵ مندا بیدوێنێ، بەڵام لەتاو باری خەمبارییەکەی، قسەکانی هەروا سەرزاریی بوون. ئەو (ئەحمەد بەگ)ەش کە میر لەبەر من بەشوێنیدا ناردبووی، تەمەنی لە نەوەد و دوو (٩٢) ساڵ تێپەڕی نەدەکرد، پیرێکی سەرو ڕوخسار جوان بوو، بەڵام بیرەوەری بەجۆرێك ئاڵۆزبوو، کە پرسیارێکت لێ بکردایە، زۆر بەگران وەڵامی ڕاستەوخۆی دەدایتەوە، چونکە دەبوایە چاوەڕێ بکەیت تا خۆی ئەو شتەی بیردەکەوێتەوە، ئەوسا خۆی دەستی بەقسە و گێڕانەوە دەکرد، ئیتر هەر لەوکاتانەدا دەتتوانی ئەوەی مەبەستتە، دەستگیرت ببێت. کە سەروسۆراخی منیشی زانی، لەپڕ وتی: (ئای، خۆ ئێمە خزمین و باپیرانیشمان هەر خزم بوون). بێگومان مەبەستی لە قسەکەش هەر سەرگورشتە ڕۆمانتیکییەکە بوو، سەرگورشتەکەی (کەیخان و فەقێ ئەحمەدی سەرکردەی کورد). بەڵام کە شتەکەم زیاتر بۆ ڕوونکردنەوە، پەشیمان بووەوە و کشایەوە.

میریش تێی گەیاندم کە بەدەم جووڵاندنییەوە هەندێ شتی قۆستۆتەوە و توانیوێتی ئەم زانیارییانەی لێ چنگ بکەوێ: بابا سلێمان بچووکترین دوازدە براکەی بووە و باوکیشی ناوی میرسلێمان بووە، بۆیە ناویان ناوە بابا سلێمان(٢٤٢)، چونکە پێش ئەوەی ئەم لە دایك بێت، باوکی کۆچی دوایی کردووە. ئەمیش دوای ئەوەی تورك و ئێرانییان لە دژی ئەم، یەکیان گرتووە، لە کوردستانی باشوور دەریان کردووە و لە (ڕەواندز)(٢٤٣) گیرساوەتەوە، لەوێ

٢٤٢- میر سلێمان: کوڕە گەورەی میر مەحموود، یان مەحموود بەگە، بەگی پشدەر بووە. لەبەرئەوە (بابا سلێمان) کوڕەزای ئەو میر مەحموودەیە، کە هەندێك کەس سەرگورشتە ڕۆمانتیکیەکەی دەدەنەپاڵ. زۆری تریش ئەمە بۆ سەردەمی زۆر پێش بابا سلێمان دەگێڕنەوە.

٢٤٣- ڕەواندز: قەڵای هۆزێکی سەربەخۆی کوردە و مستەفا بەگ فەرماندەیانە. ئەم قەڵایە کەوتۆتە سەر کێوی زۆر بەرزی کێوگەلی (زاگرۆس) و (زێ) لایەکیانی کەل کردووە. لایەکەی تریشی لە هەندێ گەلیی

هاوسەر و منداڵەکانی جێهێشتووە و ڕووی کردۆتە ئەستەمووڵ. ئەمەش لە ساڵی (١١١١ی کۆچی)دا(٢٤٤) بووە ــ

بیرەوەری ڕووداوەکە، یان مێژووەکەی لە چامەیەکدا باسکراوە، بۆ ئەو بوومەلەرزە گەورەیە وتراوە، کە لە (تەوریز) ڕوویداوە ــ ئیتر لە ئەستەمووڵ سەرنجی سوڵتان ڕادەکێشێ، بۆیە کراوەتە وەزیر، یان (پاشای بەیداخ سێ لو). لەوێش یان (بابا داخ)ی داگیرکردووە، یان تیایدا حاکم بووە. بابا داخیش هەر بەناوی ئەمەوە ناونراوە و هەر لەو ناوچانەش مردووە. ئەم ناوچانە لە کوردستانی باشووریش بەناوی (ناوچە)، یان مەڵبەندی شارەزوورەوە لەژێر دەسەڵاتی تورکدا بووە و کەرکووك پایتەختی ئەم مەڵبەندە بووە. ئەمە بە ماوەیەکی زۆر پێش ئەوەبووە کە بنەماڵەی بابانی دەسەڵاتی تێدا پەیدا بکات.. ئەوشتانەی قسەیان لێوەکرا، بیرەوەری زۆریانم سەلماند.

---

زیاتر، ڕێگەی وا نزیکی تێدانییە و بۆ بەرگری کردنیش زۆرچاك قایمکراوە. ڕەواندزییەکانیش ئەنگێو و کارامەن. چەند ساڵێك لەمەوبەر (عەباس میرزا) لەشکرێکی بۆ داگیرکردنیان نارده سەریان، بەڵام ناچاربوو بکشێتەوە و لەدوای خۆیشی تۆپەکانی بەجێ بهێڵێ. ئەم تۆپانە، تا ئێستاش لە قەڵای ڕەواندزن. پیاوگەلی ئەم هۆزە ڕەمەکیین، بەڵام کاروان بە سەلامەتی بەناوچەکەیاندا تێپەڕ دەبێ، ئەگەر باج بدەن. خێڵەکانی ڕەواندز، لە جلوبەرگدا لە خەڵکی ئامێدی دەچن و ئاخاوتنیشیان بە ئاخاوتنی (کۆیسنجاق) دەچێ.

تێبینی: زێی بچووك بەکێوەکانی ڕەواندزدا تێپەڕ نابێ. دیارە میستەر ڕیچ مەبەستی لەو کەلکردنە، گەلیی عەلی بەگە، کە لە ئەنجامی بوومەلەرزەیەکدا دروست بووە و مێژووەکەی نازانین. ئیتر ئاوەکەی بەو گەلییەدا ڕابووردووە، کە ئێستا پێی دەڵێن (ڕووباری ڕەواندز). ئەمیش لە (بێخمە)وە دەڕژێتە (زێ)وە ــ ع.

٢٤٤- واتە ساڵی (١٧٠٠ی زایین). کاتێکیش بمانەوێ ساڵی زایینی بۆ ساڵی کۆچیی بگێڕینەوە، نابێ بەتەنیا هەر ئەوەمان لەیادبێ کە مێژووی کۆچیی لە ١٥ی حوزەیرانی ٦٢٢ی زاییندا دەست پێدەکات، بەڵکو پێویستە بزانین کە ساڵی (ز) بریتییە لە ٣٦٥ ڕۆژ و شەش سەعات و یازدە دەقیقەیە. لەکاتێکدا ساڵی کۆچی، یان هەیڤی ٣٥٤ ڕۆژ و هەشت سەعات و هەشت دەقیقە. لەمەوە تێدەگەین کە ساڵێکی کۆچیی نییە، بەردەوام لەگەڵ هیچ ساڵێکی دیاریکراوی زایینیدا بەرامبەر بێت. ناشتوانین هیچ ساڵێکی زایینی بەهۆی ساڵی کۆچییەوە بزانین، ئەگەر ساڵەکەی تێپەڕبووبێ، تا ڕۆژی ئەو ساڵەش دیاری نەبێت. لەبەرئەوەی سەرەتای ساڵی کۆچی، بەپێی ئەو مەرجانە دەتوانرێ حساب بکرێ. ئەمەش هاوڕێیەك تێی گەیاندم ــ خاریچ.

ئەمڕۆ لەگەڵ میردا، کە باسی مێژووی کوردستانمان کرد، پێم بەجەرگی خۆمدانا و سەرسامیی خۆمم بۆ باسکرد، کە بۆچی ئاگاداری تەواوی مێژووی بنەماڵەکەیان نییە! بەنەزاکەت و سەنگینییەوە پێمی وت ئەو مێژووە شایانی نووسینەوە نییە، چونکە مێژووی بنەماڵەیەکی دەسەڵاتدار نییە، بەڵکو مێژووی خێڵێکی سادەیە. منیش پێم وت بەڵام بنەماڵەکەیان مێژوویەکی دووریان هەیە و شەرەفمەندن. وتی بنەماڵەکەیان زۆرکۆن نییە و ئەندامانی بنەماڵەکەشیان تەنیا سەدەیەك دەبێ بوونەتە میر و سەردار. منیش وتم لەوکاتەوە ئاگاداری زنجیرەی بنەماڵەکەیانم.

لەوەدەچوو قسەکەم جێگایەکی باشی لە دەروونیدا داگیرکردبێ، بۆیە یەکسەر گیانی خێڵچێتیی جووڵاو گەش بووەوە و ڕۆحی بەشێوەیەکی نائاسایی بووژایەوە. بۆ پیاوێکی وەك میریش کە خۆی بە ئاییندارێکی زۆرسادە و بچکۆلە دەزانێ، لەکاتی باسکردنی ئەمجۆرە شتانەدا هەرگیز خاڵی نەبوو لە شانازیی کردن بەسەربڵندیی ماڵبات و خۆ گییڤ کردنەوەوە.

دوای ئەوەش وتی: (جگە لە مێژووی پێغەمبەران و پیاوچاکان، ئەوەندەی بتوانم لە ڕۆژگار و گوزەرانیان بزانم، ئیتر زۆر تامەزرۆی مێژوو نیم و لە (شانامە) زیاتر، شتێکی لێ ناخوێنمەوە).

## ٩ی تشرینی یەکەم

ئەم ئێوارەیە عومەرئاغا دڵخۆشی کردم، کە بە لوولە کاغەزێکی درێژی پێچراوەوە خۆی بەلامدا کرد، کاغەزەکان وەك ئەو دوعایانە وابوون کە دەکرێنە مل، یان هەمیشە لە گیرفاندا هەڵدەگیرێن، ئەویش ئاوا لە دەفرێکی چەرمیندا بوو. لوولەکە بریتی بوو لە زنجیرەی ناوی میرانی بنەماڵەی بابان، هەر لە ڕۆژگاری میر سلێمانەوە تا ئەمڕۆمان. زۆریش بە بنەوەشیی سۆراخی کردبوو، تا لای کوردێك دۆزیبوویەوە، کە باپیرانی کردبوویان بە خوو، بەسەرهات و ڕووداو و مێژووی ڕوودانیشیان لەو لوولەیەدا تۆمار بکەن. ئەمیش هەر چاوی لەوان کردبوو. کاغەزەکان بە خەتی فارسی نووسرابوونەوە و ئەم کاغەزانە نرخێکی ئەوەندە گرانیان هەیە، نازانرێ چەندە، چونکە ئەوەندەی زانیباری تێدایە، ئەگەر بەختم یاربێ و بەشەکانی تری ئەو مێژووە بەکەڵکەم چنگ بکەوێ، دەبێتە ئەڵقەیەکی تەواوکەر، بۆ مێژووی کورد. دەمودەست دەستم کرد بەوەرگێڕانی ئەوەی لەم لوولە موشەمایەدا بووە(٢٤٥).

---

٢٤٥- بڕوانە: پاشکۆی سێیەم.

## ١٠ی تشرینی یەکەم

ئەمڕۆ عومەرئاغا هات بۆلام، کتێبێکی کۆنی بۆ هێنابووم، شیعری ئایینی پەرشوبڵاو و کورتەیەکیش لە (حساب- ماتماتیك) و پزیشککگەریی تێدابوو. خاوەنەکەی هەندێ بەسەرهات و مێژووی تێدا تۆمارکردبوو. منیش هەندێکیانم لێ چنی.

## 12ی تشرینی یەکەم

ئەمڕۆ کە بیستم (ئەحمەد بەگ ـــ کوڕی دووەمی میر)، بە ئاوڵە مردووە، زۆرم پێ ناخۆش بوو، بەڕاستی منالێکی ڕووخۆش بوو، زۆریش هۆگرمان ببوو... (میستەر بەل)یش تەقەللای زۆر لەگەڵ داو دووجاریش سەردانی کرد، بەڵام نەیتوانیبوو دایك و باوکی ڕازی بکات تا دەرمانی بدەنێ، یان لە جێگایەکی فێنکدا دایبنێن، هەرچەندە لەدواییدا کەمێك لە ڕاسپێرییەکانی میستەر (بەل)یان بەجێگەیاندبوو، سەلماندبووشیان کە هەموو ئامۆژگارییەکانی بەکەڵك بوون و کارێکی باشیان کردبۆوە سەر تەندروستی منالەکە.

میر زۆر خەمگین و لێو بەباربوو. کوردیش هەموویان زۆر بەتەنگ ژن و منداڵیانەوەن. هەر بەڕاستیش منداڵەکانیان لەوپەڕی شلکیی و جوانیدان. بەڵام تورك گوێ نادەنە هیچیان(٢٤٦).

بەهیوابووم بۆ دیتنی شارەزوور، سەردانێکی ئەو ناوچەیە بکەم لەم وڵاتە، کە گرینگترین ناوچەی کوردستانە لە ڕووی شوێنەواری کۆنینەوە، بەڵام لەبەر نەخۆش کەوتنی کوڕەکەی میر، سەردانەکەم دواخستبوو. میریش زۆری پێزانی کە لەبەر خاتری ئەو، دوام خست، دوای ئەم مۆرە بەسەرداهاتن و دواکەوتنە، ئێستا ئیتر دەبێ خۆمان بۆ سەفەری بەرەو مووسڵ ساز بکەین.

---

٢٤٦- بەڵگەی تریش، هەر لەو بەڵگانەی ئەم قسەیە بسەلمێنێ، ئەم چەند دێڕەیە، کە لە یادداشتی تری میستەر ڕیچەوە وەرگیراوە: (پێش چەند ڕۆژێ ـــ دیوان ئەفەندی) سەردانێکی کردم و لەگەڵ قسەکانیدا زۆر بەشێنەیی باسی ئەوەی بۆکردم کە منداڵەکەی خۆی ناشتووە و منداڵەکەیشی خۆشەویست و ساڵەوەختینە بووە، چونکە وتی: (ئەم بەیانییە چووم و منداڵەکەمم ناشت و دواییش چووم بۆ دیوان.) ئەمەی زۆر بەبێ دەربەستی و جۆرێك وت، وەك ئەوەی شتەکە پێوەندی بەوەوە نەبێت ـــ خاریچ.

## 14ی تشرینی یەکەم

ئەمڕۆ چووم بۆ سەرەخۆشیی کردن لە میر. ئەمەش ئەوەندە ئەرکێکی برایانە و پێویست بوو، ئەوەندەش بەلامەوە گران بوو. چونکە هەرچەندە میر زۆر بە مەردانە دەیویست دڵتەنگی خۆی بشارێتەوە، بەڵام ئاشکرا دیاربوو جەرگی ژانی دەکرد. منیش پێم ستەم بوو هاوبەشی خەمی نەکەم و خۆمیش بۆ تاوێك وا هەست نەکەم کە منداڵێکم مردووە و جەرگم سووتاوە. لەهیچ وڵاتێکیشدا پیاوێکی قورس و هەست ناسکی وەك میرم نەدیبوو، کە ئەوەندەی ژن و منداڵەکانی خۆی خۆش بوێ و بەتەنگییانەوە بێ و لەم ڕووەوە وێنەی نییە، مەگەر هەر پیاوە چاکەکانی ئەوروپا تامی ئەم پیاوە بدەن. شتێکی وەك ئەبڵەق بوون و ڕامانی ترسناك هەموو گیانی داگرتبووەوە. منیش کە ماڵاوایی لێکرد، لەژێر باری خەمدا دەیناڵاند.

کە بۆ سەردانی عوسمان بەگ چووم، لەو کۆشکەدا دانیشتبوو، کە هێشتا تەواو نەببوو. خەریکی وێرد و سەڵەوات خوێندن بوو، بە تەسبیحەکەیشی تەسبیحاتی دەکرد و نیشانەی ئەوەشی بەڕووەوە دیاربوو کە لە ناخییەوەیەتی. بەئاشکراش دیاربوو هەندێ ئیشوکار سەرقاڵیان کردبوو، بەڵام هەمووی مایەی خەم نەبوون. باسی کەمانچەیەکی بۆکردم، پێشتر خۆم بەدیاری دابوومێ. تکایشی لێکردم کە بیرم نەچێ ژێیەکانی بۆ بکڕم... جیاوازییەکی زۆر لەنێوان ئەم و میردا هەیە.

دوای نیوەڕۆ بۆ سەرەخۆشیی سلێمان بەگ چووم. ئەگەرچی لەچاو میردا هێمنتر و بەهیمەتتربوو، بەڵام دڵتەنگییەکەی ئەمیش لەو کەمتر نەبوو. لەبەرئەوە زۆر ڕێزی هەست و هیمەتیم دەگرت. لە ڕاستیدا ئەمیش لاوێکە، شایستەی ڕێزگرتنە. سەنگینییەکەیشی لەگەڵ تەمەنیدا دەگونجێ. زۆریش پابەندی پیاوانی ئایینی و دەروێشانە، لەم پابەندییەشدا زۆر وشك و دەمارگیر نەبوو، شێوەیشی ئەوەندەی لە ئەوڕەحمان پاشا دەچوو، ئەوەندە لە دوو براکەی تری نەدەچوو، چونکە لە هەردووکیان کەڵەگەتتر و بەخۆوەترە و چاوەشینە جوانەکانیشی، دیمەنی نەزاکەت و دڵنیایی بەڕوخساری دەدەن. هەتا زیاتر دەمدی، زیاترم خۆشدەویست، زیاتریش هۆگری دەبووم. کە باسی ئەوەم کرد بەنیازم بەم نزیکانە بڕۆم و کوردستان جێ بهێڵم، هەستم کرد ئەویش و کوردەکانی تریش پێیان ناخۆشە، هەمووشیان لەگەڵمدا هەوڵیاندا، تا بەڵێنیان بدەمێ کە ساڵی داهاتوو سەر لە نیشتمانەکەیان بدەمەوە. منیش بەڕاستی و لە ناخەوە هەرچەندە ئەوەم بەبیردا دێت کە ئەم خەڵکە دڵسۆزانە بەجێ دەهێڵم، خەم دامدەگرێ و وا بەبیرمدا دێت کە ئیتر جارێکی تر نایانبینمەوە، وا هەست دەکەم

ماوەیەکی زۆرم دەوێ تا بەختم دەکرێتەوە و دەکەومەوە ناو کەسانێکی واوە، بۆ هەرکوێ بچم و بمێنمەوە، بەوپەڕی دڵنەرمییەوە، توانای خۆیان دەخەنە گەڕ بۆ خۆشیی و نەوازش و خۆشگوزەرانیم.

**١٥ی تشرینی یەکەم**

بازرگانیی سلێمانی، بارزگانییەکی بەربڵاو نەبوو، چونکە بەشێوەیەکی گشتی تایبەت بوو بەنێوانی سلێمانی و ئەو جێگایانەی ناویان لە خوارەوە نووسراوە و بەهۆی کاروانەوە دەگوێزرێتەوە:

تەورێز: ــ هەر بە مانگی جارێك کاروانێك بەرەو تەورێز دەچێ، بەڵام ئەمە بەرێکوپێکی نییە. لەوسەریشەوە ئاوریشمی خاو و شتی تر دێننەوە. ئاوریشمە خاوەکە بۆ بەغدا دەنێردرێ و ئاوریشمەکەش هەر لە کوردستان بەکار دەبرێ. ئەوشتانەش کە لە سلێمانی یەوە بۆ تەورێز ڕەوانە دەکرێ، بریتین لە خورما، قاوەو ئەو شتانەی تر، کە لە بەغداوە دێن.

ئەرزەرۆم: ــ بەلای کەمەوە ساڵانە، کاروانێك لە سلێمانی یەوە بۆ ئەرزرۆم دەچێ، کە خورما و قاوە و شتی تر دەبات و لەوێشەوە ئاسن و مس و هێستر دێننەوە، کە ژمارەیەکی زۆر لەم وڵاخانە دەکڕن و دەیهێنن و چاکترین وڵاخی ئەم ناوچانەش هەر ئەوانەن کە لە ئەرزەرۆم دەیانکڕن.

هەمەدان و سنە: لەم دوو شارەوە، مانگی کاروانێك دێت و لەگەڵ خۆیاندا ڕۆن و میوەی وشك و هەنگوین دێنن. هەروەها لە دەوروبەری زەریای قەزوین پۆڵا دەهێنن.

کەرکووك: ــ بازرگانیی لەگەڵ کەرکووکدا هەمیشە بەردەوامە و لەوێوە پێڵاو و هەندێ کوتاڵی لۆکەی ئەستوور دەهێنن، لە سلێمانیشەوە نیسك، نۆك، ماش، پاقلە، هەنگوین، ترش، میوە، برنج، ڕۆن، لۆکە، مەڕوماڵات و مازوو بۆ ئەوێ دەنێرن.

مووسڵ: ـ لەگەڵ مووسڵیشدا بازرگانیی بەشێوەیەك لە شێوەکان بەردەوامە. لەوێوە پێڵاو، غوترە، خام(٢٤٧)، کوتاڵی هەمەڕەنگە و بەرهەم هێنراوی شام و دیاربەکر و شوێنی تریش دەهێنن، لە سلێمانیشەوە مازوو و شتی تری بۆ دەچێ.

بەغدا: ــ بازرگانیی لەگەڵ بەغدادا هەمیشە بەردەوامە. لە بەغداوە خورما و قاوە، کوتاڵ و بەرهەم هێنراوی هیندستان و ئەوروپا دێت، لە سلێمانیشەوە پاقلە، نیسك، نۆك، ماش، توتن، پەنیر، ترش، کەتیرە و سابوونی ئاسایی ــ سابوونی پیو بۆ بەغدا دەچێ.

---

٢٤٧- غوترە: جۆرە قوماشێکی سپی و تەنکە، زۆرتر پیاوانی ئایینی بەسەریانەوە دەیبەستن ــ م.

## ١٦ی تشرینی یەکەم

ئەم ئێوارەیە عوسمان بەگ هات بۆلام، ماوەی دوو سەعات لام دانیشت باسێکی زۆری کاروباری نیشتمانەکەی بۆ کردم و نهێنییەکی تایبەتی لا درکاندم و تکای لێکردم بیپارێزم. ئەویش ئەوەیە کە میر بیر لەوە دەکاتەوە واز لە کاروباری میرێتی بهێنێ و ئەمیش ئەوپەڕی توانای خۆی خستوتەکار، بۆ ئەوەی پەشیمانی بکاتەوە. خۆ ئەگەر میر وازبهێنی، ئەوا ئەم گەورە و شەرەفمەند دەبێ، ئەگەر لە جێی دابنرێ. هەر بەڕاستی منیش ئاگاداری ئەوەم کە شازادەی کرماشان لە جارێك زیاتر پلەوپایەی ناوەتە بەر عوسمان بەگ.

عوسمان بەگ پێمی وت گوایە دوێنێ شەو، تا دوای نیوەشەوی لەگەڵ میردا بردۆتە سەر و هەوڵی لەگەڵ داوە تا پەشیمانی بکاتەوە و پێی وتووە مادام خوا ئەم پایەیەی پێ بەخشیوە، دەبێ لە بەجێهێنانی ئەرکەکانیدا بەردەوام بێ و بۆی نییە شوێن خواست و ئارەزووی خۆی بکەوێ. بەڵام خواستی میر، بریتییە لە ئاشتی و ژیانی ئاسوودەیی و خۆ تەرخانکردن بۆ ماڵ و منداڵەکانی.

عوسمان بەگ لەسەر قسەکانی ڕۆیشت و وتی: (هەتا من لە ژیانمدا بم، نایەڵم کاکم وازبێنێ و لە خواش دەپاڕێمەوە لەم کارەمدا سەرم بخات).

دوای نیوەڕۆ، میر لەجیاتی خۆی، یەکێکی بۆ لام ناردبوو، تا پۆزش بخوازێ کە نەیتوانیوە لەم ڕۆژانەی دواییدا سەردانم بکات و لە پۆزش خواستنەکەشیدا وتبووی: (ئەو، خۆی دەزانێ لە چ حاڵێکدام، من ئەو منداڵەمم ئەوەندەی خۆشەویستی یەعقووب، بۆ یووسف خۆش دەویست).

## ١٨ی تشرینی یەکەم

ئەم ئێوارەیە هەندێ لە سکێچەکانم(٢٤٨) نیشانی عومەرئاغادا، زۆرم پێ سەیر بوو، کە لێی دەزانی. ناوی هەندێ جێگە و هەندێ گردیشی پێ وتم. ئەو شوێنانەشی لەو سکێچەمدا بۆ دیاری کردم، کە دەبێ هەندێ کۆسپی زەوییان تێدابێ، کە کاتی خۆی من لەبەرئەوەی ئەم شوێنانەم نەدیبوون، پشتگوێم خستبوون و دییاریم نەکردبوون. شوێنی هەندێ ناوچەیشی بۆ ڕاستکردمەوە، بەڵکو بچووکترین ئەو گردانەیشی دەرك دەکرد کە پیایاندا تێپەڕ ببووین. ئەمەش بەڵگەیەکی ڕوونە، لەسەر زرنگیی ئەو و دروستیی سکێچەکانم. لەکاتێکدا لە بەغدا

---

٢٤٨ ئەم سکێچانە هی ئەو ناوچانەبوون کە دەکەوتنە نێوان سلێمانی و سنە و بانەوە و میستەر ڕیچ بەیاوەریی عومەرئاغا، ئەو ناوچانەی دیبوو ـــ خاریج.

خەڵکێکی زۆرم دیبوو لەوانەی وەك دەڵێن (ماتماتیك - ریاچیات)یشیان بەشێوەیەکی تایبەتی خوێندبوو، بەڵام کەسیان ئەوەندەی تۆسقاڵێك ئاگاداری نەخشە، یان سکێچکاریی نەبوون...

کەچی عومەرئاغا هەرئەوەندەی دەستی بەدەفتەری سکێچەکان گەیشت، یەکسەر هەر بەدەست، یەك لە دوای یەك، ڕووی سکێچەکانی کردە ڕێکی ڕێگاکانمان و بەبێ سێ و دوو، بەپەنجە هەموویانی دیاری کرد. خۆیشی لەبەرئەوەی خەڵکی شاخە، ئەو زیرەکییە زکماکییەی لە دەستنیشان کردنی زوورگ و چاڵایی دۆڵەکاندا، ئەوەندەی تر زیادکردووە. هەر ئەمەشە هەموو خەڵکی ئەم ناوچە شاخاویانە، بەئاسانی و بەتەواوی لە سکێچ و هێڵکاریی تێدەگەن. چونکە بۆ وێنە: ئەو کەسەی نەخشەی (شاخی بەرجەستەی سپی) و ناوچەکانی دراوسێی کێشاوە، (سەرتاش)ێکی (شامۆنیا)یی بووە. هەر گوندنشینەکانیش نەخشەی (تێرول)ی جوانیان کێشاوە. منیش بەڵێن دەدەم کە دوای چەند دەرسێك، عومەرئاغا فێر دەکەم، خۆی لە مەیداندا چۆن سکێچ و هێڵکاریی بکات. بەڵام بەداخەوە کە زووتر ئەم بیرە بەمێشکمدا نەهات، چونکە ئەوکاتە دەرفەتێکی زۆرتر لەبەردەممدا بوو، تا پێش ئەوەی لە سلێمانییەوە بۆ (ئەحمەد کولوان) بچین ئەم کارە بکەم و ئەوساش بەدەم ئەم گەشتەمەوە کە لەدوای مانەوەم لە سلێمانی دەستی پێکرد، دەمتوانی لەژێر چاودێریی خۆمدا، لەسەر وێنەکێشانی هێڵکاریی و سکێچ، مەشقی پێبکەم...

ئەو کەڵکانەی کە زانست لە پیاوێکی سەرنج تیژی وەك عومەر ئاغای وەردەگرێ، کە هەموو کون و کەلەبەرێکی ئەم نیشتمانەی دیبێ، بێگومان زۆر زۆرە و جێی بایەخ پێدانە، چونکە ئەویش لای خۆیەوە دەتوانێ خەڵکی تر فێر بکات. بەمەش زانست و زانین تەشەنە دەکات.

بەشێوەیەکی گشتیش من وای دەبینم کە کورد زۆر تێنووی زانیاری کۆکردنەوەن، بەڵام خۆیانی بۆ ئامادە ناکەن و گوێش بە شتی خۆیان نادەن و ئەمانە لە تورکەکانیش زووتر فێری شت دەبن، بەڵکو پێم وایە لە ئێرانییەکانیش ئاسانتر فێر دەبن، چونکە هەندێ شت هەن، ئێرانی دەتوانێ بەئاسانی فێری ببێ، تەنیا لە بواری ئەدەب و زانستدا نەبێ، کە لەم بوارەدا خۆی وا دەبینێ لە نەتەوەکانی تر یەکجار زۆر لەسەرووترەوەیە.

تورکیش بڕوای تەواوی بەوەیە کە لە هەموو شتێکدا لە سەرەوەیە و لاقرتییەکی تاڵ بەهەموو ئەوشتانە دەکات کە دەیانزانێ، یان تێیان دەگات. بەڵام هەرتەنیا پەڕەسێلکەیەك هاوینمان بۆ ناهێنێ (٢٤٩)، بۆیە هەڵکەوتنی پیاوێك، یان دوو پیاو لەناو نەتەوەیەکی

---

٢٤٩- پەندێکی ئینگلیزی هێناوەتەوە، کە لە بەرامبەریدا پەندێکی بەغدایی هەیە، دەڵێ: چەپڵە بەدەستێك لێ نادرێ ــ ع ــ لە کوردیشدا بەرامبەری هەیە، کە دەڵێ: (بەگوڵێك بەهار نایەت. پێم وایە ئەم پەندە کوردییە نزیکترە لەو شتەی ڕیچ مەبەستێتی ــ م.

تینووی زانست و پێشکەوتندا نیشانەی ئەوەن، مەگەر لە قەوارە گشتییەکە بەدەر و ناوێزە بن. لەبەرئەوەی ورەو توانای سروشتیی زیندووی هزری ئادەمیزاد، هەندێ جار ئەو پەردەیەش دەبڕێ کە لووت بەرزیی و دەمارگیریی لەبەردەمیدا قووتی دەکەنەوە. تەنانەت لەناو زۆربەی گەلان و نەتەوە هەرەمەکییەکانیشدا کەسی وایان تێدا هەڵدەکەوێ، بتوانێ لە هەموو ڕۆژگارێکدا پێش سەردەمی خۆی و نیشتمانەکەیشی بکەوێ. بۆ وێنە: کتێبی (جیهان نوما ــ یان ــ جوگرافیای حاجی خەلیفە) لە ڕۆژگاری خۆیدا کتێبێکی زۆر مەزن بوو، چونکە هەموو ئەو زانیارییانەی تێدابوو، کە مرۆڤ هەر لە کتێبەکانی ئو رۆژگارەی ئەوروپادا بەرچاوی دەکەوتن. حاجی خەلیفەش لەچاو هەر تورکێکی تردا، پیاوێکی گەشبین و ڕووناکبیر بووە، بەڵام کەسی تری بەدوادا نەهاتووە. ئێستاش چ تورکێك (جیهان نوما) دەخوێنێتەوە؟ یان کێ بیرێکی وای لا گەڵاڵە دەبێت، کە لای خۆیەوە پێوەرێك بۆ وڵاتەکەی خۆی و بۆ دنیا دابنێ؟ چونکە ئەگەر ماتماتیك و جوگرافیاش بخوێنێ، بەهەموو دڵنیاییەوە هەر پەنا بۆ کتێبەکانی (ئیقلیدس و مەجەستی و بەسەرهاتی حەوت هەرێمەکە و زەریای تاریکی و(٢٥٠)چارەکە زەوی پڕ لە جنۆکە) دەباتەوە و مێشکی خۆی زۆر کەم خۆی بەوەوە ماندوو دەکات کە ئاخۆ ئەم تێڕوانینانەی لەم کتێبانەدا هەن، لەگەڵ بەرەو پێشچوون و دۆزینەوە تازەکاندا دەگونجێن!

تا ئێستاش چاپخانەکانی ئەستەموول، ئەرکی هۆشیارکردنەوەی گەلیان لە ئەستۆ نەگرتووە، بەڵام هەندێ کتێبی بە کەڵکیان چاپکردووە، ئەگەرچی کەس نایان کڕێت. بەڵکو ئەوەیشی دەستی بکەوێ، نایانخوێنێتەوە. تاقە بەرهەمێکیش کە چاپکرابێ و بڵاوکرابێتەوە و لای خەڵکەوە قۆسترابێتەوە هەر فەرهەنگ بووە. (عەباس میرزا)ش ئێستا لە تەورێز، خەریکی دامەزراندنی چاپخانەیەکە. تۆ بڵێی ئەم چاپخانانەی (ئێران)یش ئەوەندەی چاپخانەکانی ئەستەموول کەڵکیان بە تورکەکان گەیاندووە، ئەمیش ئەوەندە کەڵك بەئێرانی بگەیەنێت؟ هیچ نەتەوەیەکیش هەرچەندە بەهێز و پێشکەوتنخوازیش بێت، بەزەبروزەنگ و زۆرەملێ و ڕەنجی تاکە کەسیی پێش ناکەوێ. لەگەڵ ئەوەشدا ئێرانییەکان لە تورکەکان بەتواناترن و ئەگەر ئەستەموول پایتەختی ئەمان بوایە، ئێستا زۆر دەمێك بوو لە ڕیزی نەتەوە پێشکەوتووەکانی ئەوروپادا بوون. سۆنگەی ئەم پێشنەکەوتنەش ئایینی ئیسلامە، چونکە هەر نەتەوەیەك ئیسلام بێت، پێش ناکەوێت، ئیسلامیش سەروەر ئایینێکە، ڕێگەی

---

٢٥٠- زەریای تاریکی: مەبەست لە ئۆقیانووسی ئەتڵەنتیە ــ م.

پێشکەوتن دەگرێ و هانی دواکەوتن و سۆدرەیی و تاوان دەدات. محەمەدیش دەستی لە هەموو شتێك وەرداوە و بەر هەرشتێکیش کەوتبێ، ژەهراویی کردووە. هەموو شتێکیشی بە کاروباری ئایینی داناوە، هەر لە زانینەوە، تا ڕەوشت و مێژووش. لەڕووی هەریەکێك لەمانەشدا تەگەرە و کۆسپی لەبەردەم هەموو لێکدانەوە و ئاڵوگۆڕێکی نوێدا داناوە(٢٥١)لای تورکەکانیش هەرکەسێك بیر لە کارێکی مێژوویی بکاتەوە، کە محەمەد قسەی لەسەر کردبێ، بە کافری دەزانن.

جارێکیان باسی مێژووی ئەسکەندەرم کرد، کە (ئاریەن) نووسیوێتی، عومەرئاغا زۆر بەپەرۆشەوە حەزی کرد لەو ڕووداوانە بگات، کە لەو سەرچاوە کۆن و باوەڕپێکراوانەدا هەن، منیش کە بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە، وا پێدەچوو باسی شتێکم کردبێ، پێچەوانەی بیروباوەڕی ئیسلامیی بێت، بۆیە کوردێکی (شینکی) لەناو دانیشتواندا هەڵیدایە و وتی ئەو مێژووە وەك ئەسکەندەر خۆی کۆنە، لەبەرئەوە پشتی پێ نابەسترێ، چونکە پێغەمبەری ئێمە لەبارەیەوە ئەمەی وتووە و ئەوەی وتووە. عومەرئاغا بەمە کوڵی ئارەزووی تێگەیشتنی لەو کتێبە دامردەوە. بەڵام کابرای شینکی هەر لەسەر قسەکانی ڕۆیشت و وتی: (کاتی خۆیشی کە ئایینی ئیسلام تازەبوو، جوولەکە و دیانەکان، بۆئەوەی لە پەیامە ئاسمانییەکەی محەمەد بگەن، پرسیاریان لەبارەی مێژووی خۆیانەوە لێدەکرد، تا بزانن وەڵامی ڕاستیان دەداتەوە، یان چەوت! ئەویش هەر بە فەرموودەی خوا، کە (قورئان)ە، وەڵامی دەدانەوە.

هەندێ لە مووسڵمانانیش وا دەزانن ئەسکەندەری گەورە، پێغەمبەر بووە، هەندێکی تریش پێیان وایە یەکێکە لە پاڵەوانەکان. هەروەها هەندێکی تر لایان وایە (لوقمان) پێغەمبەر بووە، هی تریش هەن دەڵێن (وەلی) بووە(٢٥٢).

---

٢٥١- زۆرمان لە قەوانی ئەم خۆرهەڵاتناسانە بیستووە، چونکە زۆرمان لێ خوێندنەوە، کە لەڕاستیدا لە دوو شت بەدەرنین: یان داخ لەدڵبوون و خۆ گێلکەرن، یان نەزان و گومڕان. داخ لە دڵی و نەزانینیش، هەردووکیان مرۆڤ لەڕاستیی و دروستی دوور دەخەنەوە ــ ع.

٢٥٢- لە کتێبی: (کتێبخانەی خۆرهەڵاتەوە ـــ Bibitiothque Orientale) کە (هەر بی لوت) نووسیوێتی، ئەم سەرنجە دەنووسم: (سورەتی ٣١ لە قورئان، سورەتی لوقمانە) ، محەمەد دەفەرمووێ خوا فەرموویەتی: (وأتینا لقمان الحکمە... هتد لە ئایەتەکە). هەندێ لە مووسڵمانان دەڵێن گوایە خوشکەزای ئەیووب بووە، لەبەرئەوە میراتگرە و دەبێ پێغەمبەر بێت. مێژوونووسێکیش دەڵێ یەکێکە لە کوڕەکانی ـــ باعوور ــ ی کوڕی (ناقووری کوڕی تارح) و بەمجۆرە دەبێ برازای ئیبراهیم بێ. مێژوونووسێکی تریش دەڵێ

## ۹۱ی تشرینی یەکەم

گوایە لە سەردەمی داووددا لەدایك بووە و تا سەردەمی یونس ژیاوە. بەمەشدا دەتوانین بڵێین چەند سەردەمێك ژیاوە. بەڵکو هەندێ لە مێژوونووسان دەڵێن سێ سەد ساڵ ژیاوە. زۆربەی زانا و موسڵمانەکانیش لەسەر ئەو باوەڕەن کە لوقمان لە ڕیزەی پێغەمبەران نییە، چونکە لە بنەماڵەیەکی سووك بووە، پیشەیشی بازرگانیی و بەرگدروو بووە. هەندێکی تر دەڵێن شوان بووە. هەمووش لەسەر ئەو ڕایەن کە خەڵکی (نوبیا) یان (حەبەشە)، واتە لەو پێست ڕەشە لچ ئەستوورانە بووە، کە بۆ ئەم وڵاتانە دەهێنرێن و لەبازاڕدا دەفرۆشرێن. لوقمانیش هەر لەوان بووە و لەسەردەمی داوود و سلیمان دا بە ئیسرائیلیی فرۆشراوە. ڕۆژێکیش لەڕۆژان کە نیوەڕۆخەوی کردووە، هەندێ فریشتە چوونەتە ژوورەکەیەوە و بێئەوەی خۆیانی نیشان بدەن، سڵاویان لێکردووە. بەڵام لەبەرئەوەی ئەو، هەر دەنگیانی بیستووە و ڕەنگیانی نەدیوە، وەڵامی نەداونەتەوە. فریشتەکانیش هەر لەسەر خۆیان بەردەوام بوون: (ئێمە نێردراوی خوای تۆ و خوای خۆمانین و بۆ ئەوە بۆ لات نێردراوین، تا ئاگادارت بکەین کە دەتکاتە پاشا و جێگری خۆی، لەسەر زەوی). لوقمانیش وەڵامی دانەوە: (ئەمەی ئێوە دەیڵێن، ئەگەر فەرموودەی خوابێ، ئەوا فەرمانی بەجێیە و لێی دەپاڕێمەوە یاریدەم بدات، تا بتوانم فەرمانەکەی بەجێ بگەیەنم. خۆ ئەگەر خوا خۆمیش سەرپشك دەکات، کە کامە ژیان هەڵبژێرم، ئەوا پێم خۆشە هەروەك خۆم بژیم و لێشم ڕازی دەبێ و دەشم پارێزێ لە کفری ئەو هەموو بەخشینەی، ئەگینا مەزنایەتیی ئەم ژیانەم لێ دەبێ بەدەردەسەری. لوقمان بەم وەڵامە خوای ڕازی کرد، ئەویش دەستبەجێ بەرزترین پایەی ژیریی پێبەخشی و وای لێکرد بتوانێ نزیکەی دە هەزار ئادەمیزادیش فێر بکات، کە وتەی هەریەکێکیان لە هەموو دنیا بەنرختربوو... ڕۆژێکیان لوقمان لەناو کۆمەڵێکدا دانیشتبوو، گوێیان لێگرتبوو، گەورەیەکی جوولەکە بەلایاندا تێپەڕی، سەیری کرد لوقمان و کۆمەڵێك گوێگر ئاپوورەیان داوە، لێی پرسی کە ئاخۆ ئەو قولەڕەشە نییە، کە شوان بوو؟ ئەویش لە وەڵامدا وتی بەڵێ. جوولەکەکەش پێی وت: ئەی چۆن گەیشتوویتە ئەم پلەوپایەی ژیریی و بەرزییە؟ ئەویش وەڵامی دایەوە: سێ شتم بەڕاستگۆیی بەئەنجام گەیاندووە، کە ئەمانەن: (هەمیشە ڕاستی بڵێم، پەیمانی خۆم بەرمەسەر و خۆم لەو کارانە هەڵنەقورتێنم کە پیوەندییان بەمنەوە نییە). مێژوونووسێکی تریش دەڵێ: ڕۆژێکیان داوود لە لوقمانی پرسیوە: چۆن لەو بەیانییەدا بەئاگا هاتۆتەوە؟ ئەویش پێی دەڵێ: (لەناو خۆڵەکەمەوە هەستام). ئیتر داوودیش ڕێزی قسەکەی دەگرێ، پێی دەزانێ، گیانی ژیریی و سادەیی تێدا گەورە دەکات. مێژوونووسێکی تریش ئاگادارمان دەکات کە مەزاری لوقمان لە (ڕامە)یە، کە شارێکی جوولەکەیە، لە نزیك (قودس)ەوە و دەڵێ خەڵکی (نوب) بووە و ئاییبنی جوولەکە بووە. لە نزیك ئەو حەفتا پێغەمبەرەشەوە نێژراوە، کە هەموویان لە ڕۆژێکدا، لە نزیك قودس مردوون.

ئەمڕۆ بۆ ماڵئاوایی کردن، سەردانی میرم کرد، هەستم کرد لەجاران هێورتر بۆتەوە، بەڵام هێشتا هەر خەمبارە و بەردەوام پیش دەخواتەوە هەناسەی قووڵ هەڵدەکێشێ. ئەمڕۆش وەك پیشەی، زۆربەی قسەکانی لەبارەی کاروباری ئایینیەوە بوون. پرسیاری ئەوەی لێکردم کە ژمارەی ئینجیل، بەوانەشەوە کە ئاسمانیین و لەلایەن ئادەمیزادەوە، بەهۆی وەحی خواوە نووسراون، چەندن و ئاخۆ عیسا، جارێکی تر دەردەکەوێتەوە؟ یان نا و دەسەڵاتی بەسەر زەویدا بڵاودەکاتەوە، یان هەر لە ڕۆژی زیندووبوونەوەدا دەردەکەوێتەوە؟. پاشان باسی جەجاڵ(**٢٥٣**) و هاجوج و ماجووج و شتی تری کرد. وەك هەمیشەش هەر نەرم بوو. پێیشی وتم بەرلەوەی بڕۆم و شار بەجێ بهێڵم، جارێکی تریش دەمبینێتەوە و سبەینێش بۆ هەوارگەکەم بۆلام، دێت.

دوای ئەویش بۆ سەردانی عوسمان بەگ چووم. کە وەك هەمووکاتێکی تری بنەوەشیی بوو، بەڵام وەك ئەو پیاوەی پاڵ بە دیوارێکەوە بدات، ئەویش ئاوا، جۆرێك لە توێژاڵی زەبر و توندوتیژی پێوە دیاربوو. لەوەش دەچوو مەحموود پاشا، لەسەر پێسپێریی والی بەغدا بەتوندی پێی لەوە داگرتبێ و زۆر لە براکەی بکات کە ڕازی بێت ببێتە حاکمی (کۆیسنجاق). عوسمان بەگیش هەر قایل نەدەبوو، چونکە سڵ لەوە دەکاتەوە، کە هەر ئەم لا بۆ تورکەکان شل بکات، ئیتر ئەوان بەسەریدا زاڵ دەبن و جڵەوی هەموو ئیشوکارێك بە دەست خۆیانەوە دەگرن. کە ئەمەش بەتەواوی مانای کاولبوونی نیشتمانەکەیەتی.

(والی بەغدا) هەرگیز حەز بە یەکگرتنی بنەماڵەکە ناکات و یەکێتی بنەماڵەکەشی زۆر لەبەر دڵ گرانە. وەك کاتی خۆیشی پێم وابوو، ئێستاش هەر دڵنیام کە هەر ئەم بوو بە سۆنگەی دروستکردنی پشێویی بۆ عەبدوڵلا پاشا و ئێستاش هەر ئەم کنەی ئەوە دەکات عوسمان بەگ لابدات و وای لێ بکات لەگەڵ براکەیدا دانوویان پێکەوە نەکولێ. بەڵام هەڵوێستی عوسمان بەگ لەهەموو ڕووداوەکانی ئەم دواییەدا، هەڵوێستی پیاوێکی جوامێربوو، کە لە چاکە و پاراستنی بەرژەوەندی نیشتمانەکەی زیاتر، هیچ شتێکی تری لە

---

**٢٥٣**- جەجاڵ: یان (الدّجال): درۆزن و فریودەرە. هەروەها بەمانای یەك چاو و یەك برۆیە. بەمجۆرە موسڵمانەکان (عیسا)شیان ناوناوە ــ دّجال ــ (ریچ وای لێ تێگەیوە؟ ــ ع) هەرواشیان ناوناوە و پێیان وایە کە عیسا بەسواری گوێدرێژەکە گەیشتە قودس، ئیتر دەبێ (دّجال)یش بگاتە قودس. بڕواشیان وایە کە لە ڕۆژی زیندووبوونەوەدا دووبارە دەرکەوێتەوە، چونکە عیسا زیندووە ــ وەك ئەوان بڕوایان وایە ـــ و کە لە ئاسمان هاتەخوارێ و بەسەر (دّجال) دا زاڵ بوو، ئەوسا ئیتر دەمرێ.

دڵدا نەبوو. هەڵەی گەورەی میریش ئەو هەموو ڕێزە زۆرەبوو، کە بەرامبەر تورکەکان هەیبوو. ئەم ڕێزەش هەر بەڕاستی لە هەستێکی ئایینییەوە هەڵقوڵابوو. منیش لەم بوارەدا زۆر سەرم لە کەمتەرخەمیی و دەستە پارچەیی میر سوڕ دەما. جێی داخیش بوو کە ئەمڕۆ سەیری دەکرد والی بەغدا ئاوا بەئاسانی دەیخەڵەتاند و ئەمیش بە(ئەفەندمز)، واتە (گەورەمان)، ناوی دەبرد. خۆ ئەگەر بیتوانیایە دەسەڵات و بەرژەوەندی خۆی بەباشی هەڵسەنگێنێ، ئەوا ڕەنگ بوو وا لە والی بکات بۆ هەموو خواستێکی خۆی جڵەوی بەدەست ئەمەوەبێ و بەجۆرێ مامەڵەی بکات، کە شایانی بێ، بەڵام عوسمان بەگ ناوی نەهێنا و لە وەزیر زیاتر، هیچی تری پێ نەدەوت.

دوای ئەوەی ماوەیەك لای عوسمان بەگ مامەوە، (مەسرەف) هات. بەڵام عوسمان بەگ بەجۆرێك قسەی لەگەڵ کرد، کە پێویست ناکات درێژەی پێبدرێ و وتی: قسەکردن لەم شتەدا بێ کەڵکە، چونکە میر، برای گەورەمە و سەرداریشمە، بۆی هەیە سزاشم بدات و هەرچیشم هەیە، لێمی زەوت بکات، بەڵام من هەرگیز ناچمە کۆیسنجاق. پاش ماوەیەکی کەم ماڵاوایم لێکرد و ڕۆیشتم.

دوای نیوەڕۆ بیستم میر بەتوندی کردوویەتیە سەری، کە دەبێ بۆ کۆیسنجاق بچێ، ئەگینا لە موڵکەکانی بێ بەشی دەکات و نایەڵێ کەسیش سەردانی بکات. بە بەرچاوی خەڵکیشەوە کەوتبووە داد و بێزاریی دەربڕین لەوەی کە حەوت ساڵە، لەبەر کەمتەرخەمی خۆی، گوێی بۆ پێشنیارەکانی عوسمان بەگ شل کردووە.

عوسمان بەگ هەر هەڵەیەکیشی کردبێ، بەڵام خۆ لەهەموو ئەم ڕووداوانەی دواییدا هەڵوێستی مەردانەی هەبووە و هەر ئەویش بووە نەیهێشتووە بەدەنگ بانگهێشتنی شازادەی کرماشانەوە بچێت، کە لەهەر دوو بارەکەشدا سوور دەیزانی ئەگەر مەبەستی خۆی بوایە، دەبووە میر.

بەڵام ئەوەی خەمگینی کردووم، کردەوەی ئەم تورکانەیە، کە تۆوی ناکۆکیی لەنێوان ئەندامانی ئەم بنەماڵە خانەدانەدا دەچێنن.

بڕیارمدا پێش ئەوەی شار بەجێ بهێڵم، هەندێ قسەی چاك ئاراستەی عەبدوڵلا پاشای دۆستی دێرینەم بکەم. عوسمان بەگ پێمی وت ئەوەی ڕوویدا، بە فرتوفێڵ و پیلانی تورکەکان بوو، ئەوەش کە گومانی تێدانییە ئەوەیە کە عەبدوڵلا پاشا، لە زۆربەی ئەوشتانەی هەڵبەسترابوون، بێ بەرییە. هەروەها پێیشی وتم لەم دواییەدا میر، دڵی نەرم بووە و داوای لە

والی بەغدا کردووە، کە لە مامەکەی خۆشبێ و بەرەڵڵای بکات. بەڵام داوود پاشا ڕازی نەبووە بەری بدات. منیش پێم وت بڕوای تەواوم هەیە بەوەی ئەگەر تۆ، خۆت بۆ ماوەیەکی کورت زیانی پێنەگەیەنیت، هیچ شتێکی تر نییە، بتوانێ زیانی پێبگەیەنێت. عوسمان بەگیش وتی هەرگیز تووشی هیچ زیانێ نابێت، چونکە ئێمە وەك تورك نین و کەسی وامان تێدانییە ئەگەر دنیاشی بدەیتێ، تاڵەموویەکی لێ بکاتەوە...

پیاوێکی ڕەمەکیی پێشکارمان بوو، ناوی محەمەد چاوەش بوو، یەکێك بوو لە گزیرەکانی عومەرئاغا و باوکیشی هەر خزمەتگوزاری ماڵیانی عومەرئاغا بووە، چەند شەوێك لەمەوبەر، لەبەر دەرگا پیاسەمان دەکرد، دەمویست چەند شتێ بە عومەر ئاغا بڵێم، کە تۆزێ لە پێشمانەوە بوو، بە محەمەد چاوەشم وت بانگی بکات، کەچی محەمەد چاوەش بە فیکە، بانگی گەورەکەی کرد. عومەرئاغاش کە تەواو لەمجۆرە بانگکردنانە شارەزا بوو، یەکسەر ئاوڕێکی دایەوە، تا بزانێ کێ بانگی دەکات! هاوسەرەکەشم حەزی دەکرد کەوڵێکی بچووك بەدیاری بدات بە یەکێك لەو نۆکەرانەی پێش ماوەیەك نەخۆش کەوتبوو، لە محەمەد چاوەشی پرسی: بایی چەندە؟ بەکوردی وەڵامی دایەوە، کە بەگران قسەی پێکرد، وتی ئینجا بۆ نرخەکەی دەپرسیت؟ هەروا پێنج، تا دە قروشێك دەبێ، بەڵام ئەگەر دەتەوێ، هەروا بۆ خۆت و حەزدەکەم خۆشت پەستەکێکی لێ دروست بکەی بۆ خۆت.

ئەم پەستەك و فەرەنجیيانە، هەر لەو لبادە ئاسایيانە دروست دەکرێن، کە دەکرێن بە تەکەڵتوو، یان لبادی ڕاختن. ئەم فەرەنجییانە یەکپارچە دروست دەکرێن و ئەو شوان و خەڵکە ڕەشۆکییە لەبەری دەکەن، کە لەبەر سەرما کار دەکەن... ڕەنگە ژنەکەی محەمەد چاوەشیش یەکێکی وای لەبەردابێت.

کورد وەك ئێرانی لەناو خۆیاندا غەلبەغەلب و ژاوەژاو ناکەن، بەڵام وا خوویان گرتووە لەپڕێکدا بانگێ، یان هاوارێك دەکەن، وەك ئەوەی ئەگەر کوردێك بانگی یەکێکی تریان بکات، یان ئاگاداری بکاتەوە، بەدەنگێکی بەرز هاواری بۆ دەکات: (هۆ، حەمەکە، هۆو) بانگەکەش درێژ دەکاتەوە: (حەمەکە هۆ، هۆ، هۆ، وووررا وورا)، ئەویش بەهەمان دەنگ وەڵامی دەداتەوە. جافەکانیش هەروا یەکتر بانگ دەکەن و لە گردێکەوە بۆ گردێکی تر قسە لەگەڵ یەکتر دەکەن.

کورد زۆر بەدەگمەنیش ڕاستە و ڕاست و بێدەنگ ڕێگا دەبڕن، ئەگەر ماوەکەی هەرچەندیش بێ، بەڵکو کە بەلایەکدا دەچن، هەر لەخۆیانەوە و بێ هۆ، دەکەونە هاوار و دەنگەدەنگ و ڕاونانی یەکتری بەسەر وڵاخەوە. هەر بەپەلەش بۆ شوێنەکانی خۆیان دەگەڕێنەوە.

ئەوکاتەی عومەرئاغا بەئیش بۆ کوردستانی ئێران چووبوو، شەوێکیان لەبەر دووریی ڕێگاکە، برسییان دەبێ، دووان لە پیاوەکانی خۆی بۆ گوندێك دەنێرێ، نانیان لە گوندەکە بۆ بکڕن، گوندەکەش زۆر لە ڕێگاکەوە دوورنەبووە، شەوەکەشی تاریکەشەو بووە، دوای ئەوەی ماوەیەکی زۆریان پێچووە، گوێیان لە دەنگی هەردوو سوارەکە بووە و بەوبەردەڵانییەدا بەدوای یەکتردا غار دەکەن و بەرەو لای ئەمان دەگەڕێنەوە، بەڵام لەبەرئەوەی ناوچەکە جێی دڵنیایی نەبووە، یان بەواتەیەکی تر، لەگەڵ بنەماڵەی باباندا زۆر تەبا نەبوون، بۆیە عومەرئاغا وای بەبیردا هاتووە کە ناحەز دوای سوارەکانی کەوتوون. لەبەرئەوە خۆی و پیاوەکانی خۆیان تەیارکردووە و چەکیان بەدەستەوە گرتووە... بەڵام لەپڕدا دەنگەکان نەماون و تا ماوەیەکیش بێدەنگ بوون، بێئەوەی بزانن چی ڕوویداوە! ئیتر عومەرئاغا ناچار دەبێ بەسڵەوە ڕووبکاتە شوێنی دەنگەکان، کەچی لەناکاوێکدا ئەسپێکی بێ سواری دیوە و سوارەکەیشی لەولاوە کەوتووە، سواری دووەمیشیان دابەزیوە و بەدیارییەوە وەستاوە و جڵەوی ئەسپەکەی ئەویشی بەدەستەوە گرتووە، تەمەس ئەمە دوای ئەوەی نانەکە دەکڕن، لەسەر چەند دراوێك گرەو دەکەن کە پێشبڕکێ بکەن و دەستبەجێ پێشبڕکێکە دەست پێدەکەن. بەڵام لەبەرئەوەی شوێنەکەیان لا نامۆ و بەردەڵانی دەبێ و شەوەزەنگێکی تاریکیش بووە، یەکێکیان دەکەوێ و ئێسکی ڕانی دەشکێ...

کورد، سوارچاك و ئازان، چونکە ئەسپەکانیان بەسەر هەموو زەوییەك و بەهەموو خێراییەك تاو دەدەن و پێچی پێ دەکەنەوە، بێئەوەی بەزەییان پیایدا بێتەوە و دڵیان پێی بسووتێ. هەموو ئەم شتانەش بەڕەقیی و توندیی دەکەن و خۆیشیان بەسەر پشتی وڵاخەکەوە توند دەکەن. سەرباری ئەمەش زۆرباش لە نەژادی ئەسپ نازانن. ئەسپەکانیشیان هەمووی، تەنانەت عەرەبییەکانیشیان، دوای ماوەیەك تووشی کەموکووڕی و نەخۆشیی دەبێ و چەمووش و هاریان لێدەردەچێ. ئەسپی بەزەبر و هاریشیان بەلاوە چاکترە، چونکە لایان وایە بەمە کارامەیی و ئازایەتی سوارەکەی پێوە دیاردەبێ. بەپێچەوانەی ئەمانەوە، عەرەب، سواری کارامە و لەسەرخۆن. ئەگەریش بتەوێ سوارییەکی خۆش بکەیت، بەشوێن عەرەب سوارێکەوە، یان هەندێ جاریش بەشوێن تورك سوارێکەوە بڕۆ، بەڵام بەشوێن کورد سواردا ئەوە هەر نا.

کورد زۆر بەتەنگ ئەسپەکانیانەوەن، زۆریشیان هەرخۆیان ئەسپەکانیان ڕام دەکەن و ئالییکی زۆری دەدەنێ و گەرمیش ڕایدەگرن. هەر ئەمەش وا لە ئەسپەکانیان دەکات کەمتر بەرگەی ئەو ناخۆشیی و سەختییە بگرن، کە ئەمڕۆ لەناو ئەم گەلەدا تووش دێت. لەم ماوەیەشدا ئارەزووی

پەیداکردنی ئەسپی عەرەبییان هەیە و بێئەوەی گوێ بدەنە زانینی نەژادی، پارەیەکی زۆری پێ دەدەن. ئەم ئارەزووەش وردە وردە خەریکە هانی خستنەوە و پەروەردەکردنی ئەسپی ڕەسەنی کوردی دەدات کە دەتوانرێ بەچاکترین و بەهێزترین ئەسپێك دابنرێ، کە بەرگەی سەختی بگرێ و بۆ سوارییش بەتوانا و بێ وێنە بێت. بەڵام ئێستا ئەمجۆرە ئەسپانە خەریکن کەم دەبنەوە و لەجیاتی ئەمان، ئەسپی دوو ڕەگ لە بەغدا و لە وڵاتانی گەرمەوە دەهێنرێن. ئەسپی عەرەبیی لە کوردستاندا زاووزێ ناکات، مەگەر بەدەگمەن، چونکە نۆماکانیان لەجۆرە ئاساییەکانن و تایبەتمەندییەکانی ئەسپی عەرەبییان زۆرکەم تێدایە.

کورد، لە گردکردنەوەی زانیاریشدا لەسەر هۆردووی دوژمن، زۆر چوست و زرنگ و بەتوانان. چونکە زۆر بێباکانە پێدزە دەکەنە ناوجەرگەی سەربازگەکانیانەوە، بەڵکو بۆ ناو چادری فەرماندەکانیشیان. کاتی خۆی کە لەگەڵ والی بەغدا، جەنگابوون، بەهۆی ئەوەوە کە ژمارەیەکی زۆری سەربازی کورد، لە لەشکری تورکییدا چەوساوەبوون، ئەوەندەی تر، ئەم ئیشەی بۆ ئاسانتر کردوون...

عەبدوڵلا پاشا بۆمی گێڕایەوە، لە شەڕێکدا ئەوڕەحمان پاشای برای (٢٥٤)، کوردێکی بۆ ناو هۆردووگای والی بەغدا ناردووە، بەڵام کابرا نەیتوانیبوو، ئەو زانیارییانە کۆبکاتەوە، کە مەبەستی بووە، لەبەرئەوە بەچاکی دەزانێ سەربازێکی هۆردووگاکە بگرێ و بۆ بەردەم ئەوڕەحمان پاشای بیهێنێ، تا هەرچییەکی پێویست بێ، لێی بپرسێ.

کورد زۆر ئارەزوومەندی مۆزیکن و مۆزیککەشیان خەمناکە. هەندێ ئاواز و گۆرانییان وەك (مەلکێ جان، مەمکوژە بەناز و ئەز دەناڵم)، سەرەڕای ئەوەش کە سادەن بەڵام ناسکن، زۆر گۆرانیشیان بۆ یەکتری دەسەندرێتەوە. گۆرانی (درەو)یشیان کە سەپانەکانیان (شیرین و فەرهاد) دەڵێن، بەلەمەوانە شینەکانی (گەندول)ی شاری (بوندقیە)م بیردەخەنەوە، کە گۆرانی (ئاسۆ) دووبارە دەکەنەوە.

تا ئێستا خەڵکی لەش ساغی وەکو خەڵکی کوردستانم، لە ژن و لە پیاو، لە هیچ جێیەك نەدیوە. سەرباری نالەباریی کەشوهەواکەشیان، کەچی کورد، بەشێوەیەکی گشتی، گەلێکی لەش ساغ و بەهێزن. منداڵیشیان پێستیان ساف و ڕوومەتیان ئاڵە. بەڵام منداڵی بەغدا،

---

٢٥٤- کاتێ ئەوڕەحمان پاشا لە سەرەمەرگدا لەسەر جێ بووە، کەسوکار و خزمەکانی ئازارێکی زۆریان بەدەست هێمن کردنەوە و دامرکاندنەوەیەوە چەشتووە، چونکە لەبارێکی زۆر خرۆشاو و هەڵچوودا بووە و هەرئەوەی دووبارە کردۆتەوە کە بەزەبوونی و دەستەپارچەیی لەناو جێگادا دەمرێ. لەکاتێکدا حەزی کردووە لە مەیدانی شەڕەفدا بمرێ. ئەم هەستەش خەڵکی خۆرهەڵاتیی، زۆر کەم دەری دەبڕێ.

ڕەنگ زەرد و ورگن و لەش خواروخێچن، دەڵێی تووشی گێڕیی بوون، کە دەستیشیان بۆ دەبەیت، دەسڵەمێنەوە و خۆیان گرژ دەکەن. بەڵام منداڵی کورد، گیانلەبەرێکی بچکۆلە و گورج و ڕۆح سووك و ڕووخۆش و هۆگرە.

## ٢٠ی تشرینی یەکەم

ئەم بەیانییە (شێخ خالید)ی بەناوبانگ هەڵهات. لەگەڵ ئەوەشدا کە ڕاکردنەکەی لەناکاو و بەنهێنی بووە، بەڵام توانیبووی هەرچوار ژنەکەیشی لەگەڵ خۆی بەرێ و تا ئێستاش نازانرێ ڕووی لەکوێ کردووە. پێش چەند ڕۆژێك کوردەکان لە (عەبدولقادر)یان(٢٥٥)گەورەتر دادەنا، میریش وا خووی گرتبوو، لە بەرامبەریدا بەپێوە بوەستێ و قەنەنەی بۆ تێ بکات، بەڵام ئەمڕۆ، بە کافری ناودەبەن و زۆر شتیش لەبارەی لووت بەرزیی و کافریی و خوانەناسیی دەگێڕنەوە...

دوای مردنی کوڕەکەی میر، شێخ ناوبانگی زۆر دۆڕاند، چونکە وتبووی چاکی دەکاتەوە و سەیری کتێبی بۆ دەکات، بزانێ خوا چی لە چارە نووسیوە و شتی تریش... گەلێ قسەوباسیش لەسەر هۆی ڕاکردنەکەی دەوترا و هەندێك دەیان وت تۆوی پشێویی لەنێوان میر و براکانیدا وەشاندووە و ئەوانیش ویستوویانە لەبەردەم میردا بەرەو ڕوویان بێتەوە. هەندێکی تریش دەڵێن خەریکی دانانی بناغەیەکی ئایینی تازەبووە و ویستوویەتی خۆی بکات بە گەورەی وڵات... ئیتر زۆری لەبارەوە وترا و تاوانی شتی وا لەڕادەبەدەریشی بەپاڵ دەدرا، کە لەڕاستیدا وا نەبووە، چونکە زانا و سەییدەکان، هەموویان و لەسەروویانەوە (شێخ مارف)(٢٥٦)، ڕقیان لێیەتی... ئەویش کاتێ دەسەڵاتی هەبوو، هەموویانی بەزاندبوو.

---

٢٥٥- ڕیچ مەبەستی (عەبدولقادری گەیلانی)یە ــ ع.

٢٥٦- میستەر ڕیچ، کەمێك بەرلەوەی سلێمانی بەجێ بهێڵێ، ئەم نامە سەیرەی خوارەوەی لە سەرۆکی زانا ئایینییەکانی کوردەوە پێگەیشتووە:

(بۆ گەورەی گەلەکەی خۆی، باڵیۆز بەگ.

سڵاو لەوکەسەبێ، کە ڕێگەی چاکەی گرتووە ــ السَّلام عَلىٰ مَنِ اتَّبَعَ الهُدىٰ ــ و پیرۆزبایی لێدەکەم و لەخوا دەپاڕێمەوە بۆی، کە دەستگیرۆیی بکات و بیخاتە سەر ڕێگەی ڕاست. چەند مانگێکە بەردەوام لەشم لێیر دەکات. بۆیە هیوادارم چارەیەکم بۆ بنووسیت، کە پێی چاك ببمەوە، تامنیش دوعای خێرت بۆ بکەم.

هاوڕێیەکی جگەرسۆزیشم هەیە، ئێستا لەش بەبارە و تووشی لاوازییەکی تەواو بووە، تکام وایە ئەگەر ئەم

هەروەها یووسف بەگی برای شێخ خالید و حاکمی پشدەریش هەڵهاتبوون و پەنایان بردبووەبەر (عەباس میرزا)، کە دەڵێن گوایە ئەمی دواییانی کردووە بە حاکمی (سەردەشت) و جگە لەمەش بەپشتیوانی عەباس میرزا هەر بەردەوام دەبێ لەسەر حاکمێتیی پشدەر.

میر، هەموو پێوەندییەکی خۆی لەگەڵ عوسمان بەگ بڕی و هەرچی دەسەڵات و موڵکێکیشی هەبوو، لێی سەندەوە، کە بێگومان ئەمەش هەمووی بە فرتوفێڵی تورکەکانەوە بوو. ئا بەمجۆرە ئەم بنەماڵە کلۆڵە، بەهۆی ناکۆکی و سۆدرەوە، بەدەستی خۆی پشتی خۆی دەشکێنێ و ئاوا لای دراوسێ دەسەڵاتدارەکانییەوە، تووشی پیلان دەبێت، کە ئەگەر وا نەبێ، ئەم دەسەڵاتدارانە، ئەگەر بشیانەوێ، کەسیان ناتوانن بەتۆپزیی و زۆرەملە، دەست لە کاروباری کوردستانەوە وەردەن.

ئەم ئێوارەیە میر، بۆ دواجار، سەردانی کردم و هەرکە هاتە چادرەکەمەوە، وتی وا هەست دەکات هەر هەمان جێگا و کات و یەکەم سەردانی دوێنێیەتی. منیش بەدەم قسەوە پێم وت هەرچەندە وا هەست بکات ماوەیەکی کەمم لەناویاندا بەسەربردووە، بەڵام ئەو ماوەیەم بەس بووە، بۆئەوەی بزانم چاکەی وای لەگەڵ کردووم، تا ماوم لەیادم ناچێ.

ئەمڕۆ هەستم کرد لەجاران دڵگیرتر بوو، ڕەنگە دڵگیرییەکەی هی ئەو کارە ڕقەبەرایەتییە بێت، کە لەگەڵ براکەیدا کردبووی، ئەو برایەی دەسەڵاتی تەواوی بەسەریدا هەبوو. ئەم کارە خوێنی هێنابووە کوڵ و کەمێکیش خەمەکەی لەبیربردبووەوە. ئیتر وردە وردە قسە هاتە سەرباسی میرنشینەکەی و ئەو ناکۆکییەی لەنێوان ئەندامانی بنەماڵەکەیاندا دروست بوو. هەوڵمدا هەستی نەتەوایەتی و بنەماڵەیی تێدا ببزوێنم، بەڵام بێ کەڵك بوو، چونکە هەستم کرد زۆر بۆیان پەرۆش نییە. کە باسی مێژووی کۆنیان و ئەو پایە و ناوبانگەم کرد، کە نەتەوەکەی لەناو نەتەوە سەربەخۆکاندا هەیەتی، ئەو تۆزە پەرۆشییەشی لە تراویلکە زیاتر، هیچی تر نەبوو. پیاوێکی نەرم و سنگ فراوان بوو، کە لێکدانەوەی بێ ئەنجام وایان لێکردبوو بەتەواویی پابەندی ئەو شتە پڕوپووچانە بێ کە نەیان دەهێشت دەستی بچێتە هیچ و دەستبەرداری هەموو کاروبارێکی خۆی و

---

دەردە، دەرمانێکی هەیە، ڕێنماییمان بکەیت، بۆئەوەی نەخۆشەکەمان بەشادییەوە بگەڕێتەوە سەر دۆخی جارانی، تکاشم وایە، بۆ گەیشتن بەئاسوودەیی تەواو لە خواپەرستی بێ هیوا نەبن.

مەعروف-ی هەژار

پەراوێزەکە دوایی هات ـــ شێخ مەعروف، باوکی کاك ئەحمەد شێخی بەناوبانگە، کە لەگردی (سەیوان)ی نزیك سلێمانی نێژراوە و کاك ئەحمەدی شێخیش مەزارەکەی لە مزگەوتی گەورەی سلێمانییە ـــ ع.

ولاتەکەیشی ببێت و دوودڵم ئەگەر بڵێم بەهۆی پابەندیی بەئایینەوە بەمجۆرەی لێهاتووە و لەوەی تێپەڕاندووە گوێ بۆ کەس شل بکات و لەم بۆچوونانەی خۆی لابدات. سەرنجمدا هەر هەڤپەیڤینێکم لەگەڵ دەکرد، ڕەقیی نیشان دەدا، تا لەدواییدا بەگاڵتەوە پێم وت ئەگەر بەهیوایە هەموو کارامەیی خۆی، بۆ دۆزینەوەی کۆسپ و تەگەرە، بۆ چاککردنی میرنشینەکەی بەکاربهێنێ، ئەوا هەمووی کردووە و هیچ نەماوە بیکات، سەرەڕای ئەمەش لە خوا دەپاڕێمەوە خێروخۆشی و توانا بەبنەماڵەکە و میرنشینەکەی بدات. لە وەڵامدا وتی مادام بنەماڵەکە، ئەم هەموو فرەکوێخایەی تێدابێ، ئەو ڕۆژە هەر نایەت، کە میرنشین و بنەماڵەکەی بەهێز بن. منیش سووربووم لەسەر ڕای خۆم و وتم ڕەنگە ئەو ڕۆژە، هەربێت، ئەویش وتی: (ڕەنگە ئەو ڕۆژە بێت، ئەگەر خوا بەڵایەکمان بۆ بنێرێ، لە یەکێك زیاتر، کەسمانی لێدەرنەچێ). منیش دووبارە پێم وتەوە: بەبێ ئەمانەش ڕەنگە ئەمە هەر ببێ، چونکە خوا هەموو شتێکی لە دەست دێت. وتی بێگومان خوا دەتوانێت ئاگری دۆزەخیش بکوژێنێتەوە، بەڵام نایکوژێنێتەوە. پاشان باسی ئارەزووی وازهێنانی میرێتی خۆی کردەوە. پێم وتەوە ئەو جێیەی خوا پێی ڕەوا دیوە، دەبێ لە ئەستۆی بگرێ. وتی: ( ئەوە شکی تێدا نییە، بەڵام سەرم لەوە سوڕدەمێنێ، چۆن خوا ویستی بمکات بە فەرمانڕەوا؟). پێم وت بۆ چاککردنی ئەم هەزاران کەسە. وتی: (ئای لەو لێپرسینەوە سەختەی لە ڕۆژی دواییدا لەگەڵمدا دەکرێ!). لەمەیاندا لەگەڵی نەبووم و وتم بەڕاستی هەڵسوکەوتی لەگەڵ خەڵکدا زۆر باش بووە و دڵسۆزی هەموویان بووە و ناشتوانرێ ئەو هەموو خەڵکە،لە میرنشینەکەیدا بەشێوەیەك لەشێوەکان چاك بکات، کە دەبنە مایەی ئاژاوە و ڕەنگیشە ئاگای لێیان نەبووبێ، یان ئەوەندە توانای بۆ دامرکاندنەوەیان نەبووبێ. ئەویش بەڕاستگۆییەك وەڵامی دامەوە، کە هەموو ڕوخساری داپۆشیبوو، وتی: (قوربان گوێ بگرە، مرۆ بەرامبەر بەکردەوەکانی حسابی لەگەڵ دەکرێ، نەك بەرامبەر بەنیازەکان. لە ڕۆژی لێپرسینەوەشدا هەر بەتەنیا من بەرپرسیارم لە هەموو ئەو پشێوییەی لە میرنشینەکەمدا ڕوودەدات).

داوود پاشا هەموو چاکەکانی ئەم میرەی لەیادکرد و بەتاوان و تەڕن، لەگەڵی جولایەوە. ئێستاش بەچەند قسەیەکی شیرین بەلای خۆیدا ڕایکێشاوە، کە ئەمیش ئێستا بەڕاستی و بەتەواوی پابەندی داوود پاشا بووە و هەر میر، خۆی دەیوت هەتا لە ژیاندا بێ، دەبێ خزمەتی داوود پاشا بکات. بێگومان قسەکەی میر مەحموود، هەر قسەی ڕووت نەبوو.

ئیتر دوای گفتوگۆیەکی خۆش، کە سەعات و نیوێکی خایاند، میر هەڵسا بگەڕێتەوە، بەڵام کە ماڵاوایی لێکردم، قوڕگی پڕببوو لە گریان و کە دەستیشمی گوشی، دەستی

دەلەرزین. منیش زۆر دڵگران بووم کە لێی جیادەبمەوە. تکاشی زۆر کرد کە جارێکی تریش چاوی پێم بکەوێتەوە. من لای خۆمەوە ترسی ئەوەم لێ نیشتبوو جارێکی تر یەکتر نەبینینەوە، چونکە ئەگەر یەکێك بەلاشتەوە مەبەست نەبێ، کە بۆ دواجار جێی دەهێڵیت، هەر لەبەر دڵت گرانە، بەتایبەتیش یەکێك خۆشت بوێ و ڕێزت بۆی هەبێ. کە هەر بەڕاستی میر مەحموود، پیاوێکی خۆشەویست بوو. منیش هەمیشە بەتاسەوە یادی دەکەمەوە، چونکە ڕوخساری بێگەردی، لە پاکیی و دڵسۆزیی و ساکاریی زیاتر، هیچی تری تێدا نەدەبینرا. بڕوام نەدەکرد لە خۆرهەڵاتدا پیاوێکی وا ببینم. دەترسم مرۆ لە کۆمەڵگا پێشکەوتووەکانیشدا زۆر نموونەی ئەم پیاوە نەبینێ. مرۆ، خەم و ناسکیی لە ڕەوشتیدا بەدی دەکرد و ئەمەش ئەوەندەی تر وای لێکردبوو، پیاوێکی ناسك و سەرنج ڕاکێشەر بێ، کە هەر بەڕاستیش پیاوێکی وایە. تا ئێستاش ئەو خەمەی لەکۆڵ نەکەوتبوو، کە بەهۆی مردنی کوڕەکەیەوە تووشی ببوو.

من ئەم ڕایانەم کە دەنووسم، بەدڵنیاییەوە دەڵێم لە هەموو خۆرهەڵاتدا پیاوێکی تر نییە، ئەوەندەی ئەم، ژن و منداڵەکانی خۆی خۆش بوێ. دوێنێ ئێوارە دوای کارەساتەکە، چووبووە حەرەم، منداڵێکی برازای بە وشەی (بابە) بانگی کردبوو، ناوەکە و دەنگی ئەو منداڵەی ناوەکەی هێنابوو، لەوە گرانتر ببوو بتوانێ بەرگەی بگرێ، بۆیە قیژاندبووی و بەدەمدا کەوتبوو و لە هۆش چووبوو...

دەبێ ئەوەش بزانرێ کە ئایینی، ئیسلام ڕێی خەم خواردن نادات و زیادەڕەویش لە بەتەنگەوە هاتنی ئافرەت و منداڵدا، لەو کارە ناپەسەندانەن کە لەناو موسڵماناندا دەبنە مایەی لاقرتێ، هەر ئەمەشە دەبێتە سڕبوونی هەست و دڵڕەقیی. لەڕووی ئایینپەروەرییەوە میر ببووە بەهێزترین ئاییندار لە خۆرهەڵاتدا، بەڵام ئەم پابەندبوونەی بەئایینەوە، نەببووە هۆی دەمارگیریی و هەست سڕبوون. ئەو ڕەوشتەی کە نمونەی بەرزێتی بوو، لە هەموو بیروباوەڕە نزمەکانی ئیسلام(٢٥٧) باڵاتربوو. ڕەنگبێ پیاوێکی لەو ڕەوشت نزمتر، زۆر شیاوتر بوایە بۆ فەرمانداریێتی کوردستان.

---

٢٥٧- خوا لە ڕیچ خۆشبێ. وەك بۆمان دەردەکەوێ ویستوویەتی ستایشی کەسێك بکات، ڕەوشتی بەهۆی شتێکەوە پێ بەرزبۆتەوە، کەچی هەرخۆی هەمان هۆ ناشیرین دەکات. ئیتر نازانین لەنێوان ئەو و ئەوەدا چۆن سەردەکەوێ؟ ــ خاریچ.

میر مەحموود، ئەو سەرکردەیە نەبوو بۆ ئەم وڵاتە دەست بدات، چونکە ئەم، بۆ ئەوە دەشیا ژیانێکی تایبەتی بژی، لەبەرئەوەی پیاوێکی خۆش باوەڕبوو، زۆر بڕوای بە خەڵکی تر دەکرد. ڕێزی خۆیشی لەوە کەمتر دەگرت کە پێویست بوو. لەگەڵ ئەوەشدا کە لە جەنگدا پیاوێکی ئازا و بوێربوو، بەڵام هێشتا هەر پێویست بوو ئازاتربێ. ئایین و بیرکردنەوە، وایان لێکردبوو لەڕووی تەنگانەدا کەمتەرخەم بێ. هەروەها توندیی و زەبریشی لێ بڕیبوو، هەرکەسێ بیویستبایە، دەیتوانی بەلای خۆیدا ڕای بکێشێ، چونکە شانی بۆ هەموو ئەوانە شل دەکرد، کە بەدەنگییەوە هاتن. تەنانەت ملی بۆ ئەو شتانەش دەدا، کە لەگەڵ بیروڕایەکانی ئەمیشدا نەبوون، لەکاتێکدا خۆی نموونەی ڕاستگۆیی و شەرەفمەندیی بوو. لە فرتوفێڵی ئەو چاو و ڕاوکەرانە نەدەگەیشت کە دەیانویست پیلانە ژەهراوییەکانی خۆیان بەو شێوەیە ئەنجام بدەن، کە ئەم پێی ڕازی دەبوو. سەرەڕای ئەوەش کە چەندان جار دەکەوتە داویانەوە، کەچی هەر بڕوای پێ دەکردن، ئەویش هەر لەبەرئەوەی وەك منداڵ ساکار و بێ وەی بوو. لەم دوایییەشدا (داوود پاشا) توانی براکەی لێ هان بدا و هەوڵی دا ئەمیش تێك بشکێنێ. بەڵام ئێستا کە بۆی دەرکەوتووە بەرژەوەندی لەوەدایە بەلای خۆیدا ڕای بکێشێ، ڕێز و نەوازشێکی زۆری بەرامبەر دەنوێنێ. میر مەحموودیش هەموو ئەو شتانەی پێشووی لەبیرکردووە.

شەوێ سلێمان بەگ بۆ ماڵاوایی لێکردنم هات. لاوێکی باش و لە براکەیشی چوست و چالاکتربوو، کە باسی کوردستانیشی کرد، نائومێد نەبوو. بەسەرهاتی جەنگی حەوت ساڵەم بۆ گێڕایەوە، ئەویش بە پەرۆشەوە گوێی بۆ ڕاگرتم.

گەشتەکەم بۆ سلێمانی بەم بەرگە دەستی پێکرد و بەوەش کۆتایی دێت، کە سلێمانی بەجێ دەهێڵم. سبەینێش بەڕێگای (ئاڵتوون کۆپری و هەولێردا) بۆ مووسڵ دەچم.

بەخەمێکی بێ سنوورەوە کوردستان بەجێ دەهێڵم، چونکە بڕوام نەدەکرد ئەم هەموو خەڵکە چاکەی لە خۆرهەڵاتدا هەن، لەوێ بیانبینم. ناسیاویم تێدا پەیدا کرد و بۆ هەر شوێنێ چووبم، زۆر دڵسۆزانە، نەوازشم کراوە. میواندارییەکی بێ سنوورم کراوە. دەترسم و چاوەڕێش ناکەم لەم گەشتەمدا، کە زۆر ماندووی کردم، جارێکی تر، ئاکاری وام لەگەڵدا بنوێنرێ، لەبەرئەوە هەتا ماوم ئەم یادگارانە لە ناخمدا هەر دەمێننەوە...

# بەشی دوازدەهەم

**بەشی یەکەمی بەرگی دووەمی گەشتەکە**

**دەرچوون لە سلێمانی ـ باسی وڵاتەکە ـ گوندی دەرگەزێن ـ عومەرئاغا ـ کوڕەکەی ـ گەرووی (دەربەند) ـ جێهێشتنی کوردستان ـ دەنگوباسی سلێمانی ـ نائومێدیی عومەرئاغا ـ دەشتێکی جوان ـ گوند ـ گردێکی توورەکەڕێژ ـ ڕووباری گابروسی، یان (زێی بچووك) ـ ئاڵتوون کۆپری ـ هەوارگەی فارس ئاغا ـ نزمیی و چرووکییەکەی ـ دیتنی هەولێر بۆ یەکەمجار ـ باسێکی شارەکە ـ دەشتی هەولێر ـ گۆگە مەلا ـ چیای مەقلوب ـ گوندی (کەڵەك)ی ئیزەدی ـ ڕووباری زێ، یان (لیَ کوس) ـ ڕوخساری وڵاتەکە ـ ڕووباری خازەر، یان (بۆمادۆس (BUMADUS) ـ حاجی جەرجیس ئاغا ـ شاری کرملیس ـ کەلاوەکانی نەینەوا ـ گەیشتنە مووسڵ ـ**

## ٢١ی تشرینی یەکەم

بەداخ و خەمێکی زۆرەوە، ماڵاوایيم لە گەلیٚ برایان کرد و لە نزیك شەش و نیوی ئەم بەیانییەدا سواری ئەسپەکانمان بووین و لەباخەکەی پاشای هاوڕێی بەخشندە و ژیرمان دەرچووین و بەسەر زەوییەکی پڕ هەردە و هەڵەتی دەشتی سلێمانی دا، بەلای گوندی (ئاق بۆلاق ـــ ئابلاخ)ی گەورەدا تێپەڕبووین، کە دەکەوتە لای چەپمانەوە. سەرلەبەری دەشتەکە لەم بەشانەیەوە، لەچاو لایەکەی باکووریدا بڵندتربوو، بەلاّم تا نیوەی ڕێگاکە زیاتر و بەرامبەر گردەکانیش هەر بەرەو شۆڕبوونەوە دەچوو. لەدوای نزیکەی میل و نیوێك لە سلێمانییەوە، گەیینە (تانجەڕۆ)، یان چەمی (سەرچنار)، ئەوەی کە کاتی خۆی لە بەغداوە هاتین، لیٚماندا. بەلاّم ئێستا هەر جۆگەیەکی بچووکی ماوەتەوە، هەرچەندە پانتایی دەراوەکەی لە سەد یاردە کەمتر نەدەبوو، گوندی (ئەلیاسە ـــ قلیاسان)یش کەوتبووە لای ڕاستییەوە. دوای ئەوەی لە نۆ و بیست و پێنج دەقیقەدا بەگوندی (باوین مردە ـــ باوە مردە)دا تێپەڕبووین، هاتینە گوندی (کێلەسپی)، یان (تەپەڕەش) کە دەکەوتە دامێنی ئەو گردەوەی کاتیٚ کە لە بەغداوە بۆ سلێمانی هاتین، چادرمان لەسەر هەڵدا. ئەگەرچی گوندەکە پیسیش بوو، بەلاّم بۆ بەسەربردنی ئەمڕۆ لاماندا لیٚی. گوندنشینەکان هەموویان سەرگەرمی کۆکردنەوەی بەروبوومی لۆکە بوون. دیمەنەکەی ئێمەشیان پێخۆش بوو. زەوی لەم ناوەدا بەچەمێکی بچووك ئاوێژە دەکریٚ، کە ڕووەو باشوور و کەمێکیش بەلای خۆرهەلاّتدا ڕیٚ دەکا و دەڕژێتە (تانجەڕۆ)وە. لەم شوێنەی ئێمەوە، کێوی (گودرون ـــ پیرەمەگروون) وەك دیوارێکی بەردین ڕووەو باکووری خۆرئاواو باشووری خۆرهەلاّت درێژ ببووەوە. زنجیرە چیاکەی بەری خۆرئاواشمان لیٚوە دیاربوو، کە میل و نیوێك لە بەرامبەرمانەوە دووردەبوو. بەشێوەیەکی گشتیش، ئاسۆ، یان هێڵێکی بەردین جیای دەکردەوە. تا بەرەو باشووریش درێژتر بوایەتەوە، بەرزتر دەینواند. بەردەکانیش لەدوورەوە دیاربوون، بەشانی شاخەکەوە شەقارشەقار ببوو. ئەم شاخانە هەر لەوە دەچوون، شاخی لەتوپەت بن. لە دوورایی دوو، سیٚ میلێك بەلای خۆرئاوادا، زنجیرەیەکی نزمتر لەم زنجیرەیە جیا دەبۆوە و بە (گودرون)ەوە دەلکێتەوە و وای دەنواند کە لەولایەوە دۆڵەکەی سلێمانی داپبۆشێت. گردە توورەکەرێژەکەی (گەرماوە)(٢٥٨) و پاشماوەکانیشی

---

٢٥٨- یەکێك لە ڕێگاکانی نێوان سلێمانی و کۆیسنجاق، بە (کەڵەوانان)، ناوچەی (سـورداش) و، بەهاوتـەریبی (گودرون)دا تێپەڕ دەبیٚ. ماوەکەشی ١٤ سەعاتە -پەراوێزەکە کۆتایی هات- گوندەکەی لای گردەکەش ئێستا پێی دەڵێن (گەرمەکانی-ع).

دەکەوتنە ناو ئەم زنجیرە نزمەوە. لەویش دوورتر، لەپشت (گودرون)ەوە، گەردنە بەردینەکانی (کوڕکوڕ)ی مەزن و ڕووتەن دیاربوون.

## ٢٢ی تشرینی یەکەم

ئەم بەیانییە لە شەش و بیست دەقیقەدا سواربووین و لەبەرئەوەی ڕێگاکەمان قوڕبوو، ناچاربووین بۆئەوەی لە قوڕەکە دووربکەوینەوە، تا ماوەیەك ڕووەو باکووری خۆرئاوا لە ڕێگاکە لابدەین. لەکاتی خۆرکەوتندا هەوا زۆر سارد بوو. کەمێك دوای حەوت گەیشتینە شاخی (تاسڵوجە)، کە لەوێدا هێڵی چیاکان پانتر دەبنەوە و زۆریش نزم دەبنەوە، لووتکەکانیشی بەردەڵانی نەبوون وەك هەندێ جار لەدوورەوە، لەسەر لووتکەی تری هەمان زنجیرەوە دەردەکەوتن. لە دیوی دەشتەکەی لای باشووری خۆرهەڵاتەوە بڵندتر دەبووەوە. ڕەنگە هۆی ئەمەش چاڵایی دەشتەکە بێت، لەو ڕووەوە بەرەو ڕووباری (دیالە)، لە دەشتی(بازیان)یشەوە هەروابوو، ئەو دەشتەی کە دوای سەرکەوتن بۆی، بەپلەیەکی زۆردا، لە سەعات هەشتدا، گەیشتینێ. ئەم دەشتە لەناوەڕاستدا بەهێڵێکی شاخاویی، لە (قەرەداخ) نزمتر دەبێت بەدوو لەتەوە، کە وا دیارە کەمێك لە دامێنی ڕێگاکەمانەوە کۆتایی بێت و بریتییە لە تەمۆخ و چینەکانیشی ڕووەو خۆرهەڵات بەرزبوونەتەوە و تۆزێکیش بەلای خۆرئاوادا لایان کردۆتەوە. لەم شوێنەدا تووشی چەند پیاوێك بووین، جووانوویەکیان پێبوو، لە کەرکووکەوە هێنابوویان بۆ سلێمانی، بیفرۆشن. جووانووەکەم بەدڵ بوو، کەوتمە سەوداکردنی و دوایی بە سەدوپەنجا قرۆشی(٢٥٩)کاشم کڕی. ئەم سەودایە زۆر دوای نەخستین لە ڕێگاکە، چونکە فرۆشیارەکان چۆن هاتبوون، هەر وا لەگەڵ ئێمە گەڕانەوە و بەدەم ڕێوە سەوداکەمان کرد.(٢٦٠)

لە دە و بیست دەقیقەدا بەلای باشووری خۆرئاوادا بۆ گوندی (دەرگەزێن) لامانکردەوە. ئەو شاخانەش کە دەشتەکەیان بە دووبەشەوە دەکرد، بەهەمان شێوە لایان دەکردەوە و پاشان

---

٢٥٩- نرخی قرۆش لەو سەردەمەدا، لە نێوان دوو شلن و دوو شلن و نیودا بوو.

٢٦٠- ئەو بەردە ستوونییەی وەك لە سلێمانی سەرنجی سەمتەکەیم دابوویە و لەسەرنجە گەردووناسییەکانمدا بەناوی (ئاردەڵان)ەوە تۆمارم کردبوو، دەکەوتە لای ڕاستمانەوە، بە سەمتی باکووری خۆرئاوا. لووتکەیەك بوو بەسەر ئەو شاخانەوە، کە دەبنە سنووری خۆرئاوای دەشت، یان دۆڵی سلێمانی.

ورده ورده نەدەمان. دەرگەزێنیش دەکەوێتە ژێر زنجیرەیەکی بچووکەوە، کە لە شاخەکانی (دەربەند)ەوە ڕووەو ئەو شاخانە درێژدەبووەوە، کە دەشتەکەیان کردبوو بەدوو لەتەوە، بەڵام پێش ئەوەی بیگاتێ دوایی دەهات و بەمە کەلێنێکی لە بەشی خۆرئاوای دەشتی (بازیان)دا دروستکردبوو. لە دە و پەنجا دەقیقەدا گەیشتینە گوندەکە و هەر لە شوێن چادرگەکەی پێشوومان، چادرمان هەڵدایەوە.

دانیشتووانی هەموو ئەو گوندانەی بەلایاندا تێپەڕبووین، لە کێڵگەکانیاندا خەریکی کۆکردنەوەی بەروبوومی لۆکە بوون. دیمەنیشیان جوان بوو، یان هەر دانسقەبوو، چونکە لە هەموو خۆرهەڵاتدا، ڕێگاوبان هێمن و چۆڵە، تەنیا لەم وەرزەدا نەبێ.

دانیشتووانی گوندی (دەرگەزێن)یش لە ڕەسەندا تورکمانن و تا ئێستاش هەر بەزمانی خۆیان دەدوێن و زۆر بەئاشکراش، ڕوخساریان لە گوندنشینانی کوردیان جیا دەکاتەوە. شادمانیشم بەیادی بهێنمەوە، کە عومەرئاغای دۆستی مەزنمان، تا ئێستا میواننەوازمانە. لە سلێمانی سەرم لە دەسگاکانی دەوڵەت دا، بۆئەوەی ئەو چەند گوندەی بدەنەوە، کە بەشێوەیەکی ناشیرین لێیان زەوتکردبوو. ئەوانیش لەبەر خاتری من بەڵێنیاندا بیدەنەوە. لەبەرئەمە عومەرئاغا بۆ وەرگرتنەوەی گوندەکانی، لە سلێمانی مایەوە، بەڵام زۆربەی پیاوەکانی لەگەڵ من ناردن. نزیکەی دووسەد کەسێکی دەبێ و هەمووشیان ژیانیان لەسەرئەوە.

لە کوردستاندا بنەماڵەیەکی ئاوها هەبێت، ئێستا بێت و دواتربێت، هەر دەبێ ببێتە خێڵێك. دوان لەوانەی لای ئەو: فەقێ قادر و ئاوڕەهمان ــ عەبدولڕەحمان زۆر هۆگری من ببوون، ئیتر بۆ هەر کوێ بچوومایە، شوێنم دەکەوتن و هەرچیم بکردایە، دەیانکردەوە، خۆ ئەگەر بوەستامایە، لەپاڵمدا دەوەستان، سەیری شتێکم بکردایە، گوێیان دەگرت و پێشەکی سەیری دەموچاومیان دەکرد، پاشان سەیری ئەو شوێنەیان دەکرد کە من سەیری دەکەم... بەکورتی لە سێبەر نزیکتر بەدوامەوە بوون.

ئەمشەو (ئاوڵا ــ عەبدوڵلا)ی کوڕە بچووکەکەی عومەرئاغا، گەیشتە چادرگەکەمان کە کوڕێکی حەوت ساڵان دەبوو، منداڵێکی تریشی لەگەڵدا بوو، زۆر لەخۆی گەورەتر نەبوو، مۆڵەتی لە باوکی خواستبوو بۆئەوەی لەگەڵمدا بێت. هەر لەدوای مۆڵەت وەرگرتنەکەش، لەسەر نانخواردن، خۆی لە باوکی دزیبۆوە و کەلوپەلە کەمەکانی کۆکردبووەوە و کردبووی بەزینی ئەسپەکەیەوە و بەپەلە هاتبوو، تا بەیەك قۆناغ ئەو ماوەیەی بڕیبوو، کە ئێمە، بەدوو قۆناغ نەبوایە، بۆمان نەدەبڕدرا.

گەرما لە شەشی بەیانیدا (٥٦ پلە) بوو، لە دووی دوای نیوەڕۆدا (٨٤ پلە) بوو، لە دەی شەودا (٤٦پلە) بوو.

## ٣٢ی تشرینی یەکەم

لە شەش و نیوی بەیانیدا بەدۆڵێکدا دەرچووین لە نێوان هێڵێکی بچووکی شاخێکدا بوو، ڕاستەوخۆ دەکەوێتە پشت (دەرگەزێن)ەوە و هێڵێکی تر بەرامبەر ئەویش بوو، لە باکووری خۆرهەڵاتەوە لە (دەربەند)ەوە ڕووەو (بازیان) دەچوو. لە حەوت و بیست دەقیقەدا بە (دەربەند)دا تێپەڕبووین، چینەکانی کێوەکە، لە هەموولایەکی کێوەکە، ڕووەو دەربەندەکە هاتبوون و وەك ئەوە وابوون بیانەوێ گەرووەکە پێك بهێنن. لە دەرەوەی دەربەندەکە یەکسەر چینی بەردینی هاوتەریبی شاخەکە، بەرزببوونەوە، کە لەوە دەچوو هەر پارچەی ئەوبن، دیوی ئەولاشیان هەمووی لەبن شاخەکەدا بوون و تەواوکەری کێوی (قەرەداخ)(٢٦١) بوون.

چینەکان بەشێوەیەکی سەیر، پێچ و لوولیان خواردبوو. لە دەرکی گەرووەکەدا کەلاوەیەکی چوارگۆشە هەبوو، لە قەڵا دەچوو، بیرێکیش لەناویدا بوو، لەم ڕۆژانەی دواییدا دۆزیبوویانەوە، دیوارەکانیشی لەبەردی گەورە گەورە دروستکرابوون.

لە گەرووی دەربەندەکەوە ڕووەو باشووری خۆرئاوا ڕێمان دەکرد، هێڵی کێوەکانی (کیشەخان) و (قەرەحەسەن)ی بچکۆلە و سنوورداریش لەبەردەمماندا بەرزببوونەوە، کە بەرەو باکووری خۆرئاوا و باشووری خۆرهەڵات کشابوون. ئێستا لای ڕاستمانەوە ئاستی ڕووی خاك، نزم و سەخت و خراپ دەبوو، لەوە دەچوو نزمبوونەوەکەی بەڕادەیەك قووڵ بێت، بگاتە سەد پێ. ئاڵوگۆڕەکەش زۆر سەیر و سەمەرە بوو، کە پڕی ببوو لە هێڵی هاوتەریبی تەموخ و

---

٢٦١- (قەرەداخ)، تا (دەربەندی بازیان) درێژ دەبێتەوە، پاش ئەوەش کەمێکی تر ڕاست وەك دیوارێك درێژ دەبێتەوە و ڕووەو خۆرئاوا دەکشێ و (چەرمەلا) پێکدێنێ، پاشان زۆر بەرەوخوار وەردەسووڕێتەوە و بانی (بانی خاڵ خاڵان) دروست دەکات. لە (سەگرمە)شەوە، کە زۆر بەرزەو بەسەر چیاکانی ناوچەکەدا دەڕوانێ، بەدرێژایی بانەکان، بەرزایی (قەرەداغ) کەمتر دەبێتەوە. بەڵام (چەرمەلا) و (خاڵ خاڵان) زۆر بەرز نین و وا دەردەکەوێ کە خاکەکەیان گڵین بێ، چونکە لاپاڵەکانیان دابڕدابڕ و شەقارشەقار بوو. دوای ماوەیەکیش یەکسەر، ئەم هێڵە زوورگە دوایی دێت. (ئاقچەلەر)یش ناوچەیەکە دەکەوێتە پشتی (چەرمەلا)وە و ڕووباری (کۆیسنجاق) درێژ دەبێتەوە و بریتییە لە (١٠) دە گوند.

کەلێنی چوون یەك، هەمووشیان لە باکووری خۆرئاوە بۆ باشووری خۆرهەڵات کشابوون. ئەمیش وەك هەموو ئەو چینانەی تر، کە بەلایاندا تێپەڕبووین، ڕووەو خۆرهەڵات بەرز دەبووەوە و بەڕووکاری خۆرئاواشدا، لێژاییەکی زۆر، شۆڕ دەبووەوە. بنی ئەم چاڵاییە شەقارشەقاربوو، ئاوی باراناو خەتخەتی کردبوو، مرۆڤ بەئاشکرا لە زۆربەی ئەو شەقارشەقار و خەتانەدا، شوێنەواری نیتراتی پۆتاسی دەبینی. ڕەنگی خاکەکەش بەتێکڕایی سوورێکی تێری مەیلەو ڕەش بوو. لە حەوت و نیودا بۆی داگەڕاین و بەدرێژایی قۆناغی ئەمڕۆمان، هەر پیایدا ڕێمان دەکرد.

دوای تاوێ هاتینە گوندی (شێخ وەیسی)ی بچووك، لە ناوچەی (شوان). لێرە هەستمان بەخۆمان کرد کە کەمێك لە ڕێگاکە لامان داوە، بۆیە ڕووەو باشوور، بە (٥٤پلە) لامانکردەوە بۆئەوەی بچینەوە سەر ڕاستە ڕێگاکە.

لە گوێ چەمێکی بچووك، ژاڵەیەکی زۆرمان دی. لە هەشت و چل و پێنج دەقیقەدا چووینەوە سەر ڕاستە ڕێگاکە. زەوییەکەی دەوروپشتمان دیمەنێکی زۆر سەیری هەبوو، دەت وت هێڵی خوار خواری لە چینە تەموخ لەسەر کێشراوە و شەقارشەقاریش بوو، بەوجۆرەش کەمێك لە تێکڕای زەوییەکە بەرزتر ببووەوە.

لە دە و نیودا گەیشتینە گوندی (غەزالان)ی(٢٦٢)گەورە و هەندێ جوولەکەمان تێدا دی. وا پێدەچێ دانیشتووانی ئەم ناوچەیە سەر بە (چراغ سۆندیرەن)، واتە: چرا کوژێنەوە ــ بن. کەمێك دوای ئەوەی لە ئاقاری گوندەکە دەرچووین، دیسان ڕووی زەوی دەستی بە بەرزبوونەوە کرد. ئیتر ڕێگاکەمان بووە بەردەڵانییەکی شاخاویی و لە دوازدە و دە دەقیقەدا گەیشتینە شوێن قۆناغی ئەمڕۆمان، کە گوندی (گووڵووم کەوە ــ GHULUM KAWA)(٢٦٣)بوو، لە ناوچەی (شوان)، کە پێنج سەعات و چل دەقیقە ڕێمان کردبوو.

---

٢٦٢- ڕاستییەکەی (غەزەوان Gazavan)ە. وەك لە نەخشە تازەکاندا هەیە ــ ع.

٢٦٣- لە دەقەکەدا وا هاتووە. وشەکەش لە نەخشە تازەکاندا بە (غولام کاوا Ghulam Kawa)هاتووە، کە لەشێوەی کوردییەکەوە نزیکترە، کە (گوڵنکەوە)یە. لە گەشتەکەی (المُنشيو البغدادي)یشدا بە (گڵەکەوە)هاتووە. هەروەها (منشيو) ناوی (گڵ کەبود)یشی لەلاپەڕە ٧٥ی گەشتەکەیدا هێناوە. بەڵام ڕیچ لە گەشتەکەیدا ناوی نەهێناوە، ئێمەش بۆمان لێنەکۆڵرایەوە و لە نەخشەشدا نەمان دۆزییەوە. لەوەش دەچێ ناوەکە هەر وەرگێراو بێت بۆ (گۆلونکەوە) ــ ع.

ڕێکردنی ئەمڕۆشمان ناخۆش بوو، چونکە ڕێگاکە ماندووکەر و سەخت بوو. لەم شوێنەمانەوە زوورگەکانی کەرکووکمان دەدی، وەك هەردەیەك دەهاتنە بەرچاو، پان ببووەوە و تا دەهات بەرەو لای ئەو زەوییەی دەکەوتە نێوان ئەو زوورگانە و (دەربەند)ەوە، پلەپلە و شەقارشەقار و خەتخەتاوی دەینواند.

گەرما، لە شەشی بەیانیدا (٢٦پلە) و لە دووی دوای نیوەڕۆدا (٤٨پلە) و لە دەی شەودا (٤٦پلە) بوو.

## ٢٤ی تشرینی یەکەم

وەك ئاسایی، لە شەش چارەکێك کەمدا، سواری ئەسپەکانمان بووینەوە. لەو دۆڵە تەنگەوە کە (گوولۆونکەوە)ی تێدایە. کە ڕووی زەوی لە خۆڵ و چەو تێکەڵ بوو، بەسەر ئەو خەتخەتی تەمۆخەدا سەرکەوتین، دوێنێ لە هەموو نشێوییەکدا دەماندی، بەڵام ڕەنگی خاك بەو سوورییەی پێشووی نەمابوو. لێرەدا ئەم بەشەی زەوی، زوورگاوی بوو، کە من پێم وا نییە هەموو جێگایەکی ئاوا بەردەڵانیتر، بەمجۆرە سەخت و قووڵییان هەبێ و چەمی قووڵیشیان پێدا تێپەڕ بێت، کە لە هەندێ شوێندا دەگەیشتە (٠٦) پێ، زەویش لەم ناوەدا ئەگەر قووڵاییشی بەم ڕادەیە بێت، بەڵام لە خۆڵ زیاتر چینەکانی خۆی دەرناخات و تەمۆخیشی پێوە دیارنییە. ئەو چەوەش کە بینیم، یان لە مەڕمەڕ، یان گەچۆڕ، یان بەردە قسڵ بوو.

تاوێ دوای دەرچوونمان لە (گوولۆونکەوە) بە کەمێك نارەحەتیی، لە دوو دۆڵی قووڵمان دا، بەڵام پێدا هەڵگەڕانیان، لە پێدا هاتنەخوارەوەیان کووڕتربوو.

هێشتا هەر لە ناوچەی (شوان) داین و سەریشم لە چۆنێتی بەڕێوەبردنی دەرنەدەکرد، چونکە ناوچەکە سەر بە کەرکووك بوو، بەڵام گوندنشینەکانی سەر بە کوردستان بوون، ئەم ناوچەیەش بۆ کاروباری خۆی، جاری وا هەیە سەر لە سلێمانی دەدات و جاری واش هەیە سەر لە کۆیسنجاق دەدات. ڕێگاکەمان لە (گوولۆونکەوە)وە بۆ لای ئەم ناوچە زوورگاوییە شەقارشەقار، لای دەکردەوە، کە ئەمەش لەڕاستیدا هەر درێژبوونەوە بوو بۆ (قەرەحەسەن )، کە لەم حاڵەتەی ئێستایدا، لە هەندێ درەختی بچووك زیاتر لە دۆڵەکانیدا، ئیتر مرۆڤ هەرچۆنێ چاوبگێڕێ، سەوزایی تێدا نابینێ، تەواو ڕووتەن و قاقڕە، زۆرمان یادی دۆڵە دڵگیرەکانی کوردستان کردەوە، ئەو دۆڵە جوانانەی لە وەرزی وشك بوونیشیاندا هەر جوانن. گودرون هێشتا سەروگەردەنە بەرزەکەی هەر دیاربوو.

ئەو ئاوانەی دوێنێ دیمانن، ئەمڕۆش دیمانن، لای چەپمانەوە ڕێیان دەکرد. لە شەش و نیودا ڕێگاکەمان کەمێك لەو ڕێگایە لایدا، کە بۆ کەرکوك دەچێت. کەمێك دوای هەشت ناچاربووین تاوێ ڕاوەستین، تا نالێکی ئەسپەکەم چاك بکەینەوە، کە لە سمی ئەسپەکەم کەوتبوو. (خاڵخاڵان و کۆیسنجاق)یش هەردووکیان بەتەواوی دەکەوتنە باکووری ئێمەوە.

لە هەشت و نیودا دەستمان بەڕۆیشتن کردەوە. لەم ناوە زەوی کەمتر شەقارشەقار ببوو، یان شەقارشەقاربوونەکەی وەك ئەوەی پێشووی نەبوو. لە نۆ و پەنجا دەقیقەدا گەیشتینە گوندی (قەفار)، کە کۆتایی قۆناغی ئەمڕۆمان بوو. زۆربەی گوندنشینەکانی، لە نزیك گوندەکەوە، لە چادردا بوون. ناوچەکەش و خەڵکەکەش لێرە، سەر بە کەرکووك بوون، ئەمڕۆ سێ سەعات و سیی و پێنج دەقیقە ڕێمانکردبوو.

شەوی ڕابووردوو عومەرئاغا پێمان گەیشتەوە و ئاگاداری کردین کە (عوسمان بەگ) لەم دواییەدا ڕازی بووە بۆ (کۆیسنجاق) بچێت. عومەرئاغای بەسزمان لە داواکردنەوەی گوندەکانیدا سەرنەکەوتبوو، هەموو پیاوەکانی و کەسوکارەکانی و خێزانەکەشیانی، (جگە لە ئافرەتیان) هێنابوو. منیش هەموو توانای خۆم دەخەمە پێناوی.

گەرما لە شەشی بەیانیدا (٥٠پلە) و لە دووی دوای نیوەڕۆدا (٨٨ پلە) بوو.

## ٢٥ی تشرینی یەکەم

ئەم بەیانییە لە شەشدا کەوتینەڕێ، سەمتی ڕۆیشتنەکەشمان (٣٠پلە) بەلای باکووری خۆرئاوادا بوو. بۆ ناو دۆڵێك، چەمێکی پێدا دەڕۆیشت، گوندێکی زۆری پاراو دەکرد و ئاشێکی زۆری دەگێڕا، کە قولیپی بچکۆلەیان بەسەرەوە بوو، هەندێ درەختیش دەوری دابوون. شێوەیان لە کەنیسەی گوند دەچوو. لێرە بەولاوە دۆڵەکە لای دەکردەوە و ڕووەو دەشتەکەش پانتر دەبوو، وا پێدەچێ ئەوە دەشتی (کۆك دەرە) بێ و چەمەکەش دەڕژێتە (کوپری سۆ)ەوە. بەلای گوندێکی زۆردا تێپەڕبووین، لەوانە گوندێکی گەورە، ناوی (عومەربەگ) بوو. لێرەوە گەیشتینە دەشتێکی بەرین و جوان، هەرچەندە ڕووەکەی هێشتا چەواوی بوو، بەڵام کشتوکاڵێکی زۆری تێداکرابوو، خاکەکەیشی بۆ بەرهەمهێنانی دانەوێڵە بەبڕشت بوو. لە هەموو لایەکەوە گوندی گەورە هەبوون. یەکێك لەم گوندانە لە سەرەتای دەشتەکەدا بوو، گردێکی توورەکەڕێژی بچکۆلەی لە نزیکەوە بوو، بەڵام نەمتوانی بزانم ناوی

چییە، زوورگەکانی (قیزبیر ــ KIZBEER)یش(٢٦٤) لە بەرامبەرمانەوە بوون کە بۆلای چەپمان دەکشان و دەشتەکەش هەتا لاپاڵەکانیان دەچوو. بەڵام لای ڕاستمانەوە ئەو زەوییە زوورگاوییە شەقارشەقارە، دەکشا، کە ئێستا جێمان هێشت. لە حەوتدا بەگوندی (کۆك تەپە)دا(٢٦٥) تێپەڕبووین. لای چەپیشمانەوە گردێکی توورەکەڕێژ هەبوو، بەتەواوی ڕووی دەکردە خۆرئاوا و میلێك کەمتریش لەولای ڕێگاکەمانەوە بوو. گردەکە لە هەرەمێکی ناتەواو دەچوو، لە تەنیشتی خۆرئاوایەوە گردێکی لەو نزمتر هەبوو، دیمەنەکەیان لە ئاسەوارەکانی (بابل) دەچوو. نزیکەی نیو سەعاتێکی دواتر، بەلای گردێکی تری توورەکەڕێژدا تێپەڕبووین، لە ڕێگاکەمانەوە نزیك بوو. لە نێوەڕۆدا گەیشتینە (ئاڵتوون کۆپری ــ پردێ)(٢٦٦).

(ئەمڕۆ زۆر گەرم بوو، قۆناغی ئەمڕۆشمان درێژبوو، وەك چاوەڕێم دەکرد، شەش سەعات و نیوی خایاند.

ڕووەو ڕووبارەکە بەسەر زەوییەکدا داگەڕاین، کە چەوی گەورە گەورەی تێدابوو. بەردەکانی ڕووبارەکە و ئەوانەی بنەکەیشی چەوی چەوەلە و ڕەقەن بوون. تا ڕووەو ڕووبارەکەش شۆڕبنەبیتەوە، شارەکەت لێ دەرناکەوێ. لەبەری خواروی، سەربازگەیەکمان دی، تۆپخانەیەکی گەورە و قورس و بیابانییان پێبوو، تازە لە ئەستەموولەوە گەیشتبوو، بۆ پاشای بەغدا نێردرابوون، کە بەکاریان بهێنێ. ئەم تۆپخانەیە بریتی بوو لە چوار بەتالیۆن و لقێکیش تۆپی قورس و پازدە تۆپی بیابان و باری پێنج سەد حوشتریش تەقەمەنی. بەسەر پردە تازە ڕێ ڕێکەدا تێپەڕبووین، کە لەم دواییەدا چاککرابووەوە، پاشان بەناو شاردا تێپەڕین و دوایی لە پردێکی تر پەڕینەوە و چووین لە تەختاییەکی نزیك گەڕەکەکانی لای ڕاست، واتە لای باکووری خۆرئاوای شارەوە، چادرمان هەڵدا.

---

٢٦٤- وەرگێڕ ئەم ناوەی بۆ ساغ نەکرایەوە. لە دەقەکەشدا جارێك بە (قیزبیر) و جارێك بە (کی بیر) هاتووە. بەڵام بە وەسفەکەی نووسەردا وادیارە مەبەستی لە شاخەکانی (ئاوانەداخ) بێت، ئەو زنجیرەیەی بە هاوتەریبی ڕێگای (ئاڵتوون کۆپری) ــ (گوێر)دا ڕاستەوخۆ بۆ خۆرهەڵاتی (قەرەچوق داخ) درێژ دەبێتەوە، ئێستا خەڵکیش پێی دەڵێن (زوورگەزەرا). ئەمەش زیاتر وەسفە، وەك لەوەی ناوبێت.

تێبینی: ڕاستییەکەی (زوورگەزراو)ە. (م)

٢٦٥- وەرگێڕ زانیوێتی کە ئێستا ئەم گوندە جگە لە گردۆڵکەیەك، کە پێی دەڵێن (کۆك تەپە) هیچ ئاسەوارێکی نەماوە. بەوەسفی نووسەریشدا وادیارە ئەم گوندە کاتی خۆی لە نزیك گوندی (گۆکجە)ی ئێستاوە بووبێت-ع.

٢٦٦- ئاڵتوون سۆ)، یان (کابروس)ی کۆن، (أبو الفداو) ناوی ناوە: زێی بچووك.

ڕووباری (دیجلە)، ماوەی هەژدە سەعات لە (ئاڵتوون کۆپری)وە، دوور دەبێ ئەگەر ئاوی ڕووبارەکەش هەڵسێ، دەتوانرێ ئەو ماوەیە بە کەڵەك، بەرۆژێك ببڕدرێ. بەڵام لەم وەرزەی ساڵدا، گەیشتنە (دیجلە) سێ ڕۆژ دەخایەنێ. تۆپخانەکەش کە باسمان کرد(٢٦٧)، لە نزیك بەستێك، کە لە ناوەڕاستی ڕووبارەکەدا بوو لێژببووەوە، لە ئاوەکەی دا و ئاوەکەش سێ و چوار پێ قوولْ دەبوو، کۆیسنجاقیش (٥٣پلە) دەکەوتە لای باکووری خۆرهەلاتەوە، بەپێی ئەسپێکی خێرا، دوازدە سەعات و بەپێی کاروانییش هەژدە سەعات دەبوو. لێرەشەوە دوو ڕێگەی هەبوو، یەکێکیان بەرۆخی لای ڕاستی ئەو ڕووبارەی کە دوای شەش سەعاتە ڕێ، لە کۆیسنجاق-وە لێی جیا دەبێتەوە و هەموویشی زوورگاوی و شەقارشەقارە. شاخیش نایەتە ڕێی. لەبەری لای ڕاستی ڕووبارەکە و کەمێکیش لەخوار ئەو پردەوەی دیمان، هەندێ شوێنی حەسانەوە و (سایلو ـــ هیزرە)ی دانەوێڵە و شتی ترمان دی... لەم شوێنەدا باری ئەو کەڵەکانە خاڵی دەکەنەوە، کە لە کۆیسنجاق-ەوە دێن و هی تریش بۆ ئەوێ و بۆ (بەغدا)ی لێ باردەکرێ. ڕووبارەکە بۆ کەڵەکەوانیی نێوان کۆیسنجاق و دیجلەش دەست دەدات. پانتایی ڕووبارەکە لە سەرووی شارەوە، نزیکەی میلێك دەبێ، کە بەدووبەش دێت و پاش ئەوەی بەدەوری شاردا دێن و وەك دوورگەی لێدەکەن، لەخوار شارەوە لێك دەدەنەوە. هەردوو بەشەکە بچووکیش نین. هەندێ جاریش لە بەهاراندا، ڕووبارەکە خانوویەکی زۆر ڕادەماڵێ. ئیتر ئەوکاتە هەموو دەوری شار دەبێتە ئاو و هەردووبەشەکەش دەبن بەیەك. ڕووبارەکە لە تەنیشتی لای پردە گەورەکەوە بە خەرەندێکی بەردیندا تێپەڕ دەبێ، کە بەرزاییان لەگەڵ پردەکەدا وەکو یەکە، پاشان خەرەندە بەرزەکە تا ماوەی چارەکە میلێك لادەدا و ئیتر دوای ئەوە وردە وردە بەرزتر دەبێتەوە. لە تەنیشتی لای باکووریەوە، دەشتێکی لمینی بەردەلانی هەیە، کە میلێك لەولاوەترەوە زوورگی شەقارشەقار دەوری داوە، وا پێدەچێ ئەم پانتاییە لە سەردەمێکدا، تا سنووری لای زوورگەکانی بوویێت بەژێر ئاوهەڵسانی ڕووبارەکەوە. زوورگەکانی (کی بیر)یش(٢٦٨)، بە لووتکە تەخت و لاپاڵە شەقارشەقارەکانییەوە، لای چەپمانەوە دەوری دابووین. دەڵێن لە ناوچەی (شەمامك)ی کوردی دواییان دێت و لەپشت ئەم زوورگانەشەوە، بەو سەمتەی ڕووبارەکە پێدا دەڕوات، لە نێوانیانەوە (قەرەجوق) دەبینین.

---

٢٦٧- ئەم هێزە لە زێی گەورەیشی دا.

٢٦٨- بڕوانە پەراوێزی ژمارە (٧)ی ئەم بەشە.

پلەی گەرما، لە شەشی بەیانیدا (٩٥پلە) و لەدوای نیوەڕۆدا (٩٠پلە) و لە شەویشدا (٢٦) پلە، بوو.

## ٦٢ی تشرینی یەکەم

لە شەشی بەیانیدا ڕووەو خۆرئاوا دەستمان بەڕۆیشتن کردەوە بەناوچەیەکدا کە دەکەوتە نێوان ڕووبارەکە و زوورگە شەقارشەقارەکانەوە، یان ئەو زەوییە بڵندەی لەسەروو شارەوە دەست پێدەکات و دەکشێ و لەو زەوییە لمینە دووردەکەوێتەوە، کە جێمان هێشت و سەرلەنوێ لە زوورگەکانی (کی بیر)ەوە دەست پێدەکەنەوە. لە شەش و بیست دەقیقەدا ڕێگاکەمان بۆ (شەمامك) لایدا و بۆ لای چەپ دوورکەوتەوە. دوای تاوێ گەیشتینە کۆتایی ناوچەکە. ئیتر لێرەوە زوورگە لمینە دابڕاوەکانمان بینی. لە پشت ئەمانەوە تا دەهات وردە وردە زەوی بەرزتر دەبووەوە. زەوییەکەی لای چەپیشمانەوە، تا دەهات ڕووەو زوورگە لمینەکانی (کی بیر) خەتخەت و بڵندتر دەبووەوە. لای ڕاستیشمانەوە ئەو زەوییە زوورگاوییە شەقارشەقارە بوو، کە جێمان هێشت و لێرەوە پێیان دەوت (هەڵەجە و بستانە)، کە ناوچەیەك بوو سەر بە (کۆیسنجاق) بوو(٢٦٩).

لەپشت ئەمیشەوە شاخی (ئەزمڕ)مان دەبینی، زۆر لەپشت ئەویشەوە شاخی تری بەرز دیاربوون.

بەگوندی (مەخزومە)دا تێپەڕبووین، کە دەکەوتە لای چەپمانەوە، چەمێکی بچووکیش دەڕژایە (ئاڵتوون سو)(٢٧٠)وە.

وا دیاربوو ئەو ڕێیەی بەسەریدا دەڕۆیشتین کاتی خۆی، بۆ نیشانەی ڕێگاکە، گردۆڵکەی بچووکی توورەکەڕێژ و لە یەکتر دووری تێدابوو، کە هەندێکیانمان بینی. ئەگەرچی زەوی کەمێك چەوەلانی بوو، بەڵام دەشتێکی چاك بوو، تا (کی بیر) و (هەڵەجە و بستانە) دەکشا. لای چەپ و ڕاستیشمانەوە گوندی زۆر و مەزرای زۆر و گوندنشینمان دەبینین خەریکی، جووت و کارکردن بوون.

---

٢٦٩- ئێستا سەر بەناحیەی (قوشتەپە)ن، کە بۆتە ناحیەی ناوەندی (ئەربیل ــ هەولێر) ــ ع.

٢٧٠- پێم وایە هەڵەیە ئەگەر ئەم ڕووبارە ناوبنرێ (ئاڵتون). وشەکەش لەوە زیاتر کە ناوبووە بـۆ پردەکـە، هیچی تر نەبووە، چونکە پارەیەکی زۆر چۆتە دروستکردنی. ئاڵتونیش بەمانای زێڕ، یان پارە دێت.

له ده دا گەیشتینە هەوارەگەی (فارس ئاغا)ی سەرداری هۆزی (دزەیی)، لە گوندی (قوشتەپە)، ناوەکەش لەناوی یەکێك لەو زوورگە بچووکانەوە هاتووە کە باسمانکرد. هۆزی (دزەیی)ش کاتی خۆی سەر بە کۆیسنجاق بوو، بەڵام پاشای بەغدا لە (کۆیسنجاق) و (ئەربیل ــ هەولێر)ی جیاکردەوە و یەکسەر خستییە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە. لەبەرئەوەیە ئەم هۆزە گوێ بەکەس نادات. فارس ئاغا ئازوخەچییەکەمانی دەرکردبوو، پێی وتبوو: نە سەر بە وەزیری بەغدا و نە بەپاشای کوردستان و نە بەپاشای ئێرانە، بەڵکو خۆی سەرداری خۆیەتی و لە وڵاتی خۆیدا دەژی و میوانیش ڕاناگرێ. لەبەرئەوە چاکتر وایە بچین بۆ (ئەربیل). ئیتر بێ هیوا بووین، هەر بەڕاستیش چاکتر بوو هەر ڕێ بکەین، چونکە ڕۆژێکمان بۆ دەگەڕێتەوە. بۆیە دوای ڕاوەستانێکی کەم، دەستمان بەڕۆیشتن کردەوە.

لە یازدە و نیودا لای جۆگەیەکی بچووك دابەزین، بۆئەوەی فنجانێ قاوە بخۆینەوە، بەڵام باروبنەکان ماوەیەك لێمان دوورکەوتنەوە، پاشان لە دوازدەدا سواربووینەوە و ڕووەو باکوور دەستمان بەڕۆیشتن کردەوە. لە یەك و نیوی دوای نیوەڕۆدا (١٠پلە بەلای باکووری خۆرهەڵاتدا) هەولێرمان لێدەرکەوت. دوای تاوێ ئاشکراتر دەرکەوت لێرەدا

وێنەیەکیم(٢٧١)کێشا. دیمەنی گردە توورەکەڕێژەکە، کە ڕەنگە کاتی خۆی گۆڕستانی (ئەرساسیدی)یەکان بووبێ و ئەو قەڵایەی بەسەریدا دەڕوانێ و لە پشتیشیەوە کێوەکانی (کوردوشین)ەکان، دیمەنێکی ڕەنگین و جوان بوو. لە نزیك شار، جێگری فەرمانڕەواکەی، بەخۆی و چل، پەنجا سوارەی توورکەوە پێشوازیی لێکردین، کە لێپرسراو و تەپڵژەنەکانیان لە پێشیانەوە بوون. ئەم پێشوازیی لێکردنەم بەپێویست نەدەزانی، چونکە پێش ئەوەی دابەزین، تەپوتۆز، خەریك بوو دەیخنکاندین. لە سێ و نیودا گەیشتینە جێگاکەمان. ئەمڕۆ هەشت سەعات و چل دەقیقە ڕێمانکردبوو.

چادرگەکەمان لای (کەهرێز)، یان جۆگە ئاوێك هەڵدا، هی (حاجی جاسم بەگ)(٢٧٢)بوو.

کەمێك لە دامێنی خۆرئاوای شارەوە بوو. پێش ئێمەش کۆمەڵێکی بچکۆلەی هۆزی (حەرب)ی عەرەب، هەواریان تێدا هەڵدابوو. وەك بۆم دەرکەوتووە، بەپێی ئەو دوا ناسینەی من، عەرەب خەڵکێکی چەپەڵ و ڕوو زەرد و ئێسك گرانن، بەڵام دانیشتووانی هەولێر، کورد و تورکن.

ئەمڕۆ بەدەم ڕێگاوە تووشی کاروانێك بووین، بەرەو بەغدا دەچوو، پیاز و تۆو پیازی پێبوو. لە هەولێر (حوسێن ئاغا)ی خانەخۆیی دێرینەم چاوەڕێی دەکردم، کە پاشای مووسڵ، بۆ یاوەریی کردنم ناردبووی. بڕیارم دابوو دوو سێ ڕۆژ لە هەولێر بمێنمەوە، بۆئەوەی کۆمەڵەکەمان بحەسێنەوە و هێستری تریش بکڕین و ماڵئاواییش لە (عومەرئاغا)(٢٧٣) بکەین.

پلەی گەرما، لە پێنجی بەیانیدا ٨٥ پلە و لە دووی دوای نیوەڕۆدا (٤٩) پلە و لە دەی شەویشدا ٥٩پلە بوو.

---

٢٧١- بڕوانە: (وێنەی شاری هەولێر).

٢٧٢- تائێستا ئەم کارێزە هەر بەناوی کارێزی (قاسم ئاغا)وەیە، کە باوکی خوالێخۆشبوو(یەعقووب ئاغای گەورە)یە و یەکێکە لە خانەدان و شاعیرە دیارەکانی هەولێر ـــ ع.

٢٧٣- ئیتر لێرە بەدواوە ناوی ئەم کەسە شەریفەمان بەرچاو ناکەوێ. لە هەولێر لەگەڵ میستەر ڕیچدا، لە یەکتر جیابوونەتەوە و پیاهەڵدانیش لە وەسفیدا، جێی خەمگینییە. بێدەنگیی یادداشتەکانی میستەر ڕیچیش نیشانەی دڵتەنگییە.

## ٢٧ی تشرینی یەکەم

لەبەرەبەیاندا هەستام و گورج دەستم بەکارەکانم کرد(٢٧٤).لەپێشدا بۆ لای منارەکە چووم، کە دیارترین شت بوو لەناو شاردا، بەڵام مزگەوتەکەی ڕووخاوە و کەلاوەیە(٢٧٥)، بنچینەکەیشی هەڵتەکێنراوە و بەرد و خشتەکانی لێ دەرهێنراون. منارەکە سەد و بیست و یەك پێ بەرزە، لەسەر سەکۆیەکی هەشت گۆشەیی هەڵچنراوە، کە درێژیی هەر گۆشەیەکی ٩ پێ و (١٠گرێ)یە، بەرزایشی سیی، چل پێ دەبێ. لەناو چێوەیەکدا دوو پلیکانەی پێچاوپێچ هەن، کە تا دەگەنە سەر بیڵلاکەی سەرەوە، بەیەك ناگەن. بیڵلاکەش لەگەڵ هەندێ لە لووتکەی منارەکەدا ڕووخاوە و هەو ئەوپایەی ماوەتەوە، کە لە بیڵلاکەوە بەرزدەبێتەوە. منارەکە لەسەر شێوەی منارەکەی (تاووق) دروستکراوە و وا پێدەچێ هی سەردەمی خولەفاکان بێت، یان هی سەردەمی فەرمانڕەواکانی هەولێر بێت. پاشماوەی وارش و بناغەکەش دیارن، بەتایبەتی لە تەنیشت چادرگەکەمانەوە کە لە نزیکیەوە هەڵماندا. وا دیارە کاتی خۆی شارەکە زۆر بەرین بووبێ، یان ڕەنگە ئەوەندەی بەغدای ئێستا بووبێ.

هەولێر، کەوتۆتە لاپاڵی گردە توورەکەڕێژەکەوە، بەتایبەتیش کەوتۆتە بەشی لای خوارووییەوە. تەنیا گەرماوێکی تێدایە، لەگەڵ چەند خان و چەند بازاڕدا. بەشێکیش لە شارەکە دەکەوێتە سەر گردە توورەکەڕێژەکە و بەمە دەڵێن قەڵا. لای خۆرهەڵاتی شاریشەوە، یان کەمێك بەلای باکووری، چاڵاییەك هەیە، پێی دەوترێ: (چەکونەم)، دەڵێن کاتێ (تەیموری لەنگ) ئابڵوقەی هەولێری دابوو، چادرەکەی تێدا هەڵدابوو، شێخێکی ئایینی هەولێرییش ترسولەرز لەناو سوپاکەیدا بڵاودەکاتەوە و سوپاکەی بڵاوەی لێدەکات. ئیتر تەیموری لەنگیش لەوکاتەدا بە فارسی هاواری کردووە (چەکونەم)، واتە: چی بکەم؟. ئیتر زاراوەکە بۆتە ناو، بۆ دۆڵەکە(٢٧٦).

پلەی گەرما، لە پێنجی بەیانیدا (٢٥پلە) و لە دووی دوای نیوەڕۆدا (٩٠پلە) و لە دەی شەویشدا (٤٦پلە) بوو.

---

٢٧٤- بڕوانە (پاشکۆی دووەم).

٢٧٥- ئێستا ئەم کەلاوانە شوێنەواریشیان نییە. زەوییەکەی بەدەست خەڵکەوەیە و کردوویانەتە کشتوکاڵ ـــ ع.

٢٧٦- ئەمە ئەفسانەیە و پێشتر نەمان بیستووە ـــ ع.

## ٨٢ی تشرینی یەکەم

ئەمڕۆ چەندجارێك چوومەوە بەلای پشکنینەکانمەوە. خەڵکێکی زۆری (ئەربیللی)ش لە شێوەی نیو بازنەدا بەدەورمدا ڕادەوەستان، قەننەکانیشیان بەدەست و لێویانەوە بوون و لەناوخۆیاندا باسی ئەوەیان دەکرد کە ئاخۆ چی دەکەم، بەڵام هەرگیز کەسیان بێزاریان نەکردم. کاتێ کە (دی لامیر)م لەم کاتەدا دەهاتەوە یاد، خۆم بە (دی لامیر) دەهاتە بەرچاو، لەپاڵ پاریس دا (گەر بەراووردەکە ڕاست بێت)، بۆیە نەمدەتوانی زەردەخەنەکەم بشارمەوە هەرچەندە جیاوازیمان لەوەدا هەیە، کە من بەتاقی تەنیا و بێ پاسەوان و نۆکەر، لەناو ئەم کەش و هەوا نامۆ ومەترسیدار و دواکەوتووە دام.

من وام دادەنا کە بەرزایی گردە توورەکەڕێژەکە، کە قەڵای (ئەربیل) بەسەریدا دەیڕوانی، سەد و پەنجا پێ دەبێ و چێوەکەیشی چوارسەد یاردە دەبێ، بەڵام بێگومان کاتی خۆی لەمە بەرزتربووە. ڕێشی تێدەچێ (قارا قەڵلا ـــ CARACALLA) لووتکەکەی تێکدابێ، چونکە وا ڕوویداوە کاتێ (حاجی عەبدوڵلا بەگ)، لەسەر گردە توورەکەڕێژەکە، خانوویەك دروست دەکات، کرێکارەکان گۆڕێکیان لەناو بناغەکەیدا دۆزیوەتەوە، کە تەرمێکی تێدابووە، هیچ جێگایەکی تێك نەچووە، بەڵام هەر ئەوەندەی تەرمەکە، کەمێك هەوای لێداوە، هەڵوەریوە. خۆئەگەر گومانەکەم ڕاست بێت، کە کاتی خۆی ئەم گردە، گۆڕستانی (ئارسا سیدیی)یەکان بووبێ، ئەوا ڕێی تێناچێ ئەو تەرمە، هی یەکێك لە پاشاکانی (برپی) بووبێ؟. حاجی قاسم بەگ پێمی وت کە ژێرەوەی گردەکە، بەش بەشکراوە بۆ تاق، کە بەخشتی گەورە دروستکراوە و نووسینیان لەسەر نییە. (حاجی) بەدڵنیاییەوە ئەمەی بۆ گێڕامەوە، کاتێ کە ژێرخانی ماڵەکەی لە قەڵا، پشکنیوە، ئەو بەرزایی گردەکە بەچل گەزی گەورە دادەنێ.

ئەفسانەیەکی ناوخۆییش هەیە، تایبەتە بە (ئەربیل)ەوە، ئەویش ئەوەیە گوایە (داریوس)(٢٧٧)، ئەربیلی دروستکردووە، ئەمەش هەر لە بناغەوە شتێکی نامۆیە، چونکە هیچ

---

٢٧٧- وشەی (داریوس)، یان (دارا)، وەك وشەی (فیرعەون ) و (قەیسەر)، بەمانای نازناو دێت، نەك ناو. لەبەرئەوە ئەم ئەفسانەیە وادەگەیەنێ کە شارەکە لەلایەن یەکێك لە ئەندامانی ئەو بنەماڵەیەوە دروستکرابێ. **تێبینی**: وەك دیارە لێرەدا (ریچ) مەبەستی لە (داریوش)ی سێیەم (٣٣٦-٣٣٠)ی نەوەی (داریوش)ی دووەمی شای (هەخامەنشی)یە، کە ساڵی (٣٣٣) لە (ئیسۆس) و ساڵی (٣٣٠) لە (گۆگە مەلا)ە لەگەڵ (ئەسکەندەری مەکدۆنی) جەنگاوەو هەمان ساڵی (٣٣٠) لەلایەن فەرمانـدەکانی خۆیەوە کوژاوە. شوێنی (گۆگەمەلا= گۆگە مل)یش لە یاداشتی رۆژی ٣٠ تشرینی یەکەمی-ی دواتری ئەم کتێبەدا باسکراوە.(م)

چیرۆکێکی خۆرهەڵاتییانە، یان مێژوویەکی خۆرهەڵاتی نییە، کە باسی بەپێوەندی (دارا) و (ئەربیل)ەوە هەبێ. خۆرهەڵاتییەکانیش بەگشتی لەبارەی شەڕی (گۆگە مەلا) و ئەربیل هیچ نازانن.

لە دەشتی (ئەربیل)دا کەروێشك و ئاسك زۆرن، لەگەڵ پۆلە (قەتێ)یەکی بێ شوماردا. لەم دەشتە هەلۆی (بالابان)یش ڕاودەکرێ و بەتایبەتی بۆ کوردستان دەنێردرێ.

پلەی گەرما، لە شەشی بەیانیدا (٧٠پلە) و لە دوو و نیوی دوای نیوەڕۆدا (٤٨پلە) و لە دەی شەودا (٤٧پلە) بوو. لای باشووری خۆرهەڵاتەوە (با) هەڵیدەکرد و کەشوهەواش هەوراوی بوو.

## ٩ی تشرینی یەکەم

دوێنێ ڕۆژێکی ناخۆش بوو، چونکە کەشوهەواکەی لەوەی (کرارە)(٢٧٨) دەچوو، (با)ش وەك گێژەڵووکە، لە خۆرهەڵات و خۆرهەڵاتی باشوورەوە هەڵیدەکرد، هەواش پڕبوو لەو تۆزوخۆڵەی هەموو شتێکی داپۆشی و چاو و لووت و دەمیشمانی پڕ کردبووەوە.

ئەمڕۆ لە پێنج و نیوی بەیانیدا ڕووەو باکووری باشوور دەستمان بەڕۆیشتن کردەوە. دوای نزیکەی سەعاتێك بەگوندی (ڕەشکی)دا(٢٧٩) تێپەڕین، کە کەوتبووە لای چەپی ڕێگاکەمانەوە. لێرەوە ڕێگایەکی تر بەلای چەپدا لادەدات و دووبارە لای گوندی (گردەشێر) لەڕێگا سەرەکییەکە دەداتەوە. لەوە دەچوو زەوی هەموو کێڵرابێ و کشتوکاڵیش چاك بێت و هەردە و هەڵەتیشی لەو زەوییە کەمتر هەیە، کە لە خوار (ئەربیل)ەوەیە. گوندنشینەکان خەریکی جووتکردن بوون، کە هەر تەنیا ڕووشاندنێکی کەمی زەوی بوو، گایەکی بچووك و گوێدرێژێکمان دین، گاسنێکیان ڕادەکێشا و هەردووکیشیان بەنیرێکەوە بەسترابوونەوە.

وادیارە شاخەکانی ئەم ناوچەیە ڕووەو خۆرهەڵات لادەکەنەوە و شێوە کەوانەیەك پێکدێنن، پاشان لادەکەنەوە و لای (زێ)دا ڕوودەکەنەوە خۆرئاوا. ئێستا دەتوانم چەند زنجیرەیەك جیابکەمەوە،

---

٢٧٨- (کرارە)، جێگەیەکە لەسەر (دیجلە) و چەند میلێك لە بەغداوە دوورە. میستەر ڕیچ و هاوسەرەکەی کردبوویان بە خوو، دوای وەرزی قرچەی گەرما، لەوێ چادر هەڵدەن. ئەویش لە سەرەتای یەکی تشرینی یەکەمەوە، تا کۆتایی کانوونی دووەم. لەم ماوەیەدا زۆرجار بای خۆرهەڵاتیی باشوور هەڵی دەکرد، بایەکەش لەبەر کاریگەری ناوی هێنرا، بەتایبەتیش بۆ ئەوانەی لەژێر چادردا دەژین -خاریچ.

٢٧٩- ڕاستییەکەی (ڕەشکین)ە ـــ ع.

یەکێکیان زەوییە شەقارشەقارەکەیە، کە ئەمیان هەر درێژبوونەوەی شاخەکانی (شوان)ن، دووەمیشیان زوورگە، کە کەمێك بڵندە و یەك دوو زوورگی تر، لەو بڵندترن. زنجیرەیەکی تریش هەیە، لەبەردەم (زاگرۆس) دایە، کە بەسەر هەموویاندا دەڕوانێ. لەوەدەچێ بەو ترۆپکە بەرز و شەقارشەقارانەیەوە لە هەموو بەرزی و لە هەموو ئەو بەشانەش بەرزتربێ، کە تا ئێستا دیومانن...

وەك پێم وابێ هێڵەکانی شاخەکان، لەچاو ئەوانەی کوردستاندا، زیاتر لەیەك نزیکترن. لەپێشمانەوە چیای (مەقلوب)مان، بینی، کەمێك لەولای چەپیشیەوە شاخی (قەرەجوق) هەبوو، دەڵێن تا (جزیرە) و(ماردین) دەکشا. بۆلای ڕاستی (مەقلوب)یشەوە دوو زنجیرەی ستوونیی زوورگمان دەدی، کە بە (عەقرە ـــ ئاکرێ)دا تێپەڕبوون و لەگەڵ (مەقلوب)دا ناوچەی (ناوکوڕ)یان(٢٨٠)

پێکدەهێنا، کە ناوچەیەکی زۆر دەوڵەمەندە لە هەرێمی (عەمادیە ـــ ئامێدی).

تا بەرەو پێشتریش بچووینایە، ڕووی زەوی زیاتر هەردە و هەڵەت دەینواند، بەڵام زۆر شەقارشەقار نەبوو، زۆریش دیاردەی تایبەتمەندی پێوە دیارنەبوو، ناوبەناوێکیش گردۆڵکەیەك، یان دوو گردۆڵکەی بچووکمان دەبینی. ڕێگاکەش هەروەك ئەو ڕێگایە بوو، کە لە تەنیشتی ئەولای (ئەربیل) دیبووم. لە نزیك هەشت و نیودا بە (گردەشێر)دا تێپەڕبووین، کە قەڵایەکی بچووك بوو. بەسەر گردۆڵکەیەکەوە و گوندێکی بچووکیش لەپاڵ گردۆڵکەکەدا بوو، دەڵێن ئەمە نیوەی ڕێگایە بۆ (زێ). دوای ماوەیەکی کەمیش گوندی (گردەشێر)ی بچووکمان بڕی، کە دەکەوتە لای ڕاستمانەوە. لێرە بەدواوە ئیتر ئاستی زەوی نزم دەبووەوە، ڕووباری (زێ)ش دەکەوتە لای ڕاستمانەوە. گوندی (بەشیر)یش دەکەوتە سەر ڕۆخەکانی. لە یازدەدا گەیشتینە گوندی (کەڵەك)، لەسەر ڕۆخە چەوەلەکەی (زێ)٢٨١ ڕۆخەکەی تری ئەوبەری، بەرامبەر بەم ڕۆخە، لایدەدا و پاشان لەخوار دەراوەکەوە بەرزتر دەبووەوە. لەکاتێکدا ئەو ڕۆخەی ئێمەی لەسەربووین، لایدەدا و بەوە دەشتێکی پێکدەهێنا، پانتاییەکەی لەنێوان میل و نیو میلدا

---

٢٨٠- (ناوکوڕ): وەسفی جێگایەکە، یان باسی ناوچەیەکە. دەشتێکە دەکەوێتە نێوان دوو ڕیزە شاخەوە. ئەو گردانە، یان ئەو زنجیرانەش کە دەکەونە خۆرهەڵاتی (ناوکوڕ)ەوە هەر درێژبوونەوەی (ئەزمڕ)ن و پێیان دەوترێ شاخی (عەقرە ـــ ئاکرێ)، پاشان (ناوکوڕ) و (زەعفەرانییە) و (زاخۆ). ئەمەش دەبێ یەکەمین شاخێك بێت، کە (زەینەفۆن و دە هەزارەکە) بڕیبێتیان. زمانی کوردیش وەك تێکڕای زمانەکانی شاخاویی، لەو زاراوانـەدا دەوڵەمەندە، کە پێوەندییان بەڕێوبان و باری سروشتەوە هەیە.

٢٨١ - کوردەکان و خەڵکی ئەم ناوچانە، بە ڕووباری (زێ) دەڵێن (زەرب). وادیارە عەرەب وشەی (زاب)یان لە زمانی کلدانییەوە وەرگرتبێ و وەك (بوکارت)یش دەڵێ وەرگرتنەکەیان لەجێی خۆیدایەتی و پەسەندە.

دەبوو، کە (زێ) لەم دەشتەدا دەبوو بەدوو و سێ بەشەوە. بۆ ئەو دەشتە شۆڕبووینەوە و لە دوو بەشی (زێ)ماندا و قووڵایی ئاوەکەیان، بەلای زۆریشەوە، لەچەند گرێیەك زیاتر نەدەبوو. لە یازدە و نیودا لای ڕۆخی ڕاستیەوە، کە خەرەندێکی بەردەڵانی بوو، گەیشتینە بەشە سەرەکییەکەی و بەکەلەك لێی پەڕینەوە، بەڵام ئەسپەکانمان و نۆکەرەکان، لای بواری دامێنی ئاوەڕۆکە لێیاندا، کە لەوێدا قووڵایی ئاوەکەی هەر چوار پێ دەبوو. ئاوەڕۆکەش تامەودایەکی پان، تەخت بوو، پانتایی ڕووبارەکەش لەو شوێنەوە کە لێماندا، لە تەسکترین جێگایدا، لە چوارسەد پێ زیاتر نەدەبوو، بەڵام قووڵاییەکەی تا دوو باڵا پیاو و سێ باڵاپیاو و نیویش دەبوو. خێرایی ئاوەکەش، دوو، یان سێ گرێ دەبوو. ئاوەکەش ڕوون و ڕەنگەکەیشی وەك شینایی ئاسمان بوو. زۆر جار ڕووبارەکە لە وەرزی بەهاردا هەڵدەستێ و هەموو دەشتەکە دادەپۆشێ.

گوندی (ئاسکی کەڵەك)ی ئیزەدیش دەکەوێتە لای ئەو خەرەندی بوارەوە کە شەومان تێدا بەسەربرد و ناسیاوێکی زۆری (ئیزەدی)مان٢٨٢ دییەوە، کە لە سەفەری پێشووماندا پاسەوانییان کردبووین.( )

لە یەکەمین سەعاتی ئەمڕۆدا، ڕێکردنەکەمان لەسەرخۆ بوو، پاشان بەدرێژایی سەعاتەکانی دواوەی ڕۆژەکە، خێراتربوو. یەکەمین قۆناغیش، بە کاروان. بەحەوت سەعات دادەنرێ، بەڵام ئێمە بەپێنج سەعات و پەنجا و پێنج دەقیقە بڕیمان.

ڕووبارەکە چەندان بواری تێدا هەیە، لەنێوان گوندەکە و تا تێڕژانی، لە (زێ)دا، لەنزیك (کەشاف)ی سەر (دیجلە)، کە پێنج سەعاتەڕێ دەبێ(٢٨٣) و ڕووباری (خازەر)، یان

---

٢٨٢ - کوردانی بابانی پێیان دەڵێن (داسنێ) ـــ پەراوێزەکە دوایی هات ـــ بە سۆنگەی شاخی (داسن)ەوەیە، کە دەکەوێتە باکووری (مووسڵ)ەوە و خۆشیان هەر لەوێ دەژین ـــ ع.

( ) وەك دیارە تا ئەم مێژووەش کە (ریچ) باسی دەکات، قەڵەمڕەوی پێڕوانی ئایینی (یەزیدی- ئیزەدی)، تا کەڵەکی یاسین ئاغا) فراوان بووە.(م)

٢٨٣- ئەو بوارانەی ڕووباری (زێ) ئەمانە:

أ- لای (سەتیح)، کە گوندێکی عەرەبیە، دوای (کەشاف) بوارێکی زۆر خراپ و بنەکەی پڕە لە بەردی لووس.

ب- لای (شەمسیات)، کە ئەمیش گوندێکی عەرەبیە. بوارێکی خراپە دوای (سەتیح) و لە (ئۆردەك)ەوە نزیکە.

ج- بوارێکی تر دوای (ئۆردەك).

د- لای (ئاسکی کەڵەك)، لە هەموو بوارەکانی باشترە.

(بۆمادوس BUMADUS)، سێ سەعات لە خوار ئەو شوێنە دەڕژێتە (زێ)وە. خازەریش کە پێنج سەعات لەپشت (عەقرە ــ ئاکرێ)وە دوور دەبێ. هەروەها ڕووباری (زێ) و (خازەر)یش پێچیان زۆرە. گوندی (ئۆردەك)یش ڕاستەوخۆ دەکەوێتە دامێنی دواوانەکەیانەوە، لەسەر ڕۆخی ئاوی (زێ). من گەیشتوومەتە ئەو باوەڕە تەواوەی کە لەدوای بەیەك گەیشتنی (زێ) و (خازەر)ەوە، ئیتر هیچ دۆڵ و ئاوەڕۆ و سەرچاوەی ئاوێك نییە.

پلەی گەرما، لە شەشی بەیانیدا (٨٦پلە) و لە دووی دوای نیوەڕۆ (٨٨ پلە) و لە دەی شەویشدا (٨٦پلە) بوو.

جێگەی وێنەی ژن و مێردێکی ئیزەدی لە شەنگار دەبێ لێرەدابێ

## ٣٠ی تشرینی یەکەم

لە شەش و بیست و پێنج دەقیقەدا ڕۆیشتین. ڕووی زەوی بەشێوەیەکی گشتی بەبەرزایی دوو پێ لە ئاستی ڕووبارەکە بڵندتر دەبووەوە. لە سەرەتادا لە خەرەندەکەوە بۆ گوندەکە، لە ئاستی ئاوەکەوە دەستی پێ دەکرد، پاشان ئەم بەرزاییە لە دەشتێکی تەختەوە بۆ بەرزایی دووەم دەهات، کە بەگوێرەی ئاستی خەرەندەکان بوو، ئەمیان نزیکەی پازدە پێ بەرزدەبوو، وەك ئەوە وابوو ڕۆخی ڕووبارەکە لە ڕۆژانی ڕابووردوویدا بێ. لە گوندەکەوە بۆ بڵندایی دووەم چووین.

لە سەعات حەوتدا، پاش ئەوەی بۆ دەشتەکە داگەڕاین، ڕوومان لە خۆرئاوا کرد. ڕووی زەوی لەنێوان ئاوی (زێ) و (بۆمادوس)، یان (خازەر)دا هەوراز و نشێویی بوو، بەڵام ڕووتەن، یان شەقارشەقار نەبوو. لە زۆر جێگادا گوندنشینەکان خەریکی جووتکردن بوون. لە نۆ و پەنجا دەقیقەدا گەیشتینە ڕووباری (بۆمادوس) یان (خازەر)، کە کوتومت لە (زێ) دەچوو، چونکە خەرەندەکانی وەك ئەوانەی (زێ) بەردەڵانی و بەرزبوون و لە هەندێ جێگاش لایاندابوو، ئیتر لەنێوان خۆی و ڕێڕەوەکەیدا دەشتێکیان پێکهێنابوو. ئێمە هێشتا هەر ڕووەو خۆرئاوا لە دەشتەکەداین. گوندی (مەنکوبە)ش کە لە گوێ ڕووبارەکەیە، لەئێمەوە بڵندترە.

---

هـ- لای (یەنی کەڵەك ــ کەڵەکی نوێ). دوای ئەمیش سێ بواری تریش هەیە، کە دەکەونە نێوان کەڵـەکی نـوێ و شاخەکەوە. ئەم بوارانە ئێستا هیچیان بۆ پەڕینەوە دەستیان نەدەدا، چونکە دوای یەکەمین باران، ئیتر نامێنن.

سەرنج: خەڵك بەوشەی (ئۆردەك) دەڵێن (وەردەك) ــ ع.

له ئاستی بوارەکەشدا، ئاوەکەی لەمبەریەوە بۆ ئەوبەر، قووڵاییەکەی وەك یەك بوو، کە لەنێوان پێ و نیو و سێ پێدا دەبوو، کە دەیدا لەهەردوو ئەژنۆی ئەسپەکەم، بەڵام پانتاییەکەی نزیکەی سێ سەد پێ دەبوو. ئێستا ڕووبارەکە لە وەرزی نزم بوونەوەیدایە و ڕەوتیشی لە (زێ) خێراترە، بەڵام لە بەهاردا وەك لافاو سێڵاوی هەڵدەستێ و دەشتەکەش تا ئاستی خەرەندەکانی دادەپۆشێ. ئیتر هەرگیز بوار نادات، بەڵام لەدوو ئەژنۆ زیاتر بەو ئاستە بەرزە نامێنێتەوە، دەڵێن لە جێیەك، هەڵدەقوڵێ لە (عەقرە ــ ئاکرێ)وە نزیکە... کە لە بوارەکە پەڕینەوە چووینە بەری خۆرئاوای، وەك بەری خۆرهەڵاتی بەرزنەبوو. لەبەری خۆرئاوای بەدواوە، ئیتر زەوییەکەی وردە وردە نزمتر دەبووەوە (ئەگەر بشێ وابڵێین) و تا چاو بڕدەکات دەبووە دەشتێکی کاکی بەکاکی پان و تەخت، لە زۆر جێگایشیدا کشتوکاڵی تێداکرابوو. گوندی (سارا خاتوون)یش٢٨٤ کەمێك دەکەوتە خوار بوارەکەوە. لە ڕووبارەکەوە ڕووەو باکووری خۆرهەڵات ڕۆیشتین، لە هەشت و نیودا (٨٦) پلە بەلای باکووری خۆرئاوادا، سەمتی (قەرەجوق) لەگەڵ (مەقلوب)دا، کە لەپشتییەوە گوم دەبوو، وەك یەك بوون. پێش ئەوەی (مەقلوب)مان لێ ون بێ، لە تەنیشت و ناوەڕاستیدا کەنیسەی (مارمەتی)، یان (قەدیس مەتی)مان بینی، کە کەنیسەیەك بوو، لای دیانەکانی ئەم ناوە، پیرۆزییەکی مەزنی هەیە.

دیسان لەسەر لووتکەی (قەرەجوق)یش ئاسەواری کەنیسەیەکمان بینی. ڕێکردنیشمان لە (بۆمادوس)ەوە لە جاران خێراتربوو.

لەپشت بوارەکەی (بۆمادوس)ەوە، حاجی جەرجیس ئاغا(٢٨٥)،کە هاوڕێیەکی دێرینەم و فەرمانبەری دیاریکراوی تەشریفات بوو، بۆ یاوەری کردنم، پێشوازی لێکردم، کۆمەڵێکیش (قاووقلی)(٢٨٦)

---

٢٨٤ - (خازەر)، ماوەی سێ سەعاتەڕێیەکی کاروانیی، یان دوو سەعاتەڕێی ئەسپ، لە دامێنی (ئەسکی کەڵەك)ەوە بە (زێ) دەگات، پێش ئەوەی پێی بگات، گوندی (ئوردەك) دەکەوێتە بەری لای خۆرئاوایەوە.

٢٨٥- ئەفسەرێك بوو لە ئەفسەرانی پاشای مووسڵ.

٢٨٦- یان ئەفسەرانی حکوومەت. لەبەر ئەو کڵاوە تایبەتییەش کە لەسەری دەکەن، پێیان دەوترێ (قاووقلی). ڕاستیشە کە وایان پێدەڵێن و بریتییە لە کلێتەیەکی ناوداری ناواخن لۆکە. وشەی (قاووق)یش تورکییە و بەمانای (ناوبۆش ــ قالۆر) دێت. بڕوانە پەراوێزی ژمارە (٤١)ی بەشی حەوتەم ــ ع.

لەگەڵدا بوو، پاشای مووسڵ بۆ پێشوازی لێکردنم و بەخێرهاتنم بۆ ناوچەکەی ناردبووی. ئیتر پێکەوە لەسەرخۆ هاتین و لە دە و چل دەقیقەدا گەیشتینە گوندی (کرملیس)، کە گوندێکی پیسی کلدانی بوو.

بەدرێژایی ئەمڕۆ لەسەرخۆ ڕێمان دەکرد، ڕێکردن بەکاروان بۆ (بۆمادۆس)، دوو سەعات و نیو دەخایەنێ و لە (بومادوس)یشەوە بۆ (کرملیس)، هەر دوو سەعات و نیوە. (کرملیس) لەکاتی خۆیدا شارێکی گرنگ بووە و (نادر شا) کاولی کردووە و ئێستا وەك هەموو گوندەکانی دیانەکانی خۆرهەڵات، گوندێکی زۆر پیس و چەپەڵە. لە گوندەکەدا کەنیسەیەکی زۆرکۆن و بەرینی تێدایە، بەو مێژووەدا کە لێی نووسراوە، دەردەکەوێ کە سەد و سیی ساڵ لەمەوبەر، چاککراوەتەوە. ئێستاش خەریکە بڕووخێ. کەنیسەیەکی تریشی تێدایە لەو بچووکترە، بەڵام زۆرکۆن نییە. ئەمیش هەر خانوویەکی دیمەن دزێوە. لە پشت گوندەکەشەوە، لە دوورایی نیو میل لە چادرەکەمانەوە (٠٨پلە بەلای باکووری خۆرئاوادا) گردێکی توورەکەڕێژی کۆن هەیە، پیایدا سەرکەوتمە سەرەکەی، بۆئەوەی سەمتی هەندێ دیمەنی ناوخۆ، بە قیبلەنماکە دیاری بکەم. لەمەشدا سەرکەوتووبووم، چونکە خۆر خەریك بوو بەرەو ئاواچوون دەچوو، بەڵام هەڵکردنی (با) نەیدەهێشت تارماییە دوورەکان دەرکەون. دەرزی قیبلەنماکەش لە جێگایەکدا نەدەگیرسایەوە. گوندێکی زۆر لە هەموو لایەکی دەشتەکەدا دیاربوون و هەموو شتێکیش لەبەردەمماندا، وەك تەختایی زەریا تەخت و دیاربوو.

میجەر (ڕەنل) پێی وایە کە (کرملیس)، (گۆگە مەلا)یە(٣٠)،

(٣٠) بڕوانە لاپەڕەکانی (٣٥١،٤٥١)ی کتێبی (سەرنج لە مێژووی هەڵمەتەکەی کۆرش)، لە نووسینی میجەر (ڕەنل).

بەڵام بەوەدا کە (ئەریەن ــ ARRIEN)و (کوینتوس کورتیوس) نووسویانە، وا دەردەکەوێ، کە (گۆگە مەلا) دەکەوێتە سەر ڕۆخی (بۆمادۆس). لەبەرئەوە بە هیچ جۆرێك ناتوانرێ بوترێ کە (کرملیس) لەسەر ئەو ڕووبارە بووبێ. لە ڕاستیدا ناتوانین بەهیچ یەکێك لەو گوندە زۆرەی ناو ئەم دەشتە و لەسەر درێژایی ڕۆخی (بۆمادۆس)یش کە کامیان (گۆگە مەلا) بوویێت. ئێمەش ئەوە چاك دەزانین کە (گۆگە مەلا) کاتی خۆی، لە سەردەمی (ئەسکەندەر)دا هەر گوندێکی ئاسایی بووە. لەبەرئەوە ئەغریقەکان، ئەو شوێنەی شەڕەکەیان لە نزیکییەوە بڕاندۆتەوە، ناوی (ئەربیللا)یان لێناوە، چونکە نزیکترین شوێنێکی گرنگ بووە لە مەیدانی شەڕەکەوە. ئەوکاتەش کە جیا لە هەموو شوێنێکی تر، (گۆگە مەلا) باسکراوە، هەر مەبەست دیاریکردنی شوێنی شەڕەکە بووە. بەڵام ئەگەر

بمانەوێ ئێستا شوێنی (گۆگە مەلا) دیاری بکەین، هیچمان بەدەستەوە نییە، لەوە زیاتر کە پشت بە زانیاری خۆمان ببەستین لەسەر دەشتەکە. بەڵام ئەمە کارێکی بێ ئەنجام دەبێت، ئەگەر نەڵێین هەر ناکرێ... من نازانم لەبەر چی بوو، لەناو ئەو هەموو گوندانەی لە دەوروبەری (کرملیس)ن، بۆ هەر بەتەنیا (کرملیس)م هەڵبژارد، کە دەبێ (گۆگە مەلا) بوبێت. ڕەنگە نەزانینی جێگەکە و هەڵبژاردنە سەیرەکەی ناوەکە، هاندەربن بۆ ئەم دیارکردنە. (کرملیس) دەکەوێتە نزیك ناوەڕاستی دەشتەکەوە(٢٨٧)، شوێنەکەیشی شتێکی وا نییە، جێی سەرنج بێت.

پلەی گەرما، لە شەشی بەیانیدا (٨٥پلە) و لە دووی دوای نیوەڕۆدا (٨٠پلە) و لە دەی شەویشدا ٤٦ پلە بوو.

## ٣١ی تشرینی یەکەم

لە شەش و چارەکدا سواری ئەسپەکانمان بووینەوە. ڕێگاش بۆ (مووسڵ) سەمتەکەی (٥٧پلە) ڕووەو باکووری خۆرهەڵات بوو. تا هەشت بە دەشتە تەختەکەدا ڕێمانکرد، پاشان ڕووی زەوی بووە بەردەڵانی و نارێك، دەشتەکەش لای ڕاستمانەوە هەر بەردەوام بوو. لە هەشت و نیودا هاتینە زەوییەکی بەرزترەوە، ئیتر لە هیچ لایەکمانەوە دەشتەکە دیار نەما. ئەوەندەی نەبرد بۆ نزیك ڕووبارێك شۆڕبووینەوە ناوی (شۆردەرە) بوو، یان دۆڵە خوێ، کە وشکی کردبوو، بەڵام لە زستان و بەهاردا، لەبەر ئاو و قوڕ، بۆ ماوەی دوو و سێ ڕۆژ بوار نادات. لێرەدا بەلای کاروانێکدا تێپەڕبووین، باری مس و مازووی پێبوو، بەرەو بەغدا دەچوو.

لە نۆ و پەنجا دەقیقەدا گەیشتینە بەستێکی گەورە، پاشان بۆ نشێوییەك، کە لە چاڵ دەچوو، دوای ئەویش بۆ بەستێکی تر. تورکەکانی مووسڵ وای دادەنێن کە ئەمە (نەینەوا)ی یەکەم، یان سەرەتاکەی بێت. دوای تاوێکی تر گەیشتینە چاڵێکی تر و دیوارێك. بەمەدا دەردەکەوێ کە کاتی خۆی (نەینەوا) دوو وارشی هەبووە. لە ژێرەوەش یان لەبن ئەم دیوارەی دووەمدا کانییەك، یان بیرێك کە گومەزی خانوویەکی کۆنی بەسەرەوەیە، لە بەردی گەورە

---

٢٨٧- چەمێکی بچووك لە (تارجەڵڵا ـــ ترجللە) هەڵدەقوڵێ و بە (شاە قولی)دا تێپەڕ دەبێ، ئیتر (کرملیس) پاراو دەکات. لەم گوندەشدا بۆ ئاودانی لۆکە بەکار دەبرێ. ئەو کاتانەش کە هەمووی بۆ کشتوکاڵ لە (کرملیس)دا بەکار نابرێ، ئاوەکەی بەتەنیشت (قەرەقوش)دا تێپەڕ دەبێ، کە لەوێ پردێکی یەك کەوانەیی بەرزی دەکاتەوە و پاشان دەڕژێتە (دیجلە)وە.

دروستکراوە. ئەم بیرە پێی دەوترا (داملاجە). خەڵکەکە پێیان وایە ئاوەکەی بۆ چاککردنەوەی گەلێ نەخۆشیی دەست دەدات، نەك لەبەر تایبەتمەندی پزیشکییەوە، بەڵکو لەبەر هەندێ بیروبۆچوونی ئەفسانای، کە دراوەتە پاڵ بیرەکە و هەموویان بڕوایان وایە جنۆکەی تێدایە و دوای تاریك داهاتن کەس ناوێری توخنی بکەوێ. (حوسێن ئاغا)ش بۆی گێڕامەوە، کە گوایە شەوێك لە شەوە تاریکەکاندا بەلای بیرەکەدا ڕابووردووە، لەناو بیرەکەوە گوێی لە دەنگی تەپڵ و دەنگە دەنگێکی بەرزبووە، لەناو بیرەکەوە. ئیتر ئاوزەنگی لە ئەسپەکەی داوە و هەڵهاتووە، چونکە ئەو پیاوەی بەبێ مەبەستیش بوێرێ بۆ بینینی جنۆکەکان بوەستێ، یان دەمودەست دەمرێ، یان شێت دەبێ. لە ئاوەکەم چەشت، هەستم کرد بەتامە، ڕوون و بێگەردیش بوو.

دە دەقیقە لای بیرەکەوە ماینەوە، پاشان بەتەنیشت گوندی (نەبی یونس)دا. کە دەکەوتە لای چەپمانەوە، بەناو (نەینەوا)دا دەستمان بەڕۆیشتن کردەوە. دیوارەکانی لای خۆرهەڵاتی نەینەوا، ببوونە گڵمتکی بەردەلانی و دەتوت هەر سروشتکارە.

لە دە و بیست دەقیقەدا گەیشتینە ڕۆخی (دیجلە). ئیتر بە کەڵەکێك بۆ جێگاکەمان پەڕینەوە، کە بەدرێژایی ماوەی مانەوەمان لە مووسڵ، هەر لەوێ بووین و بریتی بوو لە کۆشکەکەی (نەعمان پاشا)، کە دەکەوتە خوارووی شارەوە و هاوڕێی دڵنەرمم (پاشا)، بۆی ساز کردبووین، چونکە مانەوە تیایدا، لەوە باشتربوو لە شار بمێنینەوە...

ماوەی قۆناغی نێوان (کرملیس و مووسڵ) چوار سەعاتێك دەبێ، بەڵام ئێمە بەچوار سەعات و چارەکێك بڕیمان، ڕێکردنەکەشمان باش بوو، ئەگەر زۆرباش نەبووبی.

پلەی گەرما، لە شەشی بەیانیدا (٨٥پلە) و لە دووی دوای نیوەڕۆدا (٨٧پلە) بوو.



## ریچ خانم

تێبینی: ئەم وێنەیەم لە بەڕێز مامۆستا تاها بابان (پارێزەر) وەرگرتووە

وەرگێڕ لە یادنامەکەی ریچ خانم دا، هەموو ئەو یادنامانەی لێ لابردوون. کە لە یادنامەی مێردەکەیدا هەبوون دووبارە دەبوونەوە (مەگەر بەدەگمەن). لە باسی گەشتەکە و شێوەی زەوی و ڕێگادا و بەتایبەتی گرنگیی بەوە داوە ئەو شتانە وەربگێڕێ کە لە یادنامەکەیدا لەبارەی ئافرەت و ژیانی ئافرەتانەوە نووسیوێتی ـــ ع.

## ١٦ی نیسان

لەدواییدا. پاش ئەوەی ئەوانەی هاتبوونە دیدەنیم، تا سەعات دوازدە دوایان خستم، ماڵاواییم لە بارەگای نیشنگەیی خواست و چووم بۆلای هەندێ بۆ ماڵاوایی لێکردنیان. لە پێشدا چووم بۆلای دەستەخوشکی کوردم (ساڵحە خانم)ی ژنی (سلێمان پاشا)، کە ئەم گەشتەمی بۆ کێوەکانی نیشتمانەکەیان، لا شیرین نەکردم، بەڵکو باسی تێشکانێکی خۆیانی بۆ کردم، کە ئەوەندەی گەڕانەوەی (دە هەزارەکە) ناخۆش بووە، کاتێ لەگەڵ مێردەکەیدا بووە و لە (کۆیسنجاق)وە بۆ (کرمنشاە ــ کرماشان) چوون. گەڕانەوەکەشیان بەسەر کێوەکانی (ڕەوەند ــ REVEND)ی ناوچەی خێڵی (بلْباس)ی کورددا بووە، کە هارترین خێڵی سەربەخۆیە و پاشاکانی بەغدا هانی داون پەلاماریان بدەن و مێردەکەی بکوژن. ئیتر تا ماوەی چل ڕۆژی بەردەوام لەشەڕدا بوون.

وا لێرەدا هەندێ لە قسەکانی دەگێڕمەوە، کە دەیوت: (زۆر جار کە بەسەر ئەسپەکەمەوە دەبووم، گوللە بەهەرچوار دەورمدا گیزەی دەکرد، کە لاشم دەکردەوە، لە کوژراو و بریندار زیاترم نەدەدی، کە لەسەر زەوی کەوتبوون).

بەڵام دەرباز ببوون و هەستیان بەشادی سەرکەوتنەکە دەکرد، کە بەهۆی ئازایەتی دەستوپێوەند و هەندێ هاوڕێی وەفادارییانەوە ڕزگاریان ببوو، کە لە کاتی خۆیدا بەهانایانەوە هاتبوون. خانم جوان و شیرین بوو... هەرچی جوانیی کە دەبوایە لە ئافرەتدا هەبێ، تیایدا بوو. لاوازیی و زراڤییەکەی، لەگەڵ ئەو مەترسییە دەگمەنەدا نەدەگونجا، کە تێی کەوتبوو. ساکارانە و لەسەرخۆ قسەکانی بۆ دەگێڕامەوە...

ماڵاواییم لێکرد و ڕوومکردە حەرەمی (کەهیا). بۆ ماڵاوایی لێکردنی دەستەخوشکی جگەرسۆز و بەوەفام (حەنیفە خاتوون). پێم سەیربوو، بینیم یەکجار لەوە تووڕەیە کە بۆ ولاتێکی زۆر دڕندەی وەك کوردستان دەچین و دەستبەرداری حەسانەوە و ڕەنگینیی بەغداد دەبین. بەدڵێکی خەمگینەوە لە خۆرنشیندا جێم هێشت و چووم بۆ باخەکەی (ساڵح بەگ)، کە پێنج دەقیقە ڕێگا لە شارەوە دوور دەبوو، بۆئەوەی لای دایکی و هەندێ دەستەخوشکی خانمی تورك بمێنمەوە، کە لەوێ بۆ ماڵاوایی لێکردنم گردببوونەوە.

بەڵام مێردەکەم بۆ باخەکەی (حاجی عەبدوڵلا بەگ) چووبوو، کە ماوەی سیی میل لە بەغداوە دوور دەبوو. بۆئەوە بانگهێشتن کرابوو، تا شەویش لەوێ بمێنێتەوە. گەشتەکەمان هەر لەو جێگایەوە دەست پێدەکات. شەوێکی باراناوی و تۆف بوو، هەمووشمان سەرمان لەوە

سورِما، که ژنەکەی حاجی عەبدوڵڵا بەگ، چۆن بەو سەعات دەی شەوە، خۆی بەناوماندا کرد، بەو شەوە تاریك و بۆرانە، بەسواری ئەسپ، سێ میل ڕێگای بڕیبوو، بۆئەوەی بۆ دواشەو لەگەڵ منی بەسەربەرێ.

## ١٧ی نیسان

پاش دوو سەعاتێك خەو، لەگەڵ شەفەقدا هەستام و ماڵاواییم لە دەستەخوشکە بەخشندەکانم خواست، کە هەریەکەیان بەشی خۆی خەمی پێبڕا. (زابت خاتوون)ی ژنی حاجی عەبدوڵڵا بەگیش پێی لەوە داگرت، کە دەبێ تا خانووی ناو باخەکەش هەر لەگەڵمدا بێت. منیش لەگەڵ (فاتمە)ی جوانکیلە و بچکۆلەی خوشکەزاکەیدا، لە تەختەڕەوانەکەی خۆمدا سوارم کردن و (تەقی)خزمەتکاریشم سواری گوێدرێژێك کرد و من و دایکی (میناس)یش کە لە سەفەرەکەماندا لەگەڵمدا دەهات، سواری کەژاوە بووین و ڕوومان لە باخەکەی(بەگ) کرد . خزمەتکارەکانیشم بەسەر ئەسپەکانیانەوە بە دەوروپشتمانەوە بوون. بەڵام کە گەیشتینە ئەوێ، هاوڕێکەمان ڕێگای نەداین بڕۆین، تا لایان دابەزین و هەندێ ساردەمەنی و شیرەمەنییان لا دەخۆین.

لەبەرئەوەش کاتێ گەیشتینە ئەوێ، مێردەکەم لەسەر ڕۆیشتن بوو. نەریتی خۆرهەڵاتییانەش، بۆ پیاو، نەنگیی بوو، ئەگەر زیاد لە گرنگیدان بەکەلوپەلی سەفەرەکەی، گوێ بەژنەکەی بدات، یان لەگەڵ خۆی بیبات، یان لەگەڵ کاروانەکەیدا بێت. بۆیە بەهەڵم زانی و داواکەیانم قبوڵ کرد، تاپێش ڕۆیشتن، نانێکی باش بخۆم. لە هەمان کاتیشدا مێردەکەم و هاوڕێکانی، ماوەیەکی باشیان لە ڕێگاکە بڕی.

لە سەعات دەدا دەرچووم و دەستەخوشکە بەخشندەکانم و دەستوپێوەند و کەسوکاریان، دوعای سەفەرێکی خۆشیان بۆ دەکردین. سواری تەختەڕەوانەکەم بووم.

لە باسی تەختەڕەواندا دەڵێم بریتییە لە داربەستێك، دوو مژانی هاوتەریب لەپێشەوە و دوو مژانی هاوتەریبیش لە دواوە، کە لەسەر پشتی وڵاخ قایم دەکرێ. لە سەریشییەوە پارچەیەك قوماشی سوور بەسەریدا دەدرێ، کە هەر چوارگۆشەکەی بەگۆی زێڕین دەڕازێنرێتەوە(٢٨٨) بەڵام کارەکەرەکانم سواری کەژاوە ببوون.

---

٢٨٨- بڕوانە بەشی یەکەم. کە لەوێ لەسەر تەختەڕەوان دواین.

کەژاوەکەش لە شێوەی قەفەسدایە و هەر دووانیان لەسەر پشتی وڵاخێك دەبێ و بەملاولایدا هەڵدەواسرێن، بۆئەوەی هاوتا بنەوە. بەڵام لەبەر قەڵەویی دایکی (میناس) و لاوازیی (تەقی)ی کلۆڵ، کارێکی سەیر و پێکەنیناوی بوو، کە هەندێ (بەرد) دابنرێ، تا پارسەنگی تایەکەی تر بدرێتەوە... هەرچۆنێکیش بێت سەفەرکردن لە کەژاوەدا، شتێکی خۆش نەبوو، چونکە ئەوەی سواری دەبێ، پێویستە بە چیچکانەوە دابنیشێ.

جگە لە خزمەتکار و قەتارچییەکان، شەش سواریش لە تەکمدا بوون. لە پێنجدا گەیشتینە چادرگەکەمان، لە نزیك گوندی (دۆخلە).

## ٢١ی نیسان

... کاتێ دەمانویست بڕۆین، باران باری. دوای تاوێ بایەکی توند لە باشووری خۆرهەڵاتەوە هەڵیکرد، ئیتر باران خۆشیکردەوە و ئاسمان ڕوون و ساماڵ بووەوە. بەدرێژایی ڕێگاکەش دایکی میناس زۆر بێزاربوو، هەرچەندە دڵیشم پێی دەسووتا، بەڵام زۆرم پێکەنین پێی دەهات، چونکە سەروسیمای بەجۆرێ نائومێدی و دەستەپارچەیی پێوە دیاربوو، ئەو وڵاخە بەستەزمانەکەیش، کە ئەمی بەسەر پشتەوەبوو، بەو ناو قوڕەدا هەر دەیشێلا. ئەمیش هەر دڵە خورپەی بوو، زۆر جێی پێکەنین بوو... لە دە دا گەیشتینە (جوبوق).

... بەڕاستی تا خوا ڕۆژی کردەوە، هەر هەڵدەلەرزیم، چونکە نەمدەزانی ها ئێستا نا، تاوێکی تر، ڕۆژگار چیمان بەسەردێنێ، کە بەلای کەمەوە تەڕ دەبین، یان چادرەکانمان بەسەرەوە لوول دەکات. شەوێك بوو لە شەوانی (بایرۆن).

## ٢٣ی نیسان

... لە دە دا بەسەر جۆگەکەی (خالس)دا گەیشتینە (دەلی عەباس)، کە لە پاشماوەی گوندێك بەولاوە، هیچی تر نەبوو. لە هەموولایەکی دەوروبەرماندا گوندێکی زۆرمان دەدی، هیچیشیان نەکەوتبوونە سەر ڕێگاکەمان. هەندێ گوندنشینی گوندی (ئەدانەکۆی)ی لای تەنیشتمانەوە ئاگاداریان کردین، کە لای ئەوان، ماوەی هەشت ڕۆژ لەسەریەك، باران باریوە و زەوی بەتەواوی باران داپۆشیوە. پەژارەی ئەوەش بوون شەوی پێنج شەممە، سێ گۆی ئاگرین، یان سێ بروسکە، بەسەریاندا تێپەڕ بووە، کە لە خۆرئاواوە هاتوون و ڕوویان لە چیاکانی (حەمرین) کردوە.

## ٢٤ی نیسان

... کەمێك دوای حەوت، گەیشتینە کۆتایی ڕیزە شاخێك، خەڵکەکە پێیان دەوت (حەمرین). لەم کاتەدا دایکی میناس، ئازارێکی زۆر توندی هاتێ، تەنانەت وای هەستکرد ئیتر دەمرێ. ئەو سەرچڵانەش کە بەکێوەکانی (تشیم بورازو ــ CHIM BRAZO)، یان (شاخە سپی ــ MONT BLANC)، یان (هەمەلایا)دا هەڵدەگەڕێن، ئەوەندەی دایکی میناس هەستیان بەچاو قایمی و ئازایەتی خۆیان نەکردووە، کاتێ کە بەسەلامەتی، خۆی لەسەر ئەم شاخە بیاباناویەوە دییەوە.

بۆئەوەی کەمێك باری تەختەڕەوانەکە سووك بکەمەوە، سواری ئەسپەکەم بووم. بەڵام دەستوپێوەندەکەم، کەمێك دوور لەدوامەوە دەهاتن، تا بتوانم بەسەری ڕووت، سواری ئەسپەکەم ببم. لە میناس زیاتریش، کەسی ترم بۆ ئاگاداریم لەگەڵ نەبوو. بەمجۆرە لە شاخەکانەوە داگەڕاین...

دیمەنەکەش لە بەرزاییەکانی شاخەکەوە، هەرچەندە نەدەگەیشتە دیمەنی سەر بەرزاییەکانی (زورا)، بەڵام دڵی ئەوانەی دەکردەوە، کە ئارەزووی دیتنی ئەو دیمەنانەیان هەیە، کە جوانییان تاڕادەی داهێنان، جوانە و دەمێکیش بێت دەروونیان لەوجۆرە دیمەنانە بێبەشە، چونکە ئەو دەشتە سەوزانە و گوندی دوور و ڕووباری (دیالە)ی هەڵساو، کە بەپێچاوپیچ بەو دەشتەدا دەکشاو تەنانەت کێوە زۆر دوورەکانیش، هەموویان جوان و ڕەنگین بوون و شادی بەخش بوو. سەرەڕای ئەوەش ئەم دیمەنانە زۆر ساکاریش بوون، کە ئەوەندە کاری زۆریان لە هەستم کرد.

دوای ئەوەی هەر بەسەر ئەسپەکەمەوە بەسەر زوورگەکاندا داگەڕام و دوای ئەوە کە تاوێك حەسامەوە، پێش (دە)، سواری تەختەڕەوانەکەم بوومەوە.

... (قەرەتەپە)ش گوندێکی تورکمانە، تەکییەکی دەروێشەکانی قادری تێدایە، کە ڕەنگە زۆرکۆن بێ، تەرمی یەکێك لە سوڵتانەکانی (بوخارا)ی تێدا نێژراوە، کە کاتی خۆی لە سەردەمی خولەفاکانی عەباسیدا لەم گوندە گیرساوەتەوە.

لەوبەر گوندەکەوە، گردێکی توورەکەڕێژ هەیە، وەك دەرکەوت ئاسەواری قەڵایەکی کۆنە. دانیشتووانی ئەم ناوچەیەش، وەك هی بەغدا، دەردی چاوئێشەیانە. ئافرەتەکانیان پەیتاپەیتا دەهاتنە لای کارەکەرەکانم و لێیان دەپاڕانەوە بۆئەوەی شەکری ئەفرنجی، واتە شەکری

ئەوروپاییان(٢٨٩) بدەنێ، کە لەسەرتاسەری خۆرهەڵاتدا، دەرمانێکی گرنگ بوو، بۆ چاو ئێشە. لە تەختەڕەوانەکەدا، پلەی گەرما، لە دووی دوای نیوەڕۆدا (٩٠پلە) بوو.

## ٢٥ی نیسان

وەك ئاسایی، کەمێك دوای چوار لە خەو هەستاین. بەیانییەکی ڕوون و جوان بوو. لە باکووری خۆرئاواشەوە سروەیەکی سازگار هەڵیکردبوو. منیش بۆ خۆم لەژێر سێبەری درەختێکدا دانیشتبووم، چاوەڕێم دەکرد بۆ سواربوونی تەختەڕەوانەکە بانگم بکەن. دوای ئەوەی پیاوەکان ڕۆیشتن، ئافرەتێکی زۆرم تێئالا. ئافرەتێکی کلۆڵیان لە بارێکی نائومێدی و دەردەسەرییەکی بێ ئەندازەی خێزانەکەیدا بوو، کە تووشی ستەمێکی بێ ئەندازە ببوون: کچی ئەم ژنە، پێش ماوەیەك شووی بە ئامۆزایەکی خۆی کردبوو. کە لە دواییدا بەڕەزامەندی هەردوولایان تەلاقی دابوو.(تەلاقیش لەناو خەڵکە ڕەشۆکییە موسڵمانەکاندا شتێکی بلاوە)، چووبوو ژنێکی تری هێنابوو. ژنە تەلاقدراوەکەیشی وەلامی ئەمی کردبوو، شووی بەپیاوێکی تر کردبوو. بەلام ئەوەی جێی داخە، دەلێن مێردە کۆنەکەی، لەسەر ئەم شووکردنەوەیەی. بەبێ هۆ کوشتبووی. دایکە ئازار چەشتووەکەیشی دەیویست بچێ بۆ بەغدا، بەسەر پێی (پاشا)دا بکەوێ و دادی لا بکات. بەلام نەیدەوێرا، چونکە تاوانبارەکە هەڕەشەی لێکردبوو کە ئەگەر هەنگاوێ بۆ داد و گازندە و لێپرسینەوەی هەڵبنێ، شوێنی دەکەوێ و دەیکوژێ. ئەمیش بێوەژنە و تەنیا کوڕێکی منداڵی هەیە، کە منداڵەکە دەیەوێ دڵی بداتەوە، بەوەی ئەگەر گەورە بێ، پەیمانی دەداتێ تۆڵەی خوشکەکەی بسێنێ.

لە قەراخ قوڕەکە، خەریك بوو تەختەڕەوانەکە بکەوێ، بۆیە لەرزم لێنیشت، بەڵکو موچوڕکەیەکم پێدا هات، بەلام بێزار نەبووم، گوێم لە قریشکەیەکی (ئامینە خاتوون ــ دایکی میناس) بوو، کە چاوی لێم بوو ئەگەر بکەوتمایە هەپروون بەهەپروون دەبووم، بەلام هێز و چالاکی قەتارچییەکان، لە مەترسی ڕزگاریان کردم.

---

٢٨٩- لە عێراقدا بە (شەکری کەللە)، یان (قەند) ناسراوە. وەرگێڕ ئەوە دەزانێ کە خەڵك لە بەغدا و لە شوێنانی تریش ئارەزووی سەری (کەللە)کەیان دەکرد، کە سەرە قووچەکەی ناو چاڵە و لەسەر ئاگر دەیتوێننەوە و تواوەکە بۆ چاو ئێشە بەکاردێنن. وشەی (کەللە)ش تورکییە، مانای (سەر)ە ــ ع.

له دوازده دا گەیشتینە (کفری)، لەوێ جێگایەکی باشمان دی بۆیان تەرخانکردبووین. له خانووی جووتیارێکی تورکی بەخشندەدا، که کاتی خۆی له دەوڵەمەندەکان بووه، بەڵام بەشداری کردنی حکوومەتی تورکی له سامانەکەیدا، خستبوویه سەر ساجی عەلی. پێش ئەوەش له بەغدا بەڕێ بکەوین، میستەر (ریچ) له زیندان ڕزگاری کردبوو. پاشایشی ڕازی کردبوو بەوەی ئەو هەزار قرۆشه قەرزەی، که هی دەوڵەته و لەسەرێتی، بیبەخشێ.

ماوەی یازده ساڵێك لەمەوبەر، گوندی (قەرەتەپه) بریتی بوو له حەوت سەد خانوو، بەڵام ئێستا هەر پەنجاوپێنج خانووی تێدایه، لەبەرئەوەی خەڵکەکەی له تەنگ پێهەڵچنینی حکوومەت بێزاربوون و کۆچ دەکەن. هەموو گوندەکانی ناو ئەم پاشایەتییه و گوندەکانی ناو پاشایەتییەکانی تری ئیمپراتوریەتی تورکی، ئەمه حاڵیانه

## ٢٦ی نیسان

ڕۆژی پشوودانی کۆمەڵەکەمان و تاقەتکردنی هێسترەکان بوو. دوای نانخواردن، ڕەشمەی وڵاخەکانمان گرت و چووین بۆ دیدەنی ئەو کەلاوانەی که دوێنێ میستەر (ریچ)، بەدەم پیاسەوه دیبوونییەوه. ماوەی ده دەقیقەیەك له گوندەکەوه دوور دەبوون که لەسەر ڕێڕەوی ئاوەکه بوون.

سەیرمانکرد چەترەکەمان بۆ هەڵدراوه و ڕایەخەکانیشمان بۆ ڕاخراون. مەحموودیش له هەڵکەندندا بنەوەشییه. میستەر (بەلی نو)شمان نارد بۆ سەیری هەندێ کەلاوەی تر بچێ، که زۆر دوورنەبوون، تا ئاگادارمان بکاتەوه که ئاخۆ ئەوه دەهێنن بۆ دیتنیان بچین.

دوای تاوێ ژوورێکمان دییەوه، دیوارەکانی له بەردی گەوره و ڕێك دروستکرابوون، که بەڕیز لەسەر یەك دانرابوون و دیوارەکانیشی گەچکاریی کرابوون و نەخش و نیگاریشیان تێدا کرابوو. که بەڕاستی هەندێکیان جوان بوون و لەوەش دەچوو کاتی خۆی ناو ژوورەکەش تەختەکەی گەچکارییەکی ساکار بووبێ. هەروەها بنمیچەکەیشی، که ڕەنگێکی سووری تێرکرابوو، نەخشی گوڵ و شێوەی عەرەبییانەی لەسەر دروستکرابوو. هێڵه سەرەکییەکانی ئەم نەخشانه، بەڕەنگی ڕەش کرابوون و سوورێکی گەش بەدەوریانەوه بوو، که سەرسامی کردبووین، چونکه پێشتر نەمان بیستووه خانووسازیی ئێرانی، زەخرەفەی ئەغریقی کرابێ.

چووینە ناو ئەم ژوورەوه هێشتا ساغ بوو. بەشێکی تری ژوورێکی تریشمان دییەوه، لەوەی یەکەم چاکتر بوو. لەوه دەچوو ئەم دوو ژووره، بەشێك بووبن له چەندین ژووری تری زۆر

بچووك، كه دەشێ بوترێ ژێرخان، یان ژێرزەمین و هەمووشیان ڕووەو خۆرهەلاتی باشووری خۆرهەلات و خۆرهەلاتی باكووری خۆرهەلات درێژ بوونەوە و ئاسەواری پێنچ، شەشێكیانمان بینی. بۆمان دەركەوت كە بەشی سەرەوەیان، كۆڵەگەی بچووك و خڕیان خراوەتە ژێر. سەرنجی وردی ژووری یەكەمماندا، كە لە هەموویان سەیرتر بوو، هەندێ پارچە و شتی ڕەشی تیابوو، لە خەڵووزی دار دەچوو. بەلام هەرچەندمان كرد، نەمانتوانی نووسراوێك، یان پارچە دراوێكی تێدا بدۆزینەوە.



## ٢٧ی نیسان

ئەمڕۆ تەندروستیم بەجۆرێك تێکچووە، کە ناتوانم سەفەری تێدا بکەم، یان لەگەڵ پیاوەکاندا بچم بۆ پشکنینی ئەو کەلاوانەی لە جێگایەکە، ناوی (ئاسکی کفری)یە و دوو سەعاتە ڕێیەك دوور دەبێ. بەختیشیان یاربوو، کە ئاسەوارێکیان دیبووەوە، لەوەی دوێنێ گەورە و بەرینتربوو، هەرچەندە لەڕووی شێوە و هەڵکەوتییەوە جیاوازتریش بوو. هەر جێگایەکیان هەڵکەندبوو، ئێسك و شتی کۆنینەیان دیبووەوە. ئاخۆ حەشاماتێکی چەند زۆر، لەم ناوچانەدا بووبێ، لەچاو ئەو خەڵکە کەمەی ئێستایدا ؟!.

ئەمڕۆ خەڵکەکە هەندێ دراوی (ئەرساسی)(٢٩٠)و (ساسانی) و (کوفی) و مۆرێکی ڕۆمانی و یەکێکی تری ساسانییان بۆ هێنایین، کە ئەمی دواییان، نووسینەکانی زۆر بەباشی دیاربوون. ڕەنگە ئەمەش تیشکێك بخاتە سەر تەمومژی ئەم کەلاوانە و ڕووناکیان بکاتەوە.

ڕۆژێکی گەرم و ناخۆش بوو، چونکە بای باشووریی هەڵیکردبوو. چاوەڕوانیش دەکرا دایکی مەحموود پاشای سلێمانی، سبەینێ بگاتە ئێرە، کە بۆ بەغداد دەچێت. دەڵێن بۆ وتووێژ لەگەڵ داوود پاشا، لەبارەی ئاشتیی نێوان هەردوولاوە. عوسمان ــ بەگی کوڕە

---

٢٩٠- ئەرساسییەکان: زنجیرەیەك بوون لە ئێرانییە (فرپ- فرس)ەکانەوە هاتوون ــ ع.

بچکۆلەیشی، تا سەر سنووری تورکی(٢٩١) لەگەڵی دێت. ڕێی (سەگیرمە)، یان ئەو ڕاستە ڕێگایەیان گرتۆتەبەر، کە چیاکان دەبڕێ و بە (ئیبراهیم خانچی)دا، تێدەپەڕێ. وەك بیستمان گوایە نزیکەی هەزار لادێیان بۆ کردنەوەی ڕێگای بەردەمیان، بەکارهێناوە، چونکە ئەگەر وایان نەکردایە، لێی نەدەدرا. ئەمەش مایەی پەشیمانی نییە، لەو بڕیارەی دامان، کە ڕێگایەکی ئاسان بگرینەبەر، هەرچەندە دووریش بوو.

## ٨٢ی نیسان

لە شەشدا لە کفری دەرچووین. منداڵانی گوندەکەش شوێنمان کەوتبوون و گوڵبارانیان دەکردین... پیاوان و ئافرەتانیش لە مەزراکاندا خەریکی کۆشش بوون، بەڵام دواکەوتوویی بەکارەکانیانەوە دیاربوو، چونکە درەویان بەداسوولکەی بچووك دەکرد، لەو داسانە دەچوون کە باخەوانەکانی ئینگلتەرە، بۆ ڕێکخستنی باخچەکانیان بەکاریان دەهێنان.

لە دووی دوای نیوەڕۆدا گەیشتینە لای ئەو ئاوەی بەتەنیشتی (توزخورماتوو)دا تێپەڕ دەبێ و ناوی (ئاق سو)ە و لای (ئیبراهیم خانچی)یەوە دێت و بە کێوەکانی کورددا دێتە خوارەوە، پاش ئەوەی بەناو زۆر باریکە ڕێگای جواندا لامانکردەوە، کە درەخت داپۆشیبوون و چڵە زەیتوون و هەڵووژە و پرتەقاڵ، بەخۆیان و گوڵ و بەریانەوە، بەسەرماندا شۆڕببوونەوە و هەزاران باڵندەش بەسەریانەوە، خۆش خۆش دەیانخوێند. لە دوو و نیودا گەیشتینە خانووە جوان و تازەکەی (عومەربەگ) و هەمووومان خۆشیمان پێکەوت، چونکە من زۆر ماندووبووم و زۆریش دڵشادبووم، کە بینیم (کلود)٢٩٢ خۆی نوێنی نەرمونیان و میوەی چاکی بۆ ئامادە کردووم.

## ٢٩ی نیسان

لە ئەنجامی ئەوەدا کە بڕیارماندا ڕۆژێك، یان دوو ڕۆژ، بۆ حەسانەوەی ولاخەکان لێرە بمێنینەوە، پیاوەکان بۆ سەردانی هەندێ چاووگە نەوت چوون، کە دەکەوتنە ئەو کەلێنەی سێڵاو، لەنێوان زوورگەکانی لای بەری باشووری خۆرهەڵاتی گوندەکەوە دروستی کردبوو...

بیستمان هەندێ (تەتەر)، کە لە ئەستەمووڵەوە هاتوون، نزیك بوونەتەوە. هیوامان خواست تا لە ڕێگاکەی بەغداد دوورنەکەوتووینەوە. بگەنە لامان.

---

٢٩١- مەبەستی لە قەڵەمڕەوی هەردوو پاشایەتی سلێمانی و بەغدایە ــ ع.

٢٩٢- کلود: مەبەست لە کلودیوس جەیمس ریچ ــ ریچی هاوسەریەتی (م).

لە دەنگوباسی بەغدا، وامان بیستبوو چاوەڕوان دەکرێ (جاسم بەگ) و (سادق بەگ)، کە هەردووکیان هەڵهاتبوون، فەرمانی لێبووردنیان بۆ دەرچووە، دەگەڕێنەوە، بەڵام ئەمی دواییان پێی داگرتبوو، کە دەبێ میستەر (ریچ) ببێتە زامنی، چونکە متمانە بەکەسی تر ناکات و دەڵێ ئەگەر (باڵیۆز بەگ ـــ میستەر ریچ) بەڵێنی بداتێ کە زامنی دەکات، بەبێ ترس و هیچ گومانێك مل دەدات و دەستبەجێ دەگەڕێتەوە. ئەمەش شتێکە لە سنووری تواناداا نییە، چونکە بێگومان حکوومەت داوا لە میستەر (ریچ) دەکات کە لە هەڵسوکەوتی ئەم پیاوە لاوە بەرپرسیار بێت، ئەگەرچیش قایلە چ سوێند و زامنێك، کە میستەر (ریچ) لێی داوا بکات، جێبەجێ بکات. لەبەرئەوەی کلۆڵە، متمانە بەبەڵێنی خەڵکی وڵاتەکەی خۆی ناکات و میستەر (ریچ)یش پشتی پێ نابەستێ. هەرچەندە ئەو ئایینەش کە سوێندی پێدەخوات، پتەوبێ. ئێمەش شتی ناخۆشی لەم بابەتەمان تاقیکردۆتەوە. وەك مەسەلەی براگەورەکەی ئەم لاوە، کە خوالێخۆشبوو (سەعید پاشا)یە، ئەوەی کە میستەر (ریچ) بۆ پاراستنی ژیانی، کەفالەتی گرتە ئەستۆی خۆی و بە ئامادەبوونی پاشا و سەرۆك وەزیران و میستەر ریچ و خەڵکی تریش، سوێندی بەقورئان خوارد، کە لە بەغداد هەڵنەیەت، کەچی هەر پاش ماوەیەکی کەم ڕایکرد و دەستی بە یاخیگەریی کرد و بووە پاشا و هەمان ئەو پیاوەی کوشت، کە بەناوبژی کردنی میستەر ریچ، ژیان و سامانەکەی پاراست.

## ٣٠ی نیسان

(کلود) بەهۆی نەخۆشیی سەختی (زەردەتا)وە، تەندروستی تێکچووە و ناچاری کردووە بحەوێتەوە.

بەیانییەکی ڕوون و بێگەرد بوو. لە باکووری خۆرهەڵاتیشەوە سروەیەکی سازگار هەڵیکردبوو. بەڵام دوای نیوەڕۆ تاریکی کرد و کەمێکیش باران باری، بەدواییدا لە دوورەوە بروسکە هەبوو. لەوە دەچوو کەشوهەوا لە بەغداد ئاڵۆز بێ، بەڵکو ئەوێش وەکو لای ئێمە تۆف بێت. شەوێ بێ پشوو، تاوێ باران باری و هاتوچوی لە ڕێگەوبان و کۆڵانەکاندا نەهێشت.

بەدرێژایی ڕۆژ (کلود) هەر نەخۆش بوو. سەر لەئێوارەش (نۆبەتی)یەکەی زیادی کرد. لەبەرئەوە تکام لێکرد بیری سەفەرکردنی سبەینێی، لەسەر دەرکات.

## ١ی ئایار

میستەر ریچ، شەوێکی هێمنی بەسەربرد، لەبەرئەوەش کە ڕۆژێکی زۆرخۆش بوو، بۆیە زۆری حەز دەکرد پێش ئەوەی دووبارە باران دابکاتەوە و ڕێگا بگرێ، لە چەمی (تاوق) بدات. بۆ ئەمەش بەچاکی زانی لە (توزخورماتوو)ەوە بڕوات. بەپێی دابونەریتیش، من و دەستەکەم، نیو سەعات دوای ڕۆیشتنی ئەوان، کەوتینەڕێ، کە لە شەشدا بەڕێکەوتین. ڕۆژێکی خۆشیش بوو، مێردە شیرینەکەمی ژیاندەوە.

سەرباری ئەوەش کە (توزخورماتوو) جوان بوو، بەڵام گومانی ئەوەم لێدەکرد نادروست بێت، چونکە گۆلەمەرەزەی زۆر تێدابوو. (کلود)یش تا نەگەیشتە ئەم جێگایە، ئەوەندە سەخت و گران نەخۆش نەکەوتبوو. منیش هەستم کرد تەندروستیم تێکچووە و دەستەکەشم هاواریان لێ هەڵسا.

دوای ئەوەی ماڵاواییمان لە (توزخورماتوو)ی خەڵەتێنەر خواست، بەلای کۆمەڵێکدا تێپەڕین، بەتورکی پێیان دەوترا (دەلی دومەن)٢٩٣ ، کۆمەڵێکی لانەوازبوون. کاری گاڵتەجاڕییان دەکرد و پیشەیان گۆرانی وتن بوو. شتی زۆر گاڵتەجاڕییان دەکرد. هەرکە دەرکەوتن، هاواری خۆشی و شادی لە دڵی کۆمەڵەکەمانەوە بەرزبووەوە. کۆمەڵەکەیان بریتی بوو لە شەش، حەوت کەس، سواری گوێدرێژی لاوازببوون، جلوبەرگی شڕ و دڕاویان لەبەردابوو، ئەمانیش هەر لەڕولاواز بوون. یەکێکیان کە لەوە دەچوو یەکەمین گاڵتەجاڕیان بێت، (کڵاو ـــ قاووغ)ێکی(٢٩٤) کۆنی ناو لۆکەی قووچ و شڕی کردبووە سەری و سواری گوێدرێژێکی ئەوەندە نزم ببوو، دەتوت بەسەر زەوییدا دەڕوات، چونکە قاچەکانی هەر نزیکەی دووگرێ لە زەوییەوە بەرز دەبوون. عەلی ئاغا و بان نۆکەرەکەی لای ئێمەی ئاوزەنگییان لە ئەسپەکانیاندا و هەڵیان کوتایە سەری، بۆئەوەی یاری (جریدبازی) لەگەڵدا بکەن.

---

٢٩٣- دەلی دومەن: وشەیەکی تورکیە و مانای (سەرشێت) دەگەیەنێ. بەڵام وەك لە دەقەکەوە دیارە، کۆمەڵێك بوون لە قەرەج ـــ ع.

٢٩٤- قاووق: کڵاوێکی کۆنی تورکییە و مانای شتی ناوبۆش ـــ قالۆر، هلۆڵ دەگەیەنێ.لە پەراوێزەکەی نووسەریشدا بەمجۆرە هاتووە: (کڵاوێکی ناودارە بەلۆکە، هەموو پیاوان و ئەفسەرانی حکوومەتی تورکی لەسەری دەکەن). لەڕاستیدا (قاووق)، جۆرێکە لەو چەندان جۆرە کڵاوانەی تورك لەسەریان دەکرد. بۆ زیاتر تێگەیشتن، بڕوانە: پەراوێزی بەشی حەوتەم و پەراوێزی بەشی دوازدەهەم.

گوێدرێژەکەیان ڕاونا و ئەویشی هەر بەسەرەوە بوو. قاوغەکەیان فڕێدایە خوارەوە و یارییان پێدەکرد و بۆ خۆشیی کۆمەڵەکە، هەڵبەزودابەزیان پێدەکرد.

تا بەرەو پێشتر بچووینایە، سەرنجمان دەدا کشتوکاڵ بەرەو کەمیی دەچوو، لەوەڕگەی دەوڵەمەند زیادی دەکرد، ڕێبوارگەلێکی زۆر لە ژنان و پیاوان و منداڵانمان دیتن، لەوانە زۆرتربوون کە لە کاتی دەرچوونماندا لە بەغداوە، تووشیان ببووین.

لە دواییدا، لە نیوەڕۆدا گەیشتینە (تاووق جای)، یان چەمی تاووقی مەزن، کە ترسولەرزی خستبووە بەر دایکی میناس و لە دوێنێ شەوەوە لە ترسی ئەم ڕووبارە نەنانی بۆ خوراوە و نەخەویش چۆتە چاوی. ئەم ڕووبارە لە چیاکانی کوردستانەوە هەڵدەقوڵێ، کە ماوەیەکی کەم لێمانەوە دوور دەبێ و لای ڕاستی ڕێگەکەمانەوەیە. لە هاویندا ئاوەکەی بۆ ئاوێژە بەکاردێ و لە پاییزدا قووڵایی ئاوەکەی هەر پێ و نیوێك دەبێ. ئەم قسەیەمان پشت بەشارەزابوونی پێشترمان دەبەستێ، چونکە لە مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ۳۱۸۱ز ـــ دا لەسەر ڕێماندا بەرەو ئەستەمووڵ، لێماندا، بەڵام کاتی هەستان و ترسناکی، لە زستان و بەهاردایە کە بارانی خوڕ لەپڕ دادەکات و ئاوەکەی بەش بەش دەبێت و باراناو هەموو دەراو و ڕێڕەوەکەی پڕ دەکاتەوە، کە پانایی نیو میل دەبێ و زۆر خوڕ و خێرا دێت و لەگەڵ خۆیشیدا تاشەبەرد ڕادەدات، زۆرجار هەستان و سێڵاوی ئاوەکەی بەسەر ڕێبواراندا دەدا، کە لە ناوەڕاستی دەراو و ڕێڕەوەکەیدان، ترسولەرزی (ئامینە خاتوون)یش لەمە بوو.

(بەتلیمۆس)یش بەناوی (گۆرگوس ـــ GORGUS)ەوە باسی کردووە و (زینەفۆن)یش بەناوی (فیسکۆس ـــ PHISCUS)ەوە ناوی هێناوە و (دانفیل)یش بەناوی (ئۆدرونە ـــ ODORNEH)ەوە باسی کردووە.

لە دوودا گەیشتینە (تاووق) و خۆمانکرد بەجێگایەکی خۆشدا، زۆریش سەرم سوڕما، چونکە دیمەنی گوندەکە زۆر پیس بوو. دەکەوتە جێگەیەکی بەپیتیشەوە، ئاویشی زۆربوو. بەشوێنەواری ئەو کەلاوە زۆرەدا کە لە هەموولایەکەوە دەوری گوندەکەیان دابوو، وامان بۆ دەردەکەوت، کە کاتی خۆی بەربڵاوبووبێ. ئەوەشی کە لێی ماوەتەوە، هەر هی سەردەمی خولەفاکانە، کە مۆڤـ بۆ خوا بڵێ، بەڕاستی فەرمانڕەواگەلێکی ڕووناکبیر و مرۆڤـ پەروەربوون، وەك فەرمانڕەواکانی پێش خۆیان. لەسەردەمی ئەوانیشدا وڵات پڕاوپڕی لە خەڵك بووە، وەك سەردەمەکانی (سەمیرامیس) و (خوسرەو) و گەلێکی تر.

(تاووق)، یان (داقووق)یش لە سەدەی سیازدەهەمدا مەڵبەندی ئەبریشیەی کلدانی بووە، کە دیارە و بێگومان ژمارەیەکی زۆری دیانەکانی تێدابوون. تا ئێستاش ئاسەوارێکی تێدا دەبینرێ، کە پێی دەڵێن کەنیسە.

## ٢ی ئایار

شەوێکی ناخۆش و بێ سرەوت بوو، هەر خەونی ناخۆشم تێدا دەبینی. ئیتر وای لێکردم خەوم بزڕێ چاکترە. لە بەرەبەیاندا خەو دایگرتم. کاتێ بە ئاگاهاتمەوە، سەرم سوڕما، چونکە گوێم لە دەنگێ نەبوو، نیشانەی خۆ سازکردنی بۆ ڕۆیشتن تێدابێ و خەڵکەکەم دەدی بۆئەوە خاووخلیچکیان نیشان دەدا، تا ئەمڕۆ لێرە بەسەربەرن، بەبیانووی ئەوەی ئاسمان هەوراوییە و چاوەڕوان دەکرێ باران بباریٚ. بەڵام ورەمان نەرم نەبووەوە، چونکە وەرزی هاوین بەرێوەیە و ئەگەر زۆر دوا بکەوین، کاتێ هەست بەخۆمان دەکەین، دەشتەکانمان نەبڕیوە و قرچەی گەرمامان هاتۆتێ. سەفەرکردنیش لە دوای سەعات هەشتی بەیانی، لە دەوروپشتی بەغدای جەنجاڵدا، لەو کارانەیە کە ئەنجام نادرێ.

بەداخەوەم کە دەڵێم ئێستا ئێمە لەسەر ڕێی پۆستە دووردەکەوینەوە، وەك دێتە بەرچاوت، ئەگەر شتێك بهێنیتەوە یادت(٢٩٥) پێوەندی بە گەشتی پێشوومانەوە هەبێ بۆ ئەستەموولّ. ئێستا ئێمە دوا دەرفەت لەدەست دەدەین، لە دیتنی (تەتەر)دا کە دەڵێن بەخێرایی لێمان نزیك دەبێتەوە و بەستێکی تایبەتیشی  بۆ ئێمە پێیە.

میستەر ریچ حەز دەکات، فەرمانبەری پۆستەی (تاووق) ڕاسپێری، تا ئەگەر پۆستەبەرەکە گەیشتە (تاووق) ئاگاداری بکات یەکسەر بچێت بۆ سلێمانی، بەڵام بۆی دەرکەوتووە، ئەگەر حکوومەت فەرمانی خێرا لە بەغداوە دەرنەکات، گوندەکان بۆ ئەم مەبەستە وڵاخ نادەن. جگە لەمەش فەرمانڕەوا دڕدۆنگە بە گومانەکەمان: (داوود پاشا) پێی وایە کە گەیشتنی پۆستەبەرەکە لە ئەستەموولەوە، پێوەندی بە سەفەرەکەمانەوە هەیە بۆ کوردستان، ئەم سەفەرەی کە ئەو دڵی نەیدەگرت و لێی ناڕازی بوو. چونکە بەلای تورکەوە بڕوا ناکات کە سەفەرکردن بۆ سەیران و خۆشیی و گەڕان بێ. ڕەنگە هەندێ جار پەنا بۆ ئەم

---

٢٩٥- وەرگێڕ پێی وایە کە (ریچ خانم)، ئەم یادداشتی ڕۆژانەیەی خۆی، وەك نامەگەلێك بۆ کەسوکاری ناردووە و کاتێ گەشتنامەی مێردەکەی  بڵاوکردۆتەوە، ئەمانەیشی کۆکردوونەتەوە و کردوونی بە پاشکۆی کتێبەکە ـــ ع.

سۆنگانە ببات، بەڵام بەردەوام هەندێ هاندەری نهێنی ناهێنێتە پێش چاوی خۆی، کە ددانی پێدانانێت، چونکە ئەو بڕوا بە هیچ کەس ناکات، کە سەفەر بۆ حەوانەوە بکات.

هەرچۆنی بێت (داوود پاشا) لە تەفرەدانی خەڵکدا پشت بە هێز و توانای خۆی دەبەستێ، لە هەنگاو هەڵهێنانی هیچ کەسێکیش ڕازی نییە. ئەگەر بڕواشی بە سۆنگە فێڵاوییەکانی ئەوکارە نەکرد، ئەوا پێی وایە لەپشت ئەوکارەوە زیانی ئەوی تێدایە. گومان لە هەموو کەسێك دەکات و بڕواشی بەکەس نییە، پێشم ناخۆشە کە دەڵێم خەڵکیش هەموو بەگومانن لێی و بڕواشی پێناکەن.

ناچارم (پێشم ناخۆشە کە ددان بەمەدا دەنێم) کە بە ڕقەوە چەند ڕۆژێك چاوەڕێ بکەم، پێش ئەوەی نیشانەی پۆستی (مردخ)ی خۆشەویست ببینم، دەبێ ئەو شوێنە کوێ بێت، ئەونامەیەی تێدا وەربگرم، کە بەخەتی خۆشەویستترین کەس و گەورەترین و شیرینترین کەسم نووسرابێ! نامەیەك لای کەسانێکەوە، کە لە جوانترین و بەختەوەرترین وڵاتی دنیادا نیشتەجێن. ئای، ئەگەر بمتوانیایە بیرێکم لەبارەی ئەو وڵاتە دڕندە سووتێنەرەوە بدانایەتێ کە ئێمەی تێداین. بەراستی ناهەقتان نییە ئەگەر ئینگلتەرەی نیشتمانی شیرینتان خۆش بوێت.

لە شەش و بیست دەقیقەدا دەرچووین. تا هەشت بەناو قوڕ و مەزرای دانەوێڵەیەکی جواندا ڕێمان دەکرد. تا لە کۆتایی زوورگێکی درێژی زوورگە نزمەکاندا، گەیشتینە گوندێك. ئەم شوێنە پێی دەوترا (مەتارا)، بەڵام من پێم وایە هەر درێژبوونەوەی زوورگەکانی (کفری)یە.

لە دەربەند، یان گەروویەکدا وەرسووڕاینە، زەوییەکەی تەموخ داپۆشیبوو، ئاوێکی جوانیشی پێدا تێپەڕ دەبوو، گابەردی گەورە گەورەش لە هەموو لایەکیدا پەرشوبڵاو بوو. لە هەندێ تەلان و تەنگەبەر و خزدا تەختەڕەوانەکەمان بەگران بۆ بەکێش دەکرا. هێسترە بەسزمانەکانیش زۆرخراپ دەخزان، بە تەقەلایەکی زۆریش نەبوایە لە خلیسکان ڕزگاریان نەدەبوو.

دوای ئەوەی لە گەرووە تەنگەبەرەکە تێپەڕبووین، تووشی زەریایەکی ترسناکی زوورگە تەمۆخی ڕووتەن بووین، تا چاو بڕی دەکرد هەر درێژبوون. لە هەندێ مەزرای دانەوێڵە زیاتر، کە لە چەند جێگایەکی کەمیدا کرابوو، ئیتر سەوزاییمان تێدا نەدی.

... کەمێك دوای یازدە گەیشتینە گوندی (لەیلان)، کە پێنج سەعاتەڕێ دەبێ لە کەرکووکەوە. کۆڵێتێکمان تێدا دییەوە، خاوەنەکانی بۆ ئێمەیان چۆڵکردبوو. ئەم گوندە، هی

(عەبدوڵلا ئەفەندی)ی سەرپەرشتیاری (ئیمام ئەعزەم) بوو. لە بەغداد ناسیاوییەکی چاکم لەگەڵ خێزانەکەیدا پەیدا کردبوو. ئەوا ئێستاش خۆی لێرەیە و دیارییەکی بۆ ناردبووین، بریتی بوو لە پێنج سەلك پەنیری تەڕوتازە و هەندێ کەرەی چاك و ماست، کە من ناتوانم باسیان بکەم، بەڵام لە چاکترین ئەو شیرەمەنییانە بوون، کە تا ئێستا دیومن، بۆیە لەمجۆرە کاتانەی ڕۆژدا و بەهۆی میوانداریێتی (ئەفەندی) بەخشندەوە خواردنێکی باشمان لێ خوارد، کە پێی دەوترێ خواردن.

## ٣ی ئایار

زۆرمان پێخۆش بوو، کە لەو پەناگە پیسە ڕزگارمان بووە. زۆریش شادمان بووم کە سواری تەختەڕەوانەکەم بووم و لە دەست ئەو ئافرەتە ڕەنگ پیاوە ژاوەژاوکارانە دەربازبووم و لەوکاتەدا تێم ئالآبوون کە مێردە شیرینەکەم سواری ئەسپەکەی بوو و جێی هێشتم. کەچی تا مێردەکەم لە تەنیشتمەوە بوو، نەیاندەوێرا توخنم بکەون و بۆئەوە سوێیان دەبووەوە و بۆم دەمردن، کە هەرتەنیا سەیرێکم بکەن... تاوێ دوای نۆ، گەیشتینە هەوارەکەی (یوسف ئاغا)، لە دۆڵی لەیلان، کە کۆیلەیەکی (گورجی) بوو لە کۆیلەکانی پاشای بەغدا و فەرمانڕەوای ئەم ناوچەیەی ناوی (قەرەحەسەن)ە و هاوڕێیەکی دێرینەی میستەر (ریچ)ە، نەوازشێکی زۆریشی نیشاندایین، کە زۆری لێکردین بەو ژمارە زۆرەشمانەوە، دەبێ میواندارییمان بکات. چادرێکیشی لەسەر گردۆڵکەیەك بۆ هەڵدایین، بەسەر ئەو ڕووبارەدا دەیڕوانی، کە خۆشم دەویست...

هەرچی شتێکیش لە دەوروپشتمانەوە بوو، دڵگیربوو. هەر ئەمەش بوو وای لێکردبووم وەك (کلود) دەیوت سۆزاویم، هەرچەندە ئەویش بەشداری ئەم هەستەمی دەکرد، ئەگەرچی هەوڵی شاردنەوەیشی بدایە. لەوە دەچوو دەمێك بێت لە دیمەنی ئاوەها دابڕابێتین، بۆیە بەمجۆرە زیاد لەو شوێنە بەناوبانگانەی ئینگلتەرە و سویسرا و ئیتالیا، دیبوومانن، هۆشی لێ سەندبووین. لە دۆڵەکەدا بەناو گوڵ و گوڵەکێویدا دەستمان بەپیاسە کرد. لەپڕێکدا گوڵەکێوییەکمان دی، ئیتر جگە لەم گوڵە، هەرچی شت بوو، لە یادمان کرد و وامان لێهات ئەم تاراوگە ترسناکەمان بپەرستین، چونکە هەستمان کرد لە ئینگلتەراین.

سەر لەئێوارە، ژنەکەی یوسف ئاغا سەردانی کردم. زۆر شارەزایانە خۆی داپۆشیبوو، لەژێر چادرەکەشمانەوە بەسکەخشێ هاتە ژوورەوە، بۆئەوەی کەس نەیبینێ. پێم وایە ئەم نەریتەی لە ئەنجامی شووکردنیدا بەتورکێك، وەرگرتووە، چونکە خۆی عەرەبە و ئەم کارەیشی لە نەریتی عەرەب نییە. دوای ئەوەی کە ڕۆیشت، دیسانەوە بۆ پیاسە چووینەوە. بەڵام هەرکە تاریك داهات، هەموومان خەم دایگرتین، چونکە ناچاری کردین بۆ چادرەکەمان بگەڕێینەوە.

## ٥ی ئایار

بۆ تاقەتکردنی هێسترەکان و خۆ ڕزگارکردن لە هەڵتەك هەڵتەکی ڕێکردنی تەختەڕەوانەکە، بەو سەر ڕێگەیەدا کە دەزانرا ناخۆشە، لە پێنج و نیودا سواری ئەسپەکەم بووم و پەشیمانیش نەبووم...

تاوێ دوای یازدە و نیو، گەیشتینە گوندی (دەرگەزێن) کە لەبەردەم دەشتێکی زۆرجواندا بوو. دەڵێن ماری زۆرە. ئەمەش بۆ ئێمە هەواڵێکی ناخۆش بوو، چونکە چادرەکەمان لەناوەڕاستی گیایەکی بەرزدا هەڵدابوو.

لەم جێگەیەوە گردێکی تری توورەکەڕێژمان بینی، لەو گردە دەچوو کە دوێنێ چادرمان لێ هەڵدا و ناوی (کۆبارا)(٢٩٦) بوو.

دوێنێ ئێوارە، کە هەزارپێیەکی گەورەم بینی، هاتە سەر ئەو ڕایەخەی ئێمە لەسەری دانیشتبووین، ڕاچڵەکینێکی زۆر توند ڕاچڵەکیم. دوای ئەوەی ئەمەشم بینی، ئەگەر نوێنەکانم لەسەر زەوی ڕابخستایە، خەوم لێ نەدەکەوت. بەڵام سوپاسی چرپایە سەفەرییە ئینگلیزییە بچکۆلەکەم دەکەم، کە لەبەر شەکەتیم خۆم لەسەر درێژکرد و بێئەوەی مار و هەزارپێ بێزارم بکەن، خەوێکی هێمن، خەوتم.

---

٢٩٦- ڕاستییەکەی (گۆپاڵە)یە. بڕوانە پەراوێزی بەشی دووەم.

## ٦ی ئایار

له چواری بەیانیدا هەستاین و دووباره بەخۆشییەوه له پێنج و نیودا سواری ئەسپە خۆشڕەوەکەم بوومەوه. دلۆپه شەونمێکی زۆر، باریبووه سەر گیا و تەڕی کردبوو. بەدەشتێکی جواندا تێپەڕبووین، که له هەموو لایەکەوه زوورگی نزم و ڕووتەن و گوند و مەزرای بچووك، لەملاولاوه تێدا بلاوببووەوه. لەوەڕگەیەکی زۆریشی تێدابوو.

ئێستا کەمێك هاتینه کوردستانەوه و چیاکانی له دەوروپشتمانن. زمانی باویش هەر بەتەنیا زمانی کوردی یه. سەرنجماندا یەکسەر جیاوازیی له سەروسیمای کوردی خێڵەکیی و گوندنشینەکاندا هەیه. لای خێڵەکیی ماوەی نێوان چاویان له یەکترەوه دووره و لووتیان بەرزتره و هەنیەشیان بەرینتره و جەستەشیان قەبەتر و ئەندامیشیان ڕێکتره. لەشولاریشیان سەربازییانه هەڵکەوتووه، بەڵام سیمای گوندنشین، ڕێکوپێك و چاونەرم و له سیمای خەڵکی خێڵەکیی ڕوخسار شیرینترن. بەڵام گوندنشین بالآیان بەرزنییه و وەك براخێڵەکییەکەی هەڵسوکەوت و ڕێکوڕەوانییەکەی، ئازاد نییه، چونکه خەڵکی ڕۆڵەی خێڵەکیی سەردارن و ڕۆڵەی لادێیش کۆیلەن...

## ٨ی ئایار

ئەمڕۆ له یەکێك لەو باخانەی (میر)دا٢٩٧ چادرمان هەڵدا، که لەگەڵ شاردا لێکی دابۆوه. هاتنمان بۆ ناوشار لەم ڕۆژانەدا، لەگەڵ کاتی ئەو خۆئامادەکردنەدا ڕێك نەدەکەوت، که هاوڕێیانی (کوردکیون)مان بۆیان سازکردبووین. لەبەرئەوه ناچاربووم له ئەسپەکەم دابەزم، ناچاریش بووم خۆم له تەختەڕەوانەکەمدا بەتەواوی حەشار بدەم. چونکه چاوەڕوانمان دەکرد خەڵکێکی زۆرمان لەسەر خڕببێتەوه، لەوانەی لەسەر و ڕوخساری ئەو ئەوروپاییانه ورد دەبنەوه، که بۆ یەکەمین جار پێ دەنێنه نیشتمانەکەیانەوه و جلوبەرگی تایبەتی ئەو سەرباز و هیندیانه دەیان ورووژێنێ. که لەگەڵ ئەوروپاییدان. چونکه: یەکەم ــ زۆر ئارەزووی دیتنی ئەو شتانەیانه، که پێوەندی بەجەنگەوەیه. دووەمیش ــ بەشێوەیەکی تایبەتی تا دەرفەتی

---

٢٩٧- میر: مەبەست له مەحموود پاشای بابان و ئەو باخەش که چادریان تێدا هەڵداوه، باخەکانی گەڕەکی (چوارباخ)ی شاری (سلێمانی)یه، که لەو کاتەدا له دەرەوەی شار و ئێستا ناوەڕاستی شاری (سلێمانی)یه. (م)

دیتنی ئەو سەربازانە بقۆزنەوە، کە موسڵمانن و بۆ یەکەمین جار دەیانبینن. هەروەها بۆ دیتنی هیندیی و ئەوروپاییش.

کە لە تەختەڕەوانەکەم دابەزیم، زۆر سەرم لەوە سوڕما، کە بەهیچ جۆرێك کەسێکی نامۆم لەدەوری چادرگەکەمان نەدی. بێدەنگییەکەی، لە بێدەنگیی چادرەکەی سەر ڕۆخی (دیجلە)مان دەچوو. پیاوە ناودارەکانی شار بۆ پێشوازیی (کلود) هاتبوون، کەمێك دانیشتن و قاوەیان خواردەوە، بێئەوەی وا بنوێنن، نیشانەی ساویلکەیەتییان پێوە دیار بێت، یان دانیشتنێکی وا بکەن، پێچەوانەی ڕەوشت و خووبێت. بەڵکو خەڵکێکی یەکجار ڕەوشت بەرزبوون و دوایی ڕۆیشتن.

فەرمانی توند، لەلایەن (میر)ەوە دەرچووبوو، جگە لەو کەسانەی خۆی دەیان نێرێ، هەرکەسێ پلەوپایەشی هەرچی بێت، لە چادرگەکەمان نزیك بکەوێتەوە، سزا دەدرێ. مەبەستیش لەم فەرمانە، هەر بۆ حەسانەوەمان بوو. ئەگینا وەك دەڵێن و قسەکانیشم پێ ڕاست بوو، ئێستا هەر لە بەیانییەوە، هەتا ئێوارە، پیاوان و ژنان و منداڵان ئاپوورەیان دەداین، تا لەم دیمەنە وردببنەوە، کە هاتووینەتە لایان.

تاوێ دوای گەیشتنمان تەتەرێك لە ئەستەمووڵەوە گەیشت. لەپێشدا چووبووە بەغدا بۆ لامان. نەیزانیبوو بۆ ئێرە هاتووین. ئەو بەستەکەش کە بۆی هێنابووین، بریتی بوون لە پرسەنامەی پاشا. لە ٩٢ی کانوونی دووەمدا و کۆچی دوایی (دوق کەنت) لە (٤٢)ی هەمان مانگدا، کە پۆستەکەم دەکردەوە، خۆم ئاسایی لەوجۆرە خۆشیانەدا گیانم مێروولەی دەکرد و هەڵدەلەرزیم، کە ترسیشیان تێکەڵ بوو، تووشی نائومێدییەکی گەورەش بووم، چونکە هیچ دەستنووسێکی خۆشەویستانم تێدا نەدی تەنانەت تەنیا دێرێکی (مەردوخ)یشم تێدانەدی. دڵم لەمە تەنگ بوو، تا ناوی باوکمم لە یەکێك لەو ڕۆژنامانەدا بینی، کە لە ناوەڕاستی شوباتدا دەرچووبوون و بەوەش ئاهێکم بەبەرداهاتەوە.

لەبەرئەوەش کە هەواڵی مردنی (پاشا) گەیشتبوو، دەبوایە جارێ چێژی خوێندنەوەی ڕۆژنامەکان واز لێ بهێنین و دەستبەجێ تەتەرەکە بنێرینەوە. بەڵام ئەمە ڕێی ئەوەی لێ نەگرتین چاوێکی خێرا بەبابەتگەلی ژمارەکانی ڕۆژنامەی (ئیڤنیگ مەلس ــ EVENING MAILS)دا نەگێڕین، کە تا چوارەمی شوبات دەرچووبوون. ئەمەش مێژوویەکی درەنگە ئەگەر لەگەڵ گەیشتنی پۆستەکەدا بۆ بەغدا بەراوردی بکەین و لەوێشەوە ناردنەوەی بۆ ئێمە.

تەتەرەکە ماوەی نێوان بەغدا و ئەم جێگەیەی ئێستای ئێمەی بەچوار ڕۆژ بڕیبوو، بەڕێگەی (سەکیرمە ــ سەگرمە)شدا هاتبوو، کە کورتترین و تاڕادەیەکیش بێ سەروشوێن و چۆڵەوانییە.

ئەو وتارە بەجێیانەمان خوێندەوە، کە باوکم لە پشتیوانی کردنی گەلاڵە یاسای پوولی پۆستە و بەیازی کۆنینەدا خوێندبوونییەوە، کە هیوادارین تیایدا سەرکەوتووبێت، بەمەبەستی بڕیاردان لەسەر ئەمجۆرە کاروبارە گرنگانە، چونکە هێزێك لەپشت هەنگاوهەڵهێنانی وەزیرە ئینگلیزەکانی ئێستامانەوە هەیە، بۆ ڕاگرتنیان لە سنووری خۆیاندا. لەوە دەچێ کوشتنی (دۆق بەری Duc de Beri)ش بووبێتە هۆی خرۆشاندنی هەستێکی ترسناك کە لە فەرەنسادا، کە هەستێکی دوژمنکارانەیە بەرامبەر بنەماڵە کلۆڵەکەی (بووربۆن)، ئەو بنەماڵەیەی جێگەی بەزەیین، سەرەڕای ئەو هەموو تاوانانەش کە کردوویانە. ئیتر دەبێ چاوەڕێی چ چاکەیەك لە ئەورووپاوە بکەین، کە ئینگلتەرە خۆی وا ڕاهێنابوو، گەلان بەچاوی ڕێزەوە سەیری دەکرد و ئێستا وا نەماوە.

لەگەڵ ئەم پۆستەیەدا، بابەتگەلێکی خوێندنەوەی زۆر و بەتامیشمان پێ گەیشتبوو، لە (جورنو دیە ساڤان ــ JOURNAU DES SAVANS) و (جورنو دیە دام ــ JOURNAU DES DAMES) و (ئەدنبەرە ئەند کورتەرلی ڕڤیو).

ئەم هەموو ڕۆژنامە و گۆڤارانەشمان لە کاتێکی لەباری وەك ئێستای دوای ئەم گەشتە درێژەماندا پێگەیشتبوو. من ترس و خەمی ئەوەمە، کە (زینەفۆن) و ئەوانەش لەگەڵی بوون، کاتێ بە (کاردوکیا)دا تێپەڕبووبن، بێبەش بوون لە چێژی وەرگرتنی نامەگەلی (یۆنان)، یان (مۆرنینگ کرۆنیکەل)ی (سبارتە)وە، یان دوا ژمارەی گۆڤاری (ئاسینس ڕڤیو ــ ATHENS REVIEW)!؟.

لەکاتێکدا ئێمە سەرقاڵی ئەم چێژوەرگرتنە خۆشە بووین، کە هەموو شتێکی لە بیر بردبووینەوە، لە کوێین و کێمان لە دەورە، نامەیەکمان لە (مەحموود پاشا)ی میری ئێستای (سلێمانی)یەوە بۆ هات، تیایدا (کلود) ئاگادار دەکاتەوە کە حەز دەکات دوای نوێژی عەسر، سەردانی بکات. ئەمەش وای لێکردین پێویستیمان بەخۆ تەیارکردن و سازدان بێت، بۆ پێشوازی کردنی.

لە ئەنجامی ئەو سڵاوەدا کە سەربازەکان بۆیان کرد، مانای ئەو ڕێزەی بۆ دەرکەوت، کە لێی گیراوە، وەڵامی سڵاوەکەیانی بەسەر نەوی کردن بۆ سنگی، دایەوە، وەك لە یادم بێ کە بەدزییەوە، لە دوورەوە، لە درزی دەرگای چادرەکەمەوە سەیرم دەکرد، پیاوێکی ئەندام بچووك و کورتە بنەبوو، شتێکی وا تایبەتی تێدا نەبوو سەرنج، ڕابکێشێ و لە خەڵکی تری جیابکاتەوە. بەپێچەوانەی ئەو پیاوانەی خۆیەوە بوو، کە هەموویان بە قەڵافەت و ڕوخسار

سەربازانە بوون. کوڕە گەورەی پێنج کوڕەکەی خوالێخۆشبوو (ئەورەحمان پاشا)ی بەناوبانگە، تەمەنی سیی و پێنج ساڵێك دەبێ، پیاوێکی هەست ناسك و بەویژدانە. ئەگەرچی زەبروزەنگ و توندوتیژیشی کەمە. زۆریش خواپەرستە. هەر ئەمە وای لێکردبوو لایەنگری ئایینداران و زانایان بێت، ئەوانەی کە لەهەر بەشێکی ئیمپراتۆریەتی ئیسلامیدا بن، ڕووناکبیرترین کەس نین و ئەمانە وا ناسرابوون کەللەڕەق و دەمارگیربن. بەڵام میر خاوەنی پشوویێکی درێژ و نەرم بوو. ملی بۆ دەمارگیریی ئەمانە نەدەدا، لەبەرئەوەش ڕەشبین بوو، بۆیە واش هەڵکەوتبوو هەمیشە بەچاوێکی تاریکەوە سەیری هەموو ئەوشتانە بکات، کە تووشیان دەبوو.

سەر لە ئێوارە لە باخەکە پیاسەمان دەکرد. هەواکەیشی بۆنی گوڵاوی لێ دەهات. هەست دەکەم بێزارم لەوەی لەم جێگە دڵخۆشە بڕۆم بۆ شار، کەوا دەردەکەوێت هیچ سەرنج ڕاکێش نەبێت. دەڵێن خانووەکانیشی داتەپیون. حەز دەکەم هەر لێرە بمێنمەوە. بەڵام میری ڕەوشت بەرز و بەخشندە حەزی دەکرد بگوێزینەوە بۆ ناوشار. منیش هیچم بۆ نەماوەتەوە، لەوە زیاتر بۆ ڕازی کردنی میر، واز لە حەزەکەی خۆم بهێنم.

## ۰۱ی ئایار

لەبەرئەوەی لەکاتی چوونە ناو شارماندا، خەڵکێکی زۆر بەشداربوون و جلوبەرگیشیان هەمەڕەنگ بوو. بۆیە کەژاوەکەمان، وەك خۆپیشاندانێکی مەزن بوو. بەشداربووەکان لە کورد و ئەوروپایی پێکهاتبوون. هەمووشیان لە جلوبەرگی جوان و فەرمیی و ڕەسمیدا بوون، چونکە سەربازانی هیندی بە تەپڵ و زوڕنایانەوە، سوارەی ڕووس(۲۹۸) بە کەڕەناکانیانەوە، ئەفسەرانی تورك دیان و تەنانەت جوولەکەکان و خزمەتگوزارەکانی سەر بەبارەگای نیشینگەیی ئێمەش هەموویان، نیشانەیەکی مەزنایەتییان پێکهێنابوو، لە تێکەڵ بوونی ئادەمیزادی سەرەتایی دەچوو. ئەوروپاییەکانیش بە دیمەنی ڕێك و لە یەکچوویانەوە، بەزەقیی سەرنجیان ڕادەکێشا و ئاپوورەکەش بەهەموویەوە، کوتومت ڕەمزێکی ئەوروپا و ئاسیا بوو، هاتبووە قسە.

دیاربوو میر حەزی دەکرد لەناو شار جێگیرمان بکات، چونکە پێی وابوو گەڕانەوەی میستەر ریچ، بۆ چادرگەکەی خۆی، فاڵێکی باش نییە، تا لەدواییدا میستەر ریچ ــ یش بەم حەزە ڕازی بوو، لەو بڕوایەوە کە پێی چاك بوو بێزاریش بێ و حەسانەوەشی نەبێ، نەك هەستی ئەو خەڵکە بەنەوازش و

---

۲۹۸- میستەر ریچ لە یادداشتەکانی خۆیدا، باسی ئەم سوارانەی نەکردووە.

بەخشندەیە بڕەنجێنێ و بەپێچەوانەی بیروباوەڕیانەوە بجووڵێتەوە. لەبەرئەوە کەلوپەلەکانیان کۆکردەوە و منیش سواری تەختەڕەوانەکەم بوومەوە و پەردە ئالەکانی دادرانەوە و لە هەموو لایەکییەوە توند شەتەك درا، تا کەس سەری نینۆکیشم نەبینێ، سەرەڕای ئەوەش کە چەرچەفەکەم(٢٩٩) بەخۆمدا دابوو و ڕووبەندیشم دادابووەوە. چونکە لەمجۆرە کاتانەی وەك ئێستای منی خێزانی پیاوێکی پایەداردا، کە ناچاربێ بەئاشکرا، بەناو خەڵکێکی زۆردا تێپەڕ بێت، دەبێ لۆیەکی ڕووبەندەکەیشی دیارنەبێ...

ئا بەمجۆرە گەیشتمە ئەو خانووی بۆمان تەرخانکرابوو. بەرلەوەش (سلێمانی) و خەڵکەکەی ببینم، پێم گرانە ناوی بنێم خانوو. کە لە تەختەڕەوانەکەمدا بووم، بەو ورتە ورتە بەردەوامەی لە دەوروبەرو پشتمەوە دەمبیست، بۆم دەرکەوت، گەیشتووینەتە سلێمانی. ئەو تاسە و ئارەزووەی بۆ دیتنی پایتەختەکە و نیشتمانەکە و خەڵکەکەی هەمبوو، ئێستا بەهۆی پەرپووتی ئەو شوێنەی بۆ نیشتەجێ بوونم تەرخانکرابوو، هەمووی بووە ڕق و قێز. ئەوەشی بەلامەوە ستەم بوو، دەبوایە پڕکێشی بکەم و بچمە ناو کۆمەڵێك کەلاوەوە، کە هەر لە حەوشەکەوە لێمەوە دیاربوو. لەبەرئەوە گوڕم دایە بەرخۆم و لەگەڵ میستەر (بەل لی نو) و پزیشکە بچووکە ئیتالییەکە، چووینە ژوورەوە. لەوێ یەکەمیان زیرەکانە، بەفوو خۆی دەتەکاند و دووەمیشیان بەلاقرتییەوە کەوتە خۆتەکاندن.

هیچ جۆرە پێوەندییەکم بەدیوانخانەوە نەبوو. ڕەنگە لە چارەشم نەنووسرابێ ببینم. شێوەی ڕێکخستنەکەی بەتەواوی لە شێوەی ڕێکخستنی ژووری حەرەمەکە دەچوو، بەڵام لەو داتەپیوتربوو. بەزەییم بە میستەر (بەل لی نو)و ئەو پیاوانەماندا دێتەوە، کە تیایدا دەمێننەوە.

## ٢٠ی ئایار

ماوەیەکی زۆری بەسەردا چووە و هیچم لە یادداشتەکەمدا تۆمار نەکردووە. ئەوەتەی هاتوومەتە سلێمانیشەوە، گۆشەگیربووم و شتێکی ئەوتۆم نەدیوە، شایستەی نووسین بێ. بەڵام لە شێوەی نامەدا، نووسینم زۆربووە. لەوساوە کە لە خانووەکەشمدام، تەنیا یەکجار حەرەمخانەکەم بەجێهێشتووە، ئەویش بۆ حەمام چووم.

---

٢٩٩- لە دەقەکەدا (چەرچەف) هاتووە، پارچەیەك قوماشی ئاوریشمە، نەخشی چوارگۆشەی سپی و شینی تێداکراوە و دەورەکەی بەداوی زێڕین چنراوە. جگە لەدەموچاو، سەرتاپای لەش دادەپۆشێ، کە پەچەیەکی لە مووی کلکی ولاخ چنراو، دایدەپۆشێ. بەمجۆرە خۆی دادەپۆشێ. بەڵام لەودیوی پەچەکەوە بەئاسانی دەتوانێ هەموو شتێك ببینێ ــ ع.

## ٦ی حوزەیران

دەبێ ئەمڕۆ لەگەڵ خێزانی میردا بەسەری بەرم. لەبەرئەوەش کە نەریتی خۆرهەڵاتییانە، وای لەسەر میوان پێویست دەکرد، دەبێ بەمانای وشەوە، ڕۆژەکەی بەسەر ببات، بۆیە کە لە سەعات دەدا لە خۆئامادەکردن بوومەوە، ئافرەتێك لە کۆشکەکەوە بەشوێنمدا هاتبوو بۆ ڕێنماییمان تا ژووری حەرەم، دایکی میناس و کارەکەرەکانم لەگەڵدا هاتن. بەڕووبەند و خۆپێچانەوەیەکی تەواوەوە ڕۆیشتین. پێویستیشی نەدەکرد زۆر دوور بڕۆین، چونکە خانووەکەمان لە کۆشکەکەوە نزیك بوو. دەرگای حەرەمەکە لە حەوشەکەوە نەبوو، بەڵکو لە پشتی حەرەمەکەوەبوو، دەرگاکەی یەکجار بچووك بوو، بۆیە ناچاربووم تەواو خۆم بنوشتێنمەوە، تا پیایدا تێپەڕبم.

لێرەدا کابانەکانی کۆشك پێشوازییان کردم و دەستەیەکیش کەنیزەك لە پێشیانەوە بوون. کابانێك لای ڕاستمەوە و یەکێکی تریشیان لای چەپمەوە دەڕۆیشتن، تا بردمیانە لای پلیکانەیەك و پیایدا سەرکەوتین، لەبەر دەرگای ژوورێکی گەورەدا، ژنی میر خۆی پێشوازی کردم و خوشکەکانی میر و چەند ئافرەتێکی تری بنەماڵەکە لەپشتییەوە بوون. قاوە(٣٠٠)تێکرا و حەڵوا و شەربەت و قەننەش ئاسایی هێنران. زۆر بێزاربووم لەم هەموو نەوازش و ڕووپێدانە زۆرە. بەڵام سەیرم کردن دوای ئەم ڕووپێدانە پێویستە، وازیان لەمجۆرە هێنا و گەڕانەوە بۆ ڕەوشتە ساکارەکەی خۆیان و ڕووخۆشییەکەیان و لە دڵەوە تەقەللایان دەدا ئاسوودەبم. عادیلە خانمی ژنی میر، کچی عوسمان بەگە. لەبەرئەوە دەبێتە خزمی مێردەکەی.

لە ڕاستیدا هەموو ئەندامەکانی ئەم بنەماڵە زۆرە، لەناوخۆیاندا ژن و ژنخوازی دەکەن و لەگەڵ بیانەدا ژن و ژنخوازی ناکەن.

عادیلە خانم هەر بیست و حەوت، بیست و هەشتساڵێك دەبێ. لە ئافرەتەکانی تری بنەماڵەکە کەڵەگەتترە. گەنم ڕەنگێکی قژڕەشە، دووچاوی نەرمی پێوەیە، شێوەی شیرینە و تەمومژاویی نییە، ناسکۆڵەیە و ڕوخساری سەرنج ڕاکێشە. لە سیمایدا دیاربوو کاتی خۆی خەمی زۆر خواردبێت. لە هەڵسوکەوتیشیدا سەلاریی و ئاغرییەکی بەرزم بەدی کرد، کە زۆر کاری تێکردم. تاقە ژنی میرە و پیوەندیشیان زۆر پتەوە. هەردووکیان بەهۆی ئەو خەمە زۆرەوەی بۆ جگەرگۆشەکانیان خواردبوو، کە بە (ئاووڵە) مردبوون، یەکجار زۆر هۆگری یەك

٣٠٠- لە یادداشتی ئەم ژن و مێردەدا تا ئێستا باسی (چایی) نەکراوە. وا دیارە لەو سەردەمەدا لە عێراقدا باونەبووە ـ ع.

ببوون ئێستا تەنیا هەر منداڵێکیان هەیە(٣٠١) ئەگەرچی ئەم زۆری خۆش دەوێت، بەڵام بەشێوەیەك باسی دەکات، وەك خۆی و مێردەکەی چاوەڕوان دەکەن، لە دەستیان دەچێت، چونکە کە سەیری دەکرد، چاوەکانی پڕ دەبوون لە فرمێسك. وتیشی: (هی من نییە، هی خوایە، دەستیش لەکاری خوا نادرێ).

تێم گەیاند پێویستە دژی ئاوڵە بکوترێ، ئەویش زۆر بەوردی گوێی بۆ قسەکانم و کەڵکەکانی کوتاندن ڕاگرتبوو. بەڵام هەر نائومێدیی لەوەدا پێوە دیاربوو، کە چاوەڕوانی نەدەکرد هیچ شتێك بەکەڵکی بێت. کە پێم وت دەرمانی کوتاندنت بۆ دەهێنم، دڵی نەشکاندم و هانیدام. بەڵام قسەکانی بەوە کۆتایی پێهێنا، کە وتی: (هەر دەبێ لەبەر بەزەیی خوادا خۆمان ڕابگرین، چونکە خۆی دەزانێت چی دەکات. لەبەرئەوە دەبێ بڕوای پێبکەین).

دەستبەجێ بە تەتەرێکی خێرادا بۆم نووسی، تا دەرمانی کوتاندنی بۆ بهێنن. منیش زۆرم پێخۆش دەبێ ئەگەر بتوانم ئەم منداڵە جوان و بچکۆلەیە لەو نەخۆشییە دلڕەق و کوشندەیە ڕزگار بکەم. لە کوردستاندا بە هەزاران کەس دەبنە خۆراکی ئەم نەخۆشییە و ڕەنگە ئەگەر خەڵکەکەش بزانن میر، کوڕە تاقانەکەی خۆی کوتاوە، ئەوانیش بیەڵن منداڵەکانیان بکوتین، ئیتر ئەوسا گەشتەکەمان بۆ کوردستان، بێ کەڵك نابێ، ئەگەر نەشتوانین بۆ یەکجاری لەناوی بەرین، دەتوانین کەمێك ئەو ئاوڵە کوشندەیە کەم بکەینەوە.

خانەخوێیەکەم (عادیلە خانم)، ساڵانێکی زۆری سەردەمی منداڵیی لە بەغدا بەسەربردبووە. فێری تورکیش ببوو، بەڵام قسەی زۆر پێنەکردبوو، بەگران قسەی بۆ دەکرا و ئەوپەڕی توانای خۆی خستەکار بۆئەوەی لەگەڵمدا بدوێ.

بەڕاستی ڕۆژێکی خۆشم لەگەڵ خۆی و ئەو ئافرەتە زۆرەدا بەسەربرد، کە لەگەڵی بوون. لە سەعات پێنجدا بۆ ماڵەوە گەڕامەوە. ئەوەندەش ماندوو نەببووم کە چاوەڕێم دەکرد(٣٠٢).

---

٣٠١- لەوەدا بەهەڵە چووبووم، چونکە دوو کوڕی هەبوو، گەورەکەیان لە کرماشان بارمتەبوو، کە ڕەنگە پێشتر تووشی ئاوڵە بووبێ، بەڵام دایکی پەژارەی زۆری بچووکەکەیانی بوو، کە هێشتا لەبەردەم ئەوەدایە تووشی ئاوڵە بێت. هەر بەتەنیاش باسی بچووکەکەیانی دەکرد.

٣٠٢- تا ئێرە یادداشتەکانی ڕیچ خانم دوایی دێت و ئیتر لێرە بەدواوە باسی گەشتەکەی نەکردووە ــ ع.

# پاشکۆی دووەم

گەشتێك بۆ شوێنەوارەکانی (زندان) و (قەسری شیرین) و (حۆش کەڕوو)... هتد، لە سنووری کوردستانی باشووردا لە مانگی مارت و نیسانی ۰۲۸۱ ـ دا کە بریتییە لە کورتەی ئەو نووسینانەی میستەر ریچ لەم گەشتەدا نووسیونی و کردوونی بەپاشکۆی کتێبی دووەم، بەڵام وەرگێڕ کردی بەپاشکۆی کتێبی یەکەم (ع).

## خانی سەیید لە بەعقووبە

## شەوی ۸۱ی مارتی ۰۲۸۱

وا ئێستا سەرەڕای پێسپێرییە زۆرەکانت کە لە (ئۆرتەخان)(۳۰۳) دوورنەکەومەوە، بەڵام سەیرم کرد ڕۆژەکە خۆشە و خانەکەش پیسە و منیش لە توانامدایە، بۆیە بیرم لەوە کردەوە بە حەیفی بزانم کاتێکی ئاوەها، لە ئەشکەوتێکی ئاوادا بەسەربەرم، لەبەرئەوە پڕکێشیم کرد و هاتمە پێشترەوە و خراپتریش نەبووم، بەڵکو لەم دوو ڕۆژەی دواییدا هەست دەکەم زۆر لە پێشوو باشترم، چونکە ژانەسەرەکەم بەریداوم و گوڕوتینێکی وام تێهاتۆتەوە، سەرەڕای ئەوەش کە پارێز دەکەم، ئەگەر پێویستیش بکات هەر ئێستا دەتوانم سەفەر بکەم.

ئەو زەوییەی دەکەوێتە نێوان بەغدا و ئەم شوێنەوە، تەختترین شوێنە، بەڵام بەشەکانی تری بیابانەکانی تەنیشت بەغدا، ئەگەر بەراورد بکرێن بەو بیابانەی منی تێدام، ئەوەندەی (پلیۆن ــ PELION) و (ئوسسا ــ OSSA) و (تامپە ــ TEMPE) دەبن. لە سەعات سێ و نیودا گەیشتینە جۆگەکەی (نەهرەوان)(۳۰٤)،کە بەلای کەمەوە ئەوەندەی ئەم ڕووبارەی (دیالە) دەبێ، کە لە سەعات چواری دوای نیوەڕۆدا گەیشتینێ.

کە بیستیشم (حاجی عومەر)ی دۆستی دێرینەمان بۆ بەغدا چووە، بڕیارمدا هەر لەم (خان)ە بمێنمەوە، کە وەك سەیریم کرد خانێکی خراپیش نەبوو. ئەم خانە دەکەوێتە بەری لای بەغدای ڕووباری (دیالە)وە و بەرامبەر گوندی (باقوبە) و گوندی (ئەلهویدەر)ەوە(۳۰۵)، کە حەز لە دیتنی ناکەم. سبەینێش بۆ (شارەبان) دەچم.

---

۳۰۳- (خان النص ــ النصف): ئێستا بە (خان بەنی سەعد) ناسراوە ــ ع.

۳۰٤- ساڵی (۵۹۰ز) کیسرا پەروێزی شای فارس لە (تەیسەفون)ەوە، بۆ شەڕی (بەهرام)ی سەرکردەی ڕاپەڕیو، کەوتەڕێ، کە بە سوپایەکی پڕ لە ژاوەژاوەوە هاتبۆوە بەردەم پایتەختی ئیمپراتۆریەتەکە. ئیتر لەنێوان هەردوولادا شەڕێك قەوماوە، کە بەشەڕی (نەهرەوان) ناسراوە. (دیر بی لو)ی مێژوونووس دەڵێ (کیسرا) لەم شەڕەدا تێشکاوە، ئەوەی ئەم مێژوونووسە، سەیر باسی دەکات، ئەوەیە کە (شا) ناچاربووە ڕابکات و پەنا بباتە بەر کەنیسەیەك، کە ڕەنگە لە (تەیسەفون) و (نەهرەوان)ەوە دوورنەبێ. ئیتر لەوێ کۆمەڵێك لەوانەی سەر بەوبوون، لێی گردبوونەتەوە. بەڵام ئێستا هەموو ئەو زەویانە، ڕیزە کەلاوەن و هیچ ئاسەوارێکی دامودەسگای (دیان) یان تێدا نییە. بڕوانە لاپەڕە (۵٦۹۹)ی کتێبەکەی (کتێبخانەی خۆرهەڵات) و بڕوانە لاپەڕە (۷۸۱)ی بەرگی دووەمی کتێبی: (تیاچوون و ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی)ی نووسینی (گیبن).

۳۰۵- لە دەقەکەدا بەهەڵە (هویدا) نووسرابوو ــ ع.

ئەوەتەی هاتوومەتە ئێرە توانیومە شوێنی (گومەزە شینە)(٣٠٦)دیاری بکەم و نۆ جاریش بەرزایی خۆرم دیاری کردووە، (گەلاوێژ ـــ کاروان کوژە)م هەژدە جار پێواوە و (کەشکەشان)یشم(٣٠٧)هەشت جار پێواوە. پاشان لە ئێوارەدا بۆ نانخواردن، ئێوارە گەڕاینەوە.

ئێستاش دەرفەتی نووسینی ئەم نامەیەم بەهەل زانیوە، کە ولاَخدارەکە بەلێنی داوە بۆتی بهێنێ. تکام وایە ئەگەر بەلێنەکەی بەجێهێنا و بۆتی هێنا، بەخشیشە ئاساییەکەی بدەیتێ. هێشتا یادداشتی ڕۆژانەشم نەنووسیوە، ڕەنگە پێش نووستن بیاننووسم.

## شارەبان ٩ی ئادار

دوای خۆرکەوتن، یەکسەر خانەکەمان جێهێشت و بە کەلەکەکەی گوندی (ئەلهویدەر) لە ڕووباری (دیالە)مان دا. خەرندەکانی ڕووبارەکە زۆر بەرز نەبوون لە هەندێ جێگادا لە دیوار دەچوون، زەویش لای ڕۆخەکەی، زۆر شەقارشەقار ببوون، کە ئاوی باراناو دایدڕیبوو. قوولایی ڕووبارەکە هەژدە پێ دەبوو. کە بوو بە سەعات هەشت، هێشتا کۆمەلەکەمان لە ڕووبارەکەیان نەدابوو، ئەگەرچی ئێمە لەگەلْ خۆرکەوتنیشدا کەوتبووینە ڕێ. دارخورمایەکی زۆر لە هەموو لایەکەوە لە دەوروبەری گوندەکانی ئەم ناوچەیە هەبوون.

لە سەعات دەدا بەلای ئاوێکدا تێپەڕبووین، لە کۆنە جۆگە دەچوو. لە تەنیشتەوە گردێکی بەرز هەبوو، لەتە خشت و هەندێ پارچە مەڕمەڕی لەسەربوو، وەك یادم بێ ئەم جێگایە پێی دەلێن (لیسیە ـــ LISSIA)، ئەگەر متمانە بەو کابرایە بکرێ کە ناوی ئەم جێگەیەی پێ وتم. بەلاَم ناونانەکانی ئەم جێگایانە لە یەك جیاوازن. لەم شوێنانە مەزارێکی زۆری ئیمامەکان لە هەموو لایەکدا هەن. دەلێن گۆڕی ئەو سەربازە موسلْمانانەن، کە لە دوای شەڕی (قەسری شیرین) بەبرینداری گەڕاونەتەوە و بەدەم گەڕانەوەیانەوە، لەهەر شوێنێ گیانیان دەرچووە و شەهید بوون، لەوێ نێژراون. بەدرێژایی ڕێگاکە شوێنەواری خانووی لەخشت دروستکراوم دەبینی، کە خشت و بەردیان لە هەموو شوێنێکدا بەرچاو

---

٣٠٦- لە دەقە عەرەبییەکەدا (القُبّە الزّرقاو) نووسراوە، کە سۆراخێکی زۆرم لـە قـاموس و لای شـارەزایان کرد، بەلاَم بەکوردی ناوی تەواویم چنگ نەکەوت، کە ڕەنگە هەیبێ و من پەییم پێنەبردبێ ـــ م.

٣٠٧- لە هەردوو بەرگی (١، ٢)ی ـــ القاموس العلمی ـــ ی ماموستا (کمال جلال غریـب)دا ئەسـتێرەی (الجوزاو) بەدوو جۆر هاتووە، بەلاَم ئەوەیانم بەپەسند زانی کە لە بەرگی دووەمیاندا هاتووە و (کەشکەشـان)ە ـــ م ـــ لاپەڕەکانی ٥١٢، ٣٧٢ی بەرگی یەکەم و دووەم لە (القاموس العلمی ـــ کمال جلال غریب).

دەکەوتن. بەلای هەندێ سەوزایی جوان و جۆگەدا تێپەڕبووین، کە لە هەندێ جۆگەی سەرەکی هەڵگیرابوون. لای چەپمانەوە گوندی (خەرنابات) و گەلێ گوندی تریشمان جێهێشت. لە سەعات دوودا گەیشتینە پردێکی یەك پایەیی، بەسەر جۆگەی (مەهروت)ەوە بوو، کە لە سەرەوە دەڕژایە ڕووباری (دیالە)وە. ئیتر تا سەعات سێ، لای مەرقەدی (ئیمام ــ سەیید میقدادی کندی) ماینەوە.

لە سەعات چواردا گەیشتینە (شارەبان). ئێستا ئیتر خۆم لەسەر زەوی درێژکردووە و توانای بینین و نووسینم نییە، چونکە سەفەرەکەمان هەتا بڵێی لەبەرئەو (با) ناخۆشەی بەتوندی لە باشوورەوە هەڵیکردبوو، زۆر ناخۆش بوو. بەتوندی هەڵی دەکرد و تەپوتۆزێکی زۆری لە زەوی بەرز دەکردەوە و بەڕووی ئێمەش و ولاخەکانیشدا دەدا. هیوادارم (میناس) ئاگادار بکەیتەوە کە هێسترەکانی ئێرە یەکجار خراپن. لە هەر میلە ڕێیەکدا خۆیان بەزەویدا دەدا. ئەگەر بەسنگەکوتێ نەبوایە، قۆناغی ئەمڕۆمان نەدەبڕی. لێرە بەڵێنیان داینێ بۆمانیان بگۆڕن. قۆناغی نێوان ئێرە و بەعقووبە نۆ سەعات ڕێ دەبێ. بەدرێژایی ڕێ زەوی زۆر تەخت و لە هەموو جێگایەکیشدا جۆگە دابڕدابڕی کردبوو. هەرکە دەستمان بەڕۆیشتن کرد، گێژەڵووکەیەك بەبارانەوە دای بەڕووماندا. هەر ئەوەندەش هێواشی کردەوە، ئەو بای باشووری خۆرهەڵاتییە، لێمانی هەڵکرد، کە تا ئەم ساتەش بەردەوامە. بەڵام جگە لە هەردوو چاوم، کە بەهۆی تۆزوباوە، سوور هەڵگەڕابوون، ئیتر لەوپەڕی چاکیدام.

لێرە، سەعدون ئاغای فەرمانڕەوای ئێرەم بینی، کە لەپێشدا لە خانووە کۆنەکەماندا بوو، ئیتر نەیهێشت بچینە خانەکە، کە من حەزم دەکرد، بەڵکو خانوویەکی بۆ چۆڵکردین. هەر لێرە (سلیم بەگ)یشم بینی، دوای ئەوەی لە فەرمانڕەوایی (خانەقین) لابرابوو. پاش ئەوەی هەردووکیان پێکەوە هاتنەلام و دڵنیا بوون کە لە جێگاکەم ڕازیم، پاشان (سەلیم ئاغا) خۆراکێکی بەتامی بۆ ناردم کە بە نسیبی کۆمەڵەکەمان بوو، چونکە کە ئەو خواردنە هات، من تازە لە ژەمێك خواردنی پۆڕ و بەهارات ببوومەوە. پێشتریش تکای تایبەتیم لێکردبوو، کە پێمانەوە ماندوو نەبێ و هیچ جۆرە خۆاردنێکمان بۆ نەنێرێ. دیارە کۆمەڵەکەشمان ئەم هەستەی منیان بەلاوە ناخۆش نەبوو. تکام وایە یەکێك بنێریتە لای ژنەکەی، تا سەبارەت بەو ڕێزونەوازشەی مێردەکەی، لە ئێمەی گرتووە، سوپاسی بکەیت، کە بەلای زۆرەوە ئەم نامەیەش هەر بەودا بۆ تۆ دەنێرم. وەك پێشیان وتم ئەگەر لێرە دەربچم، ئیتر تا خۆم بۆ بەغدا دەگەڕێمەوە، دەرفەتی پێوەندی کردنم بە بەغداوە، ئەوەندە بۆ نالوێ. ئەگەر بەهۆی ئەم گوێدرێژە بێ کەڵکانەوە نەبوایە، سەفەرەکەمان سەفەرێکی خۆش دەبوو. لە ئاسیای ناوەندا

شتێك نییە لە هێستر بێ کەڵکتر. خەریکە گەرما زیاد دەکات و چاك وایە پەلە بکەین و بەغدا بەجێ بهێڵین و دەست بە گەشتە گەورەکەمان بۆ کوردستان بکەین.

## شارەبان ـ ٠٢ی مارت

هەندێ پشکنینم کرد. کارەکانی ئەمڕۆم لەوەشی تێپەڕاند، کە بەهیوابووم. ئەوەشی کە لێرە بینیم، لەباری جوگرافی و شوێنەوارەوە، ئەوەی دەهێنا لە بەغداوە بۆی بێیت. بەڵام ئێستا بۆم دەست نادات، بۆتی بنووسم چیم کردووە، مەگەر کەمێکی. کاری ئەمڕۆ زۆر سەخت بوو، سەرباری ئەو سەختییەش، بایەکی گەرمی لە باشوورەوە لەسەرخۆ هەڵکردبوو. بەلام سوپاس بۆ خوا، ژانە سەرم نییە، هەرتەنیا کەمێك ماندووم.

ئەم بەیانییە چووم بۆ سەیری ئەو شوێنەوارانەی پێیان دەوترێ (زندان)(٣٠٨)و پێنج میلێك لە باشووری ئەم جێگایەوە دوور دەبێ، کە ئێمەی لێین. بەدەم ڕێگاوە بووین بۆ دیتنی شوێنەوارەکان، لە نیوەی ڕێ ئەوە ڕوویدا، کە چاوەڕێمان نەدەکرد، ئەویش ئەوەبوو، چاو ساغەکەم کە خانووسازێکی ناسراوبوو، پێمی وت کەمێك لە ڕێ لابدەین بۆ دیتنی قەڵایەکی کۆن. لەبەرئەمە لە یەك دوو جۆگەمان دا، ئیتر ئەوەندەمان زانی لەبەردەم شوێنەواری شارێکی ساسانیداین، کە هیچی لە (تەیسەفون) کەمتر نییە و هەڵکەوتی وارشەکەیشی هەمان شێوە و هەڵکەوتە. جێگاکەش پڕبوو لە پارچە و ئاسەواری کۆنینە. ئەم شوێنە هەر چارەکە سەعاتێك لە (شارەبان)ەوە دوور دەبێ، بەڵکو سنوورەکانی سەرەوەی شارەکە، لەوە کەمتریش بوو. لایەکانی باشووری خۆرئاوای وارشەکە، کە لێوەی چووینە ناوەوە، حاڵیان چاك بوو. زۆریش لە وارشەکانی (سلوقیە) و (تەیسەفون) دەچوو. هەرچەندە ئەم ئاسەوارانە بە بەغدای کۆن ناسراون، بەڵام مێژوویان هی پێش سەدەکانی ئیسلامە. لەیادیشتە کاتی خۆی شوێنی (دەستجرد)م لە (زندان) دیاری کردبوو. دیاری کردنەکەشم باش پێکابوو. ئێستا بڕوام زیاترە، کە ببێ و نەبێ هەر (ئاسکی بەغدا) شوێنەواری ئەو پایتەختە شاهانەیەیە(٣٠٩).

---

٣٠٨- لەناو خەڵکدا هەندێ جار بە (زندان کیسرا) و هەندێ جاری تر بە (قەڵای خوسرەو) ناسراوە. لە گەشتەکەی (المنشی‌و البغدادی)یشدا، کە مامۆستا (عباس العزاوی) کردوویەتی بەعەرەبی، بە (زندان کیسرا) هاتووە ــ ع.

٣٠٩- کاتی خۆی (دەستجرد) خۆشەویستترین کۆشکی (کیسرا پەروێز)ی شای فارس بووە، کە ئەمی لە (تەیسەفون)ی پایتەختی ئیمپراتورەکەی پێ پەسەندتربووە. (گیبن)ی مێژوونووسیش، کە بەوەسفی جوانی جوگرافیایی ناسراوە و لەوانەش ڕوون و ڕاستتر دەنووسێ کە ڕاستەوخۆ دیویانە، کاتێ دێتە سەر باسی سێیەمین هێرشی (هێرکوڵ)ی ئیمپراتور، دژی

چووینه پێشترەوە و ئاسەواری تری ساسانیمان دییەوە. لە نیوەی ڕێی (زندان) و بەرامبەر (سوڵتان عەلی)، دوو دیوار و وارشی هاوتەریبی ساسانیم بەدی کرد، بەرەو باکووری خۆرهەڵات و باشووری خۆرئاوادا درێژببوونەوە. ماوەی نێوانیشیان شەش سەد پێ دەبوو. درێژاییشیان هەر ئەوەندە دەبێ و کوتومت لە وارشەکانی (سلوقیە) دەچن. لەنێوان هەر چینە خشتێکدا، شوێنەواری قامیشم بینی.

پاش ئەوەی لەم ئاسەوارانە تێپەڕین، گەیشتینە (زندان)، کە بۆ سوار، چل و پێنج دەقیقە ڕێ دەبێ. لە (ئاسکی بەغدا)وە ئاسەوارێکی زۆر مەزن و گرنگ و سەیربوو. لە هەموو ئەوانەش جیاوازتربوو، کە تا ئێستا دیومن. چونکە خانووسازییەکەی لە خشتی سوورەوەکراوی تۆکمە دروستکرابوو. بەلای زۆرەوە پێم وایە گۆڕێکی شاهانە بووبێ. درێژایی ئەم کەلاوانە، سی زنجیری بچووك دەبن، کە هەر زنجیرێکیان پەنجا پێ و پانایی‌شیان لە سەرەوە چل و شەش پێ و شەش گرێ و بەرزایی‌شیان شازدە پێ و دە گرێ دەبێ، لە هەندێ لایەوە لەوەش بەرزترە. خانووەکە دوازدە قوللە، یان پایەی هەیە، کە هێشتا ماون و چواری تریشیان لەبەری لای سەرووییەوە ڕووخاون.

---

دەوڵەتی فارسی، لە ساڵی (٧٢٦ز)دا، بەدەم باسی پێشڕەویی سوپاگەلی ڕۆمانییەوە بۆ سەر (تەیسەفون)، دوای شەڕی (نەینەوا)، بەمەزندە جێگای (دەستجرد) لەم شوێنەدا دیاری دەکات و دەڵێت:» لە خۆرئاوای دیجلە و لە کۆتایی پردی مووسڵەوە کاتی خۆی لە سەردەمی ڕابوردوودا شاری (نەینەوا) ئاوەدان بووە. بەڵام لەبەرئەوەی دەمێکە ئەم شارە ئاسەواریشی لەبەرچاو نەماوە، جێگاکەی بۆتە مەیدانێکی بەرین بۆ جموجوڵی جەنگیی هەردوو سوپاکە.

سوارەی فارس، تا حەوتی شەو خۆیان ڕاگرتووە، لە دەوروبەری سەعات هەشتدا بۆ سەربازگەکەی خۆیان کشاونەتەوە، کە پارێزراو بووە، ئیتر کەلوپەلیان هەڵگرتووە و بەهەموو لایەکدا بڵاوبوونەتەوە، ئەمەش نەك لەبەر بێ ورەییان، بەڵکو لەبەر نەبوونی سەرکردایەتی کردنیان بووە. بەڵام (هێرکۆڵ) کە هەمیشە چابووك بووە، سێ و دووی لە قۆستنەوەی دەرفەتەکە نەکردووە و دوای ئەوەی پێشەنگی سوپاکەی، چل و هەشت میلی بە بیست و چوار سەعات بڕیوە، هەموو پردەکانی سەر (زێی گەورە) و (زێی بچووك)ی داگیرکردووە. بۆ یەکەمین جار شارانی ئاشوور و کۆشکەکانی کەوتۆتە ژێر دەسەڵاتەوە، تا گەیشتوونەتە (دەستجرد)ی پایتەختی شاهانەش، هەر دیمەنی جوان سەرنجی ڕاکێشاون. سەرباری ئەوەش کە زۆربەی زێڕ و زیوەکانیان گواستبوونەوە، یان سەرف کرابوون، بەڵام ئەو دەستکەوتانەی کەوتنە دەست ڕۆمان، زۆر لەوەش زیاتربوون کە خۆیان بەهیوای بوون، بەڵکو چاوبرسێتییەکەشیانی تێرکرد. دوای ئەوەش (هێرکۆڵ) لە کۆشکی (دەستجرد)ەوە هەر پێشڕەویی کرد، تا چەند میلێکی مابوو بگاتە (مەدائین)، یان (تەیسەفون)، کە ئیتر ڕۆخەکانی ڕووباری (ئاربا Arba) بواریان نەدا و ئاووهەواش توندبوو، دیسان قەڵاکانی پایتەختیش هەر لەڕوویدا وەستان. بڕوانە لاپەڕە (٨٤٢ــ ١٥٢)ی بەرگی (٨)ی (تیاچوون و ڕووخانی ئیمپراتوریەتی ڕۆمانی).

چێوی هەریەکە لەم قولیپانەی لە خانووەکە دەرچوون، سیی و سێ پێ و پێنج گرێیە، پانایشی لەلای وارشەکەوە نۆ، یان سیی پێ و هەشت گرێیە. ماوەی نێوان هەر قولیپێکیش، پەنجا و هەشت پێ و شەش گرێیە. لە نێوان هەر قولیپێکەوە بۆ قولیپێکی تریش، دوو جووت حەشارگە هەیە. ئەمە لە دیوی لای خۆرهەڵاتی خانووەکەوە، بەڵام لە دیوی لای خۆرئاوایەوە، وارشێکی تری بێ قولیپی هەیە، جگە لە (تاق)ێك، کە قولیپی بەرەکەی تر، دەکەوێتە بەرامبەری. ئەم تاقەی دوایی حاڵی باشە و شێوەی سەرەکەی کەوانەییە. بەرزایی تاقەکە دە پێ و شەش گرێیە و پانایشی دوو پێ و دە گرێیە. بەڵام قووڵاییەکەی بۆ ناوەوە، بەگوێرەی ئەو پێوانەیەی کردم، چل و یەك پێ و نیو دەبوو، کە بەڕاڕەوێکی باریك کۆتایی دێت و دیوارێکی ئەستووریش بەرامبەرێتی. بەڵام ڕووی سەرەوەی خانووەکە و بنمیچەکەیشی، بەتەواوی هەمووی ڕووخاون.

لە دیوی ناوەوەی خانووەکە و لە تەنیشت قولیپێکی ئەم تەلارەوە، دەستمان بەپشکنین کرد. سەیرمان کرد ئەو حەشارگانەی باسمان کرد، دەچنەوە سەر ڕاڕەوێك، یان (ڕەهەند) و باریکە ڕێگەیەك، کە ڕەنگە بچنەوە سەر قولیپەکەی بەرامبەریان. بنمیچی خانووەکەش، هەمووی لە چەند چینە خشتێك دروستکرابوو، کە هەموویان لە باری پانیی دانرابوون وەك لەو ڕووەیەوە دیاربوو، کە دەکەوتە بەری خۆرهەڵاتی و بەدرێژایی خانووەکەش هەمووی ڕووخاو و داتەپیو بوو، لە دیوی لای خۆرئاوایشیەوە، بنمیچەکە نەدەگەیشتە لێواری خانووەکە، کە لەم ڕووەیەوە وەك پێوامان، لەچاو بەری لای خۆرهەڵاتیدا، بەرزتربوو.

لای پێنجەم تاقی بەری باشووری خۆرئاوای، ئاسەواری ترمان دییەوە، پشتیان بەوارشێکەوە دابوو، وەك پاشماوەی پایە، یان چوکڵە، کە ڕەنگە پلیکانە بووبێت. بەڵام لای ئاسەوارەکان، بەتەواوی ڕووخابوون. خانوویەکی زۆر لە (شارەبان)، لە کەرەسەی گوێزرانەوەی ئەم شوێنەوارانەی (زندان) دروستکرابوون.

بیابانەکەش لەبەری خۆرئاوایەوە، تا ماوەیەکی کەم، لەو بەرییەوە بەرزبوو، شوێنەواری تری تێدابوو، چونکە ڕووی زەوی، هەندێ لەتە خشتی لێبوو.

ئەم خانووە سەیرە بەخشتی سوورەوەکراوی چاك دروستکرابوو، زۆریش ئەستووربوو. هیچ نووسینێکم لەسەر خشتەکانی نەدی و هیچ خشتێکی سوورەوەکراو، یان قوڕ و قامیشم نەدی. لە چەند جێگەیەکدا کەلەبەرێکی زۆرمان دینەوە، لە گڵ و کەرسەك کە ئێستا پڕبوونەتەوە. ئەوەی لەم کەلاوانەدا سەیربوو، ئەوەبوو کە پارچە دراوێکی مسی (چینی)مان دۆزییەوە.

زۆر شتی تریشم دیوەتەوە، هەر پێوەندییان بەم پشکنینانەوە هەن، کە لای خۆم دەیانهێڵمەوە، تا یەکتر دەبینین، چونکە هێشتا لەم جێگایەوە ڕوانگەکاریی گەردوونیم نەکردووە.

سبەینێ لەگەڵ خۆرکەوتنا، لێرەوە بۆ(قزیل ڕەبات) دەچین، کە قۆناغێکی لەسەر خۆ دەبێت. بەهیوا بووم ئەم نامەیە لەگەڵ ئەو وڵاخدارانەدا بنێرمەوە، کە دەگەڕێنەوە، چونکە هەر لێرەوە تێکڕای هێستەرە خراپەکان دەنێرمەوە و چاکەکانیان گل دەدەمەوە. هەر هێسترێکی تریشم پێویست بێت، لە گوندەکە پەیدایان دەکەم.

ئێستا نێردراوەکەی حاکم، لەسەردانم گەڕایەوە و پێمی وت، کە ئەو، ئەم نامەیە دەگرێتە ئەستۆ، چەندیشم حەز دەکرد هەر لێرە هەواڵی تۆم پێبگات، چونکە بەهیوام هەموو ئەم ناوچەیە بگەڕێم و ئیتر تا بۆ دەوروبەری بەغدا دەگەڕێمەوە، دەرفەتی نامە پێگەیشتنی تۆم بۆ ناڕەخسێتەوە. هەر ئێستاش زانیم ڕێگای تریش هەیە، کە بەلای زۆرەوە دەیگرمەبەر، چونکە بەسەر زۆر جێگای سەیردا دەمباتەوە سەر (کفری). ئەمەش ئەو ڕێگەیە بوو، کە دەمێك بوو بەئاواتەوە بووم لێی دڵنیابم و بڕواشم نەدەکرد، ڕۆژێك دێت لێی دڵنیا دەبم.

سەلیم ئاغا ئاهەنگێکی ڕابواردنی بۆ سازکردم، کە ئەوپەڕی توانای دەخستە گەڕ بۆ خۆشگوزەرانیم، لەبەرئەوەی بۆ ئەم مەبەستە تیپێکی مۆزیکی لە گوندەکەوە هێنابوو. ئەمەش (بەل لی نو)ی زۆر بێزار کردبوو. تیپی مۆزیکە گۆرانی (بر یازی یازدم)ی دەژەند، کە ماناکەی (نامەیەکم نووسی) بوو. سەلیم ئاغا دەڵێ خانمانی بەغدا، زۆر شەیدای ئەم گۆرانییەن.

لە جێگاکەم دڵنیابە، ئەوسا نامەم بۆ (کفری ) بۆ بنووسە. بەپشتیوانی خوا، من پێنج ڕۆژی تر لەوێ دەبم. ئەگەر کەسێکی وات نەدییەوە کە ڕاستەوخۆ بۆ (کفری) دەچێت، ئەوا قەیناکە، ئەگەر بەتایبەتی یەکێك بنێریت. هەرچۆنێکیش بێت، من ئەمەیان بەچاکتر دەزانم. پلەی گەرما لەم ڕۆژەدا (٦٦ پلە) بوو. ڕۆژێکی جوان و ڕوونیش بوو.

## ٢١ی مارت

له شەش و پەنجا دەقیقەدا (شارەبان)مان جێهێشت، بۆئەوەی بگەینە یەکەمین بەرزایی، کە لە دوای جێهێشتنی بەغداوە تووشی دەبین بەپەلەش ڕێمان کرد دیمەنەکان ڕەنگین بوون و لە دەشتە سەوزەکانی ئینگلتەرە دەچوون. دوای تاوێ گەیشتینە جۆگە جوانەکەی (بەلەدروز). ئیتر بەسەر پردێکی باشدا، کە یەك کەوانەیی بوو، لێی پەڕینەوە.

لە سەعات هەشت و نیودا گەیشتینە زوورگەکانی (حەمرین)، کە لە هیچ لایەکییەوە لە دووسەد پێ بەرزتر نابێ. زوورگی یەکەمیان، یان ئەوی خوارووبان لە تەمۆخێکی ڕووتەن پێکهاتبوو، کە چینەکانی لاربوون. لە پشتیەوە دەلاقەیەك هەبوو، پڕبوو لە گردی توورەکەڕێژ، دەتوت گردۆڵکەی ڕووخاون. دوابەدوای ئەمیش زنجیرەی سەرەوە دێت، کە بریتییە لە خاك و بەرد. لە خوار زوورگەکانیشەوە چەمێکی بچووك هەیە، دەڕژێتە ڕووباری (دیالە)وە.

لەسەرخۆ، لە زوورگەکانی (حەمرین)ەوە بۆ پێدەشتێك شۆڕبووینەوە، پێیان دەوت (دەشتە)(٣١٠)،هەندێ کۆڵێتی پەرشوبڵاوی تێدابوو، هی کوردانی (سوورەمەنی) (٣١١)بوون، کە لەم وەرزانەدا بۆ تووتن کردن دێنە ئێرە. پێشتریش هۆزەکانی (خەزرەج)(٣١٢)و (بەنی ڕەبیعە) و (بەنی وەیس)ی عەرەبی، بۆ کشتوکاڵ، لێرە نیشتەجێ دەبن. بەڵام لەم دواییەدا بڵاوەیان لێکردووە.

تووشی ڕێبوارێك بووین، هەواڵی دووریی (قزیل ڕەبات)مان لێ پرسی، وەڵامی داینەوە: (بر جوبوق ئیچمە)، واتە: (ئەوەندەی جگەرەکێشانێکی ماوە).

ڕێگاکەشمان بەناو قوڕولیتەدا بوو، بەڵام لە هەردوو بەرییەوە، مەزرایەکی زۆرمان دی.

لە پشت (قزیل ڕەبات)ەوە زوورگی تریش دیاربوون، هاوتەریبی ئەو زوورگانە بوون، کە هەر ئێستا جێمان هێشتن، ئەوانەی زوورگەکانی (خانەقین) بوون، کە لە (کەرکووك)ەوە دەست پێدەکەن و ڕووەو (لوڕستان) دەکشێن.

---

٣١٠- دەشت: وشەیەکی فارسییە ــ ع.

٣١١- لە دەقەکەدا لەجیاتی (سوورە میری)، بەهەڵە (سوورەمەنی) نووسرابوو. واتە هۆزی پیاوە سوورەکە ــ ع.

٣١٢- خەزرەج: هۆزێکی کۆنن، لەکاتی کۆچی (محەمەد ــ د.خ) بۆ (مەدینە)، سەرداری (مەدینە) بوون. (ئەبو ئوسەیبەعە) سەر بەم هۆزەبوو، هۆزی (رەبیعە)ش کە لە وڵاتانی عەرەبدا خاوەنی دەسەڵات بوون، ئێستا هەرتەنیا هۆزێکە و دەسەڵاتێکی نییە، عەرەبی (عەنزە)ش لەم خێڵەن.

پێش ئەوەی بگەینە (قزیل ڕەبات)، کە لە نیوەڕۆدا گەیشتینیێ، هەندێ زوورگی بچووکم بەرچاو کەوت، دەکەوتنە لای چەپمانەوە و شایستەی باسکردن نەبوون، گردێکی توورەکەڕێژیش لە گوندی (بارادان) هەیە، هەڵکەوتی زۆر سەیرە. لە نزیك خۆرئاوادا چوومە بێڵلای ئەو خانووەی تیایدا بووم، لەوێوە توانیم ڕووباری (دیالە) ببینم، کە دوو میلێك لێمانەوە دوور دەبوو.

بەهۆی تەقەڵلای (مەحموود چاوەش)ەوە(٣١٣) زانیم هەندێ ئاسەوار لە نزیك (قەسری شیرین) هەن، ئاسەوارێکن هێشتا هیچ ئەوروپاییەك سەردانی نەکردوون. بۆیە شارەزایەکم بەکرێ گرت تا بمباتەسەری.

شەوێ، لای ئاهەنگی گوندنشینەکاندا بەسەرم برد، کە بەبۆنەی زەماوەندی ژن هێنانەوە سازیان کردبوو. دیمەنێکی جوانکیلە و دڵگیربوو. یاریی شمشێربازی و ئەڵقەی هەڵپەڕکێ و سەماش، لەبەر ڕووناکیی چراووگدا کرا.

خەڵکەکەی ئێرە، بەتورکی و بەکوردی دەدوێن. لێرە زمانی (فارسی)ش بڵاوە. بەڵام (عەرەبی)ی تێدانییە. دەڵێن داهاتی گەنجینەکەی (قزیل ڕەبات)، دەگاتە (٠٠٧،٠٠٠) قروش.

پلەی گەرما، لەنێوان سەعات دوو و سێی دوای نیوەڕۆدا (٣٧پلە) بوو. لە باشووریشەوە (با) هەڵیکردبوو. ئاسۆش بۆر بوو.

## ٢٢ی مارت

ئەم بەیانییە لە شەش و چل و پێنج دەقیقەدا سواری ئەسپەکانمان بووینەوە. لە جێگەیەکدا کە پێیان دەوت (گەرمیە)، دوو گردم بینی، شتێکی وانەبوون. لەوەش دەچوون توورەکەڕێژ بن. لە سەعات حەوتدا گەیشتینە چەمی (قزیل ڕەبات)، زەوییەکەی بەردەڵانی و گیاشی کەم بوو، بەڵام بەشی لەوەڕی ماڵاتی دەکرد. مێگەلێکی زۆری مەڕوبزنیشمان بینی.

لە حەوت و چل و پێنج دەقیقەدا گەیشتینە زوورگەکان. زوورگی یەکەمیان گڵین بوو، کە باراناو شەقارشەقاری کردبوو، زۆریش دایدڕیبوو. پاشان بەلای ئەوەی دووەمدا تێپەڕبووین، بریتی بوو لە بەرد و چەوی تێکەڵ و گڵێکی کەم. لە هەندێ جێگایشیەوە تەموخ هەبوو. بە دەربەندێکی کەمێك پاندا تێپەڕبووین، پێی دەوترا (ساقال توتان)، واتە (ریش گرە)، گوایە وەك ڕەمزێك بۆئەو دزانەی ئەم

---

٣١٣- یەکێك بوو لە نۆکەرەکانی میستەر ڕیچ ـــ خاریچ.

ناوەیان ناخۆش کردووە. لەوێوە داگەڕاینە دەشتێك، یان بەواتەیەکی تر. دۆڵێکی پڕ هەرەسی گڵی زوورگی داڕماو، کە لە زوورگی بەرزترەوە بۆی داڕووخابوو.

لە نۆدا گەیشتینە (یەنی چەری تەپە ــ گردی یەنکیشاری )، کە بەناوەڕاستی ڕێگای نێوان (قزیل ڕەبات) و (خانەقین) دادەنرا. ڕێگاکەشمان دەکەوتە نێوان پێچ پێچی زوورگەکانەوە. پاش ئەوەی زوورگێکی ترمان بڕی، ئیتر لەسەرخۆ بەرەو (خانەقین) کەوتینە داگەڕان. ئەو زوورگانەش کە بەلایاندا تێپەڕبووین، کەمێك لەوانە بەرزتربوون، کە دوێنێ بڕیبوومانن. هەمووشیان گڵین و پڕ چەوبوون. لەملاولاشەوە چینە تەموخ بەرچاو دەکەوتن، کە ڕووەو ناوەندی زوورگەکان لارببوونەوە.

دەشتی (خانەقین)یش پڕ لە گیا و جوانە. لە هەندێ جێگادا هێڵی زوورگ و خاکی پڕ لە بەرد، دابڕدابڕیان کردبوو. دانەوێڵەی هیندی و تووتنیشی تێدا کرابوو. لە سەرووی (ئەلوان)یشەوە(٣١٤)

برنج دەکرێ. ئەمەش وای دەکرد هەوای وەرزەکە، لە پاییزاندا زۆر ناخۆش بکات. پێیان وتم کە بەروبوومی ئەم زەویوزارانە، یەك و دە دەبڕێ. خێڵاتێکی زۆری کوردمان بینی، لە هەموو جێگەیەکی ئەم دەشتە پڕ لە گیایەدا، خەریکی لەوەڕاندن بوون.

نیو سەعاتێك لە دەشتەکەدا وەستاین، لەو ماوەیەدا (قۆناغچی)یەکەمانم تێدا نارد، لای ڕاستمانەوە هەر شاخ بوو درێژببووەوە و بەسەر ناوچەی گەیلاندا دەیڕوانی و لە پشتمانەوە چیاکانی ئێران، لە پشت ناوچەی (زەهاو)ی کوردەوە دەردەکەوتن. دوای ئەوەی گردۆڵکەیەکمان بڕی، بۆ شارۆچکەکە داگەڕاین، یان گوندی (خانەقین) و لە دوازدە دا گەیشتینێ. لەوێ خانێکی پۆشتەمان دی، فارسەکان دروستیان کردبوو. بەڵام لەبری ئەوەی لێرە بوەستین، بەسەر پردێکی سیازدە پایەییدا لە ڕووباری (ئەلوەند) پەڕینەوە، کە (محەمەد عەلی میرزا)(٣١٥)دروستی کردبوو. ڕووباری (ئەلوەند)یش چەمێکی خوڕی شاخاوییە، لە باشوورەوە بەرەو باکوور دەچێ و کەمێك لەولای (قزیل ڕەبات)ەوە دەڕژێتە (دیالە)وە. ئیتر لەوبەرە (حاجی قەرە)مان کرد بە بارەگای خۆمان.

---

٣١٤- مەبەستی لە ڕووباری (ئەلوەند)، (حەلوان)ە ــ ع.

٣١٥- کوڕە گەورەی شای ئێران و حاکمی کرماشانە، پردەکەش (٢٠٠،٠٠٠) دووسەد هەزار قرۆشی تێچووە. لەم جێیەدا دووپردی تریش هەبوون، ئاو بردنی.

## ٢٣ی مارت

شەوێ، گێژەڵووکەیەك هەڵیکرد. ئەم بەیانییەش لە باکووری خۆرهەڵاتەوە (با) هەڵیکرد. هەر ئێستاکەش ئاگاداریان کردم ڕێگایەکی تر لێرەوە بۆ (قەرەتەپە) هەیە، پێم وایە دەیگرمە بەر.

ئەمڕۆ ئارەزووی پیاسەی لای شوێنەکانی دەورووپشت و دانیشتنم هەبوو لە باخێك، کە تیایدا، گوێم لە مۆزیکی پیرە پیاوێکی کورد گرت، لە هۆزی (سوورەمەنی)(٣١٦)کە خەڵکەکەی بەمۆزیك و سەما بەناوبانگن. ئەم پیرە بە (کەمانچە)یەکی ئەو ناوچەیە، یان (روباب)ێکی دوو ژێیی، ئاوازێکی کەمێك خۆش و ئاهەنگاوی بۆ ژەندم. شەوێش هەر هاتەوە و دیسانەوە هەندێ گۆرانی سەرەتایی، بەزمانی کوردی بۆ وتم.

پلەی گەرما لە سێی دوای نیوەڕۆدا (٦٦ پلە) بوو.

## کفری ـ ٢٧ی مارت ١٨٢٠

وا ئێستا من لێرەم، دوای ئەوەی گەشتێکی زۆر سەمەرە و گرنگم کرد، ئاکامەکانیشی سەیر و سەرکەوتووانە بوو. بۆیە زۆرجار لەو پرۆژانە دەژمێردرێ، بەبێئەوەی توانای جێبەجێکردنیمان هەبێ، ڕەنگی بۆ دەڕێژین. لە بیست و چواری ئەم مانگەدا (خانەقین)مان جێهێشت، سەلیم ئاغاش پێی داگرت، کە دەبێ لەم سەفەرەدا لەگەڵمدا یاوەریم بکات، کۆمەڵێکی ئازاشی لە سوارەکانی خۆیان هێنا، بۆ بەرگری لە مەترسیی پاسەوانەکانی دواوەی لەشکرەکەی (ئەمانوڵلاخان)(٣١٧)

جگە لەو ڕێگرانەی دەڵێن دەربەندەکانی ئەم ناوە دەگرن و ژمارەشیان (٥٠٠) سوار دەبێت. ئێمەش لەپێشمانەوە و لەملاولامانەوە پاسەوانمان ناردبوو. هەروەها (بەل لی نۆ) و (سەیید)یش، کە بەچاوتیژ ناسرابوون، لە ئێمە جیابوونەوە و لەپێشمانەوە دەڕۆیشتن و سەیری ڕێگەکەیان دەکرد. زەوییەکەیشی شاخاوی بوو. تا ماوەی پێنج سەعاتە ڕێگاش. سوارییەکی زۆرخۆش بوو.

لە سەعات نۆدا گەیشتینە لای (قالای سەلزی ـــ قەلای سەلزی)(٣١٨)،کە گەورێك بوو، (عەبدوڵلا پاشا)ی باپیری (فەتاح پاشای زەهاوی)، لەسەر شێوەی گەورِی پەزەکانی (دەربەند ـــ پایەگەی یاساوڵ) دروستی کردبوو. بەڵام ماوەیەکی زۆربوو چۆڵکرابوو.

---

٣١٦- ڕاستییەکەی (سوورە میری)یە. بڕوانە پەراوێزی ژمارە (٩)ی پاشکۆی دووەم.

٣١٧- فەرمانڕەوای میرنشینی (سنە)یە، لە کوردستانی ئێران.

٣١٨- لە نەخشە تازەکاندا بە (سەبزی) هاتووە ـــ ع.

لە یازدە و نیودا کاتێ گەیشتینە خانەکەی (قەسری شیرین)، سەیرمان کرد خەڵکەکەی شڵەژاوی هەڵمەتێکی ئەم دواییەی (ئەمانوڵلاخان) بوون. ئیتر گوندنشینە کلۆڵەکان، کە لە تورکمانەکانی (دەرگەزێن) بوون، کەوتنە گێڕانەوەی بەسەرهاتە دڵتەزێنەکانی خۆیان، کە چییان بەسەرهاتووە. وەك زانیشمان (خان ــ ئەمانوڵلاخان)، هەر چوار سەعاتە ڕێیەك لێمانەوە دوور دەبێ و لە ناوچەی پاشایەتی زەهاوی کورد(٣١٩)

دایە و دەستی داوەتە دوژمنکاریی لەگەڵیاندا.

لە سەوزەگیایەکی سەر بەرزاییەکدا، چادرەکەمم هەڵدا، بەسەر (ئەڵوان)دا دەیڕوانی. میستەر (بەل لی نۆ) لە نزیکمانەوە چادرەکەی هەڵدا و کردییە ڕوانگەیەك. سەلیم ئاغا و پیاوەکانیشی، لە پشتمانەوە جێگایەکی کەمێك ناخۆشیان هەڵبژارد. پاسەوانەکانیش بەتفەنگەکانیان شتێکی وەك لیژنەی داری سەربەیەکەوە هەڵپەسێراویان دروستکردبوو. سەیید(٣٢٠)و مەحموود و ئەوانی تریش، دوو دەستە پاسەوانیان پێکهێنا و بەدەنگێکی بەرز، ڕستەی (هەموو شتێك لەجێی خۆیدایەتی) یان دووبارە دەکردەوە، کەڕەناکەش نۆرە گۆڕینی پاسەوانەکانی ڕێك دەخست، کە دەنگەکەی لەو ناو شاخانە دەنگی دەدایەوە. ئیتر سەربازگەکەمان شێوە هەڵکەوتێکی سەربازییانەی ترسناکی بەخۆیەوە گرت. بەڵام بۆ بەختەوەریمان شتێکی وا ڕووی نەدا، پاڵەوانێتی خۆمانی تیا بنوێنین.

سێ سەعاتێك خۆم جیاکردەوە و خەریکی پیاسەی ناو ئاسەوارەکانی کۆشکی (خوسرەو ــ کیسرا)(٣٢١)بووم. وەك چاوەڕێشم دەکرد، وا دەرنەچوو. لە ڕاستیشدا ئەوەتەی لەم دواییەدا خەریکی سەردانی (تاقی کیسرا)م، خانووسازییەکم نەدیوە، هاوتای ئەم بێت.

---

٣١٩- میرنشینی (زەهاو)، سەر بە پاشایەتی بەغدایە و دەبێ بەدوو بەشەوە: (دەرەنە)، یان (زەهاو). کێوەکانی ئەو ناوچەیە و دەشتی (باجەڵان).

٣٢٠- مەبەستی لە (ئاغا سەیید)ە، واتە (المُنشی و البَغدادی) ــ ع.

٣٢١- (خوسرەو پەروێز)ی شای فارسە (لە نەوەی ساسان) و کوڕەزای (کیسرا ئەنوشیروان)ە، کچی (موریس)ی ئیمپراتۆری هێناوە، کە بەلای زۆرەوە ڕەنگە پاڵەوانەکەی چیرۆکە خۆرهەڵاتییەکە بێت، کە بە (خوسرەو و شیرین)، یان (شیرین و فەرهاد) ناسراوە، ئەم کچە پاڵەوانەش سروودەکەی لەلایەن (جوزێف فون هامەر)ە وە لە شیعری شیرین دا کراوە بەشیعر، هەرکەسیش دەیەوێ لە تەواوی ژیانی ئەم پاڵەوانە و ئەو شیعرانە ئاگادار بێت، کە پیایدا هەڵدراوە، بڕوانێتە ئەو کتێبەی لەم دواییەدا لەلایەن خۆرهەڵاتناسێکی دیارەوە، بەناونیشانی (مێژووی شیعری عوسمانی)ی نووسراوە.

ئەو ئاسەوارانەی ئێستا سەردانیان دەکەم، یەکجار تۆکمە و گەورەن و نەخشە و فراوانییەکەیان جوانییەکی وای تێدانییە. ڕیشی تێناچێ شارێك لەم جێگایەدا دروستکرابێ. هەر چۆنێ بێت ئێرە (دەستجرد) نییە، بەڵکو یەکێکە لەو کۆشکە ڕاویانەی پاشاکانی ساسان، بۆ ڕاو تێی هاتوون.

بەلای گردەکە و لە پشتی خانەکەشەوە، وارشێکی چوارگۆشەم بەرچاوکەوت، لە قەڵا دەچوو. خانووی خڕخڕ لەدەوری بوون، ئەگەر بشێ وا بڵێین. لە دیوی ناوەوەی هێشتا چاك بوو. پێوەری بچووك و لە ڕەحەتی دەمەونخوون دەچوو. شێوەی خانووسازییەکەیشی لە ئەستوورترینی ئەوانەبوو، کە تا ئێستا دیبوومن. وا دیاربوو دروستکردنەکەی بریتی بووبێ لە بنچینەیەکی خشتی ئەستوور و لەسەر ئەمیشەوە خڕکە بەردی گەورە، کە بەبێ گوێپێدان و ڕێکخستنێك لەسەر یەك کەڵەکە کرابن.

---

بەڵام ئەو شارەی گوایە دەڵێن (کیسرا پەروێز) لەبەر خاتری (شیرین) دروستی کردووە و بەناوی ئەویشەوە ناوی ناوە، وا باسکراوە کە جێگەکەی لەنێوان شاری (حەلوان) و (خانەقین)دا بێت. واش دەگێڕنەوە کە (کیسرا) بە (شیرین)ی وتووە: پاشایەتی شتێکی نایابە، ئەگەر تا سەربێ. ئەویش وەڵامی داوەتەوە: ئەگەر پاشایەتی ئەوەی نەمر بهێشتایەتەوە، کە پێی گەیشتووین ـــ خاریچ.



## قەسری شیرین

لە گۆشەی باشووری خۆرئاوادا، لەسەر چەمێك شوێنەواری پردێکم بەرچاوکەوت، لەسەر هەمان شێوەی ئەستوور دروستکرابوو. دە دەقیقە ڕێیەك لەو شوێنەوە دوورە، کە پێی دەڵێن شار. پێش ئەوەش بیگەیەنیٚ، بەلای چەند زوورگێکدا تێپەڕبووین، لە چینی سنووری هاوتەریب، لە تەموخ پێکهاتبوون. هاوڕێکانم هەولّیاندا ڕازی بم، کە ئاسەواری خانوو بووە. ئەوەیش سەیربوو هەرشتێکیان بدیبایە، بەلایانەوە سەیربوو، چونکە بە وشەی (سەیرە...) هاواریان بۆ هەر گردێکی توورەکەڕێژی بیٚ بایەخ دەکرد، کە دەکەوتە بەرچاویان و هەندیٚ جاریش دەیانوت هەرگیز خانووسازییەکی تری لەم بابەتە، لەم ڕۆژگارەدا دروست نابێتەوە.

بەڵام شارۆچکەکە لە جێگایەکی ناڕێکدایە، کە پێوانەکەی هەر میلێك دەبیٚ، چوار دەروازەی هەیە. ئێستا ئەوەی لای باکووریانەوە لە هەموویان چاکترە. وا ئێستاش بەگوێرەی ئەو دیدەنییەم بۆ ئەم ئاسەوارانە خەریك دەبم باسێکیان بکەم:

یەکەمین شتێك، دوای تێپەڕبوون لە وارشەوە (٥١پلە) بەلای باکووری خۆرئاوادا و ئەوەی ناوی دەنێم: قەلاٚ. خانوویەکی چوارگۆشە بوو، کە ڕووی دەکردە هەر چوار لا سەرەکییەکە، درێژایی هەر لایەکی **٣٥** پیٚ بوو. بەڵام بەرزاییەکەیم بۆ نەپێورا، کە ڕەنگە هەر چل پیٚ بێت. لە

هەرلایەکیشیدا دەروازەیەکی سەر گومەزیی هەبوو، کە پەنچەرەیەکی بچووك لەسەرەوەی بوو. بەڵام بنمیچەکەی، کە دیاربوو ئەویش گومەزیی بوو، تێکچووبوو. خانووەکەش وەك باسم کرد زۆر ئەستوور دروستکرابوو، بەچینی خشتی سووری ئەستوور داپۆشرابوو. چوار دەوری دەرگا و پەنجەرەکانیش هەر لەم خشتە بوو. هەندێکی هەر لە شوێنی خۆی دیاربوو. لە تەنیشتەکانی باشوور و باکوور، گۆڕەپانی چوارگۆشەی بچووکم بینی، لە تەنیشتەکانییەوە ژووری بچکۆلەی ڕووخاو هەبوون. لای خۆرهەڵاتیشەوە ئاسەواری خانوویەکی درێژکۆلەم بینی، ژوورێکی بچووکی لەناودا بوو، ئەویش هەرلەوە دەچوو، بنمیچەکەی گومەزیی بووبێ.

بەڵام کەلاوە سەرەکییەکانی پێشەوەی ئەم خانووەی، کە ئاسەوارەکانی (دارا)ی بەیاد دەهێنامەوە، لەناوجەرگەی شاردا دروستکرابوون، وا دیاربوو کاتی خۆی سەکۆیەکی پان بووبێ و گومەزی بەسەرەوە بووبێ و بەڕاڕەوی تەنگەبەر و ژووری بچووك بچووکەوە بەشبەش کرابێ. لەلای خۆرئاوای بەری باشوورەوە، شێوە داڵانێك هەبوو، دەچووە سەر دوو دەروازە. ئەم داڵانە لەهەردوو سەریەوە، لە بەری لای باکوورەوەی، ئاواڵابوو. دەچووەوە سەر ژووری بچووك و ژووری گەورەی تاك تاك. بەلای زۆرەوە پێم وایە کاتی خۆی هەربەشێك بووبێ لە سەکۆکە، یان لە شۆستەکە. بەلای خۆرهەڵات و باکوور و تەنیشتی خۆرهەڵاتی، ڕووی خۆرئاوایدا خانووەکە تەواوبوو، هیچی کەم نەبوو. لە هەردوو لایشییەوە جووت جووت پلیکانە هەیە،کە بە کۆڵەگەی سەر شۆستەکە ڕاگیراون و زۆر بەئاشکرا دیارن، بەپێی بۆچوونم، درێژایی هەر ڕوویەکی، لە دوو سەد پێ زیاتر نابێ و بەرزاییشی، لە هەشت، تا دە پێ دەبێ، ئەمەش بەرزترین بەشی ئەم ئاسەوارەیە کە ماوەتەوە. شێوەی خانووەکەش لە هەموو بەشەکانیدا وەك یەك دروستکراون.

لەبەردەم دەروازەی لای خۆرهەڵات و بەدرێژاییەکەی، وارشێکی درێژم دییەوە لە خڕکە بەرد و وشکە کەڵەك هەڵچنرابوو. ئەو گۆڕەپانەش کە دەکەوتە نێوانییەوە، ئێستا کرابوو بە کشتوکاڵ. لە سەرەتادا گومانم لەوەکرد، کە ئاخۆ ئەم گەورە، کۆن بێت، یا نوێ! بەڵام هەموو ئەوانەی لێرە ئامادە بوون، سەلماندیان کە کۆنە. بۆیە منیش کەوتمە سەر ئەو بڕوایەی کە شوێن حەوزی ئاو بووە و لەبەردەم کۆشکەکەدا دروستکراوە. وارشی لای بەری خۆرهەڵاتیشی، حاڵی زۆرباش بوو. بەڵام لە هیچ ڕوویەکییەوە شوێنەواری قولپیم نەدی. لەوە دەچێ کاتی خۆی ئەمە هەر گەوڕێکی ئاسایی بووبێ، بێ شوێنی بەرگری. بەڵام دەروازەی دەرەوەی بریتی بوو لە دەروازەیەکی دوو تاکیی، کە کاتی خۆی شتێکی گومەزیی بەسەریانەوە بووبێ. لە تەنیشتی هەر یەکێکیشیانەوە ژوورێك هەبوو، کە دیارە ئەوانیش سەرەکانیان هەر گومەزیی

بووبێ. وارشەکەش هەمووی، بەبەردی تەمۆخی شێوە درێژکۆلەیی، دروستکرابوو، پێچەکانیشی لە بەردی گەورە و تەموخ دروستکرابوون.

پانایی هەر دەرگایەکیان پازدە پێ و سێ گرێ دەبێ. پێدەچێ بەرزاییشی، لەو جێگایانەوە کە ئاسەواریان بەسەردا نەڕووخاوە، بگاتە بیست پێ.

دوو وێنەی هێڵکاریی ئەم دوو ئاسەوارەم کێشا، بەپێی خەملاندنی گشتیی، هێڵی پانایی (قەسری شیرین)، ٤٣ پلە و ٠٣ دەقیقە و ٩٣ چرکە، بەلای باکوورەوەیە.

پاش ئەوەی شەوێکی زۆر ساردمان بەسەربرد، ڕۆژی دوایی ڕوومان لە ئاسەوارەکانی (حۆش کەڕوو) کرد، کە تا ئێستا هیچیان لەبارەوە نازانرێ و کەوتۆتە سنووری پاشایەتی (زەهاو)ی کوردەوە، کە لە (قزیل ڕەبات)دا ئاماژەم بۆکرد.

سەرەڕای سەرماش، لەگەڵ شەفەقدا هەستام و کاتێ خەریکی چادر لوولکردن بوون، چووم چاوێك بەو ئاسەوارانەدا بگێڕم، کە دوێنێ ئێوارە لە یادمان چووبوون. ئەم ئاسەوارانە لەبەری لای خانووەکەوە دەکەوتنە پشت قەڵاکەوە و لەسەر بەرزترین شوێنی ئەم جێگایەوە، بەتەوێڵی ئەو گردەوە بوون، کە بەسەر خانەکەدا دەیڕوانی. ئەم گردە لەسەرەوەی خڕبوو. بەهەر چوار دەوریدا وارشێکی سەرتاسەری دروستکرابوو، کە ناوبەناو دەلاقەی تێدابوو. بەخشتی سووری ئەستووریش دروستکرابوو. تۆ بڵێی ئەمە دەبێ هەر (دەخمەی فارسی)، واتە ئەو جێگایە نەبێ، کە تەرمی مردوویان تێدا دانابێ؟!. زوورگەکانی دەوروبەریش گەچۆڕبوون و لە هەندێ جێگاشدا خاکەکەی سوور و شۆرەکات بوو. لەخوار گرد و خانەکەوە، شوێنەواری بناغەی کۆنینەم دییەوە. بەڵام دڵنیام کە ئەمە شارەکە نەبووە، بەڵکو کۆشکێکی ڕاوە، هەروەها بڕواشم وا نییە، کە جگە لەو کۆشکەی باسمان کرد، هیچ خانوویەکی تر، لە ناوەوەی وارشەکەدا هەبووبێ.

لە حەوتدا سواری ئەسپەکانمان بووینەوە و بەناو کۆمەڵە زوورگێکی چۆڵەوانی و ترسناکی نێوان ئەو خێڵە کوردانەدا تێپەڕبووین، کە لە خێڵەکانی لای (ماردین) پێشکەوتووتر بوون(٣٢٢).

تووشی گەلە حوشترێکی (میر)ی کرماشان بووین. هەروەها تووشی چەند کۆمەڵێکیش لە خێڵاتی (زەنگەنە) بووین، بەخۆیان و خێزانەکانیانەوە. بەلای هەر کۆمەڵە کوردێکدا، یان هەوارەکانیشیاندا تێپەڕبووینایە، سەلیم ئاغا پێی دادەگرت کە دەبێ سەربازەکانمان کەڕەنا

---

٣٢٢- میستەر ڕیچ و خێزانەکەی، لە گەشتێکی تریاندا بووە، کە لە بەغداوە بۆ ئەستانبوڵ، لەکاتی مانەوەیاندا لە (ماردین)، تووشی دەردەسەری، بەڵکو تووشی ئەو کوردە ڕەوەندانە بوون، کە لە قەراخ شارەکە هەڵیاندابوو. ئەوانە خەڵکێکی ئاژاوەیڕ و لە یاسا بەدەر و کەتن گێڕن ـــ خاریچ.

بژەنن، گوایە ئەمە (هەیبەتلی)یە!، واتە سام و بیمی ئێمەی پێ زیاد دەبێ. لە ڕاستیشدا من ئەوەت بۆ دەسەلمێنم، کە ئەگەر پەنجا سەربازی تری تازەشمان لەگەڵدا بوایە، ئەوەندەی کەڕەناکان سام و بیمی پێ زیاد نەدەبوو. کوردەکانیش خۆیان ئەوەیان سەلماند، کە بەو کەڕەنایانەوەی لەگەڵمن، منیان وەك (ئێلچی)، واتە (باڵیۆز) ناسیوە. بەتایبەتی ئەوانەی کە پێشتر هەردوو ژەنراڵ (ماڵکۆڵم) و (بارمۆف)یان ناسیوە. لە باسی (بارمۆف)یشدا دەڵێم کە پیرەمێردێکی کوردی کەمانچەژەن، سەمایەکی بۆ ژەندم، دەیوت لەو تیپە مۆزیکییەوە فێربووە، کە لەگەڵ(بارمۆف)دا بوون.

بەڵام لە باسی کەڕەنادا دەڵێم لە (حۆش کەڕوو)، وا ڕێکەوت ئەسپەکەم خرۆشا و هەستایە سەر پاشووی و هێرشی بردەسەر ئەسپێکی نزیك خۆی و ئەویش هەروەك ئەمی کرد. ئیتر بەوهۆیەوە کەڕەناژەنەکە، (کە لەنێوان هەردوو ئەسپەکەدا وەستابوو)، بەسەر ئەو داروبەردە بڵاوەی ئەو ناوەدا کەوت و ئەوانەی لەگەڵم بوون، پێیان وابوو کاسەی سەری هەڵتەکیوە، بۆیە پیرۆزبایی سەلامەتییان لێدەکرد، کەچی ئەو وتی: خەمی سەرمم نەبوو، بەڵکو بیرم لە کەڕەناکەم دەکردەوە، کە پێم بوو، نەك بقووپێ، بەڵام باش بوو تێك نەچوو.

لە نۆ و نیودا گەیشتینە (حۆش کەڕوو). ئەو ڕێگایەش بۆی دەچوو پێچاوپێچ بەناو زوورگەکاندا تێپەڕ دەبوو. بەڵام سەمتی گشتی ڕێگەکەمان لە باکوورەوە (٨٠) پلە، ڕووەو خۆرئاوای (قەسری شیرین) بوو. حۆش کەڕووش هەڵکەوتی وەك هەڵکەوتی (قەسری شیرین) وایە و زۆر لەیەك دەچن، بەڵام لەو داڕووخاوتر بوو، ئەمەش وای بۆ ئاسان کردین، کە بتوانین وێنەیەکی هێڵکاریی بکێشین. لێرە هەندێ کوردی (بتارەوەند)ی سەر بە میری کرماشانمان بینی، جوانییان بێ ئەندازە بوو. گورجوگۆڵ و ڕەوشت بەرزیش بوون. ئیتر دۆیەکی بەتام و پەنیری تەڕیان بۆ هێناین و پێش پشکنینی ئاسەوارەکان، ژەمێکی بەتامان لێ خوارد.

ئاسەوارەکانی (حۆش کەڕوو)، پێشەکی بریتین لە وارشێکی بەردینی ناڕێك، کە شێوەی کەندولەندی بەرزونزمی زەوی هەیە. ئەوەندەی دیوار و وارشەکانی (قەسری شیرین) درێژ نین، بەڵام هیچ کەلاوەیەکیان لەناوەندا نییە. لە دووریی سەد یاردەیەکەوە بەلای خواروودا، ئەو خانووە هەیە، کە بەتایبەتی بۆ دیتنی هاتووم و پێی دەڵێن (حۆش کەڕوو). هەندێ لە کوردەکان دەڵێن ئەو جێیە بووە، کە (کیسرا) ئەسپەکانی تێدا لەوەڕاندووە و بەجۆگەیەکیشدا شیری بۆ جوانووەکانی هێناوە، کە بەردێکی زۆری بۆ کونکراوە و هێشتا شوێنەواری هەندێکیشی، نیو سەعاتە ڕێییەك لەولای (قەسری شیرین)ەوە هەر ماون. بەڵام ئەوەی نەهێنا

بچینه سەریان. بەڵام کوردانی (بتارەوەند) کە لەگەڵماندا بوون، دەڵێن (حۆش کەڕوو)، کاتی خۆی کۆشکێك، یان قەڵایەکی (شاپوور) بووە. شێوەی خانووسازییەکەیشی لەوەی (قەسری شیرین) دەچوو، چونکە حاڵی باشتربوو. بۆیە چاکتر بۆمان ڕەخسا لێی بکۆڵینەوە و تێی بگەین، وەك چۆن لە (قەسری شیرین) کردمان.

(حۆش کەڕوو) وەك ئەو خانووە وایە کە پێشتر باسمان کرد و بریتییە لە بنمیچێك، کە بەکۆڵەکە ڕاگیراوە و هەندێ هۆڵی بچکۆلەی گومەزیی پێکهێناوە، کە لە ژێرزەمین و ژێرخان دەچن. لەم سەردەمەشدا بۆتە حەشارگەیەکی بەناوبانگ بۆ دالّدەدانی چەتە و ڕێگر. باشترینی ئەم ژوورانەش ئەوەیان بوو، کە دەکەوتە بەری لای باکوورەوە. دووکەڵی ئاگری ئەوانە ڕەشی کردبوو، کە لە وەرزی زستاندا تێی دێن. شێوەی ئەم بنمیچەش، لەهەر چوار ڕووەکەیەوە درێژکۆلە بوو... کەوتمە پێوانەکردنی بەری لای سەرووی، سەیرم کرد بەو خانووەشەوە کە دەکەوێتە لای باکوورەوە سێ سەد و چل پێیە. بەرزاییەکەیشی پازدە پێ و نیوە و پانایيشی لە سەرەوە بۆ خوارەوە، نیو ئەوەندەی درێژاییەکەی دەبێ، لە خۆرهەڵاتەوە بۆ خۆرئاوا. لەوسەری بەری خۆرئاوایشیەوە، پاشماوەی خانووی ئەو کۆشکە هەیە، کە لە لێژاییەکەوە تێی چووین و سواریش دەتوانێ بازی لێوە بدات. لەهەر دوولای لێژاییەکەشەوە گۆڕەپانێکی بچووك هەبوو، لەسەریەوە ژووری گومەزیی هەبوو، خانووی کۆشکەکەش بریتی بوو لە کۆمەڵێك داروپەردووی ژووری بچووك، کە هەموویان بەخڕکە تەمۆخ دروستکرابوون. ئەم تەمۆخانەش هەموو زەوی ئەو ناوچانەی تا دەشتی (بین کۆدرە) داپیۆشیبوو. لەوسەری خۆرهەڵاتی بەری لای باکوور و باشوور و لە گۆڕەپانەکەش و لە خوار بەری باشوورەوە، جووت جووت پلیکانە هەبوون. ئاغا سەییدیش پێمی وت ئەم خانووە، ئەو خانووانەم دێنێتەوە یاد، کە شای ئێران، لەهەر شوێنێ لەشکرکێشیی بکات، لەوێ لەمجۆرە خانووە دروست دەکات.

سەد یاردەیەکیش لەولاوە و بەلای بەری باکووری خۆرئاوادا، خانوویەکی سەیر هەیە، لە دیوی پشتەوە پاڵی بەدیوارەکانی وارشەکەوە داوە. لەسەریشەوە ئاوەڵایە. بەرزایی دیوارەکانیشی لە دە پێ تێناپەڕن. ئەم خانووە لە سەرەتاوە بریتییە لە گۆڕەپانێکی سەر ئاوەڵا، تەنیشتی لای خۆرهەڵاتی، پێوانەکەی حەفتا پێ چوارگۆشە دەبێ و لە هەموو لایەکیشیەوە، کەوانە دەوریان دابوو. پاشان هەندێ ڕاڕەوی یەکجار تەنگەبەری تێدابوو، کە وا دیاربوو لە زۆربەشیاندا بنمیچەکانیان گومەزیی بووبێ. چونکە بناغەی گومەزەکانیان هێشتا هەر مابوون. لەپشتیشیەوە گۆڕەپانێکی سەر ئاوەڵای وەك ئەوەی یەکەمین هەیە، پاشان وارشێکی گەورەتر. لە باکووریشەوە دوو ڕاڕەوی تەنگەبەر، کە وارشەکەی دەرەوە

ببووە سنووریان. ناشتوانرێ بوترێ ئاخۆ ئەم خانووە، لە ڕابووردوودا، هەمووی وەك بنمیچی کۆشکەکە، سەرگیراو بووبێ، یان نا! چونکە لە گۆڕەپانەکەدا داروپەردووی وام تێدا نەدی، کە بتوانرێ بوترێ لە بنمیچەکەوە کەوتۆتە خوارێ، بەڵام بەبێ هیچ گومانێك ڕاڕەوەکان بنمیچیان هەبووە.

هەر لەوێدا دەمودەست کۆمەڵەکەم وتیان ئەم جێگایە شوێنی نۆکەر بووە. لە ڕاستیدا گریمانەی لەمە خراپتریشیان لێدەدا. خانووەکەش هەمووی بریتی بوو لە تەمۆخ. ئەوەیشی تا ئێستا دیومە، ئاسەواری ساسانییە، کە شوێن پەنجەیەکی وای لا جێ نەهێشتم نیشانەی سەلیقە و مەزنایەتییان بێت. گومانی گەورەم هەر ئەوەیە، کە ئەم ئاسەوارانە و ئەوانەی لە (قەسری شیرین) دیمن، هەر دەبێ کۆشکی ڕاو بووبن، یان باخچە، کە پاشاکانی ساسانی هەیان بوو. ڕەنگە ئەم خانووانە کاتی خۆی دیمەنیان قەبە و قووڵ بووبێ، کە نەخشی زۆریان تێداکراوە و بەزێڕکاری ڕازاونەتەوە. بەڵام بەم حاڵەیانەوە کە داڕووخاون، شتێکی وایان تێدا نییە جێی سەرسوڕمان بێت. جگە لەمانەش کە باسم کردن، ئاسەوارێکی تر لەم ناوەدا نین.

شەو، لە (حۆش کەڕوو) نەماینەوە، بەڵکو لە سەعات یازدەدا جێمان هێشت و بە دەشتی (باجەڵان)دا، کە دەکەوێتە سەرووی قەڵەمڕەوی زەهاوەوە، دەستمان بەڕۆیشتن کرد، کە تێدا توانیم هەندێ خاڵی جوگرافیایی گرنگ دیاری بکەم و هەندێ گرێش بکەمەوە، کە نەمدەتوانی بەئامرازی تر، ڕوونیان بکەمەوە، بەتایبەتیش ڕەوتی سەرومڕی (دیالە).

ئیتر تا سەعات یەك، هەر بەسەر شاخەکاندا ڕێمان دەکرد، کە لەوێوە بۆ پێدەشتەکە شۆڕبووینەوە و لای ڕاستمانەوە ڕووباری (دیالە)مان لە دوورەوە بەدی کرد، کە بەپێچاوپێچ دەهات. لە ڕۆخەکەشیا گردێکی توورەکەڕێژمان بینی، پێی دەوترا: (شیروانە). وەك دیاربوو دەشتەکەش مەزرایەکی باشی تێدا کرابوو. ئیتر لێرەدا ڕاژەی گڵ، لەچاو ئەو خڕکە بەردەدا زیاتربوو، کە پێشتر باسم کرد.

لە یازدە و چل دەقیقەدا گەیشتینە (بن کۆدرە)، کە گوندێکی گەورەبوو، هی (حەسەن ئاغا)ی سەرداری کورد بوو لە (باجەڵان)، کە بە هەڵەداوان خۆی گەیاندە چادرەکەم و بەم بۆنەیەشەوە جلوبەرگێکی جوانی میل میل زێڕینی لەبەر کردبوو، کە کەوڵێکی گرانبەهای بەسەردا لەبەرکردبوو. بەتورکییەکی ڕەوان دەدوا و میوان ڕاگرێکی گەورەبوو، ڕێگاشی نەدا لە گوندەکەیدا، پارە بەهیچ بدەم. گوایە ڕێبواری ئەوم، واتە میوانی تایبەتی ئەوم. شەوێش خەڵکی گوندەکە هەموو هاتنە دەرەوە و لەسەر ئاوازی دەهۆڵ و زوڕنا، هەڵپەڕکێی (چۆپی)یان سازکرد. بۆ زیاتریش دڵخۆشیکردنمان، (سەلیم ئاغا)شیان بردە ئەڵقەی

هەڵپەرکێکەوە. پێش سازکردنی ئاهەنگەکەش، حەسەن ئاغا سەردانی کردم و لەسەرئەوە ڕێکەوتین، کە (کەڵەك)ێك ساز بکات، بۆئەوەی بتوانین لە ڕووباری (دیالە) پێی بپەڕینەوە، کە لەم جێگایەوە نیو سەعاتە ڕێیەك دوور دەبێ(٣٢٣).

ڕۆژی دواییش لە سەعات حەوتدا سواری ئەسپەکانمان بووینەوە. لێرەدا ماڵاوایيم لە حەسەن ئاغای چاوساغ و زرنگ کرد و بۆ (خانەقین) گەڕایەوە. بەڵام من لەگەڵ سەرۆکی ئەم ناوچەیەدا ڕووەو (دیالە) بەڕێکەوتم و دوای سەعاتە ڕێیەك گەیشتینێ. ڕێگاکەشمان زۆنگاوبوو، ئاوی زیادەی ڕووبارەکە دروستی کردبوو. سپیدار و بییەکی زۆریشمان بینی. یەکسەر دوای ئەوەش لە گوندەکە دەرچووین، بەکۆمەڵە کەلاوەیەك گەیشتین، پێی دەوترا (قەتار تەپەسی)(٣٢٤)،واتە گردی کەو. دەیانوت گوایە کاتی خۆی (ئەنوشیروان)، هێسترەکانی لێرەدا دادەنا. بەدرێژایی ڕووباری دیالەش ئاسەواری خانوویەکی زۆرمان دەبینی.

هەر گەیشتینە ڕووباری (دیالە)ش، بەهاوکاری هەندێ عەرەب، ئەسپەکانمان بەمەلە لێیاندا. کەڵەکیش بۆ پەڕینەوەی خۆمان و کەلوپەلەکانمان ئامادە کرابوو. لەبەرئەوەش کەڵەکەکە بچووك بوو، ناچاربووین بەنۆرە پێی بپەڕینەوە.

ئەمەش وای کرد نزیکەی پێنج سەعاتێك دوای خستین. پانایی سەرەکی ڕووبارەکەش نزیکەی چوار سەد یاردە دەبوو. سەردارە کوردەکەش ئاگاداری کردین کە لە کاتی ئاو هەستاندا پانایيەکەی دەبێتە میل و نیوێك، جگە لەوەش کە دەڕژێتە ئەو زونگانەوەی کە باسکران.

لۆکە و تووتنم بینی، لە زەوییەکەی تەنیشتمانەوە کرابوون. عەرەبەکانی خێڵی (بن عجێل) و (ئەلعەزە)ش لە ڕۆخی ڕووبارەکە هەڵیاندابوو. ئەو کەڵەکەش کە پێی پەڕینەوە، دەستکاری خەڵکی ئەم خێڵەی دواییان بوو. حەسەن ئاغا لە بەرامبەر پابەندییەکەیدا بڕە پارەیەك لە نێوان دووسەد و سێ سەد قروش وەردەگرێ. سەرەڕای ئەوەش کەڵەکەکە زۆر قایمیش نەبوو، بەڵام هەمووومان بەسەلامەتی پەڕینەوە. ڕووبارەکەش ئەوەندە خوڕبوو، دەتوت ئەو ئاوەیە، کە لە خەرتوومەوە فیچقە دەکات.

---

٣٢٣- ماوەی نێوان (بین کۆدرە) و (زەهاو)، نۆ سەعاتە. لە (خانەقین)یشەوە یەکسەر بەڕێگەی چیادا، سێ سەعاتە. (بین کودرە)ش (٨٠پلە) دەکەوێتە خۆرئاوای (حۆش کەڕوو)ەوە.

٣٢٤- وەرگێڕ ئەم وشە تورکییەی بۆ ساغ نەکرایەوە. ڕەنگیشە وشەی (قەتارا)، لەبری (قەتێ) بەهەڵە هاتبێ. لەبەرئەوە ئەوکاتە وەرگێڕانەکەی ناکاتە (گردی کەو). قەتێش لە زمانی تورکیدا (باغرتلاق)ە ـــ ع.

ئەحمەد ئاغاش٣٢٥ هەر ئەوەندەی بیری لەوە کردەوە، کە بەوجۆرە دەپەڕینەوە، ترسی لێ نیشت. ئیتر کاتێ هەموومانی بینی بەسەلامەتی پەڕینەوە، دەستی بەگریان کرد و وتی: (ئاه. گەورەم، دەموت چاکتر وایە پێنج ڕۆژ ڕێ بکەین، نەك لەم ڕووبارە ترسناکە بدەیت ـــ ڕەنگە مەبەستیشی لە خۆی بووبێت). بەڵام (جیت ـــ سنغ)(٣٢٦)،تا پەڕینەوە، هەر بیسمیلای دەکرد و دەیوت: بسم الله الرحمن الرحیم... بسم الله الرحمن الرحیم...

لە یەك و نیودا لەوبەری ئاوەکەوە سواری ئەسپەکانمان بووینەوە. سەرەتا بەسەر زوورگێکدا سەرکەوتین، پاشان داگەڕاینە زەوییەکی لیتەیی و هەندێ لەو زەوییانەی کە پێشتر ئاو دایپۆشیبوون. ئیتر گەیشتینە گوندی (زەنگە باد)(٣٢٧)
کە زێدی کوڕەکەی (کەیوانە) بوو(٣٢٨).

بەڵام خۆی لەوێ نەبوو، جێگرەکەی لەوێ بوو. پیاوێکی بەڕەوشت بوو. لە دووریی سێ میلێکیش لە گوندەکەوە، لە ڕۆخی چەپی ڕووبارەکە و یەکسەریش لەژێر زوورگەکەدا، گوندی (دەکە)م بینی، کە لە (زەنگەباد)ەوە سەعاتە ڕێیەك دەبێ.

لە سەعات چوار و چارەکدا گەیشتین. حاکمەکەمان دی، وەك ڕەوشتی پەیڕەوکراو لەسەر سنووردا، بۆ دزینی مەڕومالاّت چۆتە دەرەوە. باجی سالاّنەی زەنگەبادیش (٥٥،٠٠٠) پێنج هەزار قرۆش دەبێ. بەهێڵێکی ڕاست لە ڕووباری (دیالە)وە، کە پەنجا پێچاوپێچ، لەولای چەمانەوە دیمان و کەمێك لەولاترەوە دەهات، گوندەکە هەر میلێك دوور دەبوو. ڕووبارەکەش لەو شوێنەوە کە لەتەنیشت (بین کۆدرە)وە جێمان هێشت، ڕووەو خۆرهەلاّت، بەنزیك گوندی (زەنگەباد)دا دەهات. گوندی (زەنگەباد)یش مەڵبەندی ئەو هەرێمەیە و شارۆچکەیەکی پیسە، خەریکە چۆڵ ببێ، نیوەی زیاتریشی داڕووخاوە. وەك بەپاشماوەی ئەو مزگەوت و گەرماوەدا دەردەکەوێ کە سلێمان پاشای باپیری عەبدولڕەحمان پاشای سلێمانی، دروستیکردبوون. لەوە دەچێ پێشتر باشتر بووبێ. لە مزگەوتەکە لاماندا و بۆ یەکەمین جار ناوی (مەسیح)ی تێدا هێنرا(٣٢٩).

---

٣٢٥- یەکێکە لە نۆکەرەکانی میستەر ریچ.

٣٢٦- یەکێکە لە نۆکەرەکانی میستەر ڕیچ، هندۆکی بوو، ببووە موسڵمان.

٣٢٧- (٣٠پلە) بەلای باشووری خۆرئاوادا.

٣٢٨- (کەیوانی) نازناوی بان نۆکەر، یان (دوو ئەننا)یە، لە حەرەمی پاشای بەغدا ـــ خاریچ.

٣٢٩- لەوە دەچێ میستەر ڕیچ خوی گێل بکات، یان نەزانێ پایەی حەزرەتی مەسیح، لای ئیسلام و موسڵمان چییە ع.

لای باکوورەوە، چەند سەد یاردەیەك لەولای گوندەکەوە، گردێکی توورەکەڕێژی شێوە چوارگۆشەمان بینی، پێی دەوترا (قەڵان تەپەسی)، لە پاڵیشیدا گردێکی تری توورەکەڕێژی لەو بچووکتر هەبوو، لە گردۆڵکەی ئاسەوارەکانی (بابل) دەچوو. ئەم دوو گردە خشتیان لێ دەرناهێنرێ، بەڵام لە تەنیشتی ئەولای گوندەکەوە گردی زۆر لێیە و هەمووشیان ئاسەوارن. لەمانەیان خشت دەردەهێنرێ و پێیان دەوترێ (خشت کەن)، وا دیارە شوێنەواری شوێنێکی کۆنینە بێت.

بەهۆی ئەو زۆنگاو و ئاوە زۆرەوە، ئاووهەوای ئەم زەوییە نزمانە زۆر ناخۆشە. دوو میلێکیش لە خۆرئاوای (زەنگەباد)ەوە، گوندێکی وەك ئەم هەیە، پێی دەوترێ (مەنایتوە)٣٣٠دارخورمای تێدایە و ئاووهەواشی بەشێوەیەکی تایبەتی ناخۆشە. لەم هەرێمەدا چەندان گوندی تری تێدایە، کە بریتین لە کۆمەڵە کۆڵیتێکی قوڕینەی و سەریان بە قامیش داپۆشراوە.

ئەمڕۆ قرچەی گەرما زۆر بێزاری کردین و دوای سێ سەعات ڕێکردن، هەستم کرد لەوە ماندووترم، کە دە سەعاتە ڕێ، ڕێم کردبێ.

پێش سەعات چوار، زەنگەبادمان جێهێشت و لە نۆدا گەیشتینە (کوشك زەنکی)، کە بەلای زۆرەوە هی ئەتابەگەکان بێت. پێشیان وتین هەندێ کەلاوەی تێدایە. بەڵام سەیرمانکرد بێ بایەخن و بریتین لە لەتە خشتی ئەستوور و بنچینە گلێکی خشت، لەسەر گردێکی توورەکەڕێژی خڕ. ئاگاداریشیان کردین کە کەمێك لەولاترەوە ئاسەواری تر هەیە و مەڕمەڕێکی زۆری لێیە، بەڵام بۆ دیتنیان نەچووین.

ئەوەی خەڵکەکە لەبارەی مێژووی کەلاوەکانی ئەم ناوچانە دەیگێڕنەوە، بەشێوەیەکی گشتی لەنگەرگرتنێکی دەوێ. بەلای کەمەوە ئەوەی پێوەندی بەدوو سەردەمی مێژووەوە هەیە کە لە سەردەمی پێش محەمەدی پێغەمبەرن و ئەو سەردەمەی دوای ئەویش هاتووە، چونکە ئەمانە جگە لەسەردەمی (گاور ــ کافر) و سەردەمی موسڵمانەتی، هیچی تر نازانن، لەبەرئەمە زۆر کەم ئەو دوو سەردەمەی تێکەڵ دەکەن.

گوندەکانمان لای ڕاستمانەوە جێهێشت و ڕوومان کردە (کفری سو)(٨٢)، (٢٨) (٠٣پلە) بەلای باکووری خۆرئاوادا.

---

٣٣٠- لە دەقەکەدا هەروا نووسرابوو. بەڵام دەبێ (مەینەتاوا) بێت ــ م.

که یەکێکە لەو چەمانەی لەم کێوانەوە بەرەو دەشتی (کفری) شۆڕدەبێتەوە و ئاوەکەی بۆ کشتوکاڵ بەکار دەبرێ. لە سەعات یازدەدا گەیشتینە ڕووبارەکە و سەیرمان کرد بنەکەی کۆمەڵە بەردێکی گەورەی تێدایە و دوو و سێ جۆگەی ڕوون و جوانیشی تێدەڕژێن.

ئەو گردانەی باسمان کردن، لەسەر ڕێمان بوون. ئاوەڕۆیەکی زۆر و بەرینی ئەو چەمانەمان دین، کە لەو گردانەوە دادەگەڕان و ئێستا وشك بوون. پانتایی هەندێکیان دەگەیشتە چەند سەد یاردەیەك.

بەناو شاخەکاندا دەستمان بەڕۆیشتن کردەوە و لای ڕاستمانەوە (ئون ئیکی ئیمام)مان دی، کە چاووگەی نەوتی تێدایە و (کفری)ش سەعات و نیوێك ڕێگا لێرەوە دوورە، کە ئێمە کەمێك دوای نیوەڕۆ گەیشتینێ و گەرما پڕووکاندوومی و نەحەوابوومەوە، تا ئەو کاتەی ئەم بەسەرهاتەت بۆ دەنووسمەوە. ئەم دوو قۆناغەی دوایی کە بڕیمانن، بەهۆی ئەو گەرما بەتینەوە، زۆر سامناك و سەخت بوون. لەگەڵ ئەوەشدا لە سەعات دوازدە و نیودا گەیشتینە ئێرە. پیاوەکانیشم زۆر شەکەتن، بەڵام سوپاس بۆ خوا، من تەندروستیم زۆر باشە، چونکە زۆر ئاگاداری ئەوەبووم لەوە زیاتر خۆم ماندوو نەکەم، کە لەسەروو توانامەوەیە.

هەر لێرە خۆمان کردەوە. هەمان ئەو جێگایەی لە سەفەرەکەماندا بۆ ئەستەموولْ خۆمان تێدا کردەوە. کاتێ درەختەکەی گوێ جۆگە بچووکەکەشم بینی، کە لە سەفەرە نەمرەکەماندا(٣٣١)،لەپاڵیدا نانی نیوەڕۆمان خوارد، کوڵی گریانم هاتێ و خەریك بووم بگریم.

شارۆچکەی (کفری)ش لەوسا داڕووخاوتر و ژمارەشی کەمترە، کە تیایدا بوون. خەڵکەکەش پێیان سەیربوو کاتێ ئەو گردە توورەکەڕێژەم ناسییەوە، کە بەر لە حەوت ساڵ دیبووم و لە چەند جێگایەکیشەوە لێی ورد ببوومەوە. لەم دواییەدا خەڵکەکە لە دووریی میلێك لەولای شارۆچکەکەوە چاووگی نەوتیان دیبووەوە.

ئەی تۆ! سازیت بۆ گەشتەکەمان بۆ کوردستان؟ کاتمان نییە بۆ لەدەستدان. هەتاویش خەریکە بمبرژێنێ. قایلیش نەبووم لە شەودا سەفەر بکەین. ئەمڕۆ گەرماپێوەرەکە، لە سەعات دوو و سێی دوای نیوەڕۆدا، لەناو چادرەکەمدا (٩٠پلە) بوو.

---

٣٣١- لێرەدا ئاماژە بۆ ئەو گەشتە دەکات، کە میستەر ڕیچ و خێزانەکەی لەو گەشتەیاندا لە بەغداوە بۆ ئەستەنبوڵ، کە بەسواری وڵاخ، لە ساڵی ﴿١٨١٤ز ــ ١٨١٥ز﴾ کردوویانە، (١٥٠٠) میلیان بڕیوە ــ خاریچ.

ئەمشەو، یان سبەی، مەحموود بەگی بان نۆکەرەکەی کۆشك، جێمان دێڵێ و هیوادارم ئەم نامەیەمت بداتێ. هەندێ تەنگوچەڵەمەی هەیە، بۆیە تێی بگە و بزانە پێویستی بەکەسێك بێت، یارمەتی بدات. هاوڕێیەکی بەسزمانە و دڵیشی چاکە. لە چادرەکەمدا پلەی گەرما (٩٠پلە) بوو.

## کفری (٣٣٢) ـ ٨٢ی مارت

هەر ئێستا، کاتێ ئەو نامەیەتم تێدا وەرگرت، کە بەمێژووی ٣٢ی ئەم مانگە، دوای ئاهەنگە خۆشەکەت نووسیبووت، بوومە بەختەوەرترین پیاو لە دنیادا. لەم ناوچانەشدا ئەوەندە تیژ تێپەڕ دەبووین، بەڕادەیەك ئەو عەرەبەی ناردبووت، کەوتۆتە سۆراخم و منیش نازانم لەکوێیە. تا لەم دواییەدا سەلیم ئاغا، لە جێگایەکدا دیبوویەوە و لەتەك پیاوێك و نامەیەکی ناسکدا بۆمی ناردبوو. بەمەش بارێك چاکەی تری هاوێشتە گەردنم، کە پێشتریش هەر لە گەردنمی ئاڵاندبوو. بەڕاستی واژەیەکی ئینگلیزیی شیاوم نەدییەوە، شایستەی بێ. لەبەرئەوە واژەیەکم بەکارهێنا، هی خەڵکی (غال) بوو، وەرم گرتبوو.

بیرم لەوە خێراتر تێپەڕ دەبێ، کە قەڵەمەکەمی پێ ڕابگات. بەنامەکەشتدا وا دەردەکەوێ پێش ئەم نامەیەشت، نامەیەکی ترت، لە وەڵامی ئەو نامەیەمدا بۆ نووسیوم، کە لە (بەعقووبە)ەوە بۆم نووسیبوویت. خۆ ئەگەر وابێ، ئەوا دەبێ (ئیسماعیل کۆسید) وەری گرتبێ و یەکسەریش دەینێرێ بۆ (ویللوك)، یان یەکێك لەو عەرەبانەی کە ڕەنگە هێشتا لەم بیابانەدا، هەر لە دووم بگەڕێ، یان ڕەنگە بەدیلیی کەوتبێتە دەست (ئەمانوڵلاخان) و کوردەکانی لای ئەو. ئێمەش چونکە ئەوەتەی لە (خانەقین) دەرچووین، بەو ناو شاخ و دەشتەدا بەخێرایی بروسکە، ڕێ دەکەین، زۆر بەگران پێم دەگەن و دەمبیننەوە. لەوە دەچێ خۆم لە (خانەقین) نقوم کردبێ و دووبارە لە کفری سەرم هەڵدابێتەوە.

(میناس) پاکەتێ بسکیتی گەورەشی لەگەڵ نامەکەتدا ناردبوو. (کوردئۆغلۆ)ی سەنگینیش کاتێ پاکەتەکەتی کردەوە و ناواخنەکەی بینی، کە بەپەلە لە بەغداوە هاتبوو، لەجیاتی زەردەخەنەی گاڵتە پێکردن، سەرسامییەکی گەورە لە دەموچاویدا دەرکەوت.

لە هەمان ئەو شەوەشدا کە لای ئێوە گێژەڵووکە هەڵیکردبوو، لای ئێمەش کە لە خانەقین بووین، گێژەڵووکەیەکی هەمان جۆر، لە باشووری خۆرهەڵاتەوە هەڵیکرد. بەڵام هەر ئەوەندەی

---

٣٣٢- (کفری) بەتەواوی دەکەوێتە سەر ئەو گەرووەی کە بۆ کوردستان دەچێ و وارشێکیشی لە قوڕ هەیە.

قەڵەمڕەوی پاشایەتی بەغدامان، لە خانەقین جێهێشت، بایەکە گۆڕا بۆ بایەکی باکووری خۆرئاوا. هێشتا دووبارە نەگەیشتبووینەوە سنووری (زەنگەباد)یش کە بای باشووری خۆرئاوا هەڵیکردەوە. دوای ئەویش ئەو قرچەی گەرما بەتینە دەستی پێکردەوە، کە بەرگەی نەدەگیرا. ئەمڕۆ پێوەرەکە (٩٨پلە)ی تۆمار کردبوو.

ئەمڕۆ پیاسەیەکی خۆشم بەزەوییە ئەمیرییەکانی کفری دا کرد. چەند سەد یاردەیەك دەکەوتنە شارەکەوە، لەوێش لقەکانی ئاوی (کفری سو)ی سەرەکی هەن و ئەو گەرووەیە کە دوای ئەوەی زوورگە گەچۆڕەکانی دەوروبەری کفری دەبڕێ، دەچێتەوە سەر کوردستان. ڕووبارەکە لای سەرووی گردەکەوە، گردێکی بەرزی بەدووبەشی ستوونییەوە دەکرد، کە بەرزاییان دووسەد پێ دەبوو. ڕووبارێکی تریش هەیە، دەڵێن ئەگەرچیش لە کانییەکی ترەوە دێت، کە نیو سەعاتە ڕێیەك دوور دەبێ و بەسەر هەمان ئەو شوێنە چەوەلەیەدا تێپەڕ دەبێ و لای گردەکە بەیەك دەگەنەوە بەڵام ئاوەکەی بەتامە. ئەم دوو ڕووبارەش لەمجۆرە وەرزەی ساڵدا هەر بریتین لە دوو جۆگەی بچووك، بەڵام بەرێڕەوە چەوەلە گەورەکەیدا، کە ئەو چالاّییە بەرینەی داگیرکردبوو، بەڵگەی ئەوەبوو کە لە ئاوهەستانی لە ناکاویدا زۆر سامدار دەبێ، بەجۆرێکە لە بەرزایی کێوەکانەوە گاشەبەردی گەچۆڕی وا لەگەڵ خۆیدا دێنێ، کە قورساییەکەی دەگاتە یەك تەن. لووتکەکەی بەرامبەر (کفری)ش ستوونییە و یەکسەر بەپێدەشتەکە کۆتایی دێت، بەڵام ئەوەندەی چیاکانی کوردستان بەرز نییە.

خەڵکەکەی ئێرە هەموو ستایشی زۆری ئاوەکەی (کفری) دەکەن و دەڵێن بۆ هەرس زۆر بەکەڵکە. دەبێ ئەمە هی ئەوە نەبێ، کە بەسەر ئەو زەوییانەدا تێپەڕ دەبێ، کە نیترات و گەچۆڕیان تیایە و ئەمانە وای لێدەکەن تایبەتمەندی سکچوون کەم بکەنەوە؟ بەڕاستی منیش هەستم کرد ئاوەکەی سووك و سازگارە و ئەو قورسییەی تێدا نییە، کە لە نێوان بەردەلاّنییەوە هەڵدەقوڵێ. چونکە ئەم ئاوە تامی نییە.

کۆمەڵێکیش لە لاقرتیجارەکانی (دەلی دومەن)، حەزیان دەکرد ئەمشەو هەندێ یاری لەبەرچاومان بکەن. وەك من بزانم ئەمانە قەرەجن و لە هەندێ هەرێمی ئێراندا بە (تەت) دەناسرێن و لە (بازکاری)یەکانی هیند دەچن. گاڵتەکانیشیان بریتییە لە هەندێ یاری ناشیرین، کە تورکەکان زۆریان حەز لێیە. بەڵام هەندێ مۆزیکژەنی بەهرەوەریان لەناودایە.

ئەو عەرەبەی نامەکەت پیا ناردبوو، چاوەڕێی نامەکەی من دەکات، بۆئەوەی دوای تاوێك تاریك داهاتن بەرێگاکەی خۆیدا بگەڕێتەوە. بێگومان لەگەڵ ئەم سەفەرە نائاساییانەشدا

ڕاهاتووه. بەڵام بەرنامەی ئێستام دیتنی خۆرگیرانی سبەینێیە، لێره. ڕۆژی دواتریش بۆ بەغدا دەگەڕێینەوه و شەوێکیش لە (قەرەتەپە) دەمێنینەوه. بەجۆره ڕێگاکەمان بەچەند قۆناغێکی کورتەوه بەشکردووه، تا له گەرمای ڕۆژانە ڕزگارمان بێت.

## ٢٩ی ئادار

ئەم بەیانییە، بۆ دیتنی گردە گەچۆڕەکە چوومە دەرەوه و تا سەر لووتکەکەی پیایدا سەرکەوتم. لەوێ سەرباری ئەوەش کە ئاسۆ لێڵ بوو، بەڵام بەقیبلەنماکەم هەندێ خاڵم دیاری کرد.

ئەو شاخانەی بەدەم ڕێوە بڕیمانن، لەخوار (کفری)یەوە بوون. ئەو ڕێگەیەش کە لە بەغداوه دەهات، لەوێدا دەیبڕین، دوای ئەوە ڕووەو بیابان دادەگەڕێ و لەو جێگایەدا کە لەپشت شوێنی (ئون ئیکی ئیمام)ەوەیە، نامێنێ. زنجیرەکەی لای (کفری)ش شەقارشەقار و کووڕ و ڕوو لە بەغدادن. لە دەوروبەری ڕێی لای (توزخورماتو)یەوە(٣٣٣)چەند زنجیرەیەکی لەم بچووکتر هەن. شاخەکانی ئەم ناوچانە گەچۆڕن و گڵیان کەمە و لە هەندێ جێگادا کشتوکاڵیشیان تێدا کراوه. لە بەرامبەرەکانیشیانەوە، واتە لای باشووری خۆرهەڵاتی نشێوییەکەوە، لووتکەکانیان بریتین لە گڵ و بەرد، کە هەرەسی گەورە گەورەیان لێ داڕووخاوەتە ناو نشیوییەکەوه. زەویش بەرد و چەو دایان پۆشیوە و گەچۆڕیشیان تێکەڵە. لێرە گوڵە کێوییەکی یەکجار زۆر دەڕوێن، هەندێکیان بۆنیان خۆشە، وەك گوڵاڵە سوورە و گوڵی ئاڵی خاشخاشی جوان و کێوی و گوڵ ئەستێرەش، یان پەپوولەی ناو گژوگیاش بەسەریانەوە دەسووڕێنەوه.

بەپیتترین زەوی بۆ کشتوکاڵ لە ناوچەی (کفری)، کەوتۆتە (ئاسکی کفری)یەوە، چونکە زەویوزارەکانی دەوروبەری شارۆچکەکە، بەردێکی زۆری هەیە و بۆ کشتوکاڵی بەربڵاو دەست نادات. لە وەرزی بەهارەوە هەتا دوای دروێنەش، هەموو دانیشتووانی کفری، بەخۆیان و ماڵ و منداڵیانەوە دەچنە (ئاسکی کفری) و لە ڕەشماڵدا دەمێننەوه.

---

٣٣٣- (توزخورماتو)، له (ئاق سو) پاراو دەبێ، کە ڕووبارێکی بچکۆلەیە و لە کوردستان هەڵدەقوڵێ و بەئیبراهیم خانچیدا تێپەڕ دەبێ.

دوێنێ شەو لە باشووری خۆرهەڵاتەوە شەماڵێکی سازگار هەڵیکرد. ئەمڕۆش هەر لەولایەوە، کردی بەگێژەڵووکەیەکی ناخۆش و خۆڵاویی، کە وام لێدەکات ترسی ئەوەم لێ بنیشێ کاری ڕوانگەکاری ئەمشەوم لێ تێك بدات.

ئەمڕۆ لە گەرمترین ساتەکانی ڕۆژدا، گەرما پێوەرەکەم لە چادرەکەمدا (٩٠پلە)ی تۆمارکرد.

## ٠٣ی مارت

ئەم بەیانییە، سەعات شەش و چل و پێنج دەقیقە، کفریمان جێهێشت. بەلای دوو شاخدا تێپەڕبووین (٢٢ پلە) دەکەوتنە باشووری خۆرئاواوە. کەمێکیش دوای هەشت، بەلای دوو گردی بچووکدا تێپەڕبووین، پێیان دەوتن (گردی ئیشان)، پاشان لە (کفری سو)ماندا، کە ئێستاکە وشك بوو. دەراو شوێن ئاوەڕۆکەی هەر چەوی تێدابوو. لێرەدا بەهۆی شۆرەکاتەوە، دەشتەکە سپی دەکردەوە، لە بەفر دەچوو. پێش سەعات دە گەیشتینە (چمن کوپروسی ــ پردی چمن)، کە پڕی بوو لە قامیش. بەرزایی قامیشەکان دەگەیشتە پازدە پێ. بەجۆرێك ئاوەکەیان داپۆشیبوو، نەدەبینرا، ئاوەکەش پڕبوو لە زەروو. بێگومان ئەو فەیلەسوفەی لە چامەکەی (ورد زورپ)دا ناوی هاتووە، دەبێ لێرە کارێکی باشی بۆ خۆی بدیبایەوە. خەڵکەکەی ئێرە بەشی خوارەوەی ناوی قامیشەکەیان دەخوارد. بەلای هەندێ هەواری عەرەبدا تێپەڕ بووین، لە لەوەڕگەکاندا مێگەلیان دەلەوەڕاند.

نزیکەی سەعات و نیوێك، لای (چمن کۆپروسی) لاماندا، پاشان ڕووەو (قەرەتەپە) ٥١ پلە بەلای خۆرئاوادا، دەستمان بەڕۆیشتن کردەوە و بەدوو زنجیرە شاخدا تێپەڕبووین، دۆڵێك، یان چاڵاییەکیان دەکەوتە نێوانەوە. (قەرەتەپە) دەکەوتە لاپاڵی ئەوی دواییانەوە، کە لە دەوروبەری حەوت و چل و پێنج دەقیقەدا گەیشتینێ. قۆناغی ئەمڕۆ، حەوت سەعات بوو. ئەمڕۆ ڕەوە ئاسکێکی زۆرمان بینی. کە چووینە ناو شارەکەشەوە، لای چەپمانەوە گۆڕستانێکمان دی، چەند گومەزێکی بچووکی تێدابوو، وەك گوندێکی دەنواند.

ئەمساڵ (قەرەتەپە) دەبێ چل هەزار قرۆش بەدەوڵەت بدات. بەجۆگەیەك پاراو دەبێ، کە لە (دیالە)، لە ژوور (زەنگەباد)ەوە دێت. گرینگترینی بەروبومی لۆکەیە و گەنمەشامی، واتە دانەوێڵەی هیندییە. کەمێکیش مەرەزەی تێدا دەکرێ.

دانیشتووانی (قەرەتەپە) دەڵێن تورکمانین و ئاخاوتنیشیان هەر بە تورکییە. هەندێ (عەلی ئیلاهی) و (ئیسماعیلی)، یان (چراغ سوێندرەن)یشیان تێدایە.

ئەمڕۆ، ڕۆژێکی سامالّ و ساردبوو، لای باکووری خۆرئاواشەوە هەوا هەلی دەکرد و سازگار بوو. گەرماپێوەرەکەش (٢٨پلە)ی تۆمارکردبوو.

## ٣١ی ئادار

ئەم بەیانییە، لە شەش و چل و پێنج دەقیقەدا سواری ئەسپەکانمان بووینەوە. ئەوەندەی نەخایاند، کە شوێنەواری کشتوکاڵ دیار نەما و چووینە دەشتێکی وشك و قاقڕەوە، کە هەرتەنیا هەندێ گژوگیای پەرتوبڵاوی تێدابوو، ئیتر ئەوی تری زەوییەکی شۆرەکاتی خەست بوو، دەتوت بەفر داپۆشیوە، ڕووەو باشوور، بەرەو پردی (نارین) ڕوومان نا، کە لە دەوروبەری سەعات هەشتدا گەیشتینێ. پردێکی چاکە و لەسەر شەش پایە و لەلایەن سلێمان پاشای بەغداوە دروستکراوە. پاش ئەوە ڕووەو باشوور بە (٥١پلە) بەلای خۆرئاوادا ڕوومان کردە چیاکانی (حەمرین)، کە ئەمیان دەکەوتە لای ڕاستمان و (نارین)یش دەکەوتە لای چەپمانەوە. ئیتر هەر بە سەمتی باشووری خۆرئاوا، ڕووەو لاپاڵەکانی (حەمرین) ڕێمان کرد، کە لە سەعات دە و نیودا گەیشتینێ. بەشەکانی پێشەوەی لەبەرد و گلّ پێکهاتبوون و لەسەرخۆ بەرز دەبوونەوە و لە سەعات دە و چل و پێنج دەقیقەدا گەیشتینە سەرەوەی، کە بەرزترین شوێنی دەوروبەرمان بوو. ئیتر لێرە بە قیبلەنماکەم هەندێ خالّم دیاری کرد. زەویوزارەکەی دەوروبەرمان، کە لە گوندەکەوە سەیرم دەکرد، دیمەنێکی دانسقەی هەبوو، چونکە زنجیرە زوورگەکانی دەتوت شاخی ڕووخاون و بەدوای یەکدا وەك شەپۆلی زەریایەك دەیاننواند، کە لە پڕێکدا شەپۆڵەکان بەستبێتیان. ڕووباری (دیالە)ش کەمێك لەولای دەربەندەکەوە بەجوانیی دیاربوو، کە پێچاوپێچ دەهات و ئاوی (نارین)ی لە خۆ دەگرت. کە چووینە پێشترەوە. تەمۆخەکان لەپێشمانەوە دەرکەوتن، کە هەموویان ڕووەو تەنیشتی باکووری چیاکان لاربوونەوە. پارچەپارچەی ئەم بەردە بەرجەستانەی زوورگەکان لە گەلێك جێگادا خڕ و پێچاوپێچ بوون، کە ئاوی زەریا هەڵی کۆڵیبوون و لووسی کردبوون.

لە جێگایەکی تر چینێك (گلق- Talc)م بینی و نموونەیەکیم لەگەڵ خۆم هەڵگرت. ئیتر زەوی هەمووی تەمۆخ و شاخەکانیش بەچەند زنجیرەیەکی زۆری هاوتەریب کۆتاییان دەهات، هەندێکیشیان تازە پێکهاتبوون، کە بەرزاییان لە زەوییەوە هەر دە، دوازدە پێ دەبوون. لەبەری لای باشووریشەوە زوورگی تری نارێك هەبوون، کە ڕووەو لای باکوور، بەرەو زەوی نزم دەبوونەوە. لەسەردەمی زوودا، پاشایەکی تورك، ڕێگایەکی تەنگەبەری بەناو ئەم زوورگانەدا

دروستکردبوو. وەك لە نووسینی هەڵکۆڵراوی سەر بەردەکەدا وا دیاربوو، سەرنجم دا و بەیادم بێ، ئەو پاشایە ناوی (حەسەن) بووە. شۆڕەکاتێکی زۆریش لەم ناوەدا بەپەرتوبڵاویی هەیە.

لە نیوەڕۆدا ئەم شاخە دیمەن ناشیرینانەمان جێهێشت. ڕێگاکەشمان کەمێك ڕووەو باشووربوو، ڕووی لای خوارووی شاخەکە دەکەوتە بەری چەپمانەوە. ئیتر (٤٠پلە) بەلای خۆرهەڵاتدا، ڕووەو (ئەدەنەکۆی) کەوتینەڕێ، کە لە سەعات یەك و بیست دەقیقەدا گەیشتینێ. ئەم قۆناغە بەهەشت سەعات دادەنرێ.

(ئەدەنەکۆی) لە (خالس)ەوە نزیکە و گوندێکی گەورەیە و لە (دیالە)ەوە نزیکە. کاتی خۆی لە ئێستا پێشکەوتووتر بووە. مزگەوت و منارەیەکی تێدایە و باجی ساڵانەی ئەمساڵیشی (٢٠،٠٠٠) بیست هەزار قرۆشە.

نوێنەرەکەمان خانوویەکی لەناو گوندەکەدا بۆ سازکردبووین، کە کرمێکی زۆری ئاوریشممان تێدا دی، سەرگەرمی کاری خۆیان بوون. بۆنەکەیشیان کارێکی زۆری لەسەرم کرد و ناچاربووم خانووەکە جێ بهێڵم و بچمە باخچەکە، کە چادرەکەمی تێدا هەڵدرابوو. ئیتر هەستم بەحەسانەوەیەکی زۆرکرد.

خەڵکی ئەم شوێنە تورکمانن و شیعە و سوننی و چراکوژێنەوەن. تا ئێرە ئیتر ئاخاوتن بەتورکی دوایی دێت، چونکە لێرەوە تا بەغدا خەڵکەکەی بریتین لە جووتیار و گوندنشینی عەرەب. ئەمڕۆ بەدەم ڕێکردنمانەوە تووشی هەندێ عەرەبی هۆزی (مەهدەوییە)(٣٣٤)بووین.

هەر لە دەشتی (قەرەتەپە)ش تووشی هەوارێکی هۆزی (کورەوییە)ی عەرەب بووین، کە سەردارەکەیان بەمەبەستی یاوەری کردنمان وەك پاسەوانی شەرەف، بەخۆی و شەش سوارەی چەکدارەوە بەپیرمانەوە هات، بەڵام بەنەزاکەتەوە ڕەوانەم کردنەوە. گەرماپێوەرەکەش (٢٨پلە)ی تۆمارکردبوو.

## ١ی نیسان

لە سەعات شەش و نیودا (ئەدەنەکۆی)مان جێهێشت و لە دوورەوە سەرنجمدا ڕەوەسوارەی سەیر جمەی دێت، بۆم دەرکەوت سوپای سازی کوللەیە و ئەو ناوەی بەڕەنگێکی زەردی بریسکەدار پڕکردووە. دوای ئەوەی کە گوندەکەمان جێهێشت، گەیشتینە ڕووباری (دیالە) و ئیتر بەڕێڕەوی ئاوەکەیدا ڕێمان گرتەبەر. لەسەر پانتایی ئاوەکەی، بەستی تەختەبەندمان دەدی، کە بە مەبەستی

٣٣٤- وەك زانیم هەموو قەسابەکانی بەغدا، سەر بەم خێڵەن ــ پەراوێزەکە دوایی هات. ڕاستییەکەی (المهدیە)یە و لە هۆزی (قەیسی)یە، وەك (الکرویە) ــ ع.

بەرزکردنەوەی ئاستی ئاوەکەی بۆ ئاوێژەکردنی ئەو جۆگە زۆرە دروستکرابوون، کە لە هەموو جێگایەکدا ڕێگەکەمانیان دەبڕی. ئیتر هەر بەسەمتی خۆرئاوا و ڕووەو (خالس) ڕێمان دەکرد، کە گەورەترین جۆگەیەکە تا ئێستا دیبم و لای چەپمانەوە تێپەڕ دەبوو. ڕووباری (دیالە)ش لەپشتیەوە بوو. بەلای مەرقەدی (سەیید موبارەك)دا تێپەڕبووین کە شوێنێکە بۆ زیارەتگە.

کەمێك دوای سەعات هەشت گەیشتینە (دەلی عەباس)، کە لێرەدا پردێکی خراپ لەسەر (خالس) دروستکراوە. گوندەکانی ئەم ناوەش یەك بەدوای یەکدا لە ئاسۆوە دەردەکەوتن. هەروەها گوندەکانی (خۆراسان)یش لەبەری ئەوبەری (دیالە)وە دەبینران. لە سەرەتادا ڕێگاکەمان (٥٥ پلە) بەلای باشووری خۆرئاوادا بوو، دوای ئەوە بووە (٢٠پلە) بەلای باشووری خۆرئاوادا. لە سەعات دە و نیودا گەیشتینە (چوبوق)، کە گوندێکی پیسی عەرەبی بوو، پردێکی تێدابوو بەسەر جۆگەیەکی بچووکەوە. لە ناحیەی (سەراجق)ەوە دەهات و لە (خالس) هەڵگیرابوو. ئەم جۆگەیە لەبەرامبەر (بویوك ئەبی سەیدا)دا دەڕژایە (دیالە)ەوە، کە ئەویش لە (دیالە)وە نزیك بوو. هەرچەند یاردەیەکیش لە (جوبوق)ەوە دوور دەبوو. کاری ئەم جۆگەیەش بریتییە لە بەکاربردنی ئەو ئاوە زیادەیەی لەکاتی ئاو هەستانی ڕووباری (دیالە)دا سەر دەکات و بەرزدەبێتەوە. ئیتر ئەوکاتە سنگی بۆ گێڕانەوەی تەوژمی ئاوەکە دەکاتەوە، کە ئەگەر ئەم نەبوایە، ڕووباری (خالس) زیانێکی زۆری پێدەگەیشت و هەموو زەویوزارەکەی دەوروبەری نقوم دەبوو، هەرچیش کشتوکاڵ بوو لەناو دەچوون. ئەوەش کە لە ئاوی (عوزێم)(٣٣٥) زیاد دەبێ، لای (جوبوق) دەڕژێتە ئەم جۆگەیەوە.

## ٢ی نیسان

بەدرێژایی ئەمشەو، ناچاربووین پاسەوانێتی خۆمان لەو دزانە بکەین، کە ئەم ناوچەیەی پێناسراوە. بەیانی شەماڵێکی سازگار لەبەری لای باکووری خۆرئاواوە هەڵیکرد و هەوای گۆڕی. لە سەعات پێنج و نیودا کەوتینە ڕێ و لەوەش گورجوگۆڵتر بووین کە هەبووین. ڕووی

---

٣٣٥- لە دەقەکەدا (Azemia) نووسرابوو، بۆیە گێڕامەوە بۆ (العقیم)، وەك مامۆستا (عباس العزاوی)یش ئاگاداری کردم ڕووباری (العقیم) هەڵناسێ، وەك نووسەر باسی کردووە، بەڵکو سێلاوی شاخی (حەمرین لەبەری (العقیم) لە جێگایەکدا کۆدەبێتەوە، پێی دەوترێ (ئەبو فیراش). ئەگەر ئاوی (ئەبو فیراش) زیاد بکات، دەڕژێتە سەر مەزراگەلێك و نقومیان دەکات. ئەوکاتە بەری (خالس) دەبەستن و ئاوەکە ڕوودەکاتە هەمان دەراوەکەی خۆی، لە نزیك چەمی (چوبوق) و بۆ ئەوەش ئاوەکە سەرف بێت، دەڕژێتە (خالس)ەوە ــ ع.

ڕێگاکەمان کردە (خان مصبح)، کە دەکەوتە لای خۆرئاوامانەوە و بەشوێن ڕێڕەوی (دیالە)دا ڕێمان گرتەبەر، کە لە نزیك چەپمانەوە بەپێچاوپێچی ڕێی دەکرد.

لە حەوت و چل دەقیقەدا گەیشتینە (خان مصبح)، کە لەویٚ بۆ قاوە خواردنەوە و دیاریکردنی هەندیٚ جێگا بەقیبلەنماکە، دابەزین. لە هەشت و نیودا خانەکەمان جێهێشت و کەمێك دوای سەعات دە (نەهرەوان)ی جوانمان دی، کە (۱۰پلە) ڕووەو باکووری خۆرئاوا ڕێی دەکرد. (خەرنابات)یش لای خۆرهەڵاتمانەوە میلێك دوور دەبوو. دوای سەعاتە ڕێیەك بە هەندیٚ جۆگەی وشکی هاوتەریبی نەهرەوان گەیشتین. لەوێشەوە بەلای مەرقەدی (سەیید موحسین)دا تێپەڕبووین، کە مەزارێکە لەسەر جۆگەیەکی بچووك، کە لە (خالس)ەوە دێت. لە نیوەڕۆدا گەیینە (توبراق قەلعە)، کە گردێکی چوارگۆشەی توورەکەڕێژە و لەهەمان کاتیشدا پێی دەوتریٚ (مجیلیبە). کەمێکیش لە سەرروویەوە هەندیٚ ئاسەوارمان بینی، کە هەندیٚ کەسمان تێدا دەدین، خەریکی خشت لیٚ دەرهێنانیان بوون و دەیان نارد بۆ بەغدا بۆ چاککردنی باخەکەی (یوسف بەگ)۳۳٦.

لەسەر هەندێکی تریان جوغزێکی نارێك هەبوون. لەوەدەچوون ئەوکاتەی تەڕبوون، بەپەنجە کێشرابن. خشتەکان ئەستووربوون و لە قەوارەی ئەوانەی (بابل)دا نەبوون. ژمارەیەکی یەکجار زۆریشیان لێرە هەبوون. گومانی زۆرم ئەوەیە کە ئەم ئاسەوارانە (ساسانی) بن، چونکە زۆر لەو ئاسەوارانە دەچوو، کە لە (قالان تەپە)ی (زەنگەباد) و ئەو گردە توورەکەڕێژانەی لەم ناوچانە دیبوومانن.

لە سەعات یەك و چل دەقیقەدا گەیشتینە گوندی (ئەلحویش)، کە لە ڕێگایەکەوە بۆی هاتین، هێشتا پییایدا نەهاتبوون. زۆربەی بیابانی قاقڕ و کاکی بەکاکی بوو. کەم تا زۆر، شتێکی وامان تێدا نەدی شایستە بیٚ. لە مالۆسێکی کێویی، کەتە و زل زیاتر. کە شەش بەرازی تری بەشوێنەوە بوو.

ڕۆژێکی خۆش و سازگاربوو، گەرماپێوەرەکەش (۷۷ پلە)ی تۆمارکردبوو.

## ۳ی نیسان

لە سەعات شەش و نیودا (ئەلحویش)مان جێهێشت و لە نیوەڕۆدا گەیشتینەوە بارەگای نشینگەیی لە بەغدا.

---

۳۳٦- کوڕە گەورەی پاشای بەغدایە.

# پاشكۆی سێیەم

**زانیاریی وەرگیراو لە خەڵك، لەبارەی (جزیرە) و ناوچەكانی دەوروبەری.**

**(پاشكۆی دووەمە لە بەرگی یەكەمی گەشتەكە)**

**سەرنج: ڕەنگە ئەم زانیارییانەی خوارەوە، بۆ ئێستا زیانێكی جوگرافیاییان نەبێ. وەرگێڕیش وەكو خۆیان تۆماریان دەكاتەوە(ع)**

له قەڵەمڕەوی حکوومەتی (جزیرە)دا دووبەش کورد هەن، کە بریتین لە (بوهتانی، یان (بۆتانی) و (ئاشیتیی). بەشێوەیەکی گشتی (ئاشیتی) له دەشتدا٣٣٧ لە نزیك (نسیبین) و (چێل ئاغا) دەژین. لەبەرئەوەش کە لەم دواییەدا حکوومەت لاوازبووە، ئەمانە زۆر بەهێزبوون و زەوت ناکرێن.

جۆمیش کەزەك: میرنشینێکی کوردە و دوازدە سەعات لە (ئەرغەنی)یەوە دوورە، لە نزیك زەریاچەی (گول باشی)، لە کێوی تەورۆس.

چەرنەك: میرنشینێکی کوردە و هەشت سەعات لە (ئەرغەنی)یەوە دوورە، لای کێوی تەورۆسەوە.

بنەماڵەی بایەزید، لە هۆزی سیبکی = سیپەکی ــ ن

فنیك: قەڵایەکە، چوار سەعات لە باکووری (جزیرە)وە دوورە و لەبەری خۆرهەڵاتی (دیجلە)یە٣٣٨.

ئیس: چوار سەعاتێك لەبەری خۆرهەڵاتی دیجلە و (فنیك)ەوە دوورە.

بەشیرۆ (بەشیری): سەربە (دیاربەکر)ە و شەش سەعاتە ڕێیەك لەسەر ڕێی (رەزوان) دووردەبێ، کە کوردی (بەرازی) لێ نیشتەجێن.

زەرگی: دەکەوێتە نێوان (بەتلیس) و (سەعرد)و (مووش)ەوە و ناوچەیەکە ناوەندەکەی (دەرزەنی)یە و چوار سەعات لە (سەعرت)ەوە دوورە.

ڕۆژەکی (ڕاستییەکەی ــ ڕوسکی/یە ــ وەرگێڕی عەرەبی): خێڵێکی گەورەن لە دەوروبەری (بەتلیس)ن.

قۆناغە ڕێیەکیش لە (سیللوك)ەوە، مەزارێکی گەورەی دیان هەیە، ناوی (چەن گەدی ــ CHENGEDE)، یان (چەن گەللی ــ Chengelli)یە. هەروەها لێرەش کەنیسەی (سوورب قارابت) هەیە، کە کەنیسەی یوحەنای مەعمەدانە و شەش سەعات لە (موش)ەوە لە نزیك (میغاکیات) دوور دەبێ، کە چەمێکە و دەڕژێتە فوراتەوە. ئەم مەزارە لەدوای (چەمبازین) لەناو ئەرمەنەکاندا ناوبانگێکی گەورەی هەیە. لەپێشدا زیارەتی (قەیسەری) دەکەن، کە کەنیسەیەکی گرنگی تێدایە. گوایە بڕوایان وایە، کە سەری قەدیس یوحەنای مەعمەدان لەوێ نێژراوە. پاشان دێن بۆ (چەن گەدی) و دوای ئەوە ڕوودەکەنە (چەمبازین).

---

٣٣٧- ئەمانە ئێستا لە کێوی (گور) نیشتەجێن ــ ع.

٣٣٨- (ئەمیانوس) لە لاپەڕەکانی(٥١ و ٨١ و ٦٢)ی دووەمین کتێبدا، ناوی (بەزاب دە) ــ بازبدی ــ (فێ نیك) هێناوە.

سەرگورشتەیەکی زۆر ئەفسانەیی لەبارەی ئەو کەنیسە سەرەکییەوە دەگێڕنەوە. چونکە لەوێ قەدیس خەڵك فێری هەموو جۆرە هونەرەکان (جگە لە موزیك) و بازرگانێتی دەکات. لەبەر خاتری (هیرودیاس HERODIAS)یش نایەڵێت ئافرەتان لێی نزیك بکەونەوە. لە کەنیسەدا بیرێکی قووڵ هەیە، وەك ئەرمەنەکان دەڵێن دەنگی جنۆکە زیندانییەکانی لێوە دەبیسترێ. لە زۆر کاتیشدا لە دەوروبەری، ڕووناکیی دەبینرێ، بەتایبەتی دوای باران داکردنێکی کەم. بێگومان ئەمەش دەبێ دیاردەی سروشتیی بێت.

بەل غین: چوار سەعاتێك لە (فنیك)ی لای خۆرهەڵاتی (دیجلە)ەوە دوور دەبێ.

ئارزەن: ناوە ڕاستییەکەی (هەرزین)ە. جێگەیەکە لەنێوان (دیاربەکر) و (سەعرد)دا و لە چیاکانەوە نزیکە.

باتمان: پردێکی خراپی سەر ڕووباری (سەعرد)ە، لە دووریی سێ سەعاتە ڕێیەك لەسەرووی شارەکەوەیە . ئێستاش کەلاوەی شارانی لێیە و (باتمان چای)ش ڕووبارەکەی (سەعرد)ە، یان ڕووباری دیجلەی سەرەکییە.

دەڵێن لە نزیك جزیرەش ئاسەوارێك، یان پاشماوەی پردێك هەیە بەسەر ڕووباری دیجلەوە.

حەسەن: کێویێکە، بەشێك لە (تەورۆس) و (زاگرۆس) پێك دێنێ و لەنێوان (دیاربەکر) و (پالۆ) و (موش) دایە، ڕێچکە و ڕێبازگەیەك نییە بۆی بچێت. دانیشتووانیشی سەربەخۆییەکی تەواویان هەیە و کوردەکان بەخەڵکی ئەو ناوچەیە دەڵێن (زازا)، کە دیارە ئەمە نازناوێکی گاڵتەجاڕییە و مانای زمان فسی و زمان گرتن، یان ئەو قسانە دێت کە تێیان ناگەیت.

(ڕەزوان)یش هەشت سەعاتە ڕێیەك لە (هەزو)ەوە دوور دەبێ. بنەماڵەی (هەزو)یش زۆر کۆنن و لەهەمان کاتیشدا زۆر بەڕێزن.

کوفرا: شارێکە، شەش سەعات لە (سەعرد)ەوە دوور دەبێ و دەکەوێتە سەر ڕێی (بەتلیس)، لە ناوچەی (شیروان). قەڵای (شیروان)یش هەر تەنیا سەعاتێك لە (کوفرا)وە دوور دەبێ، سەردارەکەیشی بەهێز و سەربەخۆیە، دەچێتەوە سەر لقێکی تازەی بنەماڵەی (حەسەن کیف)، واتە (ئەیوبی )یە و لە نەوەی سەلاحەدینی ئەیوبییە. کانێکی زێڕیش لە (شیروان) هەیە.

(ئیروون ــ Iroon) دەداتەوە لە (سێ گوێزە) و (چوقور) و سێ سەعاتە ڕێیەك لە (کوفرا)وە دوور دەبێ و لەم جێگایانەوە کەستانە بۆ بەغدا دەچێ. ماوەی نێوان (سەعرد) و (شیرین)یش سێ سەعات دەبێ. لەوێشەوە بۆ (مەعدەن) شەش سەعاتە و بۆ (هیزان)یش بەلای کەمەوە شەش سەعات دەبێ.

کەرنی: دوو سەعاتێك لە (هیزان)ەوە دوور دەبێ و لە (شیروان)یشەوە چوار پێنج سەعاتێك دەبێ، کە ناوچەیەکی یەکجار دابڕاو و شاخاوی و سەختە. لە نێوان ئەو کوردانەشدا کە لەم ناوچانەشدا نیشتەجێن، خێڵی (عەمبەرلو) و (چنگنی)یان تێدایە و یەکێك لە سەردارەکانیشیان دەڵێن لە نەوەی ساسانییە.

(کورکێت ــ Koor Keat): ڕووبارێکە، پاش ئەوەی هەشت سەعاتە ڕێیەك بەڕێگەی (توبراق قەلعە ــ بایەزید ) لە (توبراق قەلعە) تێپەڕ دەبێت، دەیگەیتێ و لە کێوەکانی (قاغزمان) لە نزیك (قارس)ەوە دێتە خوارەوە و دەڕژێتە فوراتەوە. گەلێ جاریش ئاوەکەی زۆر هەڵدەستێ، کە تەنانەت لەو کاتانەشدا ئاوێکی کەمی هەیە و بەو بۆنەیەشەوە کە چاڵی گەورە لە بنەکەیدا هەیە و تیژ تێپەڕ دەبێ. گێژەن و گۆمی ترسناکی هەیە. لەبەرئەوە هەمیشە بۆ پەڕینەوە لێی، دەبێ چاوساغی بۆ ببرێ.

(ئاوی ماسی)، یان ڕووباری ماسی، دەڵێن ڕووبارێکی گەورەیە وەك (زێ) و بەناو (شوشك) و (خاموور)دا تێپەڕ دەبێ. لە تەنیشت (ئەرجیش) و لە نزیك زەریاچەی (وان)ەوە هەڵدەقوڵێ و لە نزیك (مەلازگرد) دەڕژێتە فوراتەوە. ماسییەکی زۆری (گاشی نە)یشی تێدایە.

خاموور: شوێنێکە هەر لە ناوچەیەك، لە ناوچەکانی (بایەزید)ی بەناوەوە ناونراوە و دەکەوێتە ڕێگەی (بایەزید) و (موش)ەوە. (شوشیك)یش بۆ ماوەی هەشت سەعاتە ڕێ لە (خاموور)ەوە دوورە.

هیچ ڕووبارێکیش نارژێتە زەریاچەی (وان)ەوە. وا دیارە بەرزترین بەشی بانووی (ئەرمینیا) دەبێت، لە (ئیخلات)یش کەلاوەیەکی زۆر هەیە و ئێستا نیمچە چۆڵکراوە. هەروەها لە (ئاجاواز ــ عادل جواز)یش کەلاوەیەکی زۆر هەیە، کە ئاوی زەریاچەکە بەشێکی لێ داڕماندووە. هێشتا لەسەر لێواری زەریاچەکەش ئاسەواری شارێك هەیە، ئەوەندەی فراوانیی شاری بەغدا دەبێ.

(بین کول) زەریاچەیەکە گاشەبەردێکی زەبەللاح لە ناوەڕاستەکەیدایەتی، کە نابزوێ و (ئازاکس)، یان (ئاراکس)ی لێ هەڵدەقوڵێ.

ڕووبارێکیش بەژێر زەویدا دێت، چوار سەعاتێك لە (بایەزید)ەوە دوور دەبێ و دەڕژێتە (ئاراکس)ەوە. ڕێڕەوەکەشی نابینرێ. بەڵام لەسەر زەوییەوە، لەهەموو جێگەیەکی ڕێڕەوەکەیەوە بەئاشکرا خوڕەکەی دەبیسترێ. لەکاتی تێکەڵبوونی هەردوو ڕووبارەکەشدا، مرۆ زۆر بەئاشکرا،

تێکەڵبوونی هەردوو ڕووبارەکە هەست پێدەکات، کە لەشێوەی گێژاو دایە. خەڵك زۆر بێهوودە خەریکی هەڵکەندنی سەر ڕێڕەوەکەی بوون، کە وەك دەرکەوتووە زۆر قووڵە.

لەبان ئەو بەردەش کە قەڵای (بایەزید)ی لەسەر دروستکراوە، وێنەی هەڵکۆڵراوی تێدایە، شێوەی سێ پیاو دەنوێنێ، کە هەریەکەیان گۆچانێکی بەدەستەوەیە و کتێبێکی لەبن هەنگڵدایە.

قەڵای (مەکس)یش، کە ڕووباری دیجلەی خۆرهەڵاتی لێ هەڵدەقوڵێ، ماوەی پازدە سەعاتێك لەپشتی (جۆلەمێرگ)ەوە دوور دەبێ. ڕووبارەکەش لە ئەشکەوتی لای شاخێك هەڵدەقوڵێ و لەسەرەتاوە لە ڕووبارەکەی لای (دیاربەکر) گەورەترە و بەنزیك (سەعرد)دا تێپەڕ دەبێ. پەڕینەوەش لێی، زۆرگرانە. تەنانەت لە ڕۆژانی نیشتنەوەشیدا، واتە ئەو ڕۆژانەی کە پێیان دەوترێ قرچەی گەرمای هاوین. لە (تەللە نافرو)ش، لەنێوان (دیاربەکر) و (جزیرە)دا، ڕووبارەکەی (دیاربەکر)ی تێدەڕژێ. ڕێگاش لە (مەکس)ەوە بۆ (سەعرد)، بەمجۆرەیە:

قورماس: قەڵایەکە، هی بەگی (شیروان)ە: 4سەعات

دەرکەن: 4 سەعات

بەرواری: ئەمانیش خێڵێکن، سەر بە جزیرەن و خێڵێکی گەورەن و لەناو خەڵکدا خۆشەویستن. هەنگوین و میوەی ئەم ناوچەیە لەوێوە دەهێنرێن: ٦سەعات

مەکس: ٦سەعات

**هەمووی**:20 سەعات (مەکس)یش ئێستا سەر بە هەکارییە و یەکێك لە خزمەکانی (مستەفا خان)ی جۆلەمێرگ فەرمانڕەوایەتی. لە (سەعرد)یشەوە بۆ (دیاربەکر) ٤٣ سەعاتە، بەم ڕێگایانەدا:

تەللە نافرو: ٥سەعات

ڕەزوان(٣٣٩) : ٥ سەعات

ڕەجیر خراپ: ٤ سەعات

سینەکەری (خێڵێکی ڕەوەندی کوردن): ٦ سەعات

بلەی دوون : ٨ سەعات

---

٣٣٩- ڕەزوان: چوار سەعاتە ڕێیەك لە (حەسەن کیف)ەوە دوورە، کە لەبەری لای سەرووی (دیجلە)، یان ڕووباری (دیاربەکر)ە. (ڕەزوان)یش لەبەری (دیاربەکر)ە و (حەسەن کیف) لەبەری (ماردین)ی ڕووبارەکەیە.

دیاربەکر : ٦ سەعات

**هەمووی: ٤٣** سەعات

لقەکانی تری دیاربەکر، لە ڕووباری **دیجلە**، پێش ئەوەی بڕژێتە ڕووباری **دیجلەی** سەرەکییەوە، بە (ڕەزوان) و (حەسەن کیف)دا تێپەڕ دەبێ. کوردانی (**محلەمی**) لەو ئەشکەوتە پەرشوبڵاوانەی ئەمبەر و ئەوبەری ڕۆخی **دیجلە** دەژین و ژمارەیان زۆرە و دەڵێن زۆر کۆنیشن و لەناویشەوە ژووری جیاجیایان تێدایە.

ڕووباری (خاموور)یش کە بە (زاخۆ)دا تێپەڕ دەبێ، لە کێوەکانی (ئامێدی) هەڵدەقوڵێ و چوار سەرچاوەیشی هەیە. (ماکدونالد کیننەر) ئەم ڕووبارە و ڕووباری (سەعید)ی تێکەڵ کردووە. (فیشخابوور)یش ناوی دووانەی (هیزل) و (خابوور)ە. (هیزل) ماوەی سەعاتە ڕێیەکی تریش لە (زاخۆ) و (سلوبی)یەوە دوورە. هەردووکیشیان لە دامێنی (زاخۆ) بەیەك دەگەن و ڕووباری (شاخ)(٣٤٠) تێکەڵیان دەبێت.

| ڕێگاش لە (مووسڵ)ەوە بۆ (جزیرە) بەمجۆرەیە: | سەعات |
|---|---|
| تەل ئەسقەف: ٦ | |
| نەمیر: (گوندێکی ئیزەدییە و سەروکێکی ئیزەدی تێدایە | |
| پاشان بواری (هیزل): ٦ | |
| تەل کێشان: | ٦ |
| زاخۆ: | ٣ |
| سلوبی، لەو ناوچەیە دایە، کە کێوی (جودی) تێدایە: | ٥ |
| جزیرە: | ٥ |
| هەمووی | ٣١ |

| ڕێگا لە جزیرەوە بۆ سەعرد: | سەعات |
|---|---|
| فێنیك: قەڵایەکی زۆرکۆن و بەناوبانگە و لە مێژووی کورددا ناوی هاتووە | ٤ |
| چەولیك: | ٨ |

٣٤٠- ڕووبارێکی تریش بەم ناوە لە نزیکی (مەکس) هەیە، لە ناوچەی (هەکاری).

| | |
|---|---|
| تەللە نافرو: دوواوانی هەردوو لقەکەی دیجلەیە. | ٣ |
| سەعرد: | ٥ |
| **هەمووی** | **٢٠** |
| ڕێگا لە (سەعرد)ەوە بۆ (بەتلیس) | سەعات |
| سێ گوێزە (سێ دارگوێزەکە) | ٦ |
| بەتلیس: | ٦ |
| **هەمووی** | **١٢** |
| ڕێگا لە (بەتلیس)ەوە بۆ (ئەرزەرۆم) | سەعات |
| جاقور: | ٦ |
| خاس کۆی: | ٨ |
| جەویرمە: | ٣ |
| سوللوق (پردێکی دارینەیە لەسەر فورات): | ٣ |
| جار کور: | ٥ |
| ئاروزە : | ٥ |
| ئال ئاراس: | ٧ |
| دەلی بابا: | ٨ |
| قزڵجە: | ٥ |
| لەسەر شاخەکەوە بۆ ئەرزەرۆم: | ٤ |
| **هەمووی** | **٤٥** |

# پاشکۆی چوارەم

**پاشکۆی سێیەمی بەرگی یەکەمی گەشتەکەیە**

**زنجیرەی میرانی بنەماڵەی بابان لە (سلێمان بابا)، یان سلێمان بەبەوە، تا پاشای ئێستای (سلێمانی):**

ماوەی حوکم

ساڵ مانگ

١- سلێمان بەگ غازی (واتە، بابا سلێمان)ی کوڕی

میر سلێمان. دوای ئەوەی حوکمی گرتەدەست: ١٠٨٨ك ٧٧٦١ز[٣٤١] -- ٤

٢ــ تەمیر (تەیمور) خان بەگ: ٠١١١ك ٨٩٦١ز -- ٤

٣ــ بەکر بەگ : ٥١١١ك ٣٠٧١ز -- ٣

لێرەدا ماوەیەك ڕادەبووڕێ، تورکی (موتەسەلیم) (٣٤٢)

حوکمی کوردستانیان گرتەدەست: ٨٢١١ك ٥١٧١ز -- ٤

٤ــ دوای چوار ساڵ (خانە پاشا) ماوەی سێ ساڵ

حوکمی کوردستانی کرد، پاشان کە (سنە)ی گرت

حەوت ساڵ حوکمی کرد و مزگەوتێکی تێدا دروستکرد. لەم

یەك دوو ساڵەی دواییدا (ئەمانوڵلاخان) تێکی دا: ٢٣١١ك ٩١٧١ز -- ٣

٥ــ جێگری خالید پاشا، کوڕی بەکر بەگ: ٥٣٣١ك ٢٢٧١ز -- ٤

٦ــ فەرهاد پاشا: ٩٣٣١ك ٦٢٧١ز -- ٢

٧ــ خالید پاشا (هەمدیسان): ١٤١١ك ٨٢٧١ز -- ٥١

٨ــ جێگری سەلیم پاشا: ٦٥١١ك ٣٤٧١ز -- ٤

٩ــ جێگری سلێمان پاشا: ١١٦٠ك ٧٤٧١ز -- ٣

١٠ــ سەلیم پاشا (هەمدیسان): ٣٦١١ك ٩٤٧١ز -- ٤١

١١ــ سلێمان پاشا (هەمدیسان). سەلیم پاشای ەغدادیش بەفێڵی ئەم لە سێدارەدرا. سلێمان پاشا، مزگەوت و گەرماوی لە (زەنگەباد) دروستکرد.

لەسەردەمی ئەمدا (زەنگەباد) و (مەندەلی) و (بەدرە)و

(جەسان) بەشێك بوون لە کوردستان: ٤٦١١ك ٠٥٧١ز -- ٠١

هەر لەسەردەمی ئەمیشدا تاعوونە گەورەکە

---

٣٤١- بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە، وەرگێڕ مێژووی (زایین)ی لێ زیاد کردووە ــ ع.

٣٤٢- لە دەقەکەدا بەهەڵە (المسلّمون) نووسرابوو ــ ع.

بڵاوبووەوە، ساڵی: ١١٧١ك ٧٥٧١ز -- -- --

٢١ــ مەحموود پاشای کوڕی خانە پاشا، لە شەڕێکدا

کوژرا، کە لەگەڵ سلێمان پاشادا کردی: ١١٧٤ك ٠٦٧١ز ٥ -- --

٣١ــ سلێمان پاشا (هەمدیسان): ٥٧١١ك ١٦٧١ز -- -- --

٤١ــ ئەحمەد پاشای کوڕی خالید پاشا: ١١٧٦ك ٦٢٧١ز -- ١

٥١ــ سلێمان پاشا (دووبارە): ٧٧١١ك ٣٦٧١ز ٢ --

٦١ــ ئەحمەد پاشا (هەمدیسان): ٧٧١١ك ٣٦٧١ز -- -- --

٧١ــ سلێمان پاشا (هەمدیسان) فەقێ ئەحمەد کوشتی: ٧٧١١ك ٣٦٧١ز --

٨١ــ محەمەد پاشای کوڕی خالید پاشا و باوکی

خالید بەگ : ٨٧١١ك ٤٦٧١ز -- ٨

٩١ــ ئەحمەد پاشا (هەمدیسان): ٦٨١١ ك ٢٧٧١ز ٢ ١

تێبینی: باوکی ئیبراهیم پاشا و خالید پاشای ئێستایە و برا گەورەی مەحموود پاشایە.

٠٢ــ مەحموود پاشا، لە (ئەحمەد کولوان) ئەحمەد پاشای(٣٤٣)

ئێستا و براگەورەی مەحموود پاشای بەدیل گرت: ١١٨٧ك ٣٧٧١ز ١

١٢ــ دووبارە ئەحمەد پاشا بەیارمەتی عەلی

مرادخان، لە (سەرسیر و چوارتا)، توانی بەسەر مەحموود پاشادا زاڵ بێت.

٢٢ــ دووبارە مەحموود پاشا، بەیارمەتی شەفیع خانی

زەندی لە ئێران گەڕایەوە، بەڵام شکا و گەڕایەوە: ٠٩١١ك ٦٧٧١ز ٩ --

٣٢ــ دووبارە لەگەڵ مەحموود عەلی سەرداردا گەڕایەوە و لە نێوان محەمەد پاشا و خوسرەو خان، خانی سنەدا، لە نزیك (سەری بار- زرێبار)دا ڕوویدا،

کە ئەمی دواییان زۆر خراپ تێکشکا: ١٩١١ك ٧٧٧١ز ١

٤٢ــ کەلب عەلی خانی سەرکردەی زەندی بۆ یارمەتیدانی ئەحمەد پاشا هات و دووبارە

لەسەر تەخت داینایەوە محەمەد پاشاش

بۆ (کۆیسنجاق) هەڵهات: ١٩١١ك ٧٧٧١ز -- -- --

---

٣٤٣- ئەحمەد پاشا، کە محەمەد پاشای برای بەدیل گرتبووی، بەیارمەتی هێزەکانی توانی هەڵبێت و جڵەوی فەرمانڕەوایی گرتەوە دەست و ماوەی شەش مانگ حوکمی کرد. محەمەد پاشاش بۆ ئێران ڕایکرد و دووبارە لەگەڵ (مراد خان)دا گەڕایەوە، بەڵام هەردووکیان لە (سەرسیر) تێشکان.

٥٢ــ محەمەد پاشا، لەگەڵ تەیمور پاشا، پاشای

کۆیسنجاق گەڕایەوە و لە (گلّی زەردە) لەگەڵ ئەحمەد پاشادا کردیان بەشەڕێکی دەستەویەخە، بەشمشێر و خەنجەر، کە سەعاتێکی خایاند و زیانێکی زۆری تێدا کەوت، تەیمور پاشا کوژرا و محەمەد پاشا دەستبەجێ لەلایەن ئەحمەد پاشای برایەوە هەردوو چاوی هەڵکۆڵرا.

ئەحمەد پاشاش هەڤدە ڕۆژ دوای گەڕانەوەی

لە قەرەداغ بۆ (قەڵاچوالان) مرد: ١١٩٢ك ١٧٧٨ز -- -- --

٢٦ــ جێگیربوونی مەحموود پاشای باوکی عەبدولڕەحمان پاشا، کە لە شەڕی (یەل تیمار)ی نێوان سەقز و (ساووق بولاّق)دا لەلایەن (بوداق خان)ی میری (ساووق بولاّق) کوژرا، کە لەگەڵی بەشەڕ هاتووە: ١١٩٣ك ١٧٧٩ز -- ٥

٢٧ــ جێگیربوونی ئیبراهیم پاشای دامەزرێنەری: ١١٩٨ك ١٧٨٣ز -- ٣

(سلێمانی)، کە حەسەن خان بەگ و حسین بەگی گرت، کە دوو میری سەر بەبنەماڵەکەی خۆی بوون و بە دیلی ناردنی بۆ بەغدا و سەرەتا ئاوارەی (حلە) کران و پاشان لە سێدارە دران: ١٢٠٠ك ١٧٨٥ز -- ٣ ٢٨ــ

عوسمان پاشای براگەورەی عەبدولڕەحمان پاشا: ١٢٠١ك ١٧٨٦ز -- ٢

٢٩ــ ئیبراهیم پاشا (دووبارە) : ١٢٠٣ك ١٧٨٨ز -- ١

٣٠ــ جێگیربوونەوەی عەبدولرەحمان پاشا: ١٢٠٤ك ١٧٨٩ -- ٨

٣١ــ ئیبراهیم پاشا (هەمدیسان): ١٢١٢ك ١٨٠٢ز -- ٥

(لەسەردەمی ئەمدا تاعوونە بچووکەکە بلاّوبووەوە)

٢٣ــ عەبدولڕەحمان (هەمدیسان): ١٢١٧ك ١٨٠٢ز -- ٢

ئیبراهیم پاشا لەکاتی هێرشی عەلی پاشا) پاشای بەغدا)دا مرد، کە بۆ سەر (سنجار ــ شەنگار)ی کرد،

عەلی پاشا چووە جێی و ئەمیش مرد، لە ساڵی: ١٢١٧ك ١٨٠٢ز -- --

عەبدولڕەحمان پاشا، لە عەلی پاشا هەڵگەڕایەوە و یاخیبوو، دوای ئەوەش لە (کۆیسنجاق) بەسەر خالید پاشادا سەرکەوت. یەکسەر دوای گەڕانەوەی محەمەد پاشا، پاشای سلێمانی، لە بەغدا بەدەستی خۆی کوشتی، دوای ئەم ڕووداوانە پاشای بەغداش خۆی هات و خالید پاشای لە سلێمانی دانا.

عەبدولڕەحمان پاشاش بۆ ئێران هەڵهات: ١٢١٨ك ١٨٠٣ز -- -

٣٣ــ خالید پاشا ٩١٢١ك ٤٠٨١ز -- --

٣٤ــ عەبدولڕەحمان پاشا لە ئێران گەڕایەوە و لە (زەریبار- زرێبار) بەسەر لەشکری یەدەکی تورك و کوردەکاندا سەرکەوت و سلێمان کەهیای بەغدای بەدیل گرت
١٢٢١ ك ٦٠٨١ز -- --

٥٣ــ عەبدولڕەحمان پاشا ناچار کرا لە سلێمانی هەڵبێت. تورکەکانیش، لەژێر فەرمانده‌یی (سلێمان کەهیە)ی پاشای ئێستای بەغدایە، سلێمان پاشای کوڕی ئیبراهیم پاشایان دانا ٣٤٤ ٣٢٢١ك ٨٠٨١ز ٣ --

٦٣ــ جارێکی تر عەبدولڕەحمان خۆی کردەوە بەسەرداری کوردستان. شازادەی کرماشان لە دژی ئەم، لەگەڵ تورکەکاندا ڕێکەوت و ناچاری کرد بکشێتەوە کۆیسنجاق، کە ئێرانییەکان ئابڵووقەیان دابوو، دوای مانگێك و چوار ڕۆژ ئابڵووقەکەیان شکاند. ئەمەش لە ساڵی (٤٢٢١ك)بوو. عەبدولڕەحمان پاشاش گەڕایەوە
بۆ (سلێمانی). ٦٢٢١ك ١١٨١ز -- ٢
مردنی عەبدولڕەحمان ٨٢٢١ك ٣١٨١ز -- --

٣٧ــ جێگیربوونی مەحموود پاشای کوڕە گەورەی عەبدولڕەحمان پاشا، کە جێی باوکی گرتەوە و میری ئێستایە. ١٢٢٨ك ١٨١٣ز -- --

هەندێ کارەسات و مێژوو، کە پێوەندییان بەمێژووی کوردستانەوە هەیە
تێشکانی هێزەکانی تورك و ئێرانی، کە هاوپەیمانی سلێمان بەگ بوون و ناچارکران لە کوردستان هەڵبێن و پەنابەرنە (ئەستانبوڵ) ٠١١١ك ٨٩٦١ز
تێشکانی بەکر بەگ ٠٢١١ك ٨٠٧١ز
ئابڵووقەی بەغدا ٠٣١١ك ٧١٧١ز
دەستگرتنی تورك بەسەر (هەمەدان)دا ٥٣١١ك ٢٢٧١ز
کوژرانی خانە پاشا، پاشای کوردستان ١١٤٥ك ٢٣٧١ز
شەڕی تۆبالە (شەل) عوسمان پاشا ٤٤١١ك ١٣٧١ز
ئابڵووقەی مووسڵ ٤٥١١ك ١٤٧١ز
هەڵاتنی خالید پاشا ــ پاشای کوردستان بۆ (ئورفە) ٥٥١١ك ٢٤٧١ز

٣٤٤- ئەمەش ساڵی (٨٠٨١ز) بوو، کە تیایدا گەیشتمە بەغداد.

مردنی خالید پاشا له (ئورفه) ٦٥١١ك ٣٤٧١ز

پاشان سەرکەوتنی بەسەر (یەکون پاشا)ی سەرکردەی تورك ٦٥١١ك ٣٤٧١ز

کوژرانی نادر شاه ٨٥١١ك ٥٤٧١ز

مردنی عادل پاشا ١٦١١ك ٨٤٧١ز

مردنی ئیبراهیم پاشا ١١٦٢ك ٨٤٧١ز

دەستپێکردنی حوکمی سلێمان پاشا، پاشای بەغدا و کوشتنی

سلێمان پاشای (کۆیسنجاق) لەلایەن سلێمان پاشای بەغداوە ١١٦٤ك ٠٥٧١ز

کوژرانی سەلیم پاشا، پاشای (قەڵاچوالان) له بەغدا ١٧١١ك ٧٥٧١ز

بڵاوبوونەوەی تاعوونە گەورەکە ١٧١١ك ٧٥٧١ز

سەرکەوتنی پاشای بەغدا، بەسەر مەحموود پاشای باباندا لە (نارین) ٦٧١١ك ٢٦٧١ز

کوشتنی سلێمان پاشا ١١٧٨ك ٤٦٧١ز

بڵاوبوونەوەی دووەمین تاعوون (بچووکەکە) ٧٨١١ك ٣٧٧١ز

کوژرانی سلێمان پاشا، پاشای بەغدا ١٧١١ك ٧٥٧١ز

بەدیل گیرانی ئەحمەد پاشا، لە (ئەحمەد کولوان) ٧٨١١ك ٣٧٧١ز

بەدیل گیرانی عەلی مرادخان، لەلایەن ئەحمەد پاشاوە ١١٨٨ك ٤٧٧١ز

هاتنی شەفیع خان، بۆ یارمەتی محەمەد پاشا ٨٨١١ك ٤٧٧١ز

هاتنی کەلب عەلی خان و سەرکەوتنی محەمەد پاشا،

بەسەر خوسرەوخاندا ١٩١١ك ٧٧٧١ز

بوومەلەرزەکەی تەورێز ١١٩٤ك ٠٨٧١ز

ڕۆیشتنی محەمەد پاشا و ئەحمەد پاشا بۆ کەرکووك ١٩١١ك ٧٧٧١ز

سەرکەوتنی ئەحمەد پاشا، بەسەر محەمەد پاشادا ١٩١١ك ٧٧٧١ز

مردنی ئەحمەد پاشا ٢٩١١ك ٨٧٧١ز

مردنی کەریم خانی شای ئێران ٢٩١١ك ٨٧٧١ز

مردنی عەبدوڵلا پاشا، پاشای (زەهاو) ٣٩١١ك ٩٧٧١ز

سەرەتای فەرمانڕەوایەتی مەحموود پاشای باپیری مەحموود پاشای ئێستا ٢٩١١ك ٨٧٧١ز

کوژرانی ڕەزا قولیخان ١١٩٧ك ٢٨٧١ز

هەڵاتنی محەمەد پاشای لە کارخراو بۆ ئێران و گەڕانەوەی و کوژرانی لەگەڵ سەرکردەیەکی تردا، ناوی عومەر پاشا بووە، لەلایەن مەحموود پاشاوە، لەژێر دارە گەورەکەی (قەڵاچوالان)دا. ٤٩١١ك ٠٨٧١ز

سەرەتای دەستپێکردنی فەرمانڕەوایی ئیبراهیم پاشا ٧٩١١ك ٢٨٧١ز

دروستکردنی شاری (سلێمانی) ١١٩٩ك ٤٨٧١ز

کوژرانی مەحموود پاشا ٨٩١١ك ٣٨٧١ز

دەستپێکردنی فەرمانڕەوایی عوسمان پاشا ١٠٢١ك ٦٨٧١ز

مردنی عوسمان پاشا ٣٠٢١ك ٨٨٧١ز

بوومەلەرزە لە (سلێمانی) ٧١٢١ك ٢٠٨١ز

مردنی سلێمان پاشا، پاشای بەغدا و بەدواهاتنی عەلی پاشا ٧١٢١ك ٨٠٢١ز

مردنی ئیبراهیم پاشا ٨١٢١ك ٣٠٨١ز

سەرەتای دەستپێکردنی فەرمانڕەوایی فەتح عەلی شای ١١٢١ك ٦٩٧١ز

ئێستای ئێران سەرپێچی کردن و یاخیبوونی عەبدولڕەحمان پاشا، لە عەلی پاشا و کوشتنی مەحموود پاشای (کۆیسنجاق)و زاڵبوونی بەسەر خالید پاشای (ئاڵتون کۆپری)دا.

لەسەر ئەمە پاشای بەغدا بەپەلە دێت و لە (دەربەند)(٣٤٥) بەسەر عەبدولڕەحمان دا زاڵ دەبێ. ٠٢٢١ك ٥٠٨١ز

هاتنی خالید پاشا بۆ سلێمانی و بەدەستەوەگرتنی جڵەوی حوکم. یەك ساڵ

شەڕی دووەمی (دەربەند) بە فەرماندەیەتی سلێمانە بچووکی پاشای بەغدا٣٤٦ ١٢٢٣ك ٨٠٨١ز

کوژرانی سلێمان پاشا، پاشای بەغدا. ٥٢٢١ك ٠١٨١ز

شەڕی کفری ٦٢٢١ك ١١٨١ز

گەڕانەوەی، عەبدولڕەحمان پاشا بۆ سلێمانی، بە یەکجاریی ٦٢٢١ك ١١٨١ز

---

٣٤٥- مەبەست لە (دەربەندی بازیان)ی نێوان سلێمانی و کەرکووکە ـــ م.

٣٤٦- ئەمەش هەر ئەو ساڵەیە، کە تیایدا گەیشتمە بەغداد.

## پاشکۆی چوارەم
## هەندێ زانیاریی کە لە (ئەحمەد کولوان) وەرگیراون لەبارەی ئەو ڕێگایانەی بۆ جێگای جۆربەجۆر دەچن لەناوچەی (قزلْجە)ەوە بۆ (زەهاو)

| لە (ئەحمەد کولوان)ی ناوچەی (قزلْجە)ەوە بۆ (زەهاو) | سەعات | سەرنج |
|---|---|---|
| بۆ (سوورەجۆ) لە - شەهرەزوور- کە پێی دەڵێن: (شارەزوور) | ٠٦:٣٠ | ناوچەیەکی زوورگاوییەوشاخی وا بەرزی تێدا نییە، پێویست بەبڕینی بکات. |
| بانی خێڵان | ٠٦:٣٠ | بەشی یەکەمی ڕێگاکە بەدەشتی شارەزووردا تێپەڕ دەبێ و کە لە بانی خێڵانیش نزیك دەبێتەوە شاخێك دەبڕیت و دەگەیتە ئەوێ، لەوێدا چەند چەمێك کە لە کوردستانەوە دێن دەڕژێنە (دیالە)ەوە. |
| زەهاو | ١٠:٠٠ | دەشتی (باجەڵان )ە. |
| **هەمووی** | ٢٣:٠٠ | |

تێبینی: ئەمە کورتترین ئەو ڕێگایانەیە کە لە کوردستانەوە بۆ کرماشان دەچێ و لە هەمووشیان تەختانیتر و چاکترە و هەموویشی بەلای کەمەوە بەگەرووی نێوان دوو شاخدا تێپەڕ دەبێ.

| له (ئەحمەد کولوان)ەوە بەڕێگەی (شامیان)دا بۆ (کرماشان) | سەعات | سەرنج |
|---|---|---|
| سەولاوا<br>پالێنگان<br>کرماشان<br>هەمووی | ٠٦:٠٠<br>٠٥:٠٠<br>10:00<br>21:00 | لەناوچەی (سنە)یە لە دۆڵێکدایە لەسەر درێژایی ڕێگاکە.<br>لەسەر درێژایی دۆڵەکەیە.<br>ڕێگەیەکی تەختە. |

کوردەکان دەڵێن ئەمە چاکترین و لەبارترین ڕێگەیە بۆ تێپەڕبوونی خێڵات پیایدا بەخۆیان و خێزان و باروبنە و ماڵات و... هتد.

| ئەو زانیارییانەی لە (سنە) وەرگیراون لەبارەی ڕێگە لە (سنە)وە بۆ هەمەدان | فرسەخ |
|---|---|
| دەهکەلان (دێگولان) | ٦ |
| کوروە (قوروە) | ٦ |
| حەما قیسی | ٦ |
| هەمەدان | ٦ |
| هەمووی | ٤٢ |

| بۆ کرمنشاە | فرسەخ |
|---|---|
| کورووک | ٥ |
| کامیارە (کامیاران) | ٥ |
| کرمنشاە (کرماشان) | ٧ |
| هەمووی | ١٧ |

| بۆ (تەوریز) | فر سەخ |
| --- | --- |
| باقلاباد (باقلاوە-بەڵام ئێستا: باقراوای پێدەڵێن) | ٦ |
| کێلە کەبوود (ڕەنگە: تیلەکۆی- ئێستا بێت) | ٦ |
| سەقز | ٩ |
| کوول تەپە | ٦ |
| میان دوئاو | ٨ |
| لووکلەر | ٩ |
| ئاق تەپە (ئاخ تەپە) | ١١ |
| تەوریز | ٢١ |
| هەمووی | ٦٧ |

| بۆ (مەراغە) | فرسەخ |
| --- | --- |
| هەڵەدەرە (ڕەنگە: قۆڵەدەرەی ئێستا بێت) | ٥ |
| دیوان دەرە | ٥ |
| قابلان تو (قافلان تو) | ٥ |
| سەفاخانە | ٤ |
| سایین قەڵعە (سایین قەڵا) | ٧ |
| دیزە | ٦ |
| مەراغە | ٤ |
| هەمووی | ٣٦ |

ڕێگا لە (سنە)وە بۆ (هەمەدان)، وەك بەگوێرەی یادداشتەکانی میستەر (بەل لی نۆ)وە ڕاستکراوەتەوە

| ڕێگا له (سنه)وه بۆ (هەمەدان) | وەك دەڵێن | ڕاستییەکەی بە سەعات |
|---|---|---|
| دەککیلان(٣٤٧ ) | ٧/ فرسەخ | ٠٩:٥٥ |
| کووربا (٣٤٨ ) | ٥/ فرسەخ | ٠٧:١٥ |
| حەماقیسی | ٥/ فرسەخ | ٠٦:٢٠ |
| هەمەدان | ٥/ فرسەخ | ٠٧:٣٠ |
| هەمووی | ٢٢/ فرسەخ | ١٣:٠٠ |

٣٤٧ پێشتر بە (دەهکەلان) هاتبوو، کە مەبەست (دێگولان)ی ئێستایە ـــ م.

٣٤٨ پێشتر بە (کوروە) هاتبوو، کە مەبەست هەر (قوروە)ی ئێستایە ـــ م.

